**میسالی عالەمی هەستی بەزاهیر نیست وعەدەم، وعالەمی نیستی بەزاهیر هەست ..**

دای نیشـان نیسـتی بەهەسـتی و باحەشـەم ‌ دای نیشـانمان هەسـتی سەرشـکڵی عـەدەم (١٠٢٦)

بـەحری داپۆشـی کـەفی کـرد ئاشـکار ‌ بـای دەپۆشـی و، ئاشکراشـی کـرد غوبـار (١٠٢٧)

وەک منارەخـاک دەسـووڕێ نێـو هـەوا ‌ بێ سەبەب کوا خاک دەچێتن بۆ حەوا؟ (١٠٢٨)

تـۆ دەبینـی خـاک لـەباڵا ئـەی عـەلیل ‌ بـا، کـەنا، ئـیللا بەتـەعریفی دەلیـل (١٠٢٩)

تـۆ دەبینـی کـەف لـەبۆ هـەر لا دەچـێ ‌ گەر نەبێ یەم، کەف لەجێی خۆی، کوا دەچێ؟ (١٠٣٠)

تـۆ دەبینـی کـەف بـەچاو، یـەم، بـا دەلیـل ‌ فیکـرو بیـر پنهـان، ئاشـکار قـال و قیـل (١٠٣١)

ئێمەمـەنفیمان بەموسـبەت دی هـەموو ‌ چـاوی مەعـدووم بینمـان چـون ئێمـەبوو (١٠٣٢)

چاوکـەچۆ نێـو بیرەخـەو، یـانی نوعـاس ‌ هـەر خـەیاڵاتان دەبینـێ ئـەو، نـەڕاس (١٠٣٣)

لاجـەرەم تێـک چـوو لەئێمـەوەزع و حـاڵ ‌ چون حەقیقـەت ون بـوو، پەیـدا بـوو خـەیاڵ (١٠٣٤)

چـۆن نیشـانی دا، بەعالـەم، ئـەو عـەدەم؟ ‌ چـۆنی لـێ کـردن حەقیقـەت، موکەتـەم؟ (١٠٣٥)

ئافـەرین ئـەی سیحرسـازی بـێ گـەزاف ‌ تـۆ کـەدات نیشـان بـەموغریز، تـار، سـاف (١٠٣٦)

مانگەشـەو گـەز گـەز دەپێـون سـاحیران ‌ لای خەریـداران، دەی بـەن، زۆر گـران (١٠٣٧)

زۆر بـەفێڵیان وەر دەگـرت پـووڵ، سـاحیران ‌ بـێ عیـوەز پـوو ڵیـان لـەدەس دا، تـاجیران (١٠٣٨)

سـاحیرەدونیاو ئێمـەش تـاجرین ‌ لـەو شـەوی مـەهتابی پێـوراو، موشـتەرین (١٠٣٩)

زیـاد لەپێنسـەت گـەزدەپێوێ، پارچـە، ئـەو ‌ هـەروەکوو سـاحیر لـەنووری مانگەشـەو (١٠٤٠)

گـەر سـتاندی زێـڕی عـومرت ئـەو غـولام ‌ کیسـەخاڵی، پارچـەنا، زێـڕیش تـەمـام (١٠٤١)

(قـل اعـوذ ) بخوێنەبێژەئـەی سـەمەد ‌ دوورکـە نەففاسـات لـێم تـۆ، هـەم عوقـەد (١٠٤٢)

دەو گرێیـان فوودەکـەن ئـەو سـاحیرات ‌ ئـەی خـودا، نـەمکات ئـەو دونیایـە، مـات (١٠٤٣)

تـۆ بەئـەزمانی عەمـەل بخوێنەئـەو ‌ چـون زبـانی قـەو ل سسـتەنەک پتـەو (١٠٤٤)

دەو زەمانـە، سـێ کەسـت تـۆ بوونـەیار ‌ یـەک وەفـادار، دوو غـەدوور و نالـەبار (١٠٤٥)

یـار و مـاڵ دوو یـاری زۆر غـەدداری تـۆ ‌ سـووەمین یـار، باوەفـا، کـرداری تـۆ (١٠٤٦)

مـاڵ لەگەڵتـە بـەس لـەنێو قەسـر و قسـوور ‌ یـار لەگەڵتـەتاکو لێـوی گـۆڕ، نـەژوور (١٠٤٧)

گـەر ئەجـەل هات،تـا تـەواو کا،کـاری تـۆ ‌ پێـت دەڵـێ ئـەو دەم لەدڵـدا، یـاری تـۆ (١٠٤٨)

نیمـەهاوڕێی تـۆ ئـەلێرە، زێـدەخۆ ‌ ڕادەوەسـتم مـاوەیـەک سـەر قـەبری تـۆ (١٠٤٩)

بگرەئـەعمالت وەفـادارن ئـەوان ‌ دێتـەنێو قـەبریش لەگـەڵ تـۆ بێگومـان (١٠٥٠)

**تەفسیری قەو لی موستەفا( علیەالسلام ) (لابد من قرین ید فن معک و هو حی وتدفن معە وا نت میت ..ان کان کریما اکرمک وان کان لئیما ا سلمک وذلک ا لقرین عملک فاصلحە ماستطعت ) صدق رسول اللە ..**

ترجمـە: لازمەکـە هـاو نشینێکت هـەبێ کەدەگـەڵ تـۆ بێتـەگۆڕ، دەحاڵێک دا کەئـەو هاونشینە زیندووە و تۆ دەگەڵ وی بچیە گۆڕ دەحاڵێک دا کە ئەتۆ مردووی .. ئەگەر ئەو هاو نشینەباش بێ ئەتوش باش و گەو رەدەکا، وئەگەر خەراپ بێ ئەتۆش پەست و خوار دەکا، ئەو هاونشینە عەمەل و کردەوەی تۆیە.. جا کە وایە هەتا دەتوانی عەمەل و کردەوەی خۆت ئیسلاح بکە..

وای دەفـــەرموو ئـــەو ڕەســـوولی کردگـــار ... بـا وەفـانین وەک عەمـەل خـۆ، قـەت چ یـار (١٠٥١)

ئـەو کـەباش بـێ، تـا ئەبـەد هـەر یـارەبۆت ... گـەر خـەراپ بـێ، ئـەو لـەگۆر دا، مـارەبۆت (١٠٥٢)

کـارو کەسـبی وا، لـەڕێی ڕاسـتی وسـەداد ... ئـەی عـەزیزم کـوا دەبـێ، بـێ ئووسـتاد؟ (١٠٥٣)

کـەمترین کارێـک لـەنێو دونیـایی دوون ... کـوا دەبـێ مـومکین نـەبێ گـەر، ڕێ نمـوون؟ (١٠٥٤)

کەسبی دانـیش لازمـە، دوایـەش عەمـەل ... ماوەیـەک پـاش، بـەر بـدا، یـا پـاش ئەجـەل (١٠٥٥)

تـۆ کەساحەب عـەقڵی هـەم زۆر هـوو شیار ... بـەس لەسـەنعەتکاری سـاڵح، فێـر بـەکار (١٠٥٦)

تـۆ تەڵـەب کـە، نێـو سـەدەف دوڕڕی گـران ... فێربەسـەنعەت هـەر لـەلای سـەنعەت گـەران (١٠٥٧)

ناسـیحت گـەردی بەئینسـاف بـە، ئـەتۆ ... فێـر بـە، لـەو، زوو، لا مـەدە، لـەو ڕوویـی خـۆ (١٠٥٨)

گـەر لیباسـی کـۆنی دەببـاغ،کرد بـەری ... زەڕڕەیـەک نـابێ لـەوی کـەم، سـەروەری (١٠٥٩)

گـەر دەبـەرکا وەختـی دەم، حـەدداد، دەڵـق ... گـەورەیی وی نـابێ مەخـدووش لایـی خـەڵق (١٠٦٠)

جلکـی مـەغرووری لەتـەن تـۆ بێنـەدەر ... وەختـی فێـر بـوو ن جلکـی زیللـەت، بیکەبـەر (١٠٦١)

فێـر دەبـن دانـیش لـەڕێی قـەو لـو وتـار ... فێـر دەبـن سـەنعەت لـەڕێی کـردار و کـار (١٠٦٢)

فـەقری دڵخـوازت بەسـوحبەت دێتـەدەس ... دەسـت و ئـەزمان لێرەسـوود نـادەن، بەکـەس (١٠٦٣)

فێـر دەبێـتن عیلمـی فـەقری، گیـان لـەگیان ... نـەک لـەڕێگای دەفتـەران یـا خێـر زەبـان (١٠٦٤)

ئـەو ڕمـووز گـەربوون لـەدڵ سـالیک نیهـان ... هـیچ نـەبوون هێشـتا، لـەبۆ سـالیک، عـەیان (١٠٦٥)

تـــا دڵـــی وی ئـــاوەڵا بێـــتن بـــەنوور ... جا، ( الم نشرح) دەفـەرمووی خـوای غـەفوور (١٠٦٦)

شـەرحی ویمـان نێـو دڵـی تـۆ کـرد ئـەدا ... شـەرحی سـەدرت، ئێمـەپێن کـردی عـەتا (١٠٦٧)

دەت هـەوێ نـوورت لـەخاریج دەسـکەوێ؟ ... شـیر لـەلای خۆتـە، لەخـەڵکی دیـت دەوێ (١٠٦٨)

کانیـــاوی شـــیر لەلاتـــە، بـــێ کـــەنار ... بـۆ دەچـی بـۆ شیری نێـو مەنجـەڵ، بـەغار؟ (١٠٦٩)

ڕێـــت لـــەبۆ دەریـــا هەیـــە، ئـــەی ئـابگیر ... نەنگـەبتوێ، ئـاو، لەیـەک بێرکـەی، حـەقیر (١٠٧٠)

بۆی نەدای تەوزیح (الم نشرح ) مەگەر؟ بۆ دەرۆی بۆ شەرحی وی، بۆ دەورو بەر؟ (١٠٧١)

چاک بنۆڕەشەرحی سەدرت نێو دەروون تا نەیبێتن، تانەبۆت،( لا تبصرون ) (١٠٧٢)

**تەفسیری (و هو معكم )..**

سفرەیەک پڕ نان کەدات نا فەرقی سەر تۆ دەچی بۆ پەلکەنانێک دەو رو بەر (١٠٧٣)

بیر لەخۆت کە، دوورکەحەیرانی، بەدە دەرکی دڵ لێدە، لەدەرکی دی، مەدە (١٠٧٤)

تاکوچۆکت ئێستەتۆی نێو ئاوی جۆ غافڵی دەت وێ، لەئێدی ئاو، ئەتۆ (١٠٧٥)

پاش و پێش و دەوری تۆ بوو ئاوی ژین پاش و پێشی چاوی تۆ سەددی قەوین (١٠٧٦)

ئەسپی خۆی ژێر ڕان، بە ئەسپی خۆی نەدی ئەوهە ئەسپە ، ئەسپەکەی من کوا ئەدی؟ (١٠٧٧)

تۆ مەگەر ئەسپت لەژێر ڕان دا نییە؟ دای جەواب، بائەسپی من چۆ وا نییە (١٠٧٨)

یەک نەفەرتینوو، لەلای ئاوی ڕەوان ڕا دەوەستا، بێ خەبەر لەو ئاوی جوان (١٠٧٩)

چەشنی دوڕ نێو یەم، دەڵێ یەم، کوا ئەدی؟ بوو خەیاڵ بۆوی سەدەف، گەر وای دەدی (١٠٨٠)

بۆی دەبێتەپەردەئەو جوور پرسیار بۆی دەبێ پێش ڕۆژی زۆر گەش، هەوری تار (١٠٨١)

بۆ حیجابی چاوی وی چاوی بەدی عەینی ڕەفعی سەددی وی بوو، بۆ سەدی (١٠٨٢)

مەنعی گوێی وی کرد لەبیستن هۆشی وی هۆش کەهاوڕێی حەق، ئەی مەدهۆشی وی (١٠٨٣)

**لەبارەی تەفسیری قەولی موستەفا ( علیەالسلام ) من جعل الهموم هما واحدا كفاەاللەسائر همومەومن تفرقت بەالهموم لایبالی اللەفی ای واد اهلكە.. تەرجەمە.. هەرکەس تەواوی غەمەکانی بەیەک غەم تەبدیل بکا خوداوەند غەمی دونیای وی لەبەین دەبا .. وهەرکەس غەمی جوور بەجووری هەبێ خوداوەند تەوەججوەوعینایەتی پێ ناکا کە لەکێهەسەر زەمینێک هیلاک دەبێ ..**

هۆشی خۆت تەقسیم کەکرد بۆ چەند جیهات ئەرزشی یەک کای نییە، ئەوتوڕڕەهات (١٠٨٤)

ئاوی هۆشی تۆ دەبەن هەر ڕیشەخار ئاوی هۆشت کوا دەگاتەلای سیمار؟ (١٠٨٥)

تۆ لکی بەد ببڕەببخەسەزەمین ئەولکی باش ئاو دە، بیکەشاد و شین (١٠٨٦)

ئێستەشینن هەردوو، جا، لەدوایەدا بەد دەبێتن باتڵ و باش، بەر دەدا (١٠٨٧)

ئاوی باغ بۆ باش حەڵاڵ، بۆ بەد حەرام فەرقی وان ئاخیر دەبینی وەسسەلام (١٠٨٨)

عەدڵ یانی، ئاو بدەی، داران ئەتۆ زوڵم یانی، ئاو بدەی خاران ئەتۆ (١٠٨٩)

ئەو هەعەدڵە، شت لەجێی خۆی دانرێ نەک هەموو ڕیشێکی ئاو کێش، ئاو درێ (١٠٩٠)

زوڵم یانی شت لەجێی خۆی دانەیێ — غەیری میحنەت هیچ لەوێ پەیدا نەبێ (١٠٩١)

نیعمەتی حەق تۆ بدەدەس عەقڵ و گیان — نەک بەتەبعی دەردمەندی ناتەوان (١٠٩٢)

باری دەردو غەم لەسەرتەن دابنێ — بۆ ئەبەد لای ڕووح و دڵیان لا بنێ (١٠٩٣)

دڵت دەتا سەر پشتی عیسا، قورس بار — جووتەداوێ کەر بەڵام نێو مێرغوزار (١٠٩٤)

کوڵ لەمێژ چاوەدەگوێ قەت ناکرێ — کاری دڵ نایێ لەتەن، داوا کرێ (١٠٩٥)

خوار مەکەخۆت گەر دڵی، نازکەو، بڕۆ — گەر تەنی شەکری مەخۆ، ژەهری بخۆ (١٠٩٦)

زۆر لەمێژ تەمەن سوودمەندە، قەند بەد — چاکەبۆتەن گەر کو نەی بێ هیچ مەدەد (١٠٩٧)

داری دووزەخ کەمکە، داری وی تەنە — گەر لکی دەرخست، ئەتۆ ئەو هەڵقەنە (١٠٩٨)

تەی بڕی گەر، دەبیەحەمما لەلحەتەب — تا ئەبەد وەک ئەوژنەی بووی، بوو لەهەب (١٠٩٩)

تۆ حەتەب هەم سیدرە، لیکیان کە، جیبا — گەرچی شینن ئێستەهەردووک وەک گیا (١١٠٠)

ئەسڵ و ڕیشەی سیدرەحەوتەم ئاسمان — داری تەن ڕیشەی لەنێو نارو دوخان (١١٠١)

هەردوو وەک یەک دێتەبەرچاو ئەودوودار — ئیشتیبای چاو، زۆرەچون، نەک جارو بار (١١٠٢)

دڵ دەزانێ فەرقی ئەودارانەبەس — ڕوو کەدڵ جا، تۆ بەدڵ، ئەی خۆش نەفەس (١١٠٣)

تۆ کەپا دار نی، تەکان دەجیسمی خۆ — تا ببینی زۆرو کەم ئەو دەم ئەتۆ (١١٠٤)

گەر لەیووسوف هات زولەیخا، بەستی دەر — پاش تەلاش، دی ڕێی نەجات و، هاتەدەر (١١٠٥)

قفڵ و دەر وازبوونو، ڕێ بوو ئاشکار — پاش تەوەککول،ڕۆی لەوێ، یووسوف بەغار (١١٠٦)

لەو جیهانەچونکەنین هیچ ڕێ دییار — تۆ لەهیچ لا، مەگرەوەک یووسوف قەرار (١١٠٧)

تاکو وازبن قفڵ و دەر، بێتن عەیان — جێت ببێ ئەودەم ئەتۆ، لای لا مەکان (١١٠٨)

بۆ جیهان هاتی و دەدەی تۆ ئیمتیحان — کوا ئەتۆ ڕێی هاتنت لێ بوو عەیان؟ (١١٠٩)

تۆ لەبۆ دونیا، بەجێت هێشت مەو تەنت — کوا دەزانی کوێ بوو جێگای هاتنت؟ (١١١٠)

تۆ کەنازانی مەڵی ڕێ کوا هەیە؟ — ڕێ لەبۆ مان بەس ئەئەو، بێڕاهەیە (١١١١)

دەچیەهەرلا، وەختی خەو خەندان ئەتۆ — هیچ دەزانی ڕێی ئەو مەیدان ئەتۆ؟ (١١١٢)

چاو ببەستەخۆت بدەدەس کردگار — جا دەبینی ئەو دەمی ئەو کۆنەشار (١١١٣)

کوا دەبەستی چاو ئەتۆ؟ سەت چاوی مەست — چاوی تۆیان بەست دەو دونیایی پەست (١١١٤)

تۆ بەچوار چاو مونتەزیر بۆ موشتەری — بووی،هەتا بت بێ، مەقام و سەروەری (١١١٥)

دێتەخەونت موشتەری تۆ ڕۆژو شەو — بەس دەبینێتن کەلاوان،کوند دەخەو (١١١٦)

تالبی بۆ موشتەری تۆ، دەمبەدەم — بۆ فرۆ ش هیچت نییەخۆ، زۆرو کەم (١١١٧)

گەر کو بت با، تۆ لەدڵدا، چێشت و نان　　نەت دەویست تۆ موشتەری، هیچ کات و ئان (١١١٨)

**داستانی ئەو کابرایەی کەئیددیعای پێغەمبەری دەکرد پێیان کوت چیت خواردوەکەوا گێژبوویە؟ وهاتەران پاتەران دەڵەی، کوتی ئەگەر شتێکم وەگیر کەوتبا کەخواردبام، نەسەرم گێژدەبوو ونەهاتەران پاتەرانم دەکوت، چونکەهەرکەس قسەی باش دەگەڵ غەیری ئەهلی خۆی بکا بێهوو دەو هاتەران پاتەرانی کوتوە، ئەگەر چی بۆ ئەو بێهوو دەکوتنەمەئموریش بێ ..**

**خولاسەی داستان ..**

کابرایەک ئیددیعای پێغەمبەری کرد وگرتیان وبۆ لای شایان برد و لەشایان تەقازا کرد کەئەو کابرایەکەئیددیعای پێغەمبەری دەکا موجازات بکا تا خەڵکی دیکەش عیبرەت وەر بگرن .. شا دیتی کەئەو کابرایەزەعیف و لاوازەوتاقەتی یەک زللەشی نییە، جا بەخۆی کوت وا چاکەلەگەڵ وی بەنەرمی وهێمنی بدوێم، تا ڕازی ئیددیعای وی ئاشکرابێ جا بەوی وی کوت بابەگیان، ئەو ڕۆ بەیانی چیت خوادروە؟ کەفیکری ئیددیعای وات هاتۆتەسەر، ئەو کابرا جوابی داوەئەگەر پاروەنانێکم وەدەس کوتبا کەخواردبام قەت ئیددیعای وام نەدەکرد ..

یەک نەفەر دەیکوت کەمن پێغەمبەرم　　مــن لەگشــت پێغەمبــەران فــازلترم (١١١٩)
پەت لەملیان کرد بردیان لایی شاه　　ئەو هەبێژیت من ڕەسوولم لای ئیلاه (١١٢٠)
دەوری وی کۆ بوون جەماعەت بێ حیساو　　زۆر عەجەب لەوجوورەفێڵ و مەکروداو (١١٢١)
گەرنەبی، بێ هەرکەسێک هات لای عەدەم　　ئێمەگشت پێغەمبەرین و موحتەشەم (١١٢٢)
لای عەدەم هاتین لەبۆ دونیای غەریب　　بۆ لەئێمەتۆ جودا بی ئەی ئەدیب (١١٢٣)
تۆ نەبوو ی وەک تیفلەکی نوستوو مەگەر؟　　وەختی هاتی بووی لەمەنزڵ بێ خەبەر (١١٢٤)
مەنزلت نان پشتی سەر نادان و مەست　　بێ خەبەربووی، تۆ لەڕێ و باڵاو پەست (١١٢٥)
ئێمەهاتین لەو جیهانی مەعنەوی　　شارەزاو ئاگا، لەڕێ و باڵاو نەوی (١١٢٦)
دین، مەنازیل، هەم لەڕیشەهەم ئەساس　　چەشنی پێشاهەنگی زانا و ڕێگەناس (١١٢٧)
جا بەشایان کوت بدە، ئازار ئەو　　تا ببێتەعیبرەتی ئەغیار ئەو (١١٢٨)
شا، بەڵام دیتی زەعیف و زۆر نەزار　　بەس بەزللێک گیان دەدا، دەس کردگار (١١٢٩)
تاقەتی ڕەنج و عەزابی خۆ نییە　　هیچ تەوانی زاهیری ئەو بۆ نییە (١١٣٠)
بەو دەڵەم ئەمما بەخۆشی وا وتار　　بۆ دەکەی تۆ، ئیددیعای وا، نا لەبار (١١٣١)

لێـرە نایـەت خـۆ، چ زەبـرو زەنـگ، بـەکار — چـون بەنـەرمی سـەر لـەکون دەردێنـێ مـاز (١١٣٢)
دەوری وی چـۆل کـرد لەعالـەم شـەهریار — چونکەشــا بـــوو میهرەبـــان و بوردبـــار (١١٣٣)
دایـدەنا لای خـۆی و لێـی کـرد پرسـیار — چۆن دەژی تۆ، شەو لەکوێ دەگری قەرار؟ (١١٣٤)
دەیکوت ئەی شا، مەو تەنم( دار هسسەلام ) — مـــن لـــەوێ هاتوومـــەنێو( دارەلمـــەلام ) (١١٣٥)
نیمــەماڵ و نیمــەمن یــەک هــاو نشـین — چـۆن لـەبۆ ماسـی دەبـێ مـاڵ و زەمـین؟ (١١٣٦)
شـا، بەشـۆخی پێیـدەکوت ئـەو جارەجـا — چی دەکەی ساز؟چیت لەپێش دا، خوارد غەزا؟ (١١٣٧)
ئێستەبرسی؟ بێژەتـۆ چیـت خـوارد بـەیان؟ — تـۆ دەکـەی جـا، ئیـددیعای وا زل بـەیـان؟ (١١٣٨)
پێیـدەکوت ئەو،گـەر کـو هـەمبا مـن چ نـان — نـەم دەکـوت پێغەمبـەرم مـن، هـیچ زەمـان (١١٣٩)
لای ئەوانـــــە، ئیــــددیعای پێغەمبـــــەری — وەک لــــەکێوان تــــۆ گومــــانی دڵ، بـــەری (١١٤٠)
کـەس لەشـاخ و بـەرد، نـەی بـوو ئینتیـزار — قەلب و عـەقڵ وفەهمی هیچ نوکتان چ جار (١١٤١)
کێـو دەکـا تیکـرار، هـەچی بیڵـەی، وتـار — وەک بکـاتن یـەک، بـەئێکی دی، قومـار (١١٤٢)
لێـک بـەدوورن زێدەئـەو قەومـەو پـەیام — کەس لەجامید نەی هەویست ڕووح و کەلام (١١٤٣)
گـەر پـەیامی زێـڕ یـا ژن دەی، بـەوان — دێـن لـەپێش تـۆ دا دەنێن،مـاڵ و گیـان (١١٤٤)
یا فلان جێ، سیم تەنێک تۆی خۆش دەوێ — دەیهـــەوێ تـــۆ ئێستەهەســـتی، بچیـــەوێ (١١٤٥)
گەربدەی پەیغامی حەق بەو، وەک عەسەل — ڕووکەحەق ئەی باش عەهدی، باش عەمەل (١١٤٦)
لەوجیهانـەی مـەرگ ڕووکـە، لای ژیـان — خـۆت نەکـەی فانی کـەچون مومکینـە، مـان (١١٤٧)
قـەس دەکـەن تـاکو جـودا کـەن لێـت سـەر — نـەک لەبـەر مەردانـەگی و دیـن و هونـەر (١١٤٨)

## عیللەتی دوژمنایەتی وبێگانەبوونی خەڵکی لەئەولییای خودا کەبۆ لای خوداو ئاوی حەیات دەعوەتیان دەکردن ..

ەڵکـــەبۆ خـــاتر عەلاقـــەی وان بـــەماڵ — بیســـتنی ئـــەو گفتـــەبۆ وان تفـــت و تـــاڵ (١١٤٩)
ئـەر بـەزەخمی کـەر وەنووسـێ پـەک پـەڕۆ — لێـی وەکـەی جـا، کەمکەمـە، لـەو زەخمـەتۆ (١١٥٠)
جووتـەداوێتن یـەقین ئـەو کـەر، لـەئێش — خۆش بەحاڵ ئەوکەس لەوێ‌دوور،نەک لەپێش (١١٥١)
بیلخســـووس پـــەنجا برینـــی بەســـتراو — بـێ لەگشـتی وان هــە واو، کـێم و زوخـاو (١١٥٢)
خان ومان وەک خەرقە، ئەو حیرسەش برین — حیرسـی زۆردێنێـت زەخمـی زۆر،یـەقین (١١٥٣)
مـاڵی کونـد وێرانەیـە، تـەنهاوو بـەس — ناچتـەگوێی وی وەسـفی بەغـدا یـا تەبـەس (١١٥٤)
بـازی سـولتانی لەشـا هەنشـا ئەگـەر — بـۆ ئـەوان کونـدان بێنـێ سـەت خەبـەر (١١٥٥)
بـاس بکـا جـا پایتـەخت و جۆبـار — ئـەو دەبێتەمەسـخەرەی دوژمـن، هـەزار (١١٥٦)

چـاو، کـەهێنای کـۆن لـەبۆن، ئەفسـانەئەو — گفتــی بــێ مانــا وەکـــوو دێوانەئـــەو (١١٥٧)
کـۆن و پـوو سـیدەئەوانن نـەک چ کـەس — خـۆ دەنـا کـۆن، نـوێ دەکـاتن ئـەو نەفـەس (١١٥٨)
ئـەو بـەمردووی زۆر قـەدیمیش گیـان دەدا — عـەقڵ و ئیمـانیش دەدا، ئـەو خـۆش ئـەدا (١١٥٩)
مـەدزە، دڵ، لـەو دڵڕوبایـەی رووحبـەخش — چـون دەکـا ئەو، تـۆ سـوواری، پشـتی ڕەخش (١١٦٠)
مـەدزە، سـەر لـەو تاجبەخشـەی سـەرفیراز — چـون دەکـاتن ئـەو لـەپێی دڵ، عوقـدەواز (١١٦١)
مـن بـەکێ بێیـژم، لـەدێ، زینـدوو کـووا؟ — ئـەو کەسـەی بۆ ئـاوی ژین زوو چوو، کووا؟ (١١٦٢)
ڕەنج کەبێ، هەڵدێی لەعیشق، تاکێوی قاف — عیشق لای تۆ بـەس بوو، عـەین و شین و قاف (١١٦٣)
عیشـــق هـــەیتی زۆر کریشـــمەو زێـــدەناز — عیشـق دیتــەدەس بەسـەت نـاز داخـوواز (١١٦٤)
عیشـــقی وافـــی وافییـــان داوادەکـــات — ڕوو لەدۆسـتی بـێ وەفـا ناکـا چ کـات (١١٦٥)
ئـــادەمی وەک دارە، پـــەیمان ڕیشـــەکەی — تـۆ بەڕیشـە، چـاک دەبـێ خزمـەت بکـەی (١١٦٦)
عەهـدی بـەد، ڕیشـەی ڕزیـوی، فاسـیدە — دوور لـــەمیوەی خۆشـــەزەو پـــڕ فایـــدە (١١٦٧)
دارەخورمـا، شـین وجـوانیش بـێ ئەگـەر — ڕیشەفاسـید بێـت سـوود نـادات بـەر (١١٦٨)
گەرنـەبێ شـین، ڕیشەسـالم بـێ، ئەگـەر — عاقیبـەت لـەو سـەت گـەڵای شین دیتـەدەر (١١٦٩)
بـت هـەوێ پـەیمان نـەعیلمی هـیچ کـەس — چونکەمـەغزی عیلمـی پێسـت، پەیمانەبـەس (١١٧٠)

**بـەیانی ئـەو مەتڵەبەکەئینسـانی بەدکارئەگـەر ئەسـەری کـاری خێرخواهـان ببینـێ دەسووڕەتێک دا کەبۆی مومکین بێ دەبێتەشەیتان ولەبەرحەسوودی وەک شەیتان مانعی کاری خێر دەبێ چونکەخەرمان سووتاو دەی هەوێ کەخەرمانی هـەموو کـەس بسووتێ( ارایت الذی ینهی عبدا اذاصلی )**

تۆکـــەدیتت وافییـــان بوویـــان ســـوود — تـۆ وەکـوو شـەیتان دەبـی، ئـەو دەم حەسـوود (١١٧١)
هەرکەسـێ تـەبعی نـەخۆش بـێ و ناتـەوان — نـای هـەوێ کـەس شـادو سـالم کـا، ژیـان (١١٧٢)
گەرکو نەت ویست تۆ حەسوود بی وەک بلیس — بـا وەفابـە، دوور لـەدەعوای پـووچ و پـیس (١١٧٣)
تـۆ خـەمووش بەگـەر کـو نیتـەهیچ وەفـا — چـون وتـار ئەغڵـەب، مـن و مـای، موددەعـا (١١٧٤)
دەخلـی مەغزەئـەو وتـەی نێـو سـینە، مـا — نێو سکووت دەی بێت ڕووح سـەت جوور نـەما (١١٧٥)
گـەر کـو بێتەسـەر زەبـان بـۆ خـەرجی مـەغز — خـەرج کەمکـە،تا بمێنــێ مـــەغز، نـــەغر (١١٧٦)
فیکری شەخسـی کـەم دوێ بـوو، زۆر عـەزیم — مـەغز، دەڕوا گـەرکو پێسـت بێ، زۆر زەخـیم (١١٧٧)
گــەر زەخــیم بـێ پێسـت، زۆر لاوازەمـــەغز — گـەر زەعیـف بـێ پێسـت،بێ حەدسازەمەغز (١١٧٨)
چـــاو لـــەگوێزو پســـتەوو، بـــادام کـــە — گـەر بگـەن جـا حوججـەتت ئیتمـام کـە (١١٧٩)

هەر کەسێک عیسیان بکا شەیتان دەبێ جا حەسوودی دەوڵەتی پاکان دەبێ (١١٨٠)

گەر بەعەهدی کردگارت کرد وەفا حیفزی عەهدی تۆ دەکا، بێ شک خودا (١١٨١)

دیتنی عەهدی خودات تۆ قەت نەویست (اذ کروا اذکرکم) وت،تۆ قەت نەبیست (١١٨٢)

بیخەگوێ (اوفوا بعهدی) وەک گووار بێ هەتا( اوف بعهدکم) لەیار (١١٨٣)

ئەمنو قەرزی ئێمە بەو خوای، لا مەکان وەک لەعەردی دا بچێنین، دەنک ودان (١١٨٤)

ئەرزشی بەو دەنکە زیاد نابێ زەوی خوای زەویش هیچ دەو لەمن، نابێ بەوی (١١٨٥)

بەو عەمەل بەس دیتەعەقڵ و فام بەحەتم ئەسڵی ئەو هەت تۆ بەئێمەدا، لەکەتم (١١٨٦)

دەنکەکەم خوارد و چەقاندم ئەو چەلەش بمدەیەئەی حەق، ئەلەو ئەنعامە، بەش (١١٨٧)

تۆ دوعای خاڵیت نەوێ ئەی هووشیار دەنکی چاند چون ئەوکەسەی کە، ویستی دار (١١٨٨)

بەو دوعا، نەتبێ ئەگەر دەنکی حەقیر نەخلی باسیق پێت دەبەخشێ خوای قەدیر (١١٨٩)

هەروەکوو مەریەم کەئێشی بوو، نە، دان بۆی دەکرد حەق داری خورما شین وجوان (١١٩٠)

چونکەفەرمانی خودای ئەنجام دەدا بێ تەوقوع ئارەزووی،وی، دا، خودا (١١٩١)

ئەو کەسەی ڕاس بوو لەپەیمان و قەرار ئەو دەبوو عالیمەقام، لای کردگار (١١٩٢)

کێوو دەریا، یەک بەیەک، بۆ وان، ڕام چوار عونسور، بوون بەبەندی وان، بەعام (١١٩٣)

ئەو هەلوتفی خوایەگەر دەی دا، نیشان تا ببینن ئەهلی ئینکار ئەو عەیان (١١٩٤)

ئەوکەراماتی نیهانیان بێ گومان جێگەیان نابێ لەنێو حیسسو بەیان (١١٩٥)

دائیمین جا، ئەو کەرامات، تا ئەبەد پایەدارن ناکرێن قەت موستەرد (١١٩٦)

**موناجات..**

ئەی بەدەس تۆ قووت و تەمکین و سەبات تۆ بدەخەڵکی لەچەن ڕەنگی نەجات (١١٩٧)

تۆ لەهەرکارێ کەلازم بێ سەبات نەفسی سستی وان، لەسستی دە، نەجات (١١٩٨)

سەبریان دەو، بێ تەرازوو ی وان گران تۆ نەجاتیان دە،لەفێڵی فێڵ کەران (١١٩٩)

ئەی خوداوەن، دوور لەوان کەتۆ حەسەد تا نەبن وەک دێوی مەڕجووم،تا ئەبەد (١٢٠٠)

چاو بەماڵی فانی دونیا هەم جەسەد چۆن دەسووتێن گشت لەنێو ناری حەسەد (١٢٠١)

چاو لەشاهان چۆن شەڕو دەعوا دەکەن چون حەسوودن قەومی خۆش ڕیسوا دەکەن (١٢٠٢)

عاشقانی دلبەرانی بەد نیهاد زۆر بەقەتلی یەکترین خۆشحاڵ و شاد (١٢٠٣)

وەیس و ڕامین خەسرەوو، شیرینمان بەس حەسد باعیس بوو هەرچی کردیان (١٢٠٤)

عاشق و مەعشووق هەردوو بێ دەوام — عیشق وعاشق هەر دوو بوون، بێ ئیحتیرام (١٢٠٥)
ئەو خودایەی لای عەدەم داینا عەدەم — دوو عەدەم عاشق دەکا، پێک، دەمبەدەم (١٢٠٦)
جا، حەسەد دەگرێ دەقەلبی بەد قەرار — جا دەداتەدەستی نیست، هەست، ئیزتیرار (١٢٠٧)
گەرچی وەک ژن میهرەبان دەس ناکەوێ — بۆ حەسەد یەکتر دەکووژن دوو هەوێ (١٢٠٨)
پیاو کەزاتەن دڵ ڕەقن، بەس خوای ئەحەد — چاک دەزانێ چی دەکەن وەختی حەسەد (١٢٠٩)
گەر شەرع نەی کردبا فکری لەتیف — هەر حەسوودێک دەیدڕاند جیسمی حەریف (١٢١٠)
شەر ع تا لابا، بەدی وا بیر دەکا — دێو لەنێو شووشەی دەلیل، یەخسیر دەکا (١٢١١)
وەک شەهادەت یا نکوول یا وەک یەمین — تاکو مەقهوور بێت ئەو دێوی لەعین (١٢١٢)
وەک تەرازوو یەک کەڕازی کا، دووزید — هەم لەئەمری هەزل و شۆخی هەم لەجید (١٢١٣)
شەرعی بگرەوەک تەرازوویەک یەقین — لا دەچێتن بەو لەئەعدا، جەنگ و کین (١٢١٤)
بێ تەرازوو چۆن عەدوو دەی بێ نەجات — قەت لەوەهمی زوڵم و فێڵ و کارەسات (١٢١٥)
لەو جیهانەی زێدەپیس و بێ وەفا — ئەو هەموو ڕەنج و عەداوەت هەم جەفا (١٢١٦)
چۆن دەبێ ئەو بەختی خۆشی مەعنەوی — جننو ئینسان حاسیدن پێکتر، لەوی (١٢١٧)
ئەو شەیاتینان حەسوودن کۆنەکار — ڕێگرن دائیم ئەو ان لەیل و نەهار (١٢١٨)
ئەو کەسانەی چاندیان جورم و بەدی — چون حەسوود بوون هات لەوان شەیتان وەدی (١٢١٩)
هات دەقوڕئان دا کەشەیتانانی ئینس — بوون بەمەسخی کردگار، بۆ دێو، جینس (١٢٢٠)
دێو کە نەیتوانی کەسێک ئیغوا بکا — ئەو لەئینسی وای دەوێ تا، وا بکا (١٢٢١)
چونکە ئێوە یارمن ، یاریم بکەن — ئێوە بۆم حامین ، تەرەفداریم بکەن (١٢٢٢)
لەو جیهانەگەر کەسێک ئیغوا دەکەن — هەر دوو شەیتان شادمانی چا دەکەن (١٢٢٣)
گەر نەجاتی بوو کەسێک والا، دەدین — شین دەکەن ئەو دوو حەسوودانی لەعین (١٢٢٤)
هێن حەسوودن ئەو دوو دێوی نانەجیب — خەم دەخۆن گەر ڕێنموون کا، یەک ئەدیب (١٢٢٥)

**پرسیاری پاشا، لەکابرای موددەعی نبووەت کەئەو کەسەی کەبەحەقیقەت سابیت بووەکەپێغەمبەرەدەبێ چی پێ بێ کەبیدا بەکەسێک، یا لەموساحەبەت وهاو نشینی وی،غەیری نەسیحەت کردن بەزبان، خەڵکی چیان وەدەس دەکەوێ؟**

شا کوتی وەحیی چییەدا دەی وەرە — چی بەد ەستەئەو کەسەی پێغەمبەرە؟ (١٢٢٦)
وا ی دەدا جواب،گشت کەماڵ بۆی حاسڵە — هەرچی دەو لەت بێ لەبۆی وی واسڵە (١٢٢٧)
با نەبێ وەحیم وەکوو وەحیی نەبی — کەم لەوەحیی مێشی هەنگوین کوا دەبی؟ (١٢٢٨)

چونکـەمێش، وەحیـی خـودای بـۆ هـاتووە — مـاڵی وەحیـی وی، بەهـەنگوین پـڕ بـووە (١٢٢٩)
ئـەو بـەنووری وەحیـی خـوای عەززەوەجـەل — کـردی دونیـا پـڕ لەشـەمع و پـڕ عەسـەل (١٢٣٠)
ئـەو لـە( کرمنـا)یـە، بۆسـەر،دەچتەپێش — چـۆن دەبێـتن وەحیـی وی کـەمتر لـەمێش؟ (١٢٣١)
تـا( لطیفـاک کـوثر ) بەرنـەزەر — تـا لـەتینوو بـوون ببـی، تـۆ بـێ خەبـەر (١٢٣٢)
یـا ئەتۆ فیرعەونی، کـەو سـەر چەشنی نیـل — بۆتـەخوێن بـۆت، زێـدەناخۆش ئـەی عـەلیل (١٢٣٣)
تـۆ یەکـەو، بێزاربـەتۆ لـەو عـەدوو — ئـاوی کـەو سـەر نیتـی ئەو هیچ نێـو کەدوو (١٢٣٤)
هەر کەسێکت دی بەکەو سەر، سوورەڕووی — ئـەو موحەممـەد، خوویـەتۆش زوو بگرەخـووی (١٢٣٥)
تـا حیسـاب بکرێـی بەدۆسـتی خـوای لەسـەر — داری ئەحمـەد چونکـە دیتـێ سـێو، بـەر (١٢٣٦)
ئـەو کەسـەی مـەحرووم لـەئاوی کـەو سـەرە — لا دە، چـون، ئـەو دوژمنـی گیـان و سـەرە (١٢٣٧)
جـا چ دایکـت بێـت یـاخێر، بـاب وکـاڵ — چونکـەلای وی، خـوێنی تـۆ خۆشـەو حـەڵاڵ (١٢٣٨)
فێـربیـە وا تـۆ لـەئیبراهیم، حیسـاب — چونکـەبێزار بـوو هـەوەڵ جـار، ئـەو لـەباب (١٢٣٩)
تاکوخەشـمت بـێ، فەقـەت بۆکردگـار — غیرەتـی عیشـق، لێـت نـەدا، تانـە، چ جـار (١٢٤٠)
تـاکو(الاالله)لـەدووی لا، تـۆ نەڵـەی — تـۆ لەڕەسـمی ئـەو تەریقەهـەر هەڵـەی (١٢٤١)

**داستانی ئەو عاشقەی کەبۆ مەعشوو قەکەی خۆی خزمەت وەفاداریەکانی خۆی و شەوانی دوور و درێژکە(تتجافی جنوبهم عن المضاجع ) دەئەژمارد وبێ نەوایی وجگەرسووتاوی دەڕۆژانی دوورو درێژ دا . دەیکوت کەئـەمن غـەیری ئـەو هانـەنازانم ئەگـەر خزمـەتێکی دیکەهەیە، رێ نموونیم بکە.. هەرچی بفەرمووی ئیتاعەت دەکەم، ئەگەرچی چوونەنێو ئا گریش بێ وەک خـەلیل علیەالسلام، ویـا کـەوتن دەنێـو زاری نەهـەنگی دەریـایی وەک یوونـوس علیەالسـلام ویـا حـەفتا جـار کوشـتن بـێ، وەک جـەرجیس علیەالسـلام،ویا لەئەسـەری گریـان کـوێر بـوون بـێ، وەک شـوعەیب علیەالسـلام، و وەفـاو فیـداکاری پێغەمبەران حەدو حیسابی نییەوجواب دانەوەی مەعشووق بەوی ..**

**خولاسەی داستان ..**

عاشقێک لای مەعشـووقی خـۆی کـارو خزمـەتێکی کەئـەنجام دابـوو بەتەفسیل بـەیانی دەکـرد، ونارەحـەتی و گرفتاریـەکی کەلەورێیـەدا هـاتبوێش زۆر بـەئاب وتـاب دەیگێڕاوە،مەعشـووق وەختێک کەئەوهەموو بەیانات و تەوزیحاتەی لەوی بیست پێیکوت فەرزم کرد کەتـەواوی ئـەو قسـانەی تـۆ ڕاسـت بـن بـەڵام لازمەکـەپێت بڵـەم کەهێشـتا شـەرتی ئەسـڵی عیشـقت بـەجێ نەهیناوە،بەڵکـەم هەرخـەریکی دەو روبـەرو لکـی داری عیشقی،عاشـق کـوتی بڵـێ بـزانم شـەرتی

ئەسڵی عیشق چییە؟ مەعشووق جوابی داوە، مردن لەڕێی مەعشووقە..هەر لەگەڵ کو عاشق ئەو قسەی بیست هەناسەیەکی هەڵکێشاو کەوتەعەرزی ومرد ..

| | | |
|---|---|---|
| عاشـقێک جارێـک چـۆ لای یـاری خـۆی | بۆی ژمارد گشت خزمەت و گشت کاری خۆی | (١٢٤٢) |
| من لە بۆ تۆ بووم گەلێک زۆر، گیان نیسار | بـووم برینـی تیـرو ڕمبـان بـێ ژمـار | (١٢٤٣) |
| قـودرەتم چـوو، نەمـدەما هـیچ، مـاڵ و فـام | مـن لەعیشـقی تـۆ، بـەڵام، ناکـام دەمـام | (١٢٤٤) |
| هـیچ بـەیان نـەی دیم،لەخـەو، یـا شـادمان | هـیچ شـەوێک نەیـدیوەمن خۆشحاڵ، چ ئان | (١٢٤٥) |
| هـەرچی دیبـووی ڕەنجـو دەردی ڕۆژگـار | یـەک بەیـەک پێیکـوت بەتەفسـیل و ژمـار | (١٢٤٦) |
| میننـەتی مـەنزوور نـەبوو، ئـەو لـەو وتـار | شـاهیدی بـۆ سـیدقی گوفتارویسـت، هـەزار | (١٢٤٧) |
| یـــــەک ئیشـــــارە،کافییەبۆ عـــــاقڵان | عاشـــقان ناکـــەن وەهـــا، فێنـــک، دڵان | (١٢٤٨) |
| ئـەو دەکـا تیکـرار وتـار، بـێ هـیچ جـەفا | کـوا بـەئاوی کـەم دەکـا حـووت ئیکتیفـا | (١٢٤٩) |
| ئـەو لـەدەردی کۆنـەدەیکوت سـەت وتـار | گـەرچی دەیکـوت مـن لـەگفتم بەسـت زار | (١٢٥٠) |
| ئاگرێـک بـوو، بـێ خەبەرلـەو زۆر و کـەم | ئەو لەگـەرمای وی، دەسووتا چەشـنی شـەم | (١٢٥١) |
| ڕاستەقەو لت پێیدەکوت مـەعشووق، بـەڵام | بگرەبۆئـەو باسـەگوێ، ئـەی خـۆش کـەلام | (١٢٥٢) |
| نەت دەبرد بۆ ئەسڵ وڕیشـەی عیشق دەس | هەرچی دەت کرد تۆ،فەقەت،هەر فەرعە، بەس | (١٢٥٣) |
| پێیـدەکوت عاشـق کەئـەو ئەسـڵەچییە؟ | پێیـدەکوت ئـەو ئەسـڵەمەرگ و نیسـتییە | (١٢٥٤) |
| تـۆ هـەمووت کـردو، نـەمردی، سـازی تـۆ | بمرەجـا، گـەر عاشـقی جانبـازی تـۆ | (١٢٥٥) |
| جـێ بـەجێ ئـەو کـەو تـو، گیـانی هاتـەدەر | هـەر وەکـوو گوڵ شادو خەندان دایی سـەر | (١٢٥٦) |
| پێکـەنینی مـا لەسـەر لێـو تـا ئەبـەد | چەشـنی گیـان و عـەقڵی عـارف، بێ کەبـەد | (١٢٥٧) |
| نـووری مانـگ ئالوودەنـابێ تـا ئەبـەد | گـەرچی دەیـدا هـەم لـەباش و هـەم لەبـەد | (١٢٥٨) |
| پـاک وخـاوێن دێتـەوەلای مانـگ نـوور | چەشنی نووری عەقڵ و گیان، بۆ لای غەفوور | (١٢٥٩) |
| وەسـفی پـاکی وەقفـی نـووری مانگەبـەس | گـەر چـی دەیـداتن لەپیسـایو لەخـەس | (١٢٦٠) |
| گەرچی نووری مانگ، دێ بۆ سەر نەجیس | نـووری مانـگ نابێت قـەت بـەو کـارە،پیس | (١٢٦١) |
| هەرکەبیسـتی (ارجعـی ) نـووری هـەتاو | هاتـەوەبۆ لایـی ئەسـڵی خـۆی بـەتاو | (١٢٦٢) |
| هـیچ لەگوڵخـەن بـۆ وی نامێنێـت نـەنگ | هـیچ لەگوڵشـەن بـۆ وی نامێنێـت ڕەنـگ | (١٢٦٣) |
| هـات گـەڕاوەنووری چـاوان دی کـەنوور | دەشت وکێو ناڵین کەبوو ن لەو نوورەدوور | (١٢٦٤) |

**نەفەرێک لەعالمێکی پرسی کە ئەگەر کەسێک دەنوێژ دا بگرێی نوێژی وی باتڵ دەبێ یان نا؟ جوابی داوەبەوەدەڵێن ئاوی چاو، وداخوا ئەو کابرایەکەدەگرێی چی دیوە؟ ئەگەر شەو**

**ڤو عەلاقەی بەخودا دیوەو دەگرێی و لەگوناهی خۆی پەشیمانە، نوێژەکەی باتڵ کەنابێ هیچ بەڵکەنوێژەکەی تەکمیل دەبێ چون، (لاصلاه الا بحضور القلب ) و ئەگەر لەبەر نەخۆشی و ناڕەحەتی بەدەن یا دوور بوون لەئەو لادە، نوێژەکەی باتڵ دەبێ چونکەئەسڵی نوێژ تەرکی بەدەن و تەرکی منداڵە، وەک ئیبراهیم کەمنداڵی خۆی قوربانی کرد بەخاتری تەکمیلی نوێژ، و بەدەنی بەئاوری نمروودی ئەسپارد، وفەرمان هات بۆ موستەفا علیەالسلام کە پەیڕەوی لەو خسڵەتانەبکا،چونکە(فاتبع ملەابراهیم لقد کانت لکم اسوەحسنەفی ابراهیم ).**

| | | |
|---|---|---|
| یەک نەفەرپرسی لەموفتی زۆر بەدین | گەر دەنوێژ دا یەک بکا گریان و شین | (١٢٦٥) |
| نوێژی وی بەو حاڵەئایا باتڵە؟ | یا نەخێر، ئەو نوێژ دروستەو کامڵە؟ | (١٢٦٦) |
| پێیدەکوت ئەشکان نێو یان ئاوی چاو | جا بنۆڕەچی دەدی گریان بەتاو؟ | (١٢٦٧) |
| دا خووا چی دیوەئاوی چاو نیهان | وا، لەکانی خۆی بەتوندی، بوو ڕەوان | (١٢٦٨) |
| دیتبی گەر ئەو جیهانی مەعنەوی | ڕەو نەقی زیاتر دەبێتن نوێژی وی | (١٢٦٩) |
| گەر بەسووگ شین کات، یا ئێشی لەشی | ڕیسی دەپسێت و دەبێ دوو لەت تەشی | (١٢٧٠) |

**موریدێک هاتەخزمەت شێخ، ومەنزوورم لەشێخ پیری ساڵ دیدەنییەبەڵکەمەنزوورم پیری عەقڵ ومەعریفەتەجا چ عیسابێ دەلانک دا، یا یەحیا بێ لەقوتابخانەی منداڵان .. مورید دیتی کەشێخ دەگرێی، ئەو یش وەک وی گریا،کاتێک کەتەواو بوو،وهاتەدەر،موریدێکی دیکەکەلەوەرع و حاڵی شێخ ئاگادارتر بوو بەپەلەبەدوای وی دا هاتەدەر وپێیکوت ئەی برا، ئەمن پێت دەڵەم موازیب بە، بەهیچ کەس نەڵەی کەشێخ دەگریا وئەمنیش دەگریام، چونکەدەبێ سی ساڵ ڕەنج و ڕیازەتی بێ ڕیا تەحەممول بکەی ولەڕێگای پڕ پێچ و خەم وزۆر دەریای پڕ نەهەنگ وزۆر کێوی بڵیندو پڕشێروپڵینگ، بگوزەرێی، تا بەو گریانی شێخ دەگەی یاناگەی .. ئەگەرپێی بگەی شوکری (زویت لی الارض ) زۆر بڵێ ..**

| | | |
|---|---|---|
| هات چەلێکی یەک مورید بۆ لایی پیر | دی لەپیر ناڵین و گریان و نەفیر | (١٢٧١) |
| هەرکەدیتی شێخ دەگرێی ئەو مورید | وەک وی گریا هات لەچاوی ئا و، شەدید | (١٢٧٢) |
| پێکەنی یەک جار گوێ ساغ، کەڕ دوو جار | چونکەشۆخی بۆ دەکا تیکرار یار | (١٢٧٣) |
| جاری ئەووەڵ هەر لەبەر تەقلیدەبەس | چون دەبینێ پێکەنینی قەومو کەس | (١٢٧٤) |
| کەڕ دەبێ خەندان وەکوو وان ئەو زەمان | بێ خەبەر بوو، پێکەنین، بۆ چی ئەوان | (١٢٧٥) |
| عیللەتی خەندەدەپرسێ ئەو چەلە | هەر کەبیستی دێتەخەندەو هەلهەلە | (١٢٧٦) |

چەشنی کەڕ بووخۆ موقەللید، بێ گومان — چەشنی وی ئیزهار دەکا، شادی نیهان (١٢٧٧)

وەجدو حاڵی خۆش و شادی زۆر عەدید — بێ گومان گشتی لەشێخە، نەک مورید (١٢٧٨)

گەر لەنێو ئاو بێ سەبەد، سەرشووشەنوور — گەر بڵێن ئی خۆتە، هەردوون بێ شعوور (١٢٧٩)

گەر لەجۆ، بکرێ جودا، جا شەخسی بەد — تێدەگا ئاو هەر لەجۆ بوو نەک سەبەد (١٢٨٠)

تێدەگا شووشەش کەدیتی هات غرووب — نوور لەمانگی ڕوون و بێ نەقسەو عیووب (١٢٨١)

وازبکاتن ئەمری (قم )چاوی ئەگەر — دیتەخەندەجاری دووهەم، وەک سەحەر (١٢٨٢)

ئەو بەخەندەی ئەووەڵی خۆی دێ کەنین — چون لەڕێی تەقلید بوو ئەو نەک یەقین (١٢٨٣)

ئەو د ەڵێ ڕێی سەخت و زۆر دوور بوون نیاز — ئاشکرابن تاکو ئەو ئەسراڕ و ڕاز (١٢٨٤)

من ئەلەو سەحرایەزۆرم بوو سروور — کوێرلەدڵ بووم، نەم دەدی من، چون، چ نوور (١٢٨٥)

غەیری فیکرم بوو حەقیقەت بێ گومان — دەرکی سستم نەقشی سستی دام نیشان (١٢٨٦)

فیکری منداڵ کوا دەبێ وەک فیکری پیاو؟ — کوا.وەکوو تەحقیق دەبن ئەو هامی خاو؟ (١٢٨٧)

فیکری منداڵان شیرو دایەنە — مێوژو گوێزو شین و گریان و جەنە (١٢٨٨)

جا موقەللید چەشنی تیفلێکە، عەلیل — گەرچی هەیبێ بەحسی باریک و دە لیل (١٢٨٩)

گەر تەعەمموق بۆ دەلیل بێ، بۆ جیدال — دوور دەکا ئینسان لەڕاستی ( بیلمەئال ) (١٢٩٠)

ماڵ و سەرمایەت لەگەل بوو بۆمیسال — تۆ فەنات کرد گشت لەئەشکال و جیدال (١٢٩١)

ئەی موقەللید لەو بوخارا بەسکەبەس — ڕوو کەخواری تا لەبۆ خۆت ببیەکەس (١٢٩٢)

تا بوخارای وی ببینی نێو دەروون — شێرەپیاوان لەو مەکان ( لایفقهون) (١٢٩٣)

گەرچی قاسید زێدەتوند دەڕوا، لەڕێ — گەرچوو نێو دەریا، لەوی دەشکێت پێ (١٢٩٤)

ئەو فەقەت دەڕوا لەنێو ئیشکایی بەس — ڕێی لەنێو دەریایەبەس، زانا و کەس (١٢٩٥)

بۆعەتا، تۆ غاردەلای شای بێ هەواڵ — ئەی ئەسیری وهم و تەسویرو خەیاڵ (١٢٩٦)

پەیڕەوی شێخ بوو موریدی سادە، وا — بۆگرین بۆشێخ ئەو بوو، هەمنەوا (١٢٩٧)

ئەو وەکوو شێخ شین واوەیلای دەکرد — ئەو لەڕووی تەقلید بوو گەر وای دەکرد (١٢٩٨)

زۆر دەگریاو کردی تەعزیم جا دەڕۆی — یەک موریدی خاس بەدووی وی، دا دەڕۆی (١٢٩٩)

پێیدەکوت ئەی شین بگێڕێ بێ خەبەر — شین دەکەی تۆ چەشنی شێخی خۆش نەزەر (١٣٠٠)

هووشیاربەئەی موریدی با وەفا — گەرچی دەت بێتن لەتەقلیدیش عەتا (١٣٠١)

ناحەزەگەرتۆ بلەی شای خۆش کیش — دیم دەگریا وەک وی گریام جا، ئەمیش (١٣٠٢)

شینی پڕتەقلیدو پڕ وەهم و خەیاڵ — کوا دەبێ وەک شیوەنی ئەو با کەماڵ؟ (١٣٠٣)

شین و گریانان مەکەلێکتر قیاس      زۆرەفەرقی شیوەنان ئەی چاکەناس (١٣٠٤)

ژێر بینای گریانی شێخ سی ساڵەکار      جێ لەوێ نادرێ بەهیچ عەقڵێک، چ جار (١٣٠٥)

لەو بەری عەقڵیش مەراحیل هەن سەدان      عەقڵی ئینسان بێ خەبەر لەو کار وان (١٣٠٦)

بۆ غەم و شادی نییەگریانی وی      ڕوح دەناسێ، شینی بێ حەد جوانی وی (١٣٠٧)

شین و شادی وین لەدونیای مەعنەوی      عەقڵی کەس ناکات دەرکی شینی وی (١٣٠٨)

ئەشکی وی وەک چاوی وی ساف دوور لەعەیب      چاو نییەچاوێک، کەنابینێت غەیب (١٣٠٩)

هەرچی دیتی ئەو، لەکەس مەعلووم نییە      بۆ عقوول و بۆ حەواس مەفهووم نییە (١٣١٠)

ڕادەکا شەو، گەرکو دیتی نوور لەدوور      کوا دەزانێ زوڵمەتی شەو، حاڵی نوور (١٣١١)

با، کەتوند بێ پێشکەیێ شک، ڕادەکات      زەو قی با یان، پێشکەناناسێ، چ کات (١٣١٢)

گەر قەدیم بێتن دەبێ حادیس عەدیم      کوا لەبۆ حادیس دەبێ مەعلووم قەدیم؟ (١٣١٣)

مات دەبێ حادیس ئەگەر دیتی قەدیم      ڕەنگی وی دەگرێ، دەبێ فانی و عەدیم (١٣١٤)

بت هەوێ لەوبارە، دەت بێ، سەت میسال      نامهەوێ ئەمما ئەمن لەو قیل و قال (١٣١٥)

ئەو ( الم) و،( حم ) و حرووف      وەک عەسای مووسان، بۆ عیلم و، وقووف (١٣١٦)

وەک ئەوان وان زاهیری حەرفانی دی      وەسفی وانی کەس لەحەرفی دی نەدی (١٣١٧)

هەرچی گرتی یەک عەسا بۆ ئیمتیحان      کوا دەبێ وەک ئەو عەسا، وەختی بەیان؟ (١٣١٨)

هەم دەمی عیسایەدەم، هەم بایەدەم      دیتەدی جا، ئەولەشادی یا لەغەم (١٣١٩)

ئەو (الم) و،( حم ) ئەی جەوان      هات لەلایەن خالقی کوللی جیهان (١٣٢٠)

ئەلف و لامی دیکەنابن وەک ئەوان      بێنەبەر چاوی دڵت، یەک یەک ئەوان (١٣٢١)

گەرچی ئەو حەرفانەگەر دەکرێن کەلام      وەک کەلامێکن کەدەیڵێتن عەوام (١٣٢٢)

پێست و گۆشتەجیسمی زاتی ئەحمەدی      گەرچی وەک وی وانە جیسمی ئیدەدی (١٣٢٣)

بۆ هەموو تەن ئێسک و پێست و گۆشت هەنە      زۆرە فەرقی ئەو تەنان، تا ئەو تەنە (١٣٢٤)

چونکەدەو تەن دا هەنەزۆر موعجیزات      گشت تەنانی دی لەحاس وی بوونەمات (١٣٢٥)

یان وەکوو تەرکیبی (حم ) ی، نوبی      زۆر مەقام باڵایە، پائین ئیدەدی (١٣٢٦)

چونکەلەو تەرکیبەژین دەی بێ زهوور      وەک لەبۆ بێ ڕووح دەکاتن نەفخی سوور (١٣٢٧)

لەت دەکا دەریاو دەبێتەگەورەمار      وەک عەسا (حم ) بەلوتفی کردگار (١٣٢٨)

وێک دەچن زاهیر، بەڵام زۆر لێک جیان      وەک جیان لێک، قورسی مانگ و قورسی نان (١٣٢٩)

گفتی وی هەم شینی وی هەم پێکەنین      گشتی خوڵقی خوانە، هیچیان لەو کەنین (١٣٣٠)

چونکـەزاهیریان دەگـرت بـەس ئەحمـەقان  بـوو لـەوان مـەعنای دەقیـق و خـۆش، نیهـان (١٣٣١)
لاجـەرەم دوور مان،لەمەقسـوود و غـەرەز  چونکەمـەعنا بـوو لـەبۆ وان موعتـەرەز (١٣٣٢)

**داستانی ئەو کەنیزەی کەدەگەڵ کەری خاتوون شەهوەت ڕانی دەکرد و ئەوی وەک نێری و کەڵەباب فێرکردبوو کەدەگەڵ ئینسان شەوەت ڕانی بکا، کەدوویەکی بەئەندازەیەکی موشەخخەس دەئالەتی کەرەکرد تا لەوئەندازەزیاتر نەڕوات، خاتوون لەو کارەئاگاداربوو بەڵام کەدوویەکەی نەدی، کەنیزەکەی بەبەهانەیەک بۆ جێیەکی دوور بەڕێ کرد و کەرەکەی بەبێ کەدوو هاویشتەخۆ، وزۆر بەئیفتیزاح هیلاک بوو، کەنیزی بێ تەقسیر گەڕاوەشیوەن و زاری دەس پێ کرد،دیکوت ئەی گیانەکەم وئەی گلێنەی چاوم، کیرت دی کەدووت نەدی، کیرت دی ئەو شتەی دیکەت نەدی،( کل ناقص ملعون ) یانی تەواوی نەزەرو فەهمی ناقیس مەلعوونن .. خۆ دەنا ناقسانی چاوی زاهیری مەرحوومن مەلعوون نین .. جا بخوێینە( لیس علی الاعمی حرج ) نەفی حەرەج ونەفەفیی لەعنەت و نەفیی عیتاب و غەزەبی کرد ..**

**خولاسەی داستان ..**

کـەنیزێک دەتەویلـەی خـانمی مـاڵی خـۆی دا دەگـەڵ کـەرێک شـەهوەت ڕانـی دەکـرد وبـۆ ئەوەکەمەحفووز بێ و زەرەری پێنەگا،کەدەوویەکی دەئالەتی تەناسولی کەرەکەکرد، ما وەیەک بەو جوورەگوزەرا، و ئەو کەرەڕۆژ بەڕۆژ کزتردەبوو خانمی ماڵ کەلەمەوزووع بێ خەبەربوو لـەکزی و لاوازبـوونی کەرەکـەی نیگـەران بـوو وئـەوی بـۆلای بـەیتالان دەبـرد بـەڵام هـیچ جووڕەنەخۆشیەکیان دەو دا نـەدەدی،تا کـو ڕۆژێـک بەسـووڕەتی ئیتیفـاقی لـەدرزو قـەڵەشتی دەرکەدا ئەو سەحنەناحەزەی دی، چونکەئاگری شەهوەت دەویش دا شوعلەوەر ببوو، ویستی کەئـەویش لـەو لەززەتەبـەهرەببا، لەهەوەڵـەوەفێڵێکی سـازکرد بـەو جوورەکەکەنیزەکـەی نـار د بۆشتێک کەپیداکردنی موشکیلە،پاشان بەحاڵەتێکی پڕ لەشەوق وزەوقو بێ دیققەت چۆ تەویلە، وچـون شـەهوەت چـاوی وی بەسـتبوونەی زانـی کـەدەبێ وەک کـەنیـز بەکـەدوو موقـەددیماتی کارئامادەبکا،دەنا لـەززەت نابـا کـەهیچ بەڵکـەم دەش مـرێ، خولاسـەی کـەلام بەسـەری هـات ئەوەی کەدەبوو بەسەری ها تبا.. ئەو ژنەلەئازارێکی کەلەو کەرەی دیت جێ بەجێ مرد .. وکاتێک کە،کەنیز بۆماڵ گەڕاوەوئەو سەحنەناحەزو نالەبارەی دی بەجەسەدی ئەو ژنـەی کوت .. ڕاستەکەئەتۆ دەت دی کەئـەمن چـۆن لـەززەتم دەبـرد بـەڵام نوکاتی دەقیق و زەریفی ویت نەدی ونابوود بووی..

یەک کەری هاویشتە سەرخۆی یەک کەنیز ‌ ‌ شەهوەتی زۆر بوو کەوای کرد نا تەمیز (١٣٣٣)

فێری گانی کرد بوو، ئەو نێرەکەر ‌ ‌ فێربیبوو کەر، چۆن جیماع کا، گەڵ بەشەر (١٣٣٤)

یەک کەدووی بوو ئەو لەبۆ دەسگایی کەر ‌ ‌ دایدەنا نێو وی بەئەندازەی، زەکەر (١٣٣٥)

دایدەنا ئەو نێو کەدوو، دەسگایی کەر ‌ ‌ تاکوبڕوا وەختی گان، نیوەی زەکەر (١٣٣٦)

گەرکوبڕواتن هەمووی، دەسگا، لەوی ‌ ‌ تێک دەچن ڕوودەو ڕەحیم تێکڕا، لەوی (١٣٣٧)

دی کەکەر لاواز دەبێ خاتوونی ماڵ ‌ ‌ ما عەجەب دیتی کەکەر بێچارەحاڵ (١٣٣٨)

ئەو، بەبەیتاڵ و بەناڵبەند، دای نیشان ‌ ‌ بۆ کەرم هەرکز دەبێ بۆم کەن بەیان (١٣٣٩)

هیچ دەلیل بۆدەردی وی زاهیر نەبوو ‌ ‌ کەس لەڕازی دەردی وی موخبیر نەبوو (١٣٤٠)

جستوجۆی کرد تا بزانێ زۆر بەجید ‌ ‌ بۆ تەفەححوس ئەو هەموو دەم، موستەعید (١٣٤١)

ڕووح دەبێ بەندەو غولام بێ، بۆ تەلاش ‌ ‌ چونکەناچێ قەت تەلاشی کەس بەلاش (١٣٤٢)

وەختی جستو جۆیی حاڵی گوێ درێژ ‌ ‌ دی لەژێر ئەو کەر کەنیز، بۆتن درێژ (١٣٤٣)

دی، لەدرزی دەرکەجا، ئەو جوورەحاڵ ‌ ‌ زۆر عەجەب لەو سەحنەما، ئەو پیرەزاڵ (١٣٤٤)

دی کەکەر، وا ئەو کەنیزە، چادەکا ‌ ‌ وەک دەگەڵ ژن، پیاوی زۆر زانا، دەکا (١٣٤٥)

جا حەسەدگرتی، کوتی چۆن مومکینە؟ ‌ ‌ من لەوی لایقترم،کەر، ئی منە (١٣٤٦)

کەر گەڵێک باش و تەمیز تەعلیم درا ‌ ‌ دانراوەسفرەبۆی، ڕەو شەن چرا (١٣٤٧)

خۆی نەدیتوو دا نیشان و، دای، لەدەر ‌ ‌ بەس گەسک دە، ئەی کەنیز بەر پێیی کەر (١٣٤٨)

هەر بەفێڵ دەیکوت وەها خاتوون، وتار ‌ ‌ ئەی کەنیز هاتم، وەکە، لێم دەر، بەغار (١٣٤٩)

نەی دەکرد ڕازی کەنیز، ئەو ئاشکار ‌ ‌ دەیهەویست چون، وەک وی، ئەنجام دات کار (١٣٥٠)

گشت وەسیلەی فیسقی ون کرد زوو کەنیز ‌ ‌ هات وەکا جا، دەر، لەخاتوونی عەزیز (١٣٥١)

ڕوو گرژ چاو پڕلەئاو، هات لایی ژن ‌ ‌ لێوی لێک دەخشاند، بەڕۆژووم یانی من (١٣٥٢)

نەرمەگەسکێکی بەدەس بوو ئەو کەنیز ‌ ‌ یانی بەرێی کەر دەکەم، ئێستا، تەمیز (١٣٥٣)

گەس بەدەس گەر هاتو کردی دەرکەواز ‌ ‌ ژن لەژێر لێو پێیدەکوت ئەی فێڵەباز (١٣٥٤)

ڕوو دەکەی تۆ گرژو تاڵ،کەسکێک بەکەف ‌ ‌ بۆ ئەدی کەر ناخواتن، هیچ عەلەف؟ (١٣٥٥)

نیوەچڵ تووڕە دەبزوێنی زەکەر ‌ ‌ مونتەزیرتە،کەر بەدوو چاو لایی دەر (١٣٥٦)

ئەو لەژێر لێو وایدەکوت نەک لای کەنیز ‌ ‌ ئەو دەمی وەک بێ گوناەلای بوو عەزیز (١٣٥٧)

پێیدەکوت چارشێو بەسەر دادەو،وەرە ‌ ‌ تۆ پەیامم بۆ فلان ماڵەی، بەرە (١٣٥٨)

پێیدەکوت دەستووری کردار و بەیان ‌ ‌ من دەکەم کوتاە، ئەفسانەی ژنان (١٣٥٩)

ئەسڵی مەقسوود بگرەتۆ ئەی باکەماڵ    ئەو کەنیزەی چۆن بەرێ کرد پیرەزاڵ؟ (١٣٦٠)

بوو لەمەستی شەهوەتی خۆی شادمان    دەرکی قائیم کرد و دەیکوت ئەو زەمان (١٣٦١)

خەڵوەتم من کەوتەدەس شوکران دەکەم    ناچمەباڵ پیا و، من لەوەی پاش زۆر و کەم (١٣٦٢)

بزنەکی ئەو ژن لەشایان، بوو، هەزار    بوو لەتینی شەهوەتی کەر، بێ قەرار (١٣٦٣)

بزنی چی؟ شەهوەت ئەوی کرد مەسخەرە    سەهلەبکرێ مەسخەرە، هەرکەس کەرە (١٣٦٤)

مەیلی شەهوەت کوێر دەکا و،کەر، ئادەمی    کەر بەیووسوف دەگرێ،نار،نوور، ئەو دەمی (١٣٦٥)

زۆر کەسان هەن مەستی نار و نار خواز    وادەزانن نووری مەحزن، بێ نیاز (١٣٦٦)

ئەو کەبگرێتن لەباوەش خۆی هودا    یا بەبەندەی خوایەیا جەزبەی خودا (١٣٦٧)

تا بزانێ ئەو، خەیاڵی نارییە    لای تەریقەت هەر مەجازەو عارییە (١٣٦٨)

جوان دەدا نیشان تەماع پیسی و بەدی    بۆ تەریق، وەک شەهوەتی، بەد، کەس نەدی (١٣٦٩)

سەت هەزار خۆشناوی ئەو بەدنام کرد    سەت هەزاران زیرەکی بێ فام کرد (١٣٧٠)

گەر کەرێک وەک یووسوفی نیشان دەدا    چۆن دەدا یووسوف نیشان، ئەو بەد ئەدا؟ (١٣٧١)

ئەو دەدا نیشان بەفێڵ پێت، پیس عەسەل    چۆن عەسەل نیشان دەدا، وەختی جەدەل؟ (١٣٧٢)

چا دەبێ شەهوەت لەخواردن، کەم بخۆ    یا نیکاح کە، چا، لەشەڕ دەربازکە، خۆ (١٣٧٣)

تۆ دەبا خواردن لەبۆ کاری حەرام    حاسڵات، خەرجی دەوێ ئەی خۆش مەرام (١٣٧٤)

جا نیکاح هەرچەشنی( لا حەولەو لا)    تا کو نەفست تۆ نەخاتەنێو بەڵا (١٣٧٥)

بێنەژن تۆ،خواردنت گەر زۆر دەوێت    تا پشیلەدووگەنەفڕێنێت، لێت (١٣٧٦)

باری بەر، دانێ لەسەر گوێ درێژی هار    پێش ئەوەی تۆ بار بکا ئەو نالەبار (١٣٧٧)

کاری ئاگر هیچ کەنازانی ئەتۆ    قەت بەعیلمی وا، لەبۆلای نار، مەڕۆ (١٣٧٨)

عیلمی نار و مەنجەڵت گەر تۆ نەبێ    مەنجەڵ و ئاش لێت دەسووتێن، جێ بەجێ (١٣٧٩)

ئاو و، دانیش لازمن هەردوو، هەتا    بێتەجۆش مەنجەل سەلامەت، بێ خەتا (١٣٨٠)

دانیشی ئاسنگەریت تۆ گەر نەبوو    لێت دەسووتێ بچیەوێ گەر، ڕیش و موو (١٣٨١)

دەرکی بەست ژن، شادمان کێشایی دەر    زۆر عەزابی سەختی جا، ئەو هاتەسەر (١٣٨٢)

بۆ وەسەت کێشایی،شاد ئەو بێ خەتەر    خۆی درێژ کرد جا،لەژێر ئەو نێرەکەر (١٣٨٣)

سەر هەمان کورسی کەنیز، خۆی کرد درێژ    وەک کەنیز، تا شاد بکا ئەو گوێ درێژ (١٣٨٤)

پێی هەڵیناو کەر دەوی ڕاکرد زەکەر    ئاگری چاکرد دەوێدا، کیری کەر (١٣٨٥)

فێر کرابوو کەر، هەمووی دەو ڕا دەکرد    جێ بەجێ ژن،گیانی تەسلیم خوا دەکرد (١٣٨٦)

زەربـــەتی زۆر محکـــەمی دەســـگایی کـــەر   لەو ژنەی کرد لەت بەلەت، ڕوودە و جگەر (١٣٨٧)

بـــێ ســـەدا گیـــانی دەدا ژن ، ئـــەو زەمـــان   هـــیچ لـــەجێی خۆیـــان ژن و کورســـی نـــەمان (١٣٨٨)

خوێن تەویلـەی گرتـو، ژن بـوو سـەر نیگوون   مـــرد وبـــردی گیـــانی وی (ڕەیبەلمـــەنوون ) (١٣٨٩)

ژن دەبـــوو ڕیســـواوو، گیـــانی دا هـــەدەر   دیو تەتۆ قەت، یەک شەهیدی کیری کەر؟ (١٣٩٠)

گـــوێ دە، ڕەنجـــی بـــەد، لـــەقورئانی خـــودا   تـــا نەکـــەی بـــۆ نـــەنگی وا گیانـــت فیـــدا (١٣٩١)

نەفســـی حـــەیوانی وەکـــوو ئـــەو نێرەکـــەر   پیســـــترەلەو کـــاری ژن،گـــەر بێتەســـــەر (١٣٩٢)

گـەر کـو بمـری تـۆ لـەڕێی نـەفس و مـەنی   چـــاک بزانـــەتۆ وەکـــو و ئـــەو ژن، دەنـــی (١٣٩٣)

خوابەنەفســـــی ئێمەشـــــکڵی کـــــەر، دەدا   سووڕەتا ن وەک خـوو، دەگۆڕێ، چـون خـودا (١٣٩٤)

ڕازی ئاشـــکاری قییامـــــەت بـــوو ئـــــەوە   تۆ خـودا لـەو جیسـمی وەک کـەر، دوورکەوە (١٣٩٥)

کـــــافری ترســــــاند لـــــەئاگر، کردگـــــار   کـافران کوتیـان، کـە( نـار ئـەو لا ) لـەعار (١٣٩٦)

خـــوا کـــوتی ئـــەو نارەڕیشـــەی گشـــت نـــار   چەشنی نارێک، ئەو ژنەی کرد، تار و مار (١٣٩٧)

لوقمـــەیێکی خـــوارد بـــەژن، ئـــاز،دوور لەحـــەد   جا گەرووی وی گرت لوقمەی مـەرگی بـەد (١٣٩٨)

ئـــەی حـــەریس لوقمێـــک بخـــۆ، ئەنـــدازەبێ   گـــەرچی شـــیرین بێـــت و خـــۆش ئـــاوازەبێ (١٣٩٩)

ســـــووڕەیی ڕەحمـــــان بخوێنەئـــــەی فـــــڵان   جـــا دەبینـــی دای بـــەمیزان خـــوا، زەبـــان (١٤٠٠)

تـــۆ لەبـــەر ئـــاز، خـــۆ لـــەمیزان لا مـــەدە   خەســـــمەبۆ تـــۆ ئـــاز، موزیللـــە، زۆر بـــەدە (١٤٠١)

تـــالبی کوللەحـــەریس، دای کـــول لەدەســـت   تۆ مەبە، ئەی پەستی پەست زاد،ئاز پەرەست (١٤٠٢)

ڕۆی کـــەنیز دەیکـــوت بـــەناڵین جـــا ئـــەتۆ   بۆچی نەت هێشت بێ لـەلات، وەستا، ئـەتۆ؟ (١٤٠٣)

کارکەئـــــەجام دەی بـــــەبێ وەســـــتا ئـــــەتۆ   گیـــان دەدەی بێهوودەئـــەو دەم جـــا ئـــەتۆ (١٤٠٤)

ئـــەی ئـــەوەی عیلمـــت دزی لـــێم، ناتـــەواو   بـــۆ چـــی نەنگـــەلات بپرســـی حـــاڵی داو؟ (١٤٠٥)

ئـــەو دەمـــی دەخـــوا لەخەرمـــەن تـــەیر دان   جـــا، ملیشـــی ناچتـــەنێـــو بەنـــدی گـــران (١٤٠٦)

کـەم بخـۆ دان، بەسکەجیسـمی خـۆت، ڕفـوو   تـــــۆ بخوێنـــــەپاش (کلـــــوا) (لاتســـــرفوا ) (١٤٠٧)

تـــــــا بخـــــــۆی دان و نەکەوێـــــــەنێو دام   وا دەکـــەن عـــیلم و قەناعـــەت، وەســـــەلام (١٤٠٨)

ســـەهمی عاقـــڵ نیعمـــەتی دونیـــا، نەغـــەم   ســـەهمی نـــادان هـــەر پەشـــیمانی و نـــەدەم (١٤٠٩)

گـــەر گـــەرووی وان کەوتـــەنێو ڕیســـمانی دام   دانـــەخواردن بـــوو لەگشـــتی وان حـــەرام (١٤١٠)

دانـــەناخوا تـــەیری نێـــو داو، دەس بەســـەر   ژەهـــــری مـــــارەدانی وا بخـــــوا ئەگـــــەر (١٤١١)

تـــــەیری غافـــــڵ دانـــــەدەخواتن لـــــەدام   وەک لـــــەنێوان داوی دونیـــــا دا، عـــــەوام (١٤١٢)

تـــــەیری زۆر زانـــــاوو زیـــــخ و هووشـــــیار   نـــــاخوا دانەلـــــەنێو داو قـــــەت، چ جـــــار (١٤١٣)

چـون لـەنێو داو، دان لەگـەڵ زار تێکـەڵاو — کوێرەتـەیرێک دان تەڵـەب کـا، نێـو داو (١٤١٤)

سـاحەبی داو ئەبلـەهی، سـەر لێـوەکرد — تـەیری جوانیشـی لـەبۆ مـەجلیس دەبـرد (١٤١٥)

چون لەوان تەنها وبەس، دێ گۆشت بەکار — دەنگـی زیـرو زار، لـەجوانی نـازدار (١٤١٦)

جـا کـەنیز هـات، دی لـەدرزو قەڵشی دەر — کـەوتووەخاتوون مـردوو، ژێـری کـەر (١٤١٧)

دەیکوت ئـەی خـاتوونی ئەحمـەق، بۆچ وای — تـۆ لـەلای وەسـتا دەبـا فـەن فێـر ببـای (١٤١٨)

زاهیـرت دی، باتنیشـی لێـت نیهـان — بـێ ئـەوەی مـاهیر بـی تـۆ، دات نـا دوکـان (١٤١٩)

چەشـنی شـەکر و ئەنگـەبین کیـرت دەدی — ئەی حەریس نەددی کەدوو، بۆچی ئەدی؟ (١٤٢٠)

یانـەچون هێنـدت هـەبوو تـۆ عیشـقی کـەر — ئـەو کەدوویـەت هـیچ نەهاتەبـەر نـەزەر (١٤٢١)

زاهیـری فیتنـەت لەوەسـتا، دی، ئـەتۆ — شـادمان دەتکـوت منـیش وەسـتامە، خـۆ (١٤٢٢)

فێڵـەبازی بـێ خەبـەر هـەن زێدەکـەس — ڕێگـەبۆ مـەردان لـەلای وان،خەرقەبـەس (١٤٢٣)

هـەن گـەلێک پـڕ ڕوو لەشاهان، هیچ هونـەر — فێـر نـەبوون ایلـلا وتـاری بـێ سـەمەر (١٤٢٤)

گشـت عەسـایان بـوو یـەنی مووسـامە، مـن — دەم دەدەن گێـزان، یـەنی عیسـامە، مـن (١٤٢٥)

وای لـەڕۆژێکی کەبـەردی ئیمتیحـان — بـێ هـەوێتن لێـت سـیدقی سـادقان (١٤٢٦)

هـەرچی مـا، ئـاخیر لەوەسـتات کـە، سـوئال — کـوێرو لاڵـەتالبی مـاڵ و مـەنال (١٤٢٧)

تۆ هەمووت ویست و نەبوو بۆت زۆر و کەم — سـەیدی گورگـانن هـەموو ئەبلـە، بەجـەم (١٤٢٨)

زاهیـرت بیسـت و ئـەوت جـا کـرد بـەیان — بـووی لـەگفتت بـێ خەبـەر وەک تـوو تیـان (١٤٢٩)

**تەمسیلی تەلقینی شێخ بۆ موریدان، و پێغەمبەر بۆ ئوممەت،**

چون تەواناتی تەڵقین وەرگرتنیان لەحەق نییەولەگەڵ حەق ئولفەتیان نییە، هەروەکوو تووتی لەگەڵ سوورەتی ئینسان ئولفەتی نییەکەبتوانێ لەوی تەڵقین وەر بگرێ (فێرببێ) لەلای خودا وەند شێخ، وەک ئاوێنەیە، کەلەپێش تووتی وەک ئاوێنە ڕای دەگرێ جا لەپشت ئاوێنەتەڵقینی دەکا (لاتحرک بە لسانک ان هو الا وحی یوحی )ئەوهەیە مەسئەلەی بێ مونتەها .. وەک دەندووک تەکان دانی تووتی دەنێو ئاوێنەدا کەبێ ئیختیارو تەسەڕڕوفی وییە.. عەکسی تووتی لەدەرەوەی ئاوێنەیە،کەموتەعەللیمە، نەعەکسی ئەو موعەللیمەی کەلەپشتی ئا وێنەدایەبەڵام خوێندنی تووتی دەرەوە، بەدەس ئەو موعەللیمەیە، جا کەوابێ ئەو میسالە، نە میسل ..

یـەک عـەدەد تـووتی لـەنێو ئاوێنەگـەر — ڕوو بەڕوو ئەو عەکسی خۆی بێ بەر نەزەر (١٤٣٠)

پشـتی ئـەو ئاوێنەیـەک وەسـتا نیهـان — زۆر بەخۆشـی ئـەو دەکـا گوفتـار بـەیان (١٤٣١)

وەدەزانێ، تووتی خۆیتی وا دەکا ‌ ‌ ‌ گفتی سەبرۆکەو، نەرم، ئیجرا دەکا (۱۴۳۲)

فێر دەبێ،جا ئەو لەجینسی خۆی وتار ‌ ‌ ‌ بێ خەبەر لەومەکری گورگی کۆنەکار (۱۴۳۳)

ئەو لەپشت ئاوێنەتووتی فێردەکات ‌ ‌ ‌ چون لەئەغیار تووتی فێر نابێ، چ کات (۱۴۳۴)

فێر دەبوو گوفتار، لەو ساحەب هونەر ‌ ‌ ‌ ئەو لەمەعناو ڕاز، بەڵام بوو بێ خەبەر (۱۴۳۵)

فێردەبێ تووتی لەئینسان وا، وتار ‌ ‌ ‌ فێر دەبێ ئەلفاز، نەمەعنی قەت، چ جار (۱۴۳۶)

هەر وەها، شەخسی مورید خۆی مومتەلی ‌ ‌ ‌ دی، لەنێو ئاوێنەکەی، جیسمی وەلی (۱۴۳۷)

ئەو لەپشت ئاوێنەنابینێت خۆ ‌ ‌ ‌ عەقڵی کول کاتێ دەکاتن گفتو گۆ (۱۴۳۸)

وا دەزانێ ئەو دەڵێ گفتار بەشەر ‌ ‌ ‌ بوو لەعەقڵی کوڵ بەڵام ئەو بێ خەبەر (۱۴۳۹)

فێر دەبێ گوفتار نەک ڕازی قەدیم ‌ ‌ ‌ چونکەئەوهە، تووتییەخۆ، نەک نەدیم (۱۴۴۰)

دەنگی تەیران چاک دەکەن تەقلید خەڵق ‌ ‌ ‌ چون دەکەن ئەو جوورەکارە، زارو حەڵق (۱۴۴۱)

کەس بەڵام حاڵی لەدەنگی وان نییە ‌ ‌ ‌ هەر سولەیمان چاک دەزانێ ئەو چییە (۱۴۴۲)

گفتی دەروێشان دەبن فێر، چاک ئەوان ‌ ‌ ‌ مینبەرو میحڕاب دەکەن ڕووناک ئەوان (۱۴۴۳)

یا لەغەیری گفتی وان بێ بەهرەبوون ‌ ‌ ‌ یانەڕەحمەت هات لەتاخیر، ڕێنموون (۱۳۴۴)

عارفێک سەگێکی حامیلەی دی کە دەنێو زگی وی دا دەنگی گجولکەکان دەهات، سەر سام و موتەحەییر ما، چونکەعیللەتی دەنگی سەگ پاسەوانییە، ودەنگ و سەرو سەدا دەنێو زگی دایک بۆ پاسەوانی نییە..وجاری واش دەبێ کەدەنگ و سەرو سەدا بۆ یارمەتی خوازتن و شیر خواستن و شتی دیکەیە، بەڵام لێرەدا هیچ کام لەوانەمەو جوود نین .. کاتێک کەوەخۆ هاتەوە، لەلای خودا ڕازو نیازی کرد (وما یعلم تاویلە الا اللە) جوابی دراوەکەئەوەسووڕەتی حاڵی قەومێکەکەلەحیجاب دەرنەهاتوون وچاوی دڵیان نەکراوەتەوە، ئیددیعای شارەزایی و زانایی دەکەن وقسان دەکەن، لەوان ڕا نەهیچ قودرەتێک و یارمەتیەک بەکەس دەگا و نەڕێنموونیو هیدایەتێک بەگوێ گران ..

عارفێک دیتی دەخەو وەختی چلە ‌ ‌ ‌ یەک سەگی دیڵی گەروڵی حامیلە (۱۴۴۵)

هاتەگوێی وی دەنگی توتکان ناگەهان ‌ ‌ ‌ تووتکەکانیش بوون دەنێو زگ دا، نیهان (۱۴۴۶)

مات و حەیران ما، کەبیستی ئەو سەدا ‌ ‌ ‌ چۆن دەکا توتک دەنێو زگ دا، نیدا؟ (۱۴۴۷)

هات لەنێو زگ دەنگ و ناڵەی تووتکان ‌ ‌ ‌ کەس وەهای دیوەلەدونیا، قەت چ ئان؟ (۱۴۴۸)

هەرلەگەڵ کو، هات وەهۆش عارف لەخەو ‌ ‌ ‌ لەحزەلەحزە، حیرەتی بوو، زێدەئەو (۱۴۴۹)

کـەس نییەموشـکیل گوشـا نێـو چللـەدا — غـەیری دەرگـای زاتـی بـێ هـەمتای خـودا (١٤٥٠)
دەیکوت ئەی ڕەب بەو سوئال و مەسئەلە — مـام لـەزیکری پـاکی تـۆ مـن، ئـەو چەلـە (١٤٥١)
وازکـــە، بـــاڵم هـــەڵفڕم تـــاکو ئـــەمن — نێـو حەدیقـەی زیکـری تـۆ کـەم، ڕوو ئـەمن (١٤٥٢)
دەنگـی غـەیبی هاتـەگوێی وی ئـەو زەمـان — یـەک میسـال بـوو ئەولـەلافی جـاهیلان (١٤٥٣)
چون لـەژێر پـەردەو حیجاب دا، مان، ئـەوان — نادروسـت گفتـان دەکـەن بـێ سـوود بـەیان (١٤٥٤)
دەنگی سەگ نێو زگ یـەقین هـەیتی زییان — چـون نـەبۆ ڕاوەو، نەشـەو بـۆ پاسـەوان (١٤٥٥)
ئـەو، چ نەیـدی گورگ،تائـەو دوور بکـا — نەیـدەدی دز،تـا ئـەوی مـەهجوور بکـا (١٤٥٦)
بـەو تـەماع و بـەو ئومێـدی سـەروەری — کوێرو کەڕ بوون هەم لەلاف لێدان جەری (١٤٥٧)
شـادمانی وی بـەبوونی موشـتەری — بـێ سـەبەب بێـژێ وتـاری سـەر سـەری (١٤٥٨)
گەرچی نەی دی مانگ، دەدا لەو زۆر نیشان — ڕێ لەسـادان ون دەکـا جـا، بـێ گومـان (١٤٥٩)
ئەولەوەسـفی مانـگ دەڵـێ بـۆ موشـتەری — سـەت نیشـان لـەو نادیـار، بـۆ سـەر وەری (١٤٦٠)
موشـتەری یـەک دانەیـە، زۆر پـڕ لەسـوود — دەو، دەشـک دان غـافڵانی زۆر عـەنوود (١٤٦١)
موشـتەری بـێ قـەدرو قیمـەتیان دەوێ — موشـتەری باشـیان لـەلا، دەس ناکـەوێ (١٤٦٢)
موشـتەری بـۆ ئێمـە( اللهاشـتری ) — غـەم مـەخۆ بـۆ موشتەری دی، ئـەی بـرا (١٤٦٣)
موشـتەری داخـواز کـە، بـێ داخـوازی تـۆ — چـاک بزانـێ ئـاخرو ئاغـازی تـۆ (١٤٦٤)
دەس بەهەرجوور موشتەری تۆ قەت مەدە — عیشـقبازی گـەڵ دوو مەعشـووقان، بـەدە (١٤٦٥)
بـت کڕێ،گـەر سـوودوومایەی بـۆت نییـە — قیمـەتی وەک عـەقڵ و فـامی خـۆت نییـە (١٤٦٦)
قیمـەتی وی کـەمترەتا نیسـفی نـەعل — تـۆ دەدەی ئایـا بـەوی یـاقووت و لـەعل؟ (١٤٦٧)
ئـاز ئـەتۆی کوێر کـرد و مـەحروومت دەکا — دێـو بـە چەشـنی خـۆی مـەڕجوومت دەکا (١٤٦٨)
هـەروەکوو ئەسـحابی فیـل و قـەومی لـووت — کردنی مەڕجووم وەکوو خۆی ئەو سەخووت (١٤٦٩)
سـابیران چـاک دێتەدەسـیان موشـتەری — موشتەری ناکـەن تەڵـەب،چون سەرسـەری (١٤٧٠)
هەرکەسـێک ڕوو لابـدا، لـەو موشـتەری — بـەخت و ئیقبـاڵ وبەقا،لـەو بـوون بـەری (١٤٧١)
مـان لەحەسـرەت دا، حەریسـان تـا ئەبـەد — چەشـنی حـاڵی ئـەهلی زەڕوان، نێـو حەسـەد (١٤٧٢)

**داستانی ئەهلی زەڕوان وحەسادەتی وان نیسبەت بەدەروێش و فەقیران..**

ئەهلی زەڕوان وحەسادەتی وان نیسبەت بـەدەروێش و فـەقیران..کە، بابی ئێمەلەبەر سادەدڵی ئەغڵەبی حاسڵی باغەکەی دەدا بەمسکین و فـەقیران، ئەگەردەبوو بـەترێ یـەک دەهومی دەدا

وئەگەر دەبوو بەمێوژو دۆشاو یەک دەهومی دەدا، وئەگەر دەیکردەهەڵواو پاڵوودە(لەقەدیم دا بەئارد و هەنگوین دروستیان دەکرد) یەک دەهومی دەدا . و ئەو کاتەکەشین و سەوز دەبوو یەک دەهومی دەدا، وئەگەر دەخەیان دا دەیکوتا وتێکەڵ بەکا بوو، یەک دەهومی دەدا،وئەگەر گەنم لەکا جودا دەبوو یەک دەهومی دەدا . وئەگەر دەیکردەئارد یەک دەهومی دەدا، وئەگەر دەیکردە هەویریەک دەهومی دەدا،وئەگەردەیکردەنان یەک دەهومی دەدا، بەوخاترە خوداوەند بەرەکەتێکی وای نارد بۆ نێو ئەو باغ وکشت و کاڵەکەهەموو باغداران موحتاج بەوی بوون،هەم بەمیوەهەم بەزێو، وئەو موحتاج بەهیچ یەک لەوان نەبوو، منداڵەکانی وی زۆر جارخەرجی ئەو یەک دەهومەیان دەدی بەڵام ئەو بەرەکەتەیان نەدی، وەک ئەو ژنەبەدبەختەی کەکیری کەری دی، بەڵام کەدووی نەدی ..

| | | |
|---|---|---|
| یەک نەفەربوو ئەهلی تەقواو دین بوو | عەقلی وی کامڵ بوو ئاخیر بین بوو | (١٤٧٣) |
| ئەو لەدێی زەڕوان دەبوو، نیزیک یەمەن | شوهرەبوو، بۆ بەخشش و خوڵقی حەسەن | (١٤٧٤) |
| بۆ فەقیران ڕووگەبوو، مەئوایی وی | موستەمەندان گشت دەچوون بۆلایی وی | (١٤٧٥) |
| هەم لەخۆشە، بێ ڕیا عوشری دەدا | هەم لەگەنمیش گەر لەکا، دەیکرد جودا | (١٤٧٦) |
| گەر ببا ئارد، عوشرەکی ئیحسان دەدا | گەر ببا نان عوشرەکی لەو نان دەدا | (١٤٧٧) |
| عوشری دەخڵی خۆی دەدا، چی باڵەلای | چوار کەڕەت دەیدا، لەهەرچی، چاندبای | (١٤٧٨) |
| زۆر کەڕەت دەیکرد وەسییەت وا، ئەدا | بۆ منالی خۆی بەعام ئەو خۆش ئەدا | (١٤٧٩) |
| پاشەمن مەگرن بەخاتر خوای قەدیر | بۆ تەماعتان، سەهمی بێچارەو فەقیر | (١٤٨٠) |
| تا بەخاتر تاعەتی پەر وەردگار | حاسڵات و میوەتان بێ، پایەدار | (١٤٨١) |
| حاسڵات و میوەهەرچین بێ لەغەیب | خوا لەبۆی ناردین بەبێ تەردید و ڕەیب | (١٤٨٢) |
| گەر ببەخشی تۆ لەجیگای خۆیی دا | سوودی زۆرت پێدەدا، بێ شک خودا | (١٤٨٣) |
| چاو کەزاریع تۆو دەچێنێ زۆر جار | هەر لەجێی خۆی، چونکەچاندن ئەسڵی کار | (١٤٨٤) |
| زۆر دەچێنێ کەم بەڵام دەخوا لەوی | چون دەزانێ شین دەکا، چی چاند، زەوی | (١٤٨٥) |
| بۆیە زاریع تۆو دەچێنێ خۆشحاڵ | چون لەعەرزی دێتەدەس مەحسوولی ساڵ | (١٤٨٦) |
| پووڵی زێدەی گەر هەبێتن پینەچی | بۆ خەریدی پێستی دەبباغی دەچی | (١٤٨٧) |
| چونکەئەسڵی دەخڵی من بوو ئەو هەبەس | چون فەقەت لەو چەرمە، ڕۆزیم دێتەدەس | (١٤٨٨) |
| چون لەوی ڕا هاتەدەستی دەخل و سوود | لاجەرەم ئەو هەر لەوێ دەی بێت جوود | (١٤٨٩) |
| ئەو زەمینەو پێست، پەردەن، هەردووان | ئەسڵی ڕۆزیت، لا، خودابێ، ئەی جەوان | (١٤٩٠) |

عەرزی ئەسڵت بێ ئەتۆ بۆ کشتزار — وێت بدا تا، تاقەدەنکێک، سەت هەزار (۱۴۹۱)

وان فەڕز کرد تۆو،چاندت نێو زەوی — تۆش لەبۆ ڕۆژی سەبەب دەگری، ئەوی (۱۴۹۲)

گەرکو ئەو تۆو شین نەبێتن یەک دوو ساڵ — تۆ دەکەی شین و دوعا، هەم ناڵەناڵ (۱۴۹۳)

دێخیەبەر چەپۆک سەر، تۆ لای خودا — دەست و سەر شاهید، کەڕۆزی خوا، دەدا (۱۴۹۴)

تا بزانی ئەسڵی ڕۆژی خوایە، بەس — لەو تەڵەب کەڕزق و ڕۆزی نەک لەکەس (۱۴۹۵)

تۆ لەحەق داواکەڕۆزی نەک لەعەمر — بەس بەحەق تۆ شادو مەست بە، نەک بەخەمر (۱۴۹۶)

دەوڵەمندی ئەو دەدا، نەک گەنج و ماڵ — یارمەتی هەرئەو دەدا، نەک مام و خاڵ (۱۴۹۷)

تۆ دەبی ئاخیرلەوان بێ شک جودا — کێ لەبۆ کۆمەک، دەکەی ئەو دەم سەدا (۱۴۹۸)

ئێستەجا، هەر ئەو سەداکە، ئەی فلان — تابیی تۆ وارسی مولکی جیهان (۱۴۹۹)

گەربیێتن ڕۆژی مەحشەر ئاشکرا — ڕۆژی ڕاکردن، لەدەس باب و برا (۱۵۰۰)

دوژمنی یەکتر دەبن گشت دۆست ویار — بوت بوو، بۆت، چون مانعی ڕێی کردگار (۱۵۰۱)

لادەنێی نەققاشی ڕۆمی بۆ کەنار — چون دڵت خووی گرت بەنەقشێک وەک بەیار (۱۵۰۲)

گەرکو یاران ئەو دەمی بۆت بن، بەزید — لابدەن لێت بینەدوژمن پێت، بەجید (۱۵۰۳)

تۆ بڵێ جا، ئێستەسەر کەوتوومە، من — گەڵ مەڕام و ئارەزووم جووت بوومە، من (۱۵۰۴)

ئەهلی دونیا بوون بەدوژمن پێم، هەتا — پێش وقووع بۆم بێ قیامەت ئاشکرا (۱۵۰۵)

پێش ئەوەی من ڕۆژگارم بێ هەدەر — پێش ئەوەی عومرم لەگەڵ وان، بەرمەسەر (۱۵۰۶)

من کڕی بووم یەک مەتاعی عەیب دار — خوا شوکر زۆر زوو، لەبۆم بوو ئاشکار (۱۵۰۷)

پێش ئەوەی بڕوا لەدەس، سەر مایەکەم — بۆم عەیان بوو عەیبی بووی کالایەکەم (۱۵۰۸)

چێ نەمابووگیان و ماڵم کەم، نیسار — بۆ وەدەس هینانی کالای عەیب دار (۱۵۰۹)

پووڵ و ماڵم دا، ستاندم زێڕی غەش — جا لەبۆ لای ماڵ دەچووم من، شادو گەش (۱۵۱۰)

خواشوکر غەش بوونی ئەو زێڕ، بوو عەیان — پێش ئەوەی بمرم بەجێ بێڵم جیهان (۱۵۱۱)

غەش دەماوەتا ئەبەد نێو گەردنم — زۆر حەیف بووعومر زایع کردنم (۱۵۱۲)

چونکەئەو غەش بوونە، زۆر بووئاشکار — زۆر بەزوویی خۆم لەوی لادا، کەنار (۱۵۱۳)

ئەو دەمەی کە، بێ بەدوژمن، پێت یار — حیقدو کینەی وی دەبێتن ئاشکار (۱۵۱۴)

لەو برینی ڕابیتەئەفغان مەکە — خۆت شێت و ئەبلەهو نادان مەکە (۱۵۱۵)

بەڵکەشوکری خوابکە، ئیعتابکە — چون لەلای وی کۆن نەبووی تۆ، وا بکە (۱۵۱۶)

دۆستایی ویت ئەتۆ لانا کەنار — تا تەڵەب کەی سادقی جاوید بەیار (۱۵۱۷)

نـازەنین یارێـک ئەگـەر تـۆ، بـش مـری — تـۆ لـەلای وی زۆر لـەپێش مـەحبووبتری (١٥١٨)

بـاری وا یـا شـایە، زۆر عالیمـەقام — یـا لـەلای شا، شـافیعەو مـەقبووڵ کـەلام (١٥١٩)

تۆبەدەسـتی حیلەگـەر دەت بـێ نـەجات — پـێش ئـەوەی مـردن لـەناکاو بێتـەلات (١٥٢٠)

ئـەو جـەفای عالـەم لـەدونیادا بـەتۆ — وا بزانەگـەنجی زێڕیـان دا بـەتۆ (١٥٢١)

هـێن لەگـەڵ تـۆ بـەد دەبـن دونیـا تەڵـەب — تـۆ بـەناچار ڕوودەکـەی بـۆ لایـی ڕەب (١٥٢٢)

جـا یـەقین بـێ لات لـەئاخیر گشـتییان — وات دەبـن دوژمـن کەنـەت بێ تـۆ گییـان (١٥٢٣)

تـۆ دەمێنـی نێـو لەحـەد، تـەنها، بەشـین — جـا دەڵـەی مەمهێڵەتـەک، تۆ ئـەی مـوعین (١٥٢٤)

ئـەی جـەفات چـاتر لەعەهـدی وافییـان — هـەر لـەدادی تۆبەشـەهدی وافییـان (١٥٢٥)

گـوێ دەعـەقڵ و فـام ئـەی ئـەنبار دار — وێدەگـەنمت تـۆ بەعـەرزی کردگـار (١٥٢٦)

تـا لەئەسپێ هـەم لـەدز، بـی بـێ، ئـەمان — دێوو دێو چان، ڕەد کە، بۆ دەریای، نەمان (١٥٢٧)

چـون بـەدائیم تـۆ دەترسـێنێ، لەفـەقر — ڕاو کەتۆ ئەو، چەشنی کەو، ئەی نێرەسەقر (١٥٢٨)

نەنگـەبۆ بـازی عـەزیزی شـەهریار — کـەو ئـەوی ڕاو کـات و، بیکـا تـارو مـار (١٥٢٩)

وەسیەتی کـرد، تـۆوی پەنـدی چانـد چـاک — شین نەبوو هیچ، شۆرەکات بوو، چونکەخاک (١٥٣٠)

گـەرچی بـۆ ناسـیح هـەبێ سـەت داعییـە — لازمـەبۆ پەند،گوێـەک واعییـە (١٥٣١)

پەنـد دەدەی بـەو، تـۆ بـەلوتف و ئیحتیـرام — پەنـدی تـۆ داوێتـەپاش گـوێ، ئـەو بـەڵام (١٥٣٢)

گەر بەگوفتار گوێ نەدا، یەک کـەس، بەکین — سـەت کەسـی وێـژەر، دەکـا عـاجر یـەقین (١٥٣٣)

ناسـحی وەک ئـەنبیا، نـەی دیوەکـەس — بـەر، دەگـۆڕا گـەر لـەوان، دەی دی، نەفـەس (١٥٣٤)

گفتـی وان دەی کـرد لەبـەردو کێـو ئەسـەر — قـەت نـەبوو غافـڵ، بـەڵام بـەو، بـا خەبـەر (١٥٣٥)

ئـەو دڵانـەی خـود پەسـەندن جـا، وەهـان — (بـەل ئەشـەددو قەسوەتەن ) بۆ وەسفی وان (١٥٣٦)

**بەیان کردنی ئەو مەتڵەبەکەعەتای حەق و قودرەت، وابەستەبەقابلییەت نییە، بەڵام عەتا و بەخششی خەڵکی قابلییەتی لازمە،چونکەعەتا، قەدیمەو قابلییـەت، حادیسـە، عـەتا سیفەتی حەققە، وقابلییەت سیفەتی مەخلووقە، وقـەدیم وابەستەبەحادیس نابێ،دەنا حدووس محاڵ دەبێ ..**

چـاری ئـەو دڵ موبـدلیک پەیدایـەلای — قابلییـەت شـەرت نییـەبۆ هـەرچی دای (١٥٣٧)

قابلییـەت، دێ، لـەدووی ئیعتـایی وی — قابلییـەت لـەفزە، دان مـەعنایی وی (١٥٣٨)

چـاو عەسـای مووسـا، دەبێتەئـەژد ەهـا — دەسـتی د ەدرەوشـێ وەکـوو تـاوی زوحـا (١٥٣٩)

سـەت هـەزاران مـوعجیزەی پێغەمبـەران — عـەقڵ و دڵ تـەنگن کـەبۆ وان ئـەی جـەوان (١٥٤٠)

نین لەئەسباب، خوایەتەنها وادەکا | کێ لیاقەت بۆ عەدەم، بڕوا دەکا؟ (١٥٤١)

شەرتی کاری خوا لیاقەت با یە،گەر | چۆن دەبا مەعدووم سەری خستبایە، دەر (١٥٤٢)

سوننەت و ئەسبابی دانا کردگار | بۆ هەچی گرتی لەژێر ئاسمان قەرار (١٥٤٣)

دێن بەعادەت ئەکسەری ئەو قات کار | چا دەکا حەق، خەرقی عادەت جارو بار (١٥٤٤)

دایدەنا حەق ڕەسم و عادەت با مەزە | خەرقی ڕەسم و عادەتی کرد، موعجیزە (١٥٤٥)

بێ سەبەب نایەت ئەگەر عیززو مەقام | عەزلی ئەسباب دێ لەدەس قودرەت، بەڵام (١٥٤٦)

ئەی گرفتاری سەبەب، پێت وانەبێ | عەزلی ئەسبابان بەدەستی خوا، نەبێ (١٥٤٧)

خوای موسەببیب چی بوێ هەروا دەبێ | قودرەتی حەق بێ سەبەب بەر پا، دەبێ (١٥٤٨)

چا دەکا کار، زۆر لەڕێی ئەسباب،بەڵام | تا عەیان بێ، دێ لەڕێی ئەسباب مەڕام (١٥٤٩)

بێ سەبەب کەس ڕێگەناکا،ئیختیار | چا دەبینێتن سەبەب چاک، ڕێبووار (١٥٥٠)

پەردەنە، بۆ چاو، هەموو تێکڕا سەبەب | دیارنییەبۆ چاو، بەعام، چون، سونعی ڕەب (١٥٥١)

چاو دەبێ تیژ بێ کەکاری وا بکات | تاکو نەگرێ پەردەپێشی چا و، چ کات (١٥٥٢)

تا ببینێ ئەو، خودا نێو لامەکان | هەرزەبگرێ کاسبی و جەهدو، دوکان (١٥٥٣)

چونکەخێرو شەڕ هەموو لای خوا درا | نینەئەسباب و وەسائیل، ئەی برا (١٥٥٤)

غەیری ئەو هام و خەیاڵات بۆ عەوام | عەسری غەفڵەت تا کەمێک بێ بەردەوام (١٥٥٥)

**دەبارەی خیلقەتی جیسمی ئادەم علیەالسلام،کەخوداوەند بەجەبرەئیلی فەرمان دا کەبڕۆ لەو عەرزەمستێک خاک هەلگرە، وبەڕیوایەتێک لەهەریەک لەنەواحی زەمین مستێک خاک هەلگرە..**

**خولاسەی داستان ..**

کاتێک کەخوداوەند ویستی کەئادەم دروست بکا، بەجەبرەئیلی فەرمان دا کەمستێک خاک لەعەرزی هەلگرە، وەختێک کەعەرز لەمەقسوودی جەبرەئیل حاڵی بوو دەستی کرد بەناڵەو ئیلتیماس وپاڕانەوە، و بەخودای سوێند دا وکوتی بەخاتری خودا بەدەستی خاڵی بگەڕێوە، چونکەپێم خۆش نییەکەلەمن مەو جوودێکی خوێنڕێژ پەیدابێ ..وجەبرەئیل گەڕاوەبێ ئەوەی کەمستێک خاک هەلگرێ، لەپاشان خوداوەند میکائیل ولەپاش ویش ئیسرافیلی بۆ لای عەرزی نارد، وناڵەو شیوەنی عەرزی لەوانیش تەئسیری کرد، وبەدەستی خاڵی گەڕانەوە، تا کونۆبەی عیزڕائیل هات، وەختێک کەئەو هاتەعەرزی، دوو بارەعەرز دەستی بەشیوەن وگریان کرد،

ولەعیزڕائیلی داواکردکەهیچ خاک لەوی هەلنەگرێ، بەڵام عیزڕائیل کوتی ئەمن مەئموورم و مەعزوور وجێی هیچ خواهیش وتەمەننایەک نییە.. خولاسەی کەلام لەکاتی گفتو گۆ دا، بێ ئەوەی کەزەمین ئاگادار بێ مستێک خاک هەلدەگرێ ودەیبا، تا بەدەنی ئادەم لەو خاکەدروست بکرێ ..

| | | |
|---|---|---|
| ئەو دەمەی حەق ویستی ئادەم، بێتەبوون | تا لەخێرو شەڕ بکا، ئەو ئازموون | (١٥٥٦) |
| فەیکوت ئەی جەبریل بڕۆ بۆ لای زەوی | مستەخۆڵێک هەلگرە،جا، تۆ لەوی | (١٥٥٧) |
| خۆی موهەیاکردو هات بۆلایی عەرز | جێ بەجێ کا، تاکو ئەمری خوایی بەرز | (١٥٥٨) |
| دەستی برد بۆخاک بەئەمری کردگار | خۆی دەکێشا، ئەو دەمی خاک بۆ کەنار | (١٥٥٩) |
| دەستی کردەئیلتیماس و ناڵەناڵ | تۆ بەخاتر زاتی پاکی بێ هەواڵ | (١٥٦٠) |
| لام بڕۆ تۆ مەمەدەئازار و عەزاب | ڕەخشی خۆت لینگ دە، لەلام تۆ، ئەی جەناب | (١٥٦١) |
| بیکەخاتر خوا، ئەتۆ ئەی موعتەبەر | مەمبەنێو غەوغایی تەکلیف و خەتەر | (١٥٦٢) |
| یا بەخاتر ئینتیخابت لای خودا | عیلمی لەوحی کول هەمووی ئەو پێت دەدا | (١٥٦٣) |
| بۆفریشتان تا موعەللیم بووی بەعام | تۆ دەکەی دائیم دەگەڵ یەزدان کەلام | (١٥٦٤) |
| قاسیدی بۆ لای عموومی مورسەلین | بۆ گییانی وەحیی،نەک تەن، تۆیی ژین | (١٥٦٥) |
| زیاد لەئیسڕافیلەفەزلت بێ گومان | چونکەبۆ تەن ژینەئەو، تۆ بۆ گییان | (١٥٦٦) |
| نەفخی سووری وی دەداتەتەن، ژییان | نەفخی تۆ ئەمما دەداتەدڵ گییان | (١٥٦٧) |
| چونکەژینی دڵ دەداتەتەن حەیات | قەت عەتای وی چاک نییە، چەشنی عەتات | (١٥٦٨) |
| گەرکو میکائیل ڕۆزی تەن دەدا | جەهەد ی تۆ ڕۆزی د لی ڕەو شەن دەدا | (١٥٦٩) |
| ئەو بەپەیمانان پڕی کرد دامەنی | ڕزقی تۆ پەیمانەنایبا، ئەی سەنی | (١٥٧٠) |
| تۆ لەعیزڕائیلی باخەشم و غەزەب | چاتری، چون پێش غەزەب بوو ڕەحمی ڕەب | (١٥٧١) |
| ئەو چووارەن حامیلی عەرشی ئیلاە | چاکترینیان تۆی، لەنێویان تۆیی شاە | (١٥٧٢) |
| حاملی عەرشن لەمەحشەر هەشت کەس | شا لەبۆوان ئەو دەمی هەرتۆیی بەس | (١٥٧٣) |
| دەی ژمارد جا، هەم دەگریا گەرمە شین | چون لەقەستی وی خەبەر دار بوو زەمین | (١٥٧٤) |
| مەعدەنی شەرم و حەیا بوو جەبرەئیل | ئەو هەموو سووێن دانە، بەستیان،لەو سەبیل | (١٥٧٥) |
| چونکەزۆر ی سوێن دەداو پاڕاوە، ئەو | هات گەڕاوە، وای بەحەق جواب داوە، ئەو | (١٥٧٦) |
| نەمدەویست من، ئەمری تۆ ئەنجام نەدەم | هەرچی بوو، تۆ چاک دەزانی، زۆر و کەم | (١٥٧٧) |
| وای بەنێوێک سامناک سوێن دام عەرز | ئەو ببیسێ چەرخی گەردوون، دێتەلەرز | (١٥٧٨) |

شـەرمی نیـوت ئـەمری تـۆی پـێم، لا دەنـا مسـتەخۆڵێک سـەهلەهێنانی دەنـا (١٥٧٩)

چـون ئـەتۆ داوتەفریشـتان قودرەتێـک قـادرن ئـەفلاک بـدەن گشـت تێک وپێک (١٥٨٠)

**ناردنی میکائیـل بـۆ مستەخۆڵێک لەعـەرزی بۆ دروست کردنـی جیسمی موبـارەکی ئەبولبەشەر خەلیفەی حەق، مەسجوود و موعەللیمی فریشتان، ئادەم علیه‌السلام ..**

دەیکـوت ئـەی میکـال بـڕۆ بـۆ لای زەوی بێنەمسـتێک خـۆڵ، چەشـنی شـێر لـەوی (١٥٨١)

هـەر کـەمیکائیل هـات بـۆ لای زەوی دەسـتی بـرد تـا هـەلگرێتن خـۆڵ لـەوی (١٥٨٢)

خـاک دەلـەرزی دەیهەویسـت لـەو کـا، فیـرار ئیلتیماسـی کـرد، ئەشـکی هاتـەخوار (١٥٨٣)

جـا دەپـاڕاوەو دەلالاوە، بـەتین سوێندی دا ئـەو کـاتێ دەیکـرد گەرمەشین (١٥٨٤)

بیکـەخاتر ئـەو خودایـەی بـێ نـەزیر تـۆی دەکردەحـامیلی عـەرش و سـەریر (١٥٨٥)

ڕزقـی مـەخلووقات ئـەتۆ ژێـر چـاو دەکـەی تینـوانی فـەزڵی خـوا، تێـراو دەکـەی (١٥٨٦)

چونکـەمیکائیل لەکـەیلی چـا دەبـوو کـەیلی ڕزقـی عـام لـەدەس وی، دا دەبـوو (١٥٨٧)

تـۆ ئـەمانم دە، مـەدەئازاری مـن چـاو کـەخوێناوین هـەموو گوفتـاری مـن (١٥٨٨)

مەعـدەنی ڕەحمـی خوداوەنـدن مەلـەک دەیکوت ئەو چۆن لەو برینەی د ەم،نەمەک (١٥٨٩)

هـەروەکوو دێـو، مەعـدەنی قـەهری خـودا دادو هـاواری بـە ئینسـانان دەدا (١٥٩٠)

ڕەحمەتی حەق، بێ گومان بوو پێش غـەزەب لوتفـە، غالـب بـوو بەسـەر ئـەو سـافی ڕەب (١٥٩١)

بەنـدەگان لایانـە، وەسـفی خـوای وەدوود جا لەجۆی وی پڕ دەکەن مەشکەی وجوود (١٥٩٢)

ئەو ڕەسوولی حـەققی پێش هـەنگی سلووک دەیکـوت ئینسـانان لەسـەر دینـی ملـووک (١٥٩٣)

چـۆوە، میکائیـل بـۆ لای کردگـار بـێ ئـەوەی ئـەنجام بـدا، دەسـتوورو کـار (١٥٩٤)

دەیکـوت ئـەی شـای شـارەزای دونیـاو دیـن هـەر دوو دەستی لێدەبەستم، خـاک، بەشین (١٥٩٥)

چـون لـەلای تـۆ زۆر بەقـەدرەئاوی چـاو چـۆن نـەدەم گـوێ، مـن بەشـینی وا، بـەتاو (١٥٩٦)

چـون لـەلای تـۆ زۆر بەقـەدرەئاو شـین مـن حـەقی ویـم پـێ نـەدەدرا، خـۆ، یقـین (١٥٩٧)

تـۆ کـەلات بـێ حـەد عـەزیزەچاوی تـەڕ چـۆن لەگـەڵ ویـم کردبـا دەعـواوو شـەڕ؟ (١٥٩٨)

پێنج کەڕەت ڕۆژێ دەکەن دەعوەت بەشین نـوێژ بکەئـەی بەنـدە، نالـەت بـێ وگـرین (١٥٩٩)

گـەر موئـەززین بـۆ فـەلاح هاوارییـە ئـەو فـەلاح، ئـەو ویسـتنەو، ئـەو زارییـە (١٦٠٠)

هەرکەسێکت ویست کە بیکەی تۆ غـەمین تـۆ لەقـەلبی وی دەبەسـتی ڕێـی شـین (١٦٠١)

تـا بەڵایـەک بـێ لـەبۆی هـیچ لای نـەبات چونکـەزاری بـۆی تکـا ناکـا چ کـات (١٦٠٢)

هەرکەسێکت ویسـت بـەڵا لـەو دوور بکـەی وا دەکـەی تـا ئـەو بەشـین مـەجبوور بکـەی (١٦٠٣)

تۆ لەقورئان دا کوتت ئەو ئوممەتان    هات لەبۆ وان ڕەنج و قەهری زۆر گران (١٦٠٤)
بۆ نەیان کرد شین و گریان ئەو دەمی؟    تا بەڵا، لاچێ، لەلای وان، سەر جەمی (١٦٠٥)
ێرقەساوەت بوو دڵی وان زیاد لەحەد    جورمی خۆیان دی بەتاعەت، بۆ ئەحەد (١٦٠٦)
تـ نەزانێ، خۆی بەبەدکار، نابەکار    غەیرەمومکین ئاو لەچاوی بێتەخوار (١٦٠٧)

**داستانی قەومی یونوس علیەالسلام، دەلیل و بورهانەلەسەر ئەوەکەشیوەنو زاری، بەڵای ئاسمانی لادەبا، وخوداوەندی والا مەقام موختارە، وشیوەنوتەعزیم لەلای وی موفیدەوفەلاسیفەدەڵێن کەخوداوەند تەبیعەتەن فاعیلە، نەموختار، و شیوەنو زاری تەبیعەت ناگۆڕێ ..**

**خولاسەی داستان ..**

یونوس کوڕی مەتا،قەومی خۆی دەعوەت کرد کەئیمان بێنن، چونکەئیمانیان نەهینا لەدەرگای خوداوەندگلەیی کرد،خوداوەند فەرمووی سێ ڕۆژیان مۆڵەت بدەئەگەرئیمانیان نەهینابەعەزابگرفتار دەبن،یونوس ئەو قسەی بەقەومی خۆی کوت و لەنێویان ڕۆیشت، دەرۆژی مەعوود، دا لەئەووەڵی بەیانی نیشانەی عەزاب ئاشکرابوو،زۆر پەڵەهەوری ئاگرین دەوری شاریان گرت،وهاتنەسەروان،وەهبی کوڕی مونەببیەدەڵێ دوو کەڵێکی ڕەش هات ئاسمانی شاری داگرت و ڕووی خەڵکی ڕەش هەڵگەڕا جا، خەڵکی ئەو شارەزۆر هەراسان و پەرێشان هاتنەلای زانایەک، بەنێوی(ڕوبیل )کەئەویش لەخانەدانی نبووەت بوو ئەو کوتی هەرچەند کەئێستا یونوس دەنێو مە، دا نییە، بەڵام خوداوەند دەنێومان دا هەیە، جا با بڕۆین بۆ سەحرا ودەستی دوعاو پاڕانەوەبڵیند بکەین، جا پیاو ژن پیرو جەوان وردو درشت، وحەتتا حەیواناتیش چوونەسەحرا ..

گەر عەزاب بۆ قەومی یونوس، بووی زهوور    هاتەسەروان، هەورەکی پڕناری سوور (١٦٠٨)
بەر، بەبەرقی وی دەسووتا چەشنی پووش    ڕوو،دەچوو ڕەنگی،کەدەی بیست لەو خڕووش (١٦٠٩)
شەو لەسەربانان ئەوان گرتیان قەرار    جا لەناکاو ئەو عەزاب بوو، ئاشکار (١٦١٠)
گشتییان ئەو دەم لەبانان هاتنەخوار    چوونەلای سەحرا بەسەر ڕووتی، بەغار (١٦١١)
کردیان ئەودەم لەخۆ، منداڵ جودا    تا لەهەموان، بێت ناڵین و سەدا (١٦١٢)
ئەو گرووهە، هەرلەمەغریب تا سەحەر    خاک وخۆڵی دەشت وچۆلیان کرد وەسەر (١٦١٣)
هێندەگریان دەنگییان نووسا ئەوان    جا لەبۆوان هات ڕەحمی خوای جیهان (١٦١٤)

پاشــی یــەئس و پاشــی ناڵــەی بــێ قــەرار ‌ ‌ ‌ هـــەوری ئـــاگردار گـــەڕاوەبۆ کـــەنار (١٦١٥)

باســی یوونــوس زۆر درێــژەو زۆر بــەرین ‌ ‌ ‌ بەس بکەین لەو، با ئیدامەی دەین، زەمین (١٦١٦)

چون لەلای حەق هەیتی شیوەن زۆر بەها ‌ ‌ ‌ شین لەکوێی دی، قەدری دێتەدەس،وەها؟ (١٦١٧)

تـــۆ ببـــەئامادە، ئـــەی ئومێـــد وار ‌ ‌ ‌ شـین بگێـر تـۆش پێکەنە،لـەیل و نـەهار؟ (١٦١٨)

چونکـــەکردوویتی بەرابـــەرخوای وەحیـــد ‌ ‌ ‌ بۆفەزیلـەت، ئەشـک،گەڵ خـوێنی شـەهید (١٦١٩)

## ناردنی ئیسرافیل علیەالسلام بۆلای زەمین کەمستەخۆڵێک لـەوێ بێنـەبۆ چـاک کردنـی جیسمی ئادەم(ع)..

وای بەئیســرافیل دەکــوت یــەزدان، بــڕۆ ‌ ‌ ‌ مســـتەخۆڵێک زوو، لەعـــەرزی بێنـــەتۆ (١٦٢٠)

هـــات ئیســـرافیل زوو، بـــۆ لای زەمـــین ‌ ‌ ‌ ئەو چەلەش خاک دەستی کردە، گەرمە شین (١٦٢١)

ئـەی فریشـتەی سـوور، ئـەی دەریـایی ژیـن ‌ ‌ ‌ فـووت بـەمردوو گیـان دەداتـن، خـۆ یـەقین (١٦٢٢)

فووت لەسوور پەیدا دەکا، دەنگێک عەزیم ‌ ‌ ‌ پـڕ، دەبـێ مەحشـەر لەوانـەی، بـوون ڕەمـیم (١٦٢٣)

تۆ، بە، نەفخی سوور دەڵەی بۆ خەلکی عەرد ‌ ‌ ‌ ڕاپــەڕن ئــەی کوشــتراوی ڕەنــج و، دەرد (١٦٢٤)

ئەی ئەوانەی بوون بەدەس مردن هیلاک ‌ ‌ ‌ وەک گەڵاو لک، بێننەدەر سەرتان، لەخاک (١٦٢٥)

ڕەحمـەت و فـووی دڵ نشینت بـوو، ئەگـەر ‌ ‌ ‌ هــەرچی مــردوو بێــت، ڕووحــی دێتەبــەر (١٦٢٦)

تـۆ فریشـتەی ڕەحمـی، ڕەحمـی تـۆم نـەزەر ‌ ‌ ‌ کانی دادی، حـەملی عەرشـی خـوات لەسـەر (١٦٢٧)

عەرشـــەکانگای دادو کانگـــای مەعدیلـــەت ‌ ‌ ‌ ژێـری وی چـوار جـۆ دەڕۆن پـڕ مـەغفیرەت (١٦٢٨)

جـۆی شـەراب و جـۆیی شـیری جاویـدان ‌ ‌ ‌ جۆی عەسەل جۆی ئاوی زۆر جوان و ڕەوان (١٦٢٩)

جا لەعەرش، بۆ لای بەهەشت جاری دەبن ‌ ‌ ‌ لــەو جیهانــەش کەمکەمــە، دیـاری دەبــن (١٦٣٠)

گــەرچی ئــالوودەن لــەدونیا ئــەو چــووار ‌ ‌ ‌ تێکـــەڵاوی زەهـــری نیســـتی نالـــەبار (١٦٣١)

جورعەیـەکیان ڕشتەسـەر خـاک، لـەو چـووار ‌ ‌ ‌ فیتنـــەوو، غـــەو غـــادەبوو، لـــەو ئاشـــکار (١٦٣٢)

تـا کـو ئەسـڵی وی تەڵـەب کـا، ئـادەمی ‌ ‌ ‌ نـەی دەویست ناکـەس مەگـەر، زۆر زۆر کـەمی (١٦٣٣)

دای بەمنـــداڵان شـــیر، تاگـــەورەبن ‌ ‌ ‌ چـاکی کـرد کـانی لەسـینگی گشـت ژن (١٦٣٤)

چـاو شـەراب غـەم لادەبـا، جورئـەت دەدا ‌ ‌ ‌ جـا لەئـەنگوور چـای دەکـرد کـانی، خـودا (١٦٣٥)

ئەنگــەبین دەرمــانی بیمــاری حــەزین ‌ ‌ ‌ بــوو بــەکانی بــاتنی مــێش هــەنگوین (١٦٣٦)

دات ئـەتۆ ئـاو، بـۆ هـەچی بـێ سـەر زەوی ‌ ‌ ‌ تـاکو، وەخـوا، یـا بکـا پـاک، خـۆی، بـەوی (١٦٣٧)

تــا بەوانــە، بــۆ ئوســوول، تــۆ، ڕێ بــەری ‌ ‌ ‌ ئـەی نـەفام تـۆ بـۆ فـرووع بـووی موشـتەری (١٦٣٨)

بگرەگــوێ ئیســتاکە، بــۆ داســتانی خــاک ‌ ‌ ‌ چـی دەبـێ دڵخـواز، لـەو میحراکـی پـاک (١٦٣٩)

روو ی دەئیسرافیل کرد خاک زۆر عەبووس — خۆی بەسەت جوور دانیشان و چاپلووس (١٦٤٠)

تۆ بەخاتر، زاتی پاکی بێ هەواڵ — قەت نەکەی تۆ، قەهری وا، بۆ من،حەلاڵ (١٦٤١)

من ئەلەو گۆڕانی خۆم ئەی سەروەرم — بەد گومانی زیندە، دێتەنێو سەرم (١٦٤٢)

تۆ فریشتەی ڕەحمی، ڕەحمت کوا ئەدی؟ — کوا هوما، ئازار دەدا، تەیری دەدی؟ (١٦٤٣)

ئەی شەفا،هەم ڕەحمەتی تۆ، بۆ نەخۆش — وەک ئەوا ن دوو شەخسی باش،کارکە، ئەتۆش (١٦٤٤)

هات ئیسرافیل گەڕاوەلای خودا — عوزری عەرزی و، ماجەڕای بۆ کرد، ئەدا (١٦٤٥)

مستەکت خۆڵ ویست بەزاهیر ئەی خودا — عەکسی ئەو ئەمرت بەقەلبی من دەدا (١٦٤٦)

بۆ کەمێک خۆڵ دات ئەتۆ، فەرمان بەگۆش — دڵ ڕەقیت مەمنووع دەکرد لەگیان و هۆش (١٦٤٧)

ڕەحمەتی تۆ، بوو لەپێش قەهرو غەزەب — ئەی بەدیع ئەفعال و ئەی باش کار، ڕەب (١٦٤٨)

### ناردنی عیزڕائیل بۆ مستێک خۆڵ تا جیسمی ئادەم علیەالسلام، لەوی دروست بکرێ ..

زوو بەعیزڕائیلی کوت خوای بێ هەواڵ — تۆ ببینە، ئەو زەمینەی پڕ خەیاڵ (١٦٤٩)

لەو زەعیفەی پیری زاڵم توند و تۆڵ — زووکە، بێنەتۆ لەبۆم یەک مستەخۆڵ (١٦٥٠)

ڕۆیی عیزڕائیل بەفەرمانی قەزا — لای زەمین، تا جێ بەجێ بێ، ئیقتیزا (١٦٥١)

تیبقی عادەت دەستی کردە، شین، زەوی — سوێندی خوارد خۆی، زۆر دەپاڕاوەش لەوی (١٦٥٢)

ئەی تۆ بەندەی خاس، ئەی حەمباڵی عەرش — ئەی تۆ ئەمرت بوو موتاع لای عەرش وفەرش (١٦٥٣)

بیکەخاتر ڕەحمەتی ڕەحمان، بڕۆ — بیکەخاتر وەی کەدای ئەنعام، بەتۆ (١٦٥٤)

بیکەخاتر وەی کەئەو مەعبوودە، بەس — لای ئەوەی مەڕدوود نییە،گریانی کەس (١٦٥٥)

پێیدەکوت نایێ بدەم گوێ بەو وتار — لابنێم من ئەمری پاکی کردگار (١٦٥٦)

دەیکوت ئاخر، ئەمری فەرموو ئەو بەحیلم — هەردوو ئەمرن بگرەئەو یان، تۆ بەعیلم (١٦٥٧)

پێیدەکوت تەئویلەگفتت یا قییاس — تۆ لەئەمری روون نەڕۆی، لای ئیلتیباس (١٦٥٨)

چاکترەتەئویل بکەی تۆ فیکری خۆت — نەک بکەی تەئویل ئەوەی ئاشکارەبۆت (١٦٥٩)

دڵ دەسووتێتن لەشین و زاری تۆ — سینەکەم پڕ خوێن، لەبەر هاواری تۆ (١٦٦٠)

نیمەیێ ڕەحم، بەڵکەلەو هەرسێی دەپاک — زێدەڕەحمم بوو بەدەردی دەردناک (١٦٦١)

گەر لەمن ڕا، وێی کەوێ زللێک یەتیم — هەم بدا هەلوا بەدەستی وی، حەلیم (١٦٦٢)

خۆشترەئەو زللە، لەو هەلوایی وی — گەر ببێ مەغروور بەهەلوا، وایی وی (١٦٦٣)

من بەناڵەی تۆ دەسووتێنم جگەر — فێر دەکا لوتفێک بەلام، پێم، دادگەر (١٦٦٤)

گــەر لــەنێو قــەهران بیــێ لوتفێــک، نیهــان | وەک لــەنێو پــیس بێ عــەقیقێک زۆر جــوان (١٦٦٥)
قــەهری وی چــاتر لەســەت حیلمــی منــە | گیــان لەحــەق مــەمنووع کــردن، مردنــە (١٦٦٦)
بــەد تــەرین قــەهری خوداوەنــد، بێ گومــان | چاکترەلــەو ســەبرو حیلمــی دوو جیهــان (١٦٦٧)
قــەهری وی لــوتفی گــەلێک تێــدان، نیهــان | گیان بەحەق دان، زیاد دەکا، بێ شک گییان (١٦٦٨)
وێــڵ کــە، تــۆ هــەم بــەدگومانی هــەم زەلال | سەرکە، پێ، تۆ گەر بڵێ ئەو، پێت، تەعال (١٦٦٩)
لــەو تــەعال بــۆت دێ تــەعالی زۆر زییــاد | فەڕش و هاو سەر پێت دەد ا، دەت کات شاد (١٦٧٠)
نـــاتوانم ئـــەمری زاتـــی کردگـــار | بەس بەمەیلی خۆم بکەم ئەو سست و خوار (١٦٧١)
خــاکی غــەمگین ئــەو وتانــەی بیســت هــەموو | دوو دڵـــی ئـــەمما لـــەلای وی لا نـــەچوو (١٦٧٢)
جــوورەکی دی ئەوچەلــە ئــەو خــاکی پەســت | شیوەن وسەجدەی دەکرد ئەوچەشنی مەست (١٦٧٣)
پێیــدەکوت ئــەو کارەنــای بــێ بــۆت زییــان | دادەنــێم گیــان و ســەرم مــن بــۆ زەمــان (١٦٧٤)
فیکـــری شـــین و دادو واوەیـــلا، مەکـــە | شین لەلای کەس غەیری زاتی خوا، مەکە (١٦٧٥)
چۆن نەکەم بۆ ئەمری وی، من سەر نەوی | تــۆز لـــەدەریا هەڵدەســـێنێ، ئـــەمری وی (١٦٧٦)
مــن بەغـــەیری زاتـــی پـــاکی کردگـــار | گوێ بەگیانی خۆش کە، نادەم من چ جار (١٦٧٧)
گــوێم لەحاستی غــەیری ئــەمری وی کــەڕە | بۆم لــەگیان شیرین تــرە، ئــەو خــۆش، فــەڕە (١٦٧٨)
گیــان لــەوی چــابوو لــەگیان، ئــەو چــا، نــەبوو | دای بــەعام گیــا ن، مــوزدی هــیچ داوا، نــەبوو (١٦٧٩)
گیــان چییەخۆشــم بــوێ ئــەو، نــەک کــەریم؟ | کـــێچ چییـــەتا بـــۆی بســـووتێنم، گلـــیم؟ (١٦٨٠)
خێـــر کەنانەاســـم بەغـــەیری خـــەیری وی | لاڵ و نابینـــاو کـــەڕم لای غـــەیری وی (١٦٨١)
گــوێم لــەلای شــین گێــر نابیســێ، کــەڕە | چەشنی نێزەم من بەدەس ئەو خۆش فەڕە (١٦٨٢)

**بــەیانی ئــەو مەتڵەبەکەئەگــەر لەمــەخلووقێک زوڵمێــک نیســبەت بــەتۆ ئــەنجام درا، دەحەقیقەت دا ئەو مەخلووقە وەک ئالەتێک وایە،**

عـارف ئـەو کەسـەیەکە بـە حـەق ڕجـووع بکـا، نـەک لـە بـەر جـەهل و نـەزانین بەڵکـەم بـۆ مەسڵەحەتێک، وەک بایەزید( قدس اللەسرە) کوتی زۆر لەمێژەکەئەمن دەگەڵ مەخلووق قسـەم نەکردووە،وهیچ قسێکم لەمەخلووق نەبیستووە، بەڵام خەڵک وادەزانن کەلەگەڵ وان قسەدەکەم ..ولەوان قسەدەبیسم، چونکەئەوان موخاتەبی ئەکبەر نابینن چون نیسبەت بەحاڵی من، وەک دەنگ بۆ خودان، گوێ گری عاقڵ تەوەجوە بە دەنگ ناکا، هەر وەک ئەو مەسەلە مەعرووفە کە (قال الجدار للوتد لم تشقنی؟ قال الوتد انظرالی من یدقنی ) ..

هەرچی ڕەحمی ویست لەنێزە، ئەحمەقە    گەر لەشای نێزەبەدەستی ویست، حەقە (١٦٨٣)

بۆ دەکەی شیوەن بەدەس تیغ و سینان؟    چون ئەسیرن ئەودوو، دەس پاشای جیهان (١٦٨٤)

ئەو بەسەنعەت ئازرە، ئەمنیش سەنەم    هەرچی چاکا، لێم، دەبم، بێ زیادو کەم (١٦٨٥)

بێ هەوێ گەر بیمەجام، جام جا، دەبم    بێ هەوێ خەنجەربیم، زوو وا، دەبم (١٦٨٦)

گەرکو کانی کا، ئەمن، ئاو چا دەدەم    گەرکو، ئاگرکا، ئەمن، گەرما، دەدەم (١٦٨٧)

گەرکو باران کا ئەمن، خەرمەن دەدەم    گەرکو، بمکا تیر، لەجیسم و تەن دەدەم (١٦٨٨)

زۆر دەدەم گەر کو بکاتن من بەمار    دەبمەخزمەتکار، بکا گەر من بەیار (١٦٨٩)

من دەنێو دووقامکی وی دام وەک قەڵەم    زۆر دەتاعەت دا دەقیقم نەک هەڵەم (١٦٩٠)

خاکی مەشغووڵ کرد بەو گفت و، وتار    مستەکی خۆڵ لەو فڕاند جا، ڕۆی، بەغار (١٦٩١)

ئەو دەمەی مەشغووڵی گوفتار بووزەوی    زۆر بەدیققەت خۆڵی هەڵگرت ئەو، لەوی (١٦٩٢)

خاکی نارازی دەبرد لای کردگار    تیفلی تیز پای بردە، مەکتەب، ئەو بەغار (١٦٩٣)

خوا کوتی سوێندم بەعیلمی خۆم، ئەمن    ژینی ئەو خەڵقە، بەتۆ دێنم، لەبن (١٦٩٤)

دەیکوت ئەی حەق دەبنەدوژمن، پێم خەڵق    گەر فشاردەم وەختی مردنیان، حەڵق (١٦٩٥)

ئەی خودا، ئەی کردگاری لا یەنام    چۆن ڕەوایە، لات عەدوو بن، پێم، بەعام (١٦٩٦)

پێیدەکوت ئەسباب دەکەم من زۆر عەیان    وەک تەب و قۆڵنج و خەرفان و سینان (١٦٩٧)

وادەکەم کەس تۆ نەکا، تەقسیر کار    چا دەکەم ئەسباب و دەردان، بێ ژمار (١٦٩٨)

دەیکوت ئەی حەق بەندەگانێک هەن،کەوان    پەردەیی ئەسباب دەدڕێنن، عەیان (١٦٩٩)

تێپەڕی چاویان لەمەحدوو دەی سەبەب    گشت حیجابی دوور لەوان کرد لوتفی ڕەب (١٧٠٠)

سورمەیی تەوحید، بەدەس کەحالی حاڵ    کەوتەچاویان، جا لەدەردان بوون بەتاڵ (١٧٠١)

چاو کەناکەن قەت لەقۆڵنج و لەتەب    ڕێگەنادەن بێتەدڵیان هیچ سەبەب (١٧٠٢)

چون هەیانەگشت ئەوان دەردان، دەوا    گەر دەوا بێ، بێ ئەسەر وای ویست، قەزا (١٧٠٣)

هەرچی دەردە، بێ گومان هەیتی دەوا    وەک دەوا بۆ ڕەنجی سەرما بوو، عەبا (١٧٠٤)

گەر بەسەر مای ویست کەسێ ڕەق کا، غەفوور    سەت عەباشی بێت، سەرما، دەچتەژوور (١٧٠٥)

لەرزەلەرزێکی دەخاتەنێو وجوود    قەت چ نادەن بەو، لیباس و خانەسوود (١٧٠٦)

گەرقەزا بێتن، تەبیب نابێ شعوور    لەو دەوای نافیع، دەبێتن سوود، بەدوور (١٧٠٧)

کوا دەبن حاجیب لەبۆ بینا دڵان    ئەو حیجابانەی دەکەن کوێر غافڵان؟ (١٧٠٨)

ئەسڵەمەرئی، چاو ئەگەر ئەکمەل ببێ    فەرعەمەرئی،چاو ئەگەر ئەحوەل ببێ (١٧٠٩)

**جواب دانەوەی خوداوەند بەعیزرائیل کەئەوکەسەی کەچاو لەئەسباب و نەخۆشی و برینی تیغ ناکا چاو لەکاری تۆش ناکا،چونکەئەتۆش سەبەبی ئەگەر چی لەئەسبابی دی مەخفی تری ..ولازمەبۆ ئەو نەخۆشە، بزانێ کە(وهواقرب الیه منکم ولکن لاتبصرون ) ..**

پێیدەکوت یەزدان ئەوەی بێ، ئەسڵ زان   تۆ لەلای وی نی، بەقابیز بۆ گیان (١٧١٠)

گەرچی خۆ ت پنهان کرد تۆ لای عەوام   لای خەواس وروون دلان، پەردەی بەلام (١٧١١)

ئەو کەسەی مردن دەکا ئەو خۆشحاڵ   کوا دەکاتن چاوی وی مەست،گەنج وماڵ (١٧١٢)

خۆ لەلای وی تاڵ نییەهیچ مەرگی تەن   چون لەچاڵ و بەند، دەروا، بۆ چەمەن (١٧١٣)

چون نەجاتی هات لەدونیای پڕ لەغەم   شین، کەناکا کەس لەبۆ بێ قەدرو کەم (١٧١٤)

گەرکو وێران کات یەک مەئموور، بەند   کوا دەبێ بەندی لەوی، دڵ دەردمەند؟ (١٧١٥)

جا، بڵێ ئەو بۆ شکاندی بەردی جوان   تا نەجات داتن لەزیندان گیانمان (١٧١٦)

سەت ئەسەف بۆ بەردی وا جوان و نەفیس   کاخی زیندان بوو بەوان بەردان ئەنیس (١٧١٧)

بۆ خەرابی کرد نەجات بن بەندی تا؟   دەستی وی لازم بوو بشکێ بەو خەتا (١٧١٨)

خۆ، چ بەندی والەنالێ نالەبار   غەیری وەی بی بەن لەبەند،بۆ زێری دار (١٧١٩)

کوا کەسێک نێو ژەهری ماران بێت بەند   تاڵەبۆ وی بی بەنە، نێو شەکرو قەند؟ (١٧٢٠)

رووح دەبێ راحەت لەدەس غەوغایی تەن   ئەو بەباڵی دڵ دەچێ نەک پایی تەن (١٧٢١)

هەروەکوو بەندی لەنێو زیندان شەو   چیمەن و گوڵزار بیی نێتن لەخەو (١٧٢٢)

جادەڵێ تۆ مەمبەتەن ئەی خوای وەداد   تاکو لەو گوڵزارەبم من خۆش و شاد (١٧٢٣)

خوا دەڵێ بەو، تۆ دوعات بوو موستەجاب   تۆ مەڕۆ تەن، خوا دەزانێ، چاک سەواب (١٧٢٤)

چاو کەخەونی هێندەپرسەیران و گەشت   بێ ئەوەی بمرێت دەروا، بۆ بەهەشت (١٧٢٥)

دەیهەوێ داخوا کەوشیارێ تەواو   بەوتەنی نێو بەند ی، زەنجیر پێچ کراو؟ (١٧٢٦)

گەرتۆ ئیمانداری بێرەسەففی ڕەزم   چون لەئاسمانان بووت تۆ، جێگەبەزم (١٧٢٧)

تۆ بەهیوای جێی بڵێندت بێ مەقام   چەشنی شەمعێک لایی میحراب ئەی غولام (١٧٢٨)

ئەشکی گەرمت بۆ تەڵەب با، بێن بەتاو   شەو هەتارۆژ چەشنی شەمعی سەر براو (١٧٢٩)

تۆ ببەستەلێو لەخۆرا ک و لەئاو   رووکەسفرەی ئاسمانی تۆ، بەتاو (١٧٣٠)

ئاسمانت بێ ئومێد، تۆ، گشت ئان   بێرەرەقسین تۆ بەعیشقی ئاسمان (١٧٣١)

دەمبەدەم بۆت دێ لەئاسمان ئاوونار   زیاد دەبێ جا، رزق و رۆزی تۆ، بەبار (١٧٣٢)

گەر تەڵەب، بتباتەوێ، نەت بێ، عەجەب   تۆ مەنۆرە عەجز، بنوارە تەڵەب (١٧٣٣)

چـون تەڵـەب لات بـوو وەدیعـەی کردگـار ئەرزیشـی تاڵـب بەمـەتلووب بـوو دیـار (١٧٣٤)
تۆ تـەلاش کە، ئەو تەڵـەب، تا زیاد بکـەی تـا دڵـت لـەو چـاڵی تـەن ئـازاد بکـەی (١٧٣٥)
خـەڵک بێـژن، مـرد ئـەو مسـکین فـلان تـۆ دەڵـەی زیندوومـەمن، ئـەی غـا فـلان (١٧٣٦)
گەرتـەنی مـن چۆتەخـەو چەشـنی تـەنان ئـەو دڵـم بـۆ هەشـت بەهەشـتان، بـۆ مـەکان (١٧٣٧)
گیـان لـەنێو گـوڵزار گـەر بـێ خۆشـحاڵ بۆی چ غەم،گـەر تـەن ببێ نێـو پـەین و پاڵ (١٧٣٨)
گیان کەنوست نای بێ خەبەر هیچ لەو تەنە جـێ خـەوی وی گوڵشـەنەیا گوڵخەنـە (١٧٣٩)
لێـدەدا ڕووح لـەو جیهانـەی زێـدەڕوون نارەتـەی( یالیـت قـومی یعلمـوون ) (١٧٤٠)
گەر کوڕووح، بێ ئەو تەنە، نەی وێ ژیان جەننـەتی جاویـد، دەبـێ بـۆ کـێ مـەکان؟ (١٧٤١)
ڕووح کەنـەی وێـتن ژیـانی بـێ بـەدەن (فـی السـماء رزقکـم) دەس کـێ دەدەن؟ (١٧٤٢)

**بەیان کردنی وەخامەت وخەرابی چەور و شیرینی دونیا و مانع بوونی وی لە تەعامی خودا هەر وەکوو فەرمووی (الجوع طعام اللەیحیی بەابدان الصدیقین ) ای فی الجوع طعام اللە.. و قولە(ابیت عند ربی یطعمنی ویسقینی ) وقولە(یرزقون فرحین )..**

گـەر نـەجاتت بێـت لـەو ڕۆژی کەسـیف دێتەدەسـتی تـۆ غـەزای بـێ حـەد شـەریف (١٧٤٣)
لـەو غـەزا گـەر کـو هـەزاران قـاب بخـۆی وەک فریشـتان پـاکوسووک تـۆ،ڕێ دەڕۆی (١٧٤٤)
نـەفخ و قـوڵنج زۆر و کـەم بـۆت نایـە، تـۆ دەردی مەعـدەش دا دەنێـی لـەو لایـەتۆ (١٧٤٥)
کـەم بخـۆی برسـی دەمێنـی چەشـنی زاغ زۆر بخـۆی، قرپـت دەدا ئـازار دیمـاغ (١٧٤٦)
کەم بخۆی،خـۆت سست و، تـەن لاوازدەبێ مەعدەشـت گـەر پـڕ ببـێ، ناسـاز دەبـێ (١٧٤٧)
لـەو تـەعامی خۆشـی پـاکی کردگـار چەشـنی کەشـتی تـۆ لـەدەریا بـە، سـووار (١٧٤٨)
تـۆ لـەڕۆژودا، شـەکیبا بـەو سـەبوور ئینتیـزارت بێـت قـووتی خـوای غـەفوور (١٧٤٩)
چـون خوداوەنـدی سـەبوورو جـوان کـار زۆر دەدا هـەدیان لـەکاتی ئینتیـزار (١٧٥٠)
ئینتیـزاری نـان ناکـا، شەخسـی تێـر زوو لـەبۆ وی جیـرەدێ یـاخێر، دێـر (١٧٥١)
مونتـەزیر مـا، شەخسـی برسـی و بـێ نـەوا لەحزەلەحزەئـەو دەڵێـتن نـان کـووا؟ (١٧٥٢)
نایـەبۆ تـۆ گـەر نـەبی تـۆ مونتـەزیر نیعمـەتی پـەروەردگاری موقتـەدیر (١٧٥٣)
بابـەگیان مەردانـەبت بـێ ئینتیـزار تـۆ لەسـفرەی زێـدەوالای کردگـار (١٧٥٤)
عاقیبـەت برسـی وەدەس دێنێـت قـووت جـا دەبێتن ئـەو دەگـەڵ مەقسـوود جـووت (١٧٥٥)
زەیفی باهیممـەت کـەخواردی کـەم غـەزا میزبـان خـۆراکی چـاتر بـەو دەدا (١٧٥٦)
جـا مەگـەر میزبـان فـەقیر بێـت و لـەئیم تـۆ نـەبی بـەد بـین بـەڕەززاقی کـەریم (١٧٥٧)

سـەر بڵیندکەچەشـنی کێـو ئـەی خۆشـناو     ویـت کـەوێ تـا، ئـەووەڵین نـووری هـەتاو (١٧٥٨)

چـون سـەری ئـەو کێـوی بـەرزو ئیسـتیوار     بـۆ هـەتاوی سـوبحدەم بـووی ئینتیـزار (١٧٥٩)

**جوابی ئەو نەفامەی کەکوتوویەتی ئەو جیهانەخۆش دەبوو ئەگەر مردن نـەبا، وخـۆش دەبوو ئەگەر موڵکی دونیا لەبەین نەچووبا، ولەو جوورەقسەبێهوودانە..**

یەک نەفەر دەیکوت جیهان خۆش بوو ئەگەر     تیغـی مـردن قـەت نـەچووبا، سـەر چ سـەر (١٧٦٠)

یـەک نەفـەر دەیکـوت ئەگـەر مـردن نـەبا     قیمـەتی دونیـا دەبـوو کـەمتر لـەکا (١٧٦١)

خەرمـەنێک بـوو یـەک لەسـەحرا کۆی وەکا     ویـڵ کـراو بـێ، تێکـەڵاوبێ، گـەنم و کـا (١٧٦٢)

مردنـت تـۆ بـوو لـەلا ژیـن و حـەیات     بـەزر و تـۆوت چانـد لەعـەرزی شـۆرەکات (١٧٦٣)

عـەقڵی کـازب، شـت لـەلای مەعکووسـەخۆ     ژیـن بـەمردن ئـەو دەبینـێ، ڕاس درۆ (١٧٦٤)

ئـەی خـودا پێمـان بـدە، ئەشـیا نیشـان     لـەو سـەرای فێـڵ هـەر چلۆنێـک بـن ئـەوان (١٧٦٥)

حەسـرەتێک نـاخوا لـەمردن، قـەت چکـەس     حەسـرەتی بوو،کـەم کەتۆشـەی کـەو تـەدەس (١٧٦٦)

خـۆ دەنـا ئـەو هات،لـەچاڵێک کەوتەدەشـت     زۆر بەرین جێ عەیش و نیعمەت،سەیر وگەشت (١٧٦٧)

لـەو مـەکانی ماتـەم و زۆرپـیس و بـەد     کەوتەسـەحرایەک وەسـیع و موعتەمـەد (١٧٦٨)

ئـەو مـەکانی سـیدقەنەک کۆشـکی درۆ     ئـەو شـەرابی نـاب، نەمەسـتی وی بـەدۆ (١٧٦٩)

ئـەو مـەکانی سیدق، بـۆ حـەق هـاو نشین     بـووی نـەجات لـەو ئـاوو خـۆڵی ئاتەشـین (١٧٧٠)

گەرتۆ نەت دی ژینی باش و ڕوون لەخۆت     بمرە، وەک مەرد، یەک دوو دەم تا ماوە، بۆت (١٧٧١)

**فیما یرجی من رحمه الله تعالی معطی النعم قبل استحقاقها وهو الذی ینزل الغیث من بعد ما قنطوا .. ورب بعد یورث قربا ورب معصیه میمو نه، ورب سعاده تاتی من حیث یرجی النقم، لنعلم ا ن الله یبدل سیئاتهم حسنات ..**

دەبارەی ئەو مەتڵەبەدا کەڕەحمەتی خوداوەند جێگای ئومێدە، ئەو خودایەی کەنیعمەت دەدا پێش ئەوەی کەمەخلووق لایقی ئەو بەخششەبێ، وتەنها هەرئەو ەکەپاش یەئس و نائومێدی بەندەگان باران دەنێرێ، زۆر دووری هەن کەنیزیکی لەدووی وان دێ، وزۆرگوناهەهەن کەباش وموبارەکن، وزۆر خۆشبەختی هەن کەلەجێگای مەترسی عیقاب و عەزاب دێن، تا مەعلووم بێ کە خوداوەند، بەدی و خەراپەی وان بەچاکە، دەگۆڕێ ..

وا، حـەدیس هـات ڕۆژی ڕەسـتاخیز، دێ     ئـەمرو فـەرمان بـۆ تـەنان، هەسـتن لـەجێ (١٧٧٢)

نەفخی سوور فەرمان و ئەمری خوایی پاک    ئەی بەنی ئادەم وەدەرنێن سەر،لەخاک (١٧٧٣)

ئەو چەلەش گیان دێتەوەبۆ نێو بەدەن    وەک بەیانان دێتەوەهۆش نێو تەن (١٧٧٤)

گیان دەناسێتن تەنی خۆی پاشی خەو    دەچێتەوەوێرانەکەی، وەک گەنج ئەو (١٧٧٥)

چاک دەناسێ جیسمی خۆی، جا دەچێتەوێ    ڕووحی زەڕگەر کوانێ خەیاتی دەوێ؟ (١٧٧٦)

ڕووحی عالم ڕوو دەلای عالم دەکا    ڕووحی زاڵم ڕووی دەلای زاڵم دەکا (١٧٧٧)

جێگەیان ناسی بەعیلمی خوای لەسەر    هەر وەکوو بەڕ خ و مەڕان، وەختی سەحەر (١٧٧٨)

پا، دەناسێ کەوشی خۆی نێو جێی تار    بۆ تەنی خۆی، بۆ نەبێ ڕووح، ناسیار؟ (١٧٧٩)

حەشری ئەسغەربوو یەقین بۆ عام بەیان    حەشری ئەکبەر لەو قیاس کە، ئەی فلان (١٧٨٠)

وەک دەکا بۆ لایی قوڕ، پەرواز گیان    نامەدەفڕێ لای چەپ وڕاس، بێ گومان (١٧٨١)

بەو دەدەن جا کارنامەی کاری وی    هەرچلۆن بێ خوڵق و خوو و، کرداری وی (١٧٨٢)

گەر سەحەر هاتو، هەڵستا ئەو لەخەو    دێتەوە، ئەو خێر و شەڕ بۆ لایی ئەو (١٧٨٣)

گەرکو خووی خۆی،کردبێ پەرهێزکار    گەر هەڵستا دێتەوە، لای وی بەغار (١٧٨٤)

گەرکو بوو بێ،نێو بەدی و نێونا لەبار    نامەدەگرێ ڕەش، بەچەپ وەک تازیەدار (١٧٨٥)

گەرکوپەرهێزکار بووبێت و بەدین    وەختی وشیاربوون دەبا دوڕڕی سەمین (١٧٨٦)

شاهیدی سەر مەرگ و مەحشەر، بۆمە، دوون    خەو هەوەڵ بوو، دووهەمیش وشیار بوون (١٧٨٧)

حەشری ئەکبەر،بوولەحەشری چووک،دیار    مەرگی گەورەی مەرگی چووک کردئاشکار (١٧٨٨)

نامەیی ئەعمال کەئێستا بوو نیهان    ئەو لەمەحشەر دا، دەبێ زۆر چاک عەیان (١٧٨٩)

لەو خەیاڵی لێرە، ون، زاهیر ئەسەر    چا دەکا لەو، خوا لەدونیای دی، سووەر (١٧٩٠)

دێتەزیهنی یەک موهەندیس خانەیەک    وەک لەعەرزی دا بچێنرێ دانەیەک (١٧٩١)

ئەو خەیاڵ ئاخر لەجێی خۆی دێتەدەر    وەک زەمین شین کات دەنکێک، خۆڵ،لەسەر (١٧٩٢)

هەر خەیاڵێکی دەدڵ بگرێ قەرار    ڕۆژی مەحشەر ئەو دەبینرێ ئاشکار (١٧٩٣)

وەک خەیاڵی ئەو موهەندیس نێودڵی    چەشنی دەنکێک، شین ببێتن نێو گڵی (١٧٩٤)

لەو دوو مەحشەر داستانێک بووم مەرام    زیکری وی نافیع لەبۆ موئمین، بەعام (١٧٩٥)

ڕۆژی ڕەستاخیز تلووع کاتن ئەگەر    پاک وپیس توند، دێننەدەر لەو خاکە، سەر (١٧٩٦)

گشت دەڕۆن بۆ مەحکەمەی پەروەردگار    زێڕی باش و غەش دەڕۆن بۆ، نێو نار (١٧٩٧)

زێڕی باش لەو ئیمتیحانەخۆشحاڵ    زێڕی غەش ئەمما لەسوزو ناڵەناڵ (١٧٩٨)

وەختی ئازموون دێ دەگا، جا،کەمکەمە    ڕازدەبن زاهیر لەئەبدان، ئەو دەمە (١٧٩٩)

وەک دەبینرێن نەفت و ئاو، جوان نێو چرا — وەک دەکا خاک ڕازی خۆی جوان ئاشکرا (١٨٠٠)

چەشنی خەشخاش و،پیاز، هەم وەک کەوەر — گەر بەهار هات ڕازی زستان دێتەدەر (١٨٠١)

دەستەیەک، سەربەرزو سەوزن، زۆر قەوی — دەستەیەک سیس،وەک بنەوشەن، سەرنەوی (١٨٠٢)

چاو دەمۆڵەق، ڕا دەوەستێنێ خەتەر — بیم، دە، کانیاوان لەچاو دێنێتەدەر (١٨٠٣)

چاو هەموو، ئەودەم، دەیان بێ، ئینتیزار — تا، نەیەت، نامە، لەبۆ وان، لای یەسار (١٨٠٤)

چاو لەسووڕان،ڕاست و چەپ،هیچ ناسرەوێ — چونکەنامەی ڕاس،سووک دەس ناکەوێ (١٨٠٥)

دێ لەبۆ یەک بەندە، نامێک لای غەفوور — ڕەش سەراسەر، پڕ لەفیسق و پڕ فجوور (١٨٠٦)

زەڕڕەیەک دەو دا نییە، خێر و سەلاح — غەیری ئازاری دڵی ئەهلی فەلاح (١٨٠٧)

پڕ لەجورم و ناحەزی و گوفتاری سووک — مەسخەرەو تەوهین بەئەشخاسی سلووک (١٨٠٨)

پڕدزی، پڕ مەکری بێ ئەندازی وی — پڕغروور و زیاد لەحەد دڵخوازی وی (١٨٠٩)

نامەکەی خۆی خوێندەوە، ئەو بەد، ئەگەر — تێدەگا بڕوا دەبێ، بۆلای سەقەر (١٨١٠)

جا دەچێ ئەو وەک دزان بۆ لایی دار — جورمەئاشکار، ڕێ نەما، بۆ ئیعتیزار (١٨١١)

جا هەزاران حوججەت و،گوفتاری بەد — سەر دوولێوی وین، وەکوو بزماری بەد (١٨١٢)

وەک لیباسی دز، دەبەروی بێ و لەماڵ — ئاشکرابێ، جا بەهانەی بێ بەتاڵ (١٨١٣)

جا دەبێ ئەو بۆجەهەننەم ڕەهسوپار — غەیری ئاگر نیتی خۆ هیچ چارە، خار (١٨١٤)

بوون لەپاش و پێش فریشتەی خۆش نەفەس — بوون نیهان، پەیدا دەبن جا وەک عەسەس (١٨١٥)

جا دەبەن ئەو، زۆر بەڕەنجی تێوەژین — دەی بڕۆ کادێتەبۆ سەگ، جێگەژین (١٨١٦)

ئەو لەڕێگا دا، گەلێک دەگرێ جەنە — تا نەجاتی بێت لەو حەپس و بەنە (١٨١٧)

ڕادەوەستێ ئەو لەڕێگا، جارو بار — چاو دەخاتەپشت، کەهەیتی ئینتیزار (١٨١٨)

چەشنی باران ئاو لەچاوی دێتەخوار — هەیتی بەس یەک، وشک و خاڵی ئینتیزار (١٨١٩)

چاو لەپشت سەر خۆی دەکا، گشت ئان وکات — ڕوو لەدەرگای پاکی بێ هەمتا، دەکات (١٨٢٠)

دێ لەحەق فەرمان لەلای ئیقلیمی نوور — پێی بڵێن، ئەی هیچ نەزانی بێ شعوور (١٨٢١)

ئینتیزاری چی دەکەی ئەی جێی بەدی؟ — چاو لەلای پشت، بۆ دەکەی ئەی موعتەدی؟ (١٨٢٢)

نامەکەی تۆ ئەو هەبوو گرتت بەدەست — ئەی خودا، ئازار دەری شەیتان پەرەست (١٨٢٣)

تۆ کەدیتت نامەکەی کرداری خۆت — تۆ بنۆڕەبەس جەزاکەی کاری خۆت (١٨٢٤)

دوور لەسوود تەئخیردەکەی بۆ ئەی دەنی؟ — کوا لەچاڵی وا، ئومێدی ڕەو شەنی؟ (١٨٢٥)

زاهیرەن تۆ، تاعەتت هیچ لا، نەبوو — باتینەن تۆ، نییەتت هیچ چا، نەبوو (١٨٢٦)

شەو ئەتۆ، نەت بوو عیبادەت، هەم دوعا ‌‌ ڕۆژ نەبوو تەقواوو، ڕۆژوت بۆ خودا (١٨٢٧)

دای زەبانت ڕەنجی غەیرەو قەوم و خوێش ‌‌ تۆ بەعیبرەت نەت دەدی، قەت پاش و پێش (١٨٢٨)

پێش، یانی یادی مەرگی خۆت و بەس ‌‌ پاش، یانی مەرگی پێشووی قەوم و کەس (١٨٢٩)

تۆ لەزوڵمت نەت دەکرد تۆبە، بەشین ‌‌ ئەی بەسەممت، تێکەڵاو کرد، ئەنگەبین (١٨٣٠)

تۆ تەرازووت بوو، کەج و موعوەجج و، خوار ‌‌ چۆن تەرازووی ڕاس دەکەی تۆ ئینتیزار (١٨٣١)

چونکەنەت کرد کاری ڕاست وباش، چ جار ‌‌ ناگرێ نامەت لەدەستی ڕاس قەرار (١٨٣٢)

چونکەپاداش سێبەرە، ئەی قەد خووار ‌‌ سێبەری تۆ خوار لەپێشت دێتەخوار (١٨٣٣)

لەو خیتابانەی شەدیدی خوا ی جیهان ‌‌ خەم دەبێ کێو گەر ببیستێتن ئەوان (١٨٣٤)

جا دەڵێتن بەندە، هەرچیت کرد ئەدا ‌‌ سەت بەرابەر بەد ترم من، ئەی خودا (١٨٣٥)

خۆ ت پۆشیت عەیب و عاری من، بەحیلم ‌‌ تۆ دەنا، عەیبم دەزانی چاک، بەعیلم (١٨٣٦)

خۆ بەلام بێ سەعیو، بێ کرداری خۆم ‌‌ بێ شەڕ وخێر، کافری و دینداری خۆم (١٨٣٧)

بێ ئەوەی بم، بێ نییاز بەو سەرمەدی ‌‌ بێ خەیاڵ و، وەهمی خۆم و، ئیدەدی (١٨٣٨)

لوتفی مەحزی تۆم ئومێد، ئەی کردگار ‌‌ جا، چ باش بم یا خەراپ و، نالەبار (١٨٣٩)

تۆ عەتای مەحزی لەلوتفی بێ عەوەز ‌‌ تۆم ئومێدە، ئەی کەریمی بێ غەرەز (١٨٤٠)

ڕووم لەپشت کرد، لوتفی تۆم بوو ئینتیزار ‌‌ نیم بەئەعمالم دەنا، ئومێد وار (١٨٤١)

ڕووم دەکردەلوتفی پاکت ئەی وەدوود ‌‌ زۆر لەپێش، چون پێت عەتاکردم وجوود (١٨٤٢)

دات وجوود پێم، موفتە، ئەی پەروەردگار ‌‌ بەخشیشت لام موعتەمەد، جێی ئیعتیبار (١٨٤٣)

گەرکو ببژێرێ لەخۆی جورم و خەتا ‌‌ دێ لەبۆوی مەحزی بەخشایش عەتا (١٨٤٤)

ئەی فریشتان بێننەلام ئەو، ئێوە، جا ‌‌ چونکەبووی ئەو، چاوی دڵ، بۆ لای ڕەجا (١٨٤٥)

ئەو دەکەم ئازاد بەبێ وەی هیچ بڵەم ‌‌ سەرگوناهی وی دەکێشم خۆم، قەڵەم (١٨٤٦)

بوو موباح ڕەحمی خوداوەندی جیهان ‌‌ چونکەبۆی نایەت لەباش و بەد، زییان (١٨٤٧)

من لەلوتفم ئاگرێکی هەڵدەکەم ‌‌ تا نەمێنن جورم و لەغزیش زۆر و کەم (١٨٤٨)

ئاگرێک کام شوعلەلەو سیس بێ و نەزار ‌‌ پێی بسووتێ جورم و جەبر و ئیختیار (١٨٤٩)

زینی ماددییات دەسووتێنم بەنار ‌‌ دەیکەمە گوڵزاری ڕووح، من جێگەنار (١٨٥٠)

ناردمان ئێمەلەئاسمانی نوهوم ‌‌ کیمییا (یصلح لکم اعمالکم ) (١٨٥١)

هیچ نییەلای نووری جوانی دائیمی ‌‌ کەڕ و فەڕوئیختیاری ئادەمی (١٨٥٢)

پارچەگۆشتێک ئالەتی گوفتاری وی ‌‌ پارچەیەک بەز، ئالەتی دیداری وی (١٨٥٣)

ئــەو بــەدوو ئێســکان دەبیســێ، ئــەو گــوێن ‌ ‌ ئــەو دەفــامێتن بــەدڵ، دوو قــەترەخوێن (١٨٥٤)
چەشــنی کرمێکــی کەســیفی بــۆ گــەنی ‌ ‌ ئەو جیهانـەت پـڕ هـەرا کـرد، ئـەی دەنـی (١٨٥٥)
تـۆ مـەنی بـووی مـن منـی خـۆت بێخـەبیر ‌ ‌ ئـەی ئـەیاز تـۆ خەرقەکـەی خـۆت، بێتـەبیر (١٨٥٦)

**داستانی ئەیاز وبوونی حوجرەیەک بۆوی بەخاتری کاڵەو خەرقە، وگومان کردنی کاربەدەستان وئەتڕافیانی شا، کەئەیاز دەو حوجرەدا گەنجێکی پنهانی هەیە، بەدەلیلی محکەم بوونی دەرکە..وقرس و گران بوونی قفڵ ..**

**خولاسەی داستان ..**

ئەیاز غولامی خۆشەویستی سوڵتان مەحموودی غەزنەوی کاتێک دەحکوومەتی ویدا بەمەقام ومە نسەب گەیشت بەحوکمی ئەمەک ناسین و بەپێچەوانەی ئەو کەسانەی کەقودرەتیان دیتەدەست و کیسەپەرستن، کاڵەو خەرقەی خۆی لەدیواری وەتاغی خۆی هەڵاوەسیبوو، وهەمووڕۆژێک پێش هەموو کارێک دەچۆ وێ وتەماشای وانی دەکرد وڕۆژگاری پێشووی خۆی وەبیرخۆی دەهیناوەو لەپاشان لەسەر مەقام ومەنسەبی دەوڵەتی خۆی حازر دەبوو، جا بۆ ئەوەکەکەس لەو کارە ئاگادار نەبێ،بەقفڵێکی قورس و گران دەرکەکەی قایم کردبوو، ئەتڕافیانی حەسوود وەختێک کەوەتاغی قفڵ کراوی ئەیاز یان دیت، بەو خەیاڵەکەگەنجی زێڕو زێوی دەوێدا پنهان کردووە، هاتنەلای شا،ودەستیان کردبەنەمامی و قسەسازکردن،شا، کەخوو و خدەی ئەیازی زۆر چاک دەناسی، لەڕەددی ئیددیعای وان چی نەکوت، بەڵکەم بۆ ئەوەکەنەمامان خەجاڵەت و شەرمەزار بکا، کوتی وەختێک کەئەیاز دەوەتاغی خۆی دا نییەبچنەوێ وهەرچی زێڕو زێوێکی پەیداتان کرد لەبەینی خۆتا ن تەقسیمی بکەن، نیوەشەوێک، سی نەفەر مەشعەل بەدەست بۆ لای وەتاغی ئەیاز وەڕێ کەوتن، بەحیرس و تەماعێکی زۆرقفڵی دەرکەیان شکاند و هروژمیان بردەنێو وەتاغ و هەرچەند ئەو لاو ئەولا، گەڕان غەیری جووتێک کاڵەودەستێک لیباسی کۆنی شوانی هیچیان پەیدا نەکرد، لەوەحشەت و پەرێشانی روویان زەرد بوو، و بەدەنیان کەوتەلەرزین، بەخۆیان کوت چی جوابی شا بدەینەوە، عاقیبەت بەشەرمەزاری وخواری هاتنەوەلای شا، شا کەحەقیقەتی مەو زووعی چاک دەزانی خۆی لەنەزانین دا، وعەمدەن کوتی ئەدی بۆ بەدەستی بەتاڵ هاتوون؟ گەنجەکانتان بۆ کوێ برد؟ نەمامەکان عاجزانەکەوتنەسەخاکی مەزەللەت ومەعزەرەتیان خواست، شا،کوتی ئەمن ناتوانم لەبارەی ئێوەدا تەسمیم بگرم،چونکەئەمن موتتەهەم نەبووم، بەڵکەم ئەوەئەیازەکەتوهمەتی

لێدراوە، جا حوکم و قەزاوەت بەدەس وییە،کەببەخشی یا تۆڵەبستێنی، شا، ئەیازی حازر کرد وکوتی لەنێو ئەو خەرابکارانەقەزاوەت بکا، ئایا دەبەخشی یا تۆڵەدەستێنی؟ .. ئەیاز کوتی ..

هەرچی ئەمن هەمە، لەتۆڕایە، جا ئەی شا، فەرمان فەرمانی تۆیەو ئەمن تابیع و پەیڕەو ..

ئــەو ئــەیازی زیــخ و ژیــرو بــا وەفــا — ئــــاوێزانی کردبـــــوو کاڵـــــەو عـــــەبا (١٨٥٧)

ئـەو هـەموو ڕۆژێ دەچـوو نێـو حوجرەکـەی — ئەو هەکاڵەی تۆیـە، ڕووت لای سـەر نەکـەی (١٨٥٨)

دەورو بـــەرکوتیان بەشاهەنشـــای جەســـوور — حوجرەکـەی پـڕ کـرد بـەزێوو، زێـڕی سـوور (١٨٥٩)

نـا یـەڵێتن ئـەو کـەهیچ کـەس بچتـەژوور — دەر، دەبەســتێ ئــەو لەخــەڵک و بــاو نــوور (١٨٦٠)

شـا کـوتی حـەیران گـەلێک لـەو بەندەمـە — چـــی هەیـــەپنهانی کـــاتن ئـــەو لەمـــە؟ (١٨٦١)

یـــەک ئـــەمیری کردەمـــەئموور شـــا،کەئەو — دەر وەکـــا، جـــا بچتـــەحوجرە، نیوەشـــەو (١٨٦٢)

چـی لـەوێت تـۆ دەسـکەوت بـابێ، لـەبۆت — بێـــژەڕازی وی بەگشـــت دۆســـتانی خـــۆت (١٨٦٣)

بـەو هـەموو لوتفـەی کـەبۆ وی، مـن هەمـە — چـۆن دەکـا ئـەو زێـڕو زێـو، پنهـان لەمـە؟ (١٨٦٤)

ئەو وەفاو عیشقەی بەمن بووی ئەو، مەگەر — وای دەکـرد، چـون فێڵـەباز بووو،حیلەگـەر؟ (١٨٦٥)

هەرکەسێکی ژیـا لـەڕێی عیشـق و ئـەوین — کفــرە، غــەیری بەنــدەگی بــۆ وی، یــەقین (١٨٦٦)

نیوەشـەو، ئـەومیر، دەگـەڵ سـی موعتەبـەر — کـــردی شـــوورا، تاوەکـــا لـــەو حـــوجرەدەر (١٨٦٧)

چـەن نەفـەر مەشـعەل بەدەسـتی پاڵـەوان — ڕێ دەکـــــەوتن بێنـــــەحوجرە، شـــــادمان (١٨٦٨)

ئـەمری شـایە، حەملـەبۆ حـوجرەی ئـەیاز — پڕدەکــــەین کیســــان، لــــەزێڕی دڵخــــوواز (١٨٦٩)

یـــەک کـــوتی زێـــڕ هیچەلێرەئـــەی ڕەفیـــق — باس کە، لەعل وگەو هەری جوان و عەقیق (١٨٧٠)

چـون حـەبیب و خۆشەویسـتی شـایە، ئـەو — بەڵکەئێســـتا گیـــانی شـــایە، وایـــە، ئـــەو (١٨٧١)

جـــا لەحاســـتی خۆشەویســـتێکی وەهـــا — لـەعل و یـاقووت، دوڕڕو گـەو هـەر، بێ بـەها (١٨٧٢)

شا، نـەبوو نیسـبەت بـەوی هـیچ بـەدگومان — مەسـخەرەی کـردن ئـەوان بـەو ئیمتیحـان (١٨٧٣)

گـەرچی شـا، زانـی ئـەیاز، نیتـی، چ غـەش — وەهمـــی وی لـــەرزینی خســـتەقەلبی گـــەش (١٨٧٤)

چـــون مـــەبادا گفتـــی خـــەڵکی بێـــت ڕاس — نامهـەوێ مـن قـەت خەجاڵـەت بێ، هـەیاس (١٨٧٥)

گـەرچی نـەی کـرد، لـەو ڕەوایـە، وا، بکـا — یـــارەبۆ مـــن، هـــەرچی ویســـتی، بـــا، بکـــا (١٨٧٦)

هـەر ئـەمن کردوومـە، هـەرچی کـرد، یـار — ئـەو منـەو، مـن هەرئـەووم، مـن نـیم دییـار (١٨٧٧)

خوڵق و خووی وای، شا لـەوی، زۆر دوور دەدی — چـــی دەڵـــێن بـــەو ئیفتیراێـــە، ئیـــدەدی (١٨٧٨)

نیســـبەتی وا، بـــۆ ئـــەیاز خـــۆ وا، نییـــە — ئـــەو، یەمێکەقـــەعری وی، پەیـــدا، نییـــە (١٨٧٩)

بـوون لـەحاس وی قەترەیـەک حەودانە،یـەم — مـەو جی وی،هەستی لەوی، یـەک زەڕڕەنـەم (١٨٨٠)

دێن هەموو، لەو یەم هەتا، پاکی بەرن   قەترەکانی وی، هەموو کیمیاگەرن (١٨٨١)
شایەبۆ شایان، دەکا ئەو شاەساز   چاوی بەد باعیس بوو، نێوی بوو ئەیاز (١٨٨٢)
چاوی باشیش خۆ بەحەسرەت، زۆر بەدە   لەو بنۆڕێ، حوسنی وی چون بێ حەدە (١٨٨٣)
دەمهەوێ زارێک بەقەد ئاسمان پان   تا بکەم من وەسفی بەندەی وا، بەیان (١٨٨٤)
سەت بەرابەر زاری واشم گەر هەبا   پێم نەدەکرا من ئەدا کەم رازی وا (١٨٨٥)
گەر ئەوەندەش من نەڵەم ئەی شەخسی باش   شووشەیی قەلبم دەبێتن، وردو خاش (١٨٨٦)
چونکەشووشەی دڵ زەعیفە، زێدە،جا   من لەبەر تەسکین دەردێنم، عەبا (١٨٨٧)
خۆ هەموو مانگان، سێ ڕۆژ، ئەی فلان   هەر دەبێ دێوانەبم، من بێ گومان (١٨٨٨)
ئەو ڕۆ، ئەووەڵ ڕۆژ، لەسێ ڕۆژ، ئەی سەنی   ڕۆژی فەتحی زاهیری، نا، باتنی (١٨٨٩)
هەر دڵێکی پڕ بێ بۆ شا، لەغەم   ئەووەڵی مانگانە، بۆوی، دەمبەدەم (١٨٩٠)
باسی مەحموودو ئەیاز ئەی خۆش نەفەس   چونکەمەجنوون بوومە، ئێستا، چوو لەدەس (١٨٩١)

**بەیانی ئەومەتڵەبەکەهەر مەتڵەبێک کەبەیان دەکرێت زاهیری مەتڵەبەوئەو زاهیرەش لایقی زاهیرخوازانە، وزبان لەبەیان کردنی حەقیقەتی ئەو داستانەکەهەیتی، عاجزەو لەشەرم و خەجاڵەتیان سەرو ڕیش و قەڵەمی خۆی ون دەکا و ( العاقل یکفیەالاشارە) بۆ عاقڵ ئیشارێک بەسە..**

چونکەهیندی، دی، دەخەو، فیلم، بەجێ   لا بەرەبیری خەراج، وێرانەدێ (١٨٩٢)
کوا لەبوم دێ قافییەوەک ئەهلی فەن؟   من کەساغیم هیچ نەما، ئێستا، لەتەن (١٨٩٣)
نیمەتەنها یەک جنوون نێو غەم، هەزار   بەڵکەدامام نێو جنوونی بێ ژمار (١٨٩٤)
بوو بەئاو تەن، لەو ئیشاراتی خەفی   گەر بەقام دی، نێو فەنا، من ئەی سەفی (١٨٩٥)
ئەی ئەیاز من بووم لەعیشقت چەشنی موو   مام لەباست، باسی من تۆ بێژە، زوو (١٨٩٦)
من بەدڵ خوێندوومە، زۆر داستانی تۆ   باس لەمن کەزێدەمەشهوور بوومە، خۆ (١٨٩٧)
تۆی کەدەخوێنی، نەمن، ئەی موقتەدا   کێوی توورم، تۆش مووسای، باس سەدا (١٨٩٨)
کێوی بێچارە، لەگفت کوا حاڵییە؟   چاک دەزانێتن کەلیم،کێو خاڵییە (١٨٩٩)
کێو دەزانێ هەر بەئەنداز خۆی و بەس   تەن لەڕووح دێتی کەمێک نەرمی، بەدەس (١٩٠٠)
بۆ حیساب هەر چەشنی ئوستوڕلابە، تەن   بۆ نیشانەی ڕووحی چەشنی ڕۆژ، بەدەن (١٩٠١)
گەر مونەججیم دی کەبینایی کەمە   شەخسی ئوستوڕلاب سازی، لازمە (١٩٠٢)
تا، ستوڕلابێک لەبۆ وی چا، بکا   حاڵەتی ڕۆژ تا بەوی پەیدا، بکا (١٩٠٣)

گەر لەئوستورلاب، ڕاستی ویست گیان — چی وەدەس دێ ئەو لەڕۆژو، ئاسمان (١٩٠٤)
گەربەئوستورلاب بنواڕی جیهان — کەم لەڕاستی تێدەگەی تۆ، بێ گومان (١٩٠٥)
تۆ جیهانت دی لەدیدگای خۆت و بەس — کوا لەوی ڕاستی و، دروستیت دێتەدەس؟ (١٩٠٦)
تۆ بەدووی سورمەی کەعارف بووی، بڕۆ — بینەیەم، تا ئەو دوو چاوی چەشنی جۆ (١٩٠٧)
زەڕڕەیەک گەر عەقڵ و هۆشم بایە، من — بۆچی دەمکرد ئەو هەراو هوریایە، من؟ (١٩٠٨)
چونکەمەغزم عەقڵ و هۆشی لا نییە — من گوناهم لەو هەراو هوریا، نییە (١٩٠٩)
بۆ گوناەبۆ وەی کە، لام، عەقڵی دەبرد — گشتی عەقڵی عاقڵان لای وی، دەمرد (١٩١٠)
ئەی لەبۆ عەقڵان پەنا، هەم فیتنەگەر — بۆ عقوول هەرتۆی ئومێد، ئەی مو عتەبەر (١٩١١)
لەو دەمەی دات پێم جنوون، لام ناوەفام — من بەجوانی نیم حەسوود، جوانیت کەدام (١٩١٢)
من لەعیشقت، باشە، یا، نا، بم بەشێت؟ — بێژەباشە، خوا بدا پاداش پێت (١٩١٣)
گەر بڵێ ئەو فارسی یاعارەبی — عەقڵو هۆش کوان؟تا بەوان حاڵی ببی (١٩١٤)
نین بەبادەی وی سەزاوار گشت هۆش — نین بەحەڵقەی وی سەزاوار گشت گۆش (١٩١٥)
ئەو چەلەش هاتم ئەمن وەک شێت و هار — ئەی عەزیزم بێنەزەنجیرێک بەغار (١٩١٦)
غەیری ئەو زەنجیری زولفی یارەکەم — شەرتەزەنجیر، چەندەبێنی پارە،کەم (١٩١٧)

**حیکمەتی تەماشا کردنی کاڵەو خەڕقەکە( فلینظرالانسان مم خلق )..**

ئەوچەلەش تۆ باس کەبۆم عیشقی ئەیاز — چونکەئەو گەنجێکەتێیدا زێدەڕاز (١٩١٨)
ئەو دەچۆ حوجرە، هەموو ڕۆژ، تا لەوێ — هەم عەبا هەم کاڵەکەی چاو پێکەوێ (١٩١٩)
چون دەبێ ئینسان بەهەستی زێدەمەست — بەو دەچن عەقڵ و حەیا، هەردوو، لەدەست (١٩٢٠)
بێ حیساب و حەد، قڕوونی بێ ژمار — مەستی هەستی، کردنی گشت تارو مار (١٩٢١)
بوو عەزازیلێک بەمەستی وا، بلیس — بۆدەبێ ئادەم لەسەرمن بێ، ڕەئیس؟ (١٩٢٢)
من بەگم ئەسڵەن ئەمن بەگزادەمە — بۆ هونەر هەرچەن بڵەی، ئامادەمە (١٩٢٣)
بۆ هونەر کەم نیم لەهیچ گیان دار ئەمن — بۆ عەدوو تا ببمەخزمتکار ئەمن (١٩٢٤)
من لەئاگربووم، لەقوڕ بوو ئەو بەڵام — کوا لەبۆ قوڕ بوو لەلای ئاگر، مەقام (١٩٢٥)
ئەو دەمەی کە، ئەو نەبوو، بۆ کەس دیار — سەدری عالەم بووم و فەخری ڕۆژگار (١٩٢٦)

**(خلق الجان من مارج من نار) وقولەتعالی فی خلق ابلیس (انەکان من الجن ففسق )..**

شوعلەوەربوو ناری گیانی ئەو سەفیە — چون لەنار بوو، بوو بەباب، منداڵ شەبیە (١٩٢٧)

ئەو وتانەم ئیشتیبا کردن، ئەدا — وای دەکرد تەنهاو بەس قەهری خودا (١٩٢٨)

دوور لەعیللەت بوون، کاری کردگار — ئیبتیدا بۆ کاری و ی ناکرێ دیار (١٩٢٩)

نێو کەماڵی سونعی پاکی کردگار — عیللەتی حادیس، حەدەس هەم نین دیار (١٩٣٠)

بابی ئێمەسونعی خوایە، نەک چ کەس — مەغزەسونع و، بابی زاهیر، پێستەبەس (١٩٣١)

عیشق بگرەئەی تەنی ناچیز بەیار — دەیهەوێ ڕووح، مەغزو پێستی دا کەنار (١٩٣٢)

دووزەخێک بی وێ کەپۆست بۆی بێ بەدۆست — بەو دەداتن خالقی پۆستا ن پۆست (١٩٣٣)

مەغزو مەعنای تۆ، لەسەر نار سەروەرن — پۆست هەموو یان دەستەچیلەی ئاگرن (١٩٣٤)

گەرکو تێیدابێت ئاو، یەک زەرفی دار — بەس دەسووتێنێت زەرفی ئاو، نار (١٩٣٥)

مالیکەبۆ نار، مەعنای شەخسی پاک — کوا لەدووزەخ دا دەبێ مالیک هیلاک؟ (١٩٣٦)

زیاد بکەمەعنا ئەتۆ جا، نەک بەدەن — چەشنی مالیک سەروەری نار، پێت دەدەن (١٩٣٧)

پۆست لەسەرپۆست دادەنێی لەیل و نەهار — لا جەرەم وەک پۆستەجێت، نێو دوودی نار (١٩٣٨)

چونکەغەیری پۆست، نییەبۆ نار گییا — خوا دەکا مەغروور لەتاخیر، ڕووسییا (١٩٣٩)

ئەو غرووره، بوو نەتیجەی پۆست بەس — جاهو ماڵ بۆ ئەو غروورەن، دۆست بەس (١٩٤٠)

غەفڵەتی ئینسان لەحەق، دێنێ غروور — وەک سەهۆڵ گەرکو لەتاو بێ، زیندەدوور (١٩٤١)

گەر سەهۆڵ هاتو خەبەرداربوو لەتاو — زوو دەبێتەئاوو، دەڕوا جا، بەتاو (١٩٤٢)

هەرچی دی، لوب، لەو دەبێتن تەن تەمەع — عاشقی ڕیسوایە(ذل من طمع) (١٩٤٣)

هەرچی نەی دی لوب، بەپۆستی کرد بەس — بەندی ( عزمن قنع) لەو بەستی دەس (١٩٤٤)

لێرەعیززەت کفرو خواری وزوللی دین — بەر، هەتا فانی نەبێ نابێ نگین (١٩٤٥)

تۆ کەبەردی بۆ دەکەی هاوار (انا)؟ — وەختی مسکێن بوونی تۆیە، هەم فەنا (١٩٤٦)

بۆ غروور دەی وێ بەداتیم جاهو ماڵ؟ — چونکەگوڵخەن بووی لەپەین و پاڵ کەماڵ (١٩٤٧)

ئەو دوو دایەن زیاد دەکەن پۆست بێ قسوور — جا بەگۆشت و بەز، دەیاخنن هەم غروور (١٩٤٨)

چون نەیان دی مەغزو کاکڵ، قەت ئەوان — بوو لەلای وان پۆست کاکڵ، بێ گومان (١٩٤٩)

ڕابەری ڕێگای غروور، ئیبلیسی هار — چون بەداوی خود پەسەندی بوو شکار (١٩٥٠)

ماڵ بەچەشنی مار، مەقام وەک ئەژدەها — زومڕودی ئەو دووانە، سایەی مەردی خوا (١٩٥١)

چون بەزومڕود دێنەدەر دوو چاوی مار — کوێر دەبێ مار، دێ نەجات بۆ ڕێبووار (١٩٥٢)

دایدەنا لەو ڕێگەزۆرخار ئەو ڕەئیس — ڕێ دەکا لەعنەت برێندار، بۆ بلیس (١٩٥٣)

یانی فێڵی وی بوو هینای ئەو غەمە — ئەو لەفێڵان موقتەداو، سابیق لەمە (١٩٥٤)

پاشـەوی زۆر نەسـلی دی، پەیـدا دەبـوون گشـت بـەڕێگاو سـوننەتی وی دا دەچـوون (١٩٥٥)

هـەرچی دانـێ سـوونەتی بـەد، ئـەی فـەتا چەشـنی کـوێر وەدوای کـەون، عالـەم هـەتا (١٩٥٦)

بـۆی دەبێـتن جـورمی عالـەم، یـەک سـەرە چونکەعالـەم، چەشـنی کلکـەو، ئـەو سـەرە (١٩٥٧)

دای نیشـان ئـاد ەم، بـەڵام کاڵـەو عـەبا خاکەئەسـڵم، تێبگـەن عالـەم، دەبـا (١٩٥٨)

چـون لـەبۆ لای کاڵـەهات گشـت ڕۆژ ئـەیاز لا جـەرەم بـۆی عاقیبـەت بـوو دڵخـوواز (١٩٥٩)

ژینـی جاویـد نایـەبۆ سـالیک مەگـەر خـۆی فـەناکا ئـەو لـەزاتی دادگـەر (١٩٦٠)

کـەس لەسەرنوسـراو نانووسـێ، چ جـار یـا بچێنـێ ئـەو لەسـەر یـەک دا ر دار (١٩٦١)

کاغـەزێک نووسـراو نـەبێ، داوا دەکـا تـۆو، بەعـەرزێکی نـەچانراو، دا دەکـا (١٩٦٢)

جێگەیـەک بـە، تـۆ، نـەچانراو ئـەی بـرا کاغـەزێک بـە، تۆ، سپی وساف وەک چـرا (١٩٦٣)

تـا موشـەڕڕەف کـا، ئـەتۆ (ن والقلـم ) تـا لەقـەلبت تـۆو، بچێنـێ (ذوالکـرم) (١٩٦٤)

لـەززەتی دونیـا وەلانـێ، بـۆ کـەنار تـۆ مەنۆڕەمەتبـەخی دونیـا، چ جـار (١٩٦٥)

بـەو لـەزایز،چون دەبـی تـۆ مەسـت و شـاد هـەم عـەبا هـەم کاڵـە، نـات مێـنن، لـەیاد (١٩٦٦)

وەختـی مـەرگت ئادەکێشـی کەمکەمـە دێتـەبیرت دەڵـق و کاڵەئـەو دەمـە (١٩٦٧)

تـا نـەبی تـۆ غـەرقی مـەو جـی ناحـەزی تـا نـەچێژی بـێ کەسـی و بـێ مەرکـەزی (١٩٦٨)

بیر،کە، تا کەی قەت ئەتۆ کەشتی نەجات چـاو لەکاڵـەو خەرقەناکـەی تـۆ، چ کـات (١٩٦٩)

گـەر لەغـەرقابی فـەنا، مـای ناتـەوان تـۆ دەکـەی تیکـرار (ظلمنـا ) زۆر چـەلان (١٩٧٠)

دێو کوتی لەو شەخسی خام، چاک کەن نەزەر لـەو خرووسـی بـێ محـەل، ببڕێـت سـەر (١٩٧١)

خـۆ لەفەرهـەنگی ئـەیاز بـوو زۆر بـەدوور نـوێژی وی بـی بێـت یـەک زەڕڕەقسـوور (١٩٧٢)

ئـەو خرووسـی جـوانی زوور ئاسـمان بـوو وەخـت و کـاتی خـۆی بوو،بانگی وی هـەموو (١٩٧٣)

**لەبارەی مەعنای ئەو حەدیسە کە( ارنا الاشیاء کما هی )ئەی خودا ئەشیا هەر چلۆن هەن هەروایان بە ئێمە نیشان بدە، و مەعنای ئەو فەرمایشەی حەزرەتی عەلی( کرم اللەوجهە) (لو کشف الغطاء ما ازددتِ یقینا ) ئەگەر پەردە و حیجـاب لـەپێش چـاوم لاچن یـەقینم زیاترنابێ، وقولە..**

در هر کە تو از دیدە بد، می‌نگری از چنبرە وجود خود می‌نگری ..

پایەکژ، کژ افکند سایە..

ئـەی خڕووسـان فێـرببن لـەو بانـگ دان بانـگ بـەخاتر خـوا دەداتـن ئـەو، نـە، دان (١٩٧٤)

سـوبحی کـازب دێ، فریـو نـا دات ئـەو سـوبحی کـازب عالـەمی بـاش و درەو (١٩٧٥)

عــەقڵی ناقیســیان هــەبوو ئــەهلی جیهــان — چــون جیهانیــان سـوبحی سـادق دی، ئــەوان (١٩٧٦)

ســوبحی کــازب کــاروان گــومڕا دەکــا — چــون بــەبۆی ڕۆژ، ڕوو دەڵای ســەحرا دەکـا (١٩٧٧)

ســوبحی کـازب خۆزگەقـەت ڕەهبــەر نــەبا — چــــون دەدا ئــــەو، زێـــدەکاروانان، بـــەبا (١٩٧٨)

ئـەی ئەسـیری سـوبحی کـازب قـەت ئـەتۆ — ســوبحی ســادق مــەگرەوەک کــازب درۆ (١٩٧٩)

تـۆ کەمــەحفووز نـی لـەدوو ڕوویـی و بـەدی — بۆ هەمان زەن، بۆ برای خۆت بووت، ئەدی؟ (١٩٨٠)

بــەدگومانی بــەر دەوامـــە، نـــا بـــەکار — وەسـفی پیسـی خـۆی دەدا نیسـبەت بـەیار (١٩٨١)

لای کەســانێک نابــەکارو زیــددی دیــن — ســاحیرو جـادوو گـەرن، گشـت مورسـەلین (١٩٨٢)

ئـــەو ئەمیرانـــەی خەســـیس و فێڵـــەباز — وا،گومانیــان بــوو، لەمــەڕ، حــوجرەی ئــەیاز (١٩٨٣)

گـەنجی زۆری کـرد ئـەیاز، دەو، دا، نیهــان — تــۆ لەئاوێنــەت، مــەنۆ ڕەکــەس، چ ئــان (١٩٨٤)

شا بەپاک بوونی ئـەیاز، هـەی بـوو، یـەقین — وایـدەکرد، چـون بـوو لـەوانـی دی، بـەقین (١٩٨٥)

شا بـەمیری کوت. وەکا، لـەو حـوجرە، دەر — .نیوەشـەو ئـەو دەم کـەبوو ئـەو بـێ خەبـەر (١٩٨٦)

تــا لــەبۆن ئاشــکار ببــێ ئــەفکاری وی — ئێمەپاشـــان چـــاک دەدەیـــن ئـــازاری وی (١٩٨٧)

دام بـــەئێوەچی لـــەوێ بـــێ زێـــڕو زێـــو — نامهـەوێ هـیچ، بـەس خەبـەر دەم وێـت لێـو (١٩٨٨)

زۆر پـەرێش دڵ بـوو کـەوایکوت، شـەهریار — بـــۆ ئـــەیازی بـــێ نـــەزیری نامـــدار (١٩٨٩)

ئــەو وتانــەی پڕجــەفام مــن کـرد بــەیان — چـــی دەبـــێ ئـــاخۆ ببیســـێ خـــۆی، ئــەوان (١٩٩٠)

ئـەو چەلـەش دەیکـوت بەحـەققی دینـی وی — زیادلـــەوەی بـــوو تاعـــەتو، تـــەمکینی وی (١٩٩١)

تـــا بەقـــەزفو، توهمـــەتم بـــێ شـــەرمەزار — یانـــەبێ ئاگـــا لەقەســـتی مـــن، چ جـــار (١٩٩٢)

موبتـــەلا گـــەر دیتـــی تـــەئویلاتی، ڕەنـــج — شـاد دەبـێ، نـابێ چ کـات، ئـەوماتی، ڕەنـج (١٩٩٣)

ســـا حـــەبی تـــەئویل، ئـــەیازی ســـابیرە — چـــون بەهـــەرچی عاقیبـــەت بـــێ، نـــازیرە (١٩٩٤)

چەشـنی یووسـوف خـەونی ئـەو زینـدانییان — ئەسـڵی تـەعبیری لـەلا بـوو، ئـەو عـەیان (١٩٩٥)

ڕازی خــەونی خــۆی، چلــۆن ســاڵح، نــەدی — ئـــەو کـــەدیتی ڕازی خـــەونی ئیـــدەدی؟ (١٩٩٦)

گـەر کو سـەت تیغ، لەو بـدەم بۆ ئیمتیحان — وەســـڵەتی نابێـــت کـــەم، ئـــەو میهرەبـــان (١٩٩٧)

چـون دەزانـێ مـن لـەخۆم بـەو تیـغ، دەدەم — ئـەو منـەو مـن ئـەو، جـودا نـین، لێک، چدەم (١٩٩٨)

**بەیانی ئیتتیحادی عاشق و مەعشووق لەڕێگای حەقیقەت ئەگەرچی موتەزادن لەو ڕێگایەکەنیاز زیددی بێ نیازیە، هەر وەکوو ئاوێنەکەبێ سووڕەتەو سادەیەو بێ سووڕەتی زیددی سووڕەتە، بەڵام دەحەقیقەت دا لەنێو وان دا، ئیتتیحاد هەیەکەشەرحی ئەو مەتڵەبەزۆر دوورو درێژە،و ( العاقل یکفیه‌الاشاره)..**

جیسمی مەجنوون چون لەلەیلا دوور بوو  تا گەهان بیمار و زۆر ڕەنجوور بوو (١٩٩٩)

خوێن لەشەو ق و عیشقی لەیلا هاتەجۆش  بوو بەدەردی دیفتری ئەو، زۆر، نەخۆش (٢٠٠٠)

هات تەبیب دیتی و، کوتی ئیجباریە  قەتعی ڕەگ دەرمانی ئەو بیماریە (٢٠٠١)

تا کو خوێنی پیس و بەد، لەو دەر کەوێ  ڕەگ بڕێکی باش و ماهیر هاتەوێ (٢٠٠٢)

باسکی بەست و نشتەرێکی گرتەدەس  زۆر بەتوندی جا کوتی ئەی خۆش نەفەس (٢٠٠٣)

بگرەموزدت مەبڕەلێم، ڕەگ، بۆ عیلاج  بش مرم، تەن زەڕڕەیەک نیتی ڕەواج (٢٠٠٤)

پێیدەکوت تۆبۆ دەترسی ئەی دلێر  تۆ کەناترسی دەجەنگەڵ دا، لەشێر (٢٠٠٥)

شێرو گورگ و، ورچ و، وەحشی و، گۆڕەخەر  کۆ دەبن دەگرن لەتۆ، شەو، دەو رو بەر (٢٠٠٦)

نایەبۆ وان هیچ لەتۆ بۆنی بەشەر  چونکەزۆرەعیشق و وەجدت نێو جگەر (٢٠٠٧)

گورگ و ورچ و شێر هەموو ناڵین لەعیشق  کەم لەسەگ، ئینسانی ناحاڵین لەعیشق (٢٠٠٨)

گەر ڕەگی عیشقی نەبایەسەگ ئەدی  بۆ لەبۆ ئەسحابی کاف، بوو موقتەدی؟ (٢٠٠٩)

هەن لەجینسی وی، سەگی دی، بێ ژمار  گەرچی هیچ کامیان نەیان بوو، ئیشتیهار (٢٠١٠)

تۆ لەقەلبی جینسی خۆت نەت برد، چ بۆن  بۆن لەقەلبی گورگ و مەڕ بۆت، دێ چلۆن؟ (٢٠١١)

عیشقەباعیس گەر جیهان پەیدا دەبوو  عیشقە، لات هات، نان و، تۆی لێ چا دەبوو (٢٠١٢)

عیشقەباعیس گەر بەتۆ گۆڕاوە، نان  نان دەنا ڕێگای نییەلای تۆ، چ ئان (٢٠١٣)

نانی مردوو عیشقەدەیداتێ گییان  ڕووحی فانی عیشقەدەیکا، جاویدان (٢٠١٤)

پێیدەکوت مەجنوون لەنشتەر نیمە، بیم  سەبری کێوی بەر، لەلای سەبرم عەدیم (٢٠١٥)

مەڵحەمم ئاسوودەنیم من، بێ برین  عاشقم دائیم، برینم هاو نشین (٢٠١٦)

ئەو تەنەم ئەمما بەلەیلا زۆر پوڕە  تەن سەدەف، پڕ بوو بەوەسفی ئەو دوڕە (٢٠١٧)

من دەترسێم تۆ کەخوێنم بەر بدەی  ناگەهان، لەیلا، وەبەر نشتەر بدەی (٢٠١٨)

عاقڵێکی قەلبی وی تابانییە  تێدەگا فەرقم دەگەڵ لەیلا نییە (٢٠١٩)

**مەعشووقێک لەعاشقی خۆی پرسی کەخۆت خۆشتر دەوێ یا ئەمن؟ جوابی داوەکە ئەمن لەخۆ مەوە مردوومە وبەتو وەزیندوومە، لەخۆم و سیفاتی خۆم، بوومەتە، فەنا، وبەتۆ**

**مەو جوودم و هەمە، عیلمی خۆم لەبیر چووە، وبەعیلمی تۆ عالم بوومە، قودرەتی خۆم لەبیر چووەو لەقودرەتی تۆ قادرو تەوانا بوومە، ئەگەر خۆم خۆش دەوێ، دەواقیع دا، تۆم خۆش دەوێ، وئەگەر تۆم خۆش دەوێ دەواقیع دا خۆم خۆش دەوێ ..**

یەک سەباح، مەعشووق کردی ئیمتیحان — عاشقی خۆی بێژە، پێم تۆ، ئەی فلان (۲۰۲۰)

بێژەتۆ زیاتر منت خۆش ویست یان — زێدەتر خۆت ویست ئەی بابی غەمان (۲۰۲۱)

پێیدەکوت من وا، لەتۆ دا بوو م عەدەم — من لەتۆ پڕبووم، لەسەر ڕا، تا قەدەم (۲۰۲۲)

هەر وجوودی زاهیریم من ماوە، بەس — نێو وجوودم تۆی فەقەت، ئەی خۆش نەفەس (۲۰۲۳)

وا لەتۆ دا من دەبووم فانی و عەدەم — وەک لەدەریای ئەنگەبین بێ، سرکە،کەم (۲۰۲۴)

چەشنی بەردێک، بێ بەلەعلی ناب، تەواو — پڕ ببێتن ئەو لەئەو سافی هەتاو (۲۰۲۵)

هیچ کەنامێنێ دەوێدا وەسفی بەر — ئەو لەوەسفی ڕۆژ دەبێ، پڕ، پشت و بەر (۲۰۲۶)

جا لەپاشان خۆی کەخۆش ویست ئەو بەرە — هەر هەتاو بۆی خۆشەویستەو سەر وەرە (۲۰۲۷)

گەر هەتاوی خۆش بوی بەدڵ و گیان — خۆشەویستی خۆی، خۆیەتی، خۆ، بێ گومان (۲۰۲۸)

جا، چ خۆی خۆش ویست لەعلی ناب،یا — ئەو هەتاوی ڕوون کەری دەشت و چییا (۲۰۲۹)

ئەو دوو عیشقەهەریەکن، لێک نین جییا — هەردوولا، تەوزیح دەدەن، بۆ ڕۆژ، زییا (۲۰۳۰)

پێش لەعل بوون، خۆی لەبۆ خۆی دوژمنە — چون لەوێ یەک من نییەئەو، دوومنە (۲۰۳۱)

چونکەکوێرە، بەردو، تاری یارییە — زیددی نوور تەنهاو بەس، هەر تارییە (۲۰۳۲)

کافرەبەر، گەر کوهەر خۆی، خۆش بوێ — چونکەناهێڵێ هەتاوی وێکەوێ (۲۰۳۳)

جا نەبوو لایق بڵێتن بەر، (ئەنا) — چونکەتارەو جێگەبۆوی بوو فەنا (۲۰۳۴)

فیرعەونی کرد ( اناالحق ) پەست و خوار — هەر (انا الحق ) کردی مەنسوور ڕەستگار (۲۰۳۵)

ئەو(انا)ی، فیرعەونی لەعنی خوای عەقەب — ئەو(انا)ی مەنسوور،لەدووی هات ڕەحمی ڕەب (۲۰۳۶)

بەردی ڕەش بوو فیرعەون، مەنسوور عەقیق — دوژمنی حەق فیرعەون، مەنسوور عەشیق (۲۰۳۷)

ئەو ( انا )( هو) بوو، لەوا قیع ئەی جەهوول — ئیتتیحادی نوور سەبەب بوو، نەک حلوول (۲۰۳۸)

وەسفی بەردی تۆ لەخۆت زۆر دووکەدوور — تاکو بەردت بێ بەلەعلێک، زۆر بەنوور (۲۰۳۹)

تۆ سەبوور بە، هەم لەڕەنج و هەم جیهاد — تا بەقات بێ نێو فەنا، گشت لەحزەشاد (۲۰۴۰)

وەسفی بەردیت، لەحزەلەحزە،کەم دەبێ — وەسفی لەعلیت، تۆ گەلێک، محکەم دەبێ (۲۰۴۱)

وەسفی هەستی زاهیریت دەڕوا عەدەم — وەسفی مەستی دڵ دەبێ زیاد، دەمبەدەم (۲۰۴۲)

خۆت بەگوێ تەبدیل بکەئەی هووشیار — تا لەحەڵقەی لەعلی جوانیت، بێ گووار (۲۰۴۳)

چەشنی کەن کەن، لەو تەنەی خاکیت خاک هەڵقەنـــەتا دێتەدەســـتت ئـــاوی پـــاک (٢٠٤٤)

گــەر خـــودا لــوتفی بگـــا، ئـاوی مــەعین دێ بـــەبێ هەڵقەنـــدنی خـــاکی زەمـــین (٢٠٤٥)

کـار، بکـەتۆ، نـەت بـێ بـۆ ئـەو، ئینتیـزار خـاکی چاڵ، جا، لادەکـەم کـەم، بـۆ کـەنار (٢٠٤٦)

هـەرچی، ڕەنجی دیت گـەنجی کـەو تـەدەس بـــەهرەنابا، تـــا نـــەکا کۆشـــش، چ کـــەس (٢٠٤٧)

بەو ڕکووع و سـەجدە، بـەر دەرگای وەدوود کـوت نـەبی لێدانـە، بـەس زەنگـی وجـوود (٢٠٤٨)

هــەر کەسـێ، زەنگـی سـەرای خـوا، لـێ بـدا گـــەو ڕەیـــی ســـەر دەر دەخـــا لـــەو بارەگـــا (٢٠٤٩)

**هاتنی ئەو ئەمیری نەممام دەگەڵ عیددەیەک لەکار بەدەستان نیوەشەو بۆ کردنەوەی دەرکی حوجرەی ئەیاز ودیتنی کاڵەو خەرقەی هەڵاوەسراو، وگومان بردنی وان کەئەوەفێڵ و حیلەیەو وەسەت وگۆشەو کەناری حوجرەهەڵقەندن کەگومانیان لێدەکرا، وکەن کەن هینان و دیوار کون کردن وهیچ شت پەیدا نەکردن، و خەجاڵەت و شەر مەزار بوون ..هەر وەکـوو بـەد گومانـــان و خـــەیاڵ پـــەر دازان لـــەبارەی کـــاری ئـــەنبیا دەیـــان کـــوت کەئەوانەساحیرن وجاهو مەقام تەڵەبن، کەلەپاش تەحقیق و تەفەحوس خەجاڵەت و، شەرمەزار دەبن ..**

ئـەو ئـەمینان چوونـەلای حـوجرەی ئـەیاز بێننـــەد ەس تـــا گـــەنج و زێـــڕی دڵخـــوواز (٢٠٥٠)

مـــاهیرو زانـــا بەفـــەن چەنـــدین نەفـــەر بـوون خـەریک، تـا واز بکـەن ئـەو قفڵـی دەر (٢٠٥١)

چونکەئـــــەویان قفڵـــــەکی پیچیـــــدەدی مونتەخــەب بـــوو ئـــەو لـــەنێو قفڵـــی دەدی (٢٠٥٢)

ئەو لەبەر خیسسـەت نـەبوو وای کـرد ئەگـەر بەڵکەلـەو ڕازتـاکو نـەی بـێ کـەس، خەبـەر (٢٠٥٣)

چـــون دەکـــەن قـــەومێک خـــەیاڵی نـــاڕەوا قەومـــەکی دیـــش پـــێم دەڵـــێن ئـــەهلی ڕیـــا (٢٠٥٤)

چـون لـەلای ئـەهلی کـەماڵ، ئەسـرارِی گیـان چـــاکترەون بـــێ لەخـــەس، تـــا لـــەعلی کـــان (٢٠٥٥)

زێـــڕ لـــەڕووح زۆر باشـــترەلای ئەبلـــەهان زێـــڕ دەکـــەن ئـــەمما، نیسـاری گیـان، شـــەهان (٢٠٥٦)

حیرسـی زێـڕ کـردی بـەوان، بـێ حـەد پەلـە عـەقڵی وان دەیکـوت هـەتان بـێ، حـەو سـەلە (٢٠٥٧)

لای سـەراب، ئاز پێت دەڵـێ، تۆ تونـد هـەڵێ چـــاک بنـــۆڕە، ئـــاو نییـــە، عاقـــڵ دەڵـــێ (٢٠٥٨)

چیرەبـوو ئـاز، زێـڕ کـەبوو چەشـنی گیـان نارەتـەی عـەقڵیش نیهـان بـوو ئـەو زەمـان (٢٠٥٩)

زێـــدەبوون جـــا، ئـــاز هـــەم غـــەوغایی وی ون دەبـــوو جـــا، حیکمـــەت و ئیمـــایی وی (٢٠٦٠)

تـا کـو ئـەو دەم کەوتـەنێو چـاڵی غـروور جـــا دەبیســـێ لـــەومی عاقـــڵ بـــێ قســـوور (٢٠٦١)

موبتـەلا، نـەی مـا غـروور گـەر هـیچ لـەبۆی نەفسـی لـەووام ئـەو دەکـا یەخسـیری خـۆی (٢٠٦٢)

تـــا بـــەدیواری بـــەلا، ســـەردا نـــەدات پەندی دڵ، ئەو گوێی کەڕی، نابێی، چ کات (٢٠٦٣)

چونکەخۆشـــەلای منـــاڵ هـــەڵواو شـــەکەر — پەنـــد نابیســـێ لەخـــەڵکی هـــەم پـــدەر (٢٠٦٤)

گەر شرووع بێ، ئێش و ئەو بێ، دەرد مەند — هـەردووگوێی وی وازدەبـن بـۆ وەعـز و پەنـد (٢٠٦٥)

حوجرەیان واز کرد بـەحیرس و سـەت هـەوەس — چوست و چالاک ئەو دەمی، ئەو چەند کەس (٢٠٦٦)

چوونـــەنێو حـــوجرە، حەریســـانی دەنـــێ — چەشـــنی گیانـــدارانی زۆر، نێـــو بـــۆ گـــەنی (٢٠٦٧)

دێنـــەنێو دۆ، زۆر بەعیشـــق و کـــەڕڕو فـــەڕ — هـــیچ کـــەناخۆن و، دەبەســـرێ بـــاڵ و پـــەڕ (٢٠٦٨)

ئـەو ئـەمیران ڕاسـت و چـەپ نۆڕیـان تـەواو — خەرقەیـــەکیان، دیـــت و دوو کاڵـــەی، دڕاو (٢٠٦٩)

ئەو چەلەش کوتیان کەزێڕ زۆر لێرە، هەس — کاڵەلێرەهـــەر فەقـــەت ڕوو پووشـــە، بـــەس (٢٠٧٠)

هەستەبێنەزێدەســـــیخی تیـــــژ نـــــووک — ئیمتیحان کە، جا کەلێنان، چوست و سووک (٢٠٧١)

خـــاکی ئـــەتراف و، وەســـەتیان ڕا، دەکـــرد — قوولکەهـــەم کەنـــداڵی قوولیـــان چـــا، دەکـــرد (٢٠٧٢)

قوولکـەکان بانگیـان دەکـرد جـا ئـەو زەمـان — ئـــەی گـــەنیوان ئێمـــەخاڵین گشـــتمان (٢٠٧٣)

زۆر پەشـیمان بـوون، لـەو کـاری چەپـەڵ — قوولکـەکانیان پـڕ لـەخۆڵ کـرد، وەک هـەوەڵ (٢٠٧٤)

گشـــتیان لا حەولـــەیان بووســـەر زەبـــان — تـــەیری حیرســـی وان،نـــەی بـــوو جـــا، چ دان (٢٠٧٥)

ئـــەو زەلال و گـــومڕەهی وان نابـــەکار — بـــوون بەقوولکـــەی ژووری حـــوجرە، ئاشـــکار (٢٠٧٦)

نـەی دەتـوانی سـواغ، کـە قوولکان ون بکات — پێی نەدەکرا، لەو ئـەیاز فێڵ، کەس، چ کات (٢٠٧٧)

گـەر دەدەن خۆیـان نیشـان بـێ هـیچ گونـاه — عەرســـەهەم دیـــوار لەســـەر وانـــن، گـــەواه (٢٠٧٨)

هاتنـــــەوە، ئـــــەوجارەبۆ لای شـــــەهریار — پـــڕ لـــەتۆزو ڕەنـــگ زەردو، شـــەرمەزار (٢٠٧٩)

**گەڕانەوەی نەمامان لەحوجرەی ئەیاز بۆ لای شا، بەتۆربەی خاڵی و خەجاڵەت، وەک بەدگومانان لەبارەی ئەنبیا علیهم السلام.. کاتی ظهووری بەڕا ئەت وپاک بوونیان (یوم تبیض وجوه و تسود وجوه) وقوله ( وتری الذین کذبوا علی الله وجوههم مسوده ) ڕۆژێک دێ کـەگرووهێک ڕوویـان سـپی وگرووهێـک ڕوو ڕەش دەبـن ..ڕۆژی قیامـەت کەسانێک کەدەبارەی خوداوەند درۆیان کوتووەدەبینی کەڕوو ڕەڕەشن ..**

شـا کـوتی بێـژن بـەمن دەی، چۆنـەحاڵ؟ — مـــن لـــەزێڕ، هەنبانـــەتان دیـــتم، بـــەتاڵ (٢٠٨٠)

زێـڕو زێوتـان گـەرکو پنهـان کـرد ئـەدی — مـــن لـــەئێوەم شـــادمانی بـــۆ نـــەدی؟ (٢٠٨١)

گـــەر چـــی نابینرێـــت ڕیشـــەی ڕیشـــەدار — حـاڵی ڕیشـەی، بـەس گـەڵا کـرد ئاشـکار (٢٠٨٢)

هـەرچی خـواردی ڕیشـە، قـەن بێ، یـا نـەژار — لـــک بـــەهاوار، ئـــەو دەکـــاتن ئاشـــکار (٢٠٨٣)

ڕیشـەگەر نـەی بێـت هـیچ تـاب و تـەوان — بۆ لەسەر لک هەن، گەڵای وا شین و جوان؟ (٢٠٨٤)

گـــەر بـــەقوڕ بکـــرێ زبـــانی ڕیشـــە، مـــۆر — لـک کەدەسـت و پـێن، دەبـن شـاهید، بـەنۆر (٢٠٨٥)

ئـەو ئـەمینان عوزرییـان ویسـت لایـی شـاه ‏ چوونەسەجدەچەشـنی سـێبەر لایـی مـاه (٢٠٨٦)

عوزرییـان ویسـت لـەو وتانـەی نـا لـەبار ‏ کفن و شیریان برد و، چوون لای شەهریار (٢٠٨٧)

قامکی خۆیان گەست لەشەرمان گشت ئەوان ‏ یەک بەیەک کوتیان کەئەی پاشای جیهان (٢٠٨٨)

گـەر برێـژی خوێنمـان لێـت بـێ حـەڵاڵ ‏ گەرکو، بش بەخشی، دەدەی نیشان، کەماڵ (٢٠٨٩)

لایقـــــی خۆمـــــان، ئێمـــــەکرد،کار ‏ چـی دەفـەرمووی ئێستەتۆ، ئـەی شـەهریار؟ (٢٠٩٠)

گەرببەخشـی جورممـان ئـەی شـەهریار ‏ ڕۆژ وەکوو خۆی ڕوونە، شەو وەک خۆیی تار (٢٠٩١)

گـەر ببەخشـی نـا ئومێـدی چـۆ کـەنار ‏ گەر نەبەخشی گیان فیدات ئەی شەهریار (٢٠٩٢)

شـا کـوتی ناکـەم ئـەمن قـەهرو نـەواز ‏ هـەرچی کـردی بـا بکـا، هـەر خـۆی، ئـەیاز (٢٠٩٣)

**حەواڵەکردنی شا، قەبووڵ و تۆبەی نەممامان وحوجرەواز کەران وسەزادانی وان بەئەیاز..**

**چونکەئەو جینایەتەبەزیانی ئابڕو و شەخسییەتی وی ئەنجام دراوە..**

چونکـە ئـەوجور مـەزیانی وی بـوو وە ‏ زەر بەتێکـە زۆر قـەوی لـەو خـۆش خـوو وە (٢٠٩٤)

گەرچی ڕووحمان گەڵ ئەیاز،یەک بوو، نەدوو ‏ لـەوزیان و سـوودە، هـیچ سـەهمم نـەبوو (٢٠٩٥)

بەندەیـەک بـێ موتتەهـەم بـۆ شـا، چ عـار؟ ‏ حیلمـی شـا جێگـای ئومێـد، بـۆ نابـەکار (٢٠٩٦)

عەبـدەکی مـوجریم دەکـا قـاڕوون، شـاه ‏ چـی دەدا، ئـاخۆ، بـەوەی نـەی کـرد گونـاه؟ (٢٠٩٧)

وا مـەزان، نـازانێ شـا، کـاری چ کـەس ‏ مـانعی ئیزهـاری ئـەو کـار، حیلمەبـەس (٢٠٩٨)

کـێ دەبـێ شـافیع لەحاسـتی عیلمـی وی ‏ بـێ موحابـا بێـژە، ئـیللا حیلمـی وی؟ (٢٠٩٩)

حیلمـــی وی باعیس،گوناهـپەیـــدا دەبـــێ ‏ چـۆن لەترسـی وی دەنـا، ئـەو، چـا دەبـێ؟ (٢١٠٠)

خـوێنی جـورمی نەفسـی قاتـڵ، عوهـدەدار ‏ چەشـنی خزمـان، حیلمـی زاتـی کردگـار (٢١٠١)

حیلمی وی بـوو کـردی نەفسـی ئێمەمەسـت ‏ جـا کـڵاوی وی ڕفانـد، شـەیتانی پەسـت (٢١٠٢)

دڵ شـەرابی حیلمـی وی نـەبوا، ئەگـەر ‏ چـۆن فریـوی دێـوی دەخـوارد، بولبەشـەر؟ (٢١٠٣)

کـێ بـوو ئـادەم کـاتێ عیلمـی دا مەلـەک؟ ‏ شـارەزاو زانـا بـەعیلمان، یـەک بەیـەک (٢١٠٤)

چون شەرابی حیلمی خوارد ئەو نێو بەهەشت ‏ دێـو بـەفێڵێک کـردی ڕوو زەر،کەوتەدەشـت (٢١٠٥)

ئـەو بـەلا دووڕانـی تـەعلیمی خـودا ‏ چوسـت وزیـری و عیلمـی زۆریـان پێـدەدا (٢١٠٦)

حیلمی وەک ئەفیوونی بێ حەد سەختی وی ‏ دز دەبـا بـۆلای لیبـاس و ڕەختـی وی (٢١٠٧)

بـۆ پـەنا، ویسـتی عـەقڵ حیلمـی خـودا ‏ بگرەدەسـتم تـۆ شـەڕابت پـێم دەدا (٢١٠٨)

**فەرمان دانی شا، بەئەیاز کەلەعەفوو، ,موکافات یەکێک ئیتیخاب بکە، چونکەلێرەدا لەعەدڵ و لوتف هەرچی بیکەی سەحیحە و دەهەریەک لەو دووانەدا زۆر مەسڵەحەتی تێدایە، کەدەعەدڵ دا هەزار لوتف هەنە(ولکم فی القصاص حیواه ) ئەو کەسەی کەقیساسی پێ باش نییە فەقەت حەیات و زیندەگی قاتڵی دەنەزەردایە، ونانۆڕێتەحەیات و زیندەگی سەدان هەزار بێ گوناه، کەمەو ریدی زوڵم و تەجاوز قەرار دەگرن ..**

دادگاهی موجریمان کە، ئەی ئەیاز ئە ی ئەیازی پاکی ئەهلی ئیحتیزاز (٢١٠٩)

بت کوڵێنم گەر دە دوو سەد جار نێو عەمەل لە و کوڵینەت کەف دەبینم دوور لە غەل (٢١١٠)

بوون خەجوول عالەم بە ئازموون بێ زمار ئازموون هەرچی هەبوون، لێت شەرمەزار (٢١١١)

بەحری بێ پایانەک هەر عیلمەبەس ئەو دووسەت کێو زیندە، نەک هەرحیلمەبەس (٢١١٢)

پێیدەکوت تۆ، پێت عەتا کردم،کەماڵ نیمەخۆم، خۆ غەیری خەرقەو کاڵە، ماڵ (٢١١٣)

بۆیەئەحمەد مەتڵەبی وا کرد ئەدا هەر چی ناسی خۆی، یەقین ناسی خودا (٢١١٤)

خەرقەکەی تۆ خوێنی تۆ، کاڵەت مەنی مابەقی، دای پێت خوداوەندی غەنی (٢١١٥)

دای بەتۆ حەق، بت هەوێ، ئێدی هەتا تۆ مەڵێ نەی ماوەغەیری ئەوهە، لا (٢١١٦)

پێت دەدا نیشان چەن سێو باغەوان تا کو میوەو داری مێو، لێت بێ عەیان (٢١١٧)

لۆچەگەنمێکی نیشان کرپار دا تا بزانێ چی دەنێو حەمباردا (٢١١٨)

بۆیەئوستاد مەتڵەبێک تەوزیح دەدا عیلمی زۆری وی بناسی تۆ هەتا (٢١١٩)

گەر بڵەی تۆ هەر ئەوەندەی بوو و، بەس دوور دەکا تۆ، وەک لەڕیشی خۆیی خەس (٢١٢٠)

ئەی ئەیاز ئێستاکەداد ئیجرا بکە لەو جیهانەدادی حەق بەر پا بکە (٢١٢١)

موجریمانت لایقن گشت بۆ نەمان حیلم و لوتفت مەتعەمی وان، بۆ ئەمان (٢١٢٢)

تا عەیان بێ ڕەحمەغاڵب یا غەزەب؟ ئاوی کەوسەر غاڵبەیا خێر لەهەب؟ (٢١٢٣)

تا درێژ بکرێن فەقەت لای وی دوو دەست حیلم و قەهری هەر دوو بوون ڕۆژی ئەلەست (٢١٢٤)

بۆیەئەو لەفزی ئەلەستی موستەبین نەفی و ئیسبات بوون دەلەفزێک دا، قەرین (٢١٢٥)

چونکەئیستیفهامی وی ئیسبات بوو لەفزی لەیسەش، دەو، نیهان و مات بوو (٢١٢٦)

بەسکەلەو باسەبێ با، نا تەمام دامەنێ جامی خەواس، سەر خوانی عام (٢١٢٧)

لوتفو قاری وەک سەباوو، وەک وەبا قار ئاسن کێشە، لوتفیش کارەبا (٢١٢٨)

ڕاستان لای ڕاس دەبا پەر وەردگار باتڵان لای خۆی دەکێشێ نا بەکار (٢١٢٩)

مەعدەهەڵواخوازەگەر هەڵوائیە مەعدەسر کەخوازەگەر سەفرائیە (٢١٣٠)

جێـی گـەرم سـەرما، لـەجالیس لا دەبـا | سـار، کـەبێ، گـەرما لـەجالیس لا دەبـا (٢١٣١)
دیتنـی دۆسـت دێنـێ بـۆ تـۆ، حـوب، یـەقین | دیتنـی دوژمـن لـەبۆت دێنێـت کـین (٢١٣٢)
زوو دە، ئەنجام ئەی ئەیاز، ئەو جوورە، کار | چونکەنـەوعێک ئینتیقامـەئینتیزار (٢١٣٣)

**دەستوور دانی شا، بەئەیاز کەزوو ئەو داوەری و قەزاوەتە، ئەنجام بدا وتەرەفی موقابیل مونتەزیر نەهێڵێتەوەوبەوەختێکی دیکەی وا گوزار نەکا، چونکەئینتیزار مەرگی سوورە، وجواب دانەوەی ئەیاز بەشا ..**

دەیکوت ئەی شا ئەمری تۆ فەرمانەبەس | نووری ئەستێرەی نەدی لای ڕۆژ، چ کەس (٢١٣٤)
کـوا عوتاریـد یانەئەسـتێران تـەواو | دێـن دەکـەن ئیزهـاری خۆیـان، لای هـەتاو؟ (٢١٣٥)
دڵـق و خەرقـەم گـەر وەلانـا بـا، ئـەمن | سەر سەزەنیش دەکرام وەها،کەی جا، ئەمن؟ (٢١٣٦)
بـۆچی قفڵـم مـن لـەدەرکی حـوجرەدا | لای سەدان شەخسی حەسوودی بەد ئەدا؟ (٢١٣٧)
دەسـتی خۆیـان بـرد، بـۆ نێـو ئـاوی جـۆ | سـندەگڵیان کـرد لـەنێو ئـاو جستو جـۆ (٢١٣٨)
کـوا لـەنێو ئـاو سـندەگڵ پەیـدا دەبـێ؟ | کـوا شـەڕی ماسـی دەگـەڵ ئـاو، چـا دەبێ؟ (٢١٣٩)
وا دەزانـن مـن بـەدم، ئـەهلی جـەفا | گـەر چـی بـێ حـەد شـەرمەزارە، لـیم وەفـا (٢١٤٠)
گـەر نەبایەزەحمـەتی نـا مـەحرەمان | چەنـد حـەرفێک بـۆ وەفـا دەمکـرد بـەیان (٢١٤١)
چونکەشـوبهان چـا دەکـەن خـەڵکی جیهـان | فـەوقی زاهیـر مـن دەکـەم مەتڵـەب بـەیان (٢١٤٢)
خـۆ ت کەبشـکێنی بـەکاکـڵ بـی بـەدەل | دێتـەگوێت داسـتانی شـیرین وەک عەسـەل (٢١٤٣)
گـوێز کەپێسـتی بـێ دەگـەڵ،د ەیبـێ سـەدا | ڕۆن وکاکـڵ بـێ سـەدان و بـێ هـەرا (٢١٤٤)
دەنگی وانی گوێ نەبیست،هیچ کات و ئان | دەنگـی وانـی بیس،فەقـەت گـوێی دڵ، نیهـان (٢١٤٥)
دەنگـی خۆشـی مـەغزو کاکـڵ گـەر نـەبا | نەی دەبیست هیچ گوێ، لەهیچ پێستێک سەدا (٢١٤٦)
دەنگـی پێسـتت بۆیـەتۆ مەقبووڵـە،لا | تـا بـەکاکڵ تـۆ بگـەی، بـێ هـیچ سـەدا (٢١٤٧)
مـا وەیـەک تـۆ لێـوو، گـوێ بـێ کـار بکـە | چەشنی لێو، جا،گەڵ عەسەل خۆت یاربکە (٢١٤٨)
تـۆ خـەریکی قیـل و قـال بـووی زۆر، بەساڵ | ڕۆژەکیش بـۆ ئیمتیحـان تـۆ، خـۆت کـە، لاڵ (٢١٤٩)

**حیکایەت لەبارەی ئەو مەتڵەبەدا کەزۆر جار،باس وگفتو گۆمان ئیمتیحان کردووە، ما وەیەکیش با، سەبرو خامۆشی و بێ دەنگی ئیمتیحان بکەین ..**

تفـت و تاڵیـت ئیمتیحـان کـرد تـۆ، گـەلێ | ئیمتیحـان کـە، یـەک غـەزای شیرین، چـەلێ (٢١٥٠)
ڕۆژی مەحشـەر، بـۆ خەبـەر دار بوونەبـەس | گـەر یـەکێک نامـەی ڕەشـی دەدرێتـەدەس (٢١٥١)

| | | |
|---|---|---|
| سەر ڕەشە، هەر چەشنی نامەی تازییە | پڕ گوناهە، نێوی نامەو حاشییە | (١٢ |
| پڕ لەفیسق و مەعسییەت پڕ کەڕبە، ئەو | پڕ لەکفرە، چەشنی دارەلحەڕ بە، ئەو | (٥٣ |
| نا مەیێکی پڕ پەلیدی و پڕ هەراس | دەستی چەپ دەگرێت ئەو، نەک دەستی ڕاس | (٥٤ |
| بێنەبەرچاو کارنامەی خۆت ئەتۆ | لایقی دەستی چەپەیاراستە، خۆ؟ | (٥٥ |
| کەوش و چەکمەی لاقی چەپ خۆ، نێو دوکان | تۆ دەزانی بۆ چەپن پێش ئیمتیحان | (٥٦ |
| گەر نەبی تۆ ڕاس، چەپی تۆ، بێ گومان | دەنگی شێر و دەنگی مەیموون لێک جودان | (٥٧ |
| ئەو کەسەی گوڵ زێدەخۆشبۆ و، جوان دەکا | فەزڵی وی چەپ ڕاست و بێ نوقسان دەکا | (١٥٨ |
| ئەو دەدا راستی بەگشت چەپیان، یەقین | ئەو بەدەریایان دەدا، مائی مەعین | (١٥٩ |
| گەر چەپی تۆ، ڕاس ببە،گەڵ خوای جیهان | تا ئەوانی لوتفی ویت بێ، لێ عەیان | (١٦٠ |
| پێت ڕەوایەنا مەیەک وا، پەس مەگەر؟ | بێتەدەستی ڕاس، لەدەس چەپ،بێتەدەر؟ | (١٦١ |
| نامەیێکی هێندەپیس و، نا لەبار | چۆن دەبێ بگرێ لەدەستی ڕاس قەرار؟ | (١٦٢ |

**لەبارەی ئەومەتڵەبەکەکەسێک قسێک دەڵێ کەحاڵ و وەزعی وی موناسبی ئەو قسەو ئەو ئیددیعایەنەبێ، هەر وەک کافران (ولئن سئلتهم من خلق السموات والارض ليقولن الله ) خزمەت کردن بەبوتی بەرد، وگیان وزێڕ فیدای وی کردن کوا موناسبی ڕووحێکەکەدەزانێ خالقی ئاسمان وزەمین وجەمیعی مەخلووقات خودایەکە، کەدەبیسێ و دەبینێ وحازرو ئاگادارەوموسەللەت و غەیوور .. الی اخره..**

**خولاسەی داستان ..**

یەک نەفەر بەزاهیر زاهید، ژنێکی بەغیرەت و کەنیزێکی بێ حەد جوانی هەبوو. ژن بەشوویەکەی ئیعتیماد نەبوو هیچ کاتێک ئەو ی دەگەڵ کەنیزەکەی بەتەنێ لەماڵ دا بەجێ نەدەهێشت تا کوڕۆژێک ژن دەگەڵ کەنیزەکەی چۆ حەمام ولەکاتی حەمام کردن دا، وەبیری هاتەوەکەتەشتی لەماڵێ لێ بەجێ ماوە، جا بەو خاترەبەکەنیزەکەی کوت زوو برۆ ماڵێ و تەشتی بێنە، کەنیز لەبیستنی ئەو قسەیەزۆر خۆشحاڵ بوو وزانی کەوەختی بەئارەزوو گەیشتنە، جا، بەپەلەخۆی گەیاندەماڵێ، و فەورەن دەگەڵ کابرا، یەکتریان دەباوەش گرت، بەڵام هەردووکیان بەعیللەتی غەڵەبەی شەهوەت لەبیر یان چوو کەدەرکەقائیم بکەن، لەو لاشەوە،لەناکاو، ژن بەفکری داهات کەئەوەچ،کارێک بوو کەئەمن کردم؟ بۆچی کەنیزم بەتەنها بۆ ماڵ نارد؟ ناکا دەستەگوڵێک بەئاو دا دا جا، بەسەرو وەزعێکی تووڕە، لیباسەکانی دەبەرکرد، وهەراسان و

پەرێشان بۆ لای ماڵ هات، و بەعەجەلە، لایەکی دەرکەی پاڵ پێوەنا، وبەتوندی چۆ نێو ماڵ، دەنگی بەستن و کردنەوەی دەرکە، ئەودووانەی خستەترس و وەحشەت، پیاوی فێڵباز بۆ شوێنەونکە، جێ بەجێ ڕوو بەقووبڵەڕاوەستا و وای نیشان دا کەنوێژ دەکا، بەڵام بەدەنی وی وەک دارەبی، دەلەرزی .ژن لەو وەزعییەتەغەیرەعادییەو لەرزینی شوویەکەی زانی کەکارێکی ناحەز ڕووی داوە، زۆر بەبێ ترسی وڕوو هەڵماڵاوی گۆشەی لیباسی کابرای هەڵداوە، دیتی کەلاق و ڕانی کابرا، غەرقی پەلیدی و کەسافەتن جا، زللەیەکی محکەمی لەکابرای هەوس باز دا، و بەجنێو دان پێیکوت تۆ مەگەر بەو وەزعییەتەپیس و پەلیدە، شایستەو شیاوی نوێژو پاڕانەوەی؟

زاهدێک هەیبوو ژنێک بێ حەد غەیوور | یەک کەنیزیشی هەبوو جوان، چەشنی حوور (٢١٦٣)
ژن لەغیرەت ژێر نەزەر خۆی گرت شوو | نەی دەهێشت بن، گەڵ کەنیزەک، دوو بەدوو (٢١٦٤)
ماوەیەک ژێر چاوی گرت ئەو دووانە، ژن | تا دەگەڵ یەکتر دەخەڵوەت دا، نەبن (٢١٦٥)
تاکو هات تەقدیرو حوکمی کردگار | ماوەسەر گەردان عەقڵی هووشیار (٢١٦٦)
گەر لەناکاو بێت حوکمی کردگار | عەقڵ دەڕوا، مانگ دەبێ، بێ نوورو، تار (٢١٦٧)
هاتەبیر ئەو ژن لەحەممام ناگەهان | ما، لە، ماڵ دا، تەشت، لەبیر یان چوو ئەوان (٢١٦٨)
بەو کەنیزەی کوت کەزووکە، زوو، بڕۆ | تەشتی زێو مان بۆ لەنێو ماڵ، بێنەتۆ (٢١٦٩)
وەختی بیستی وا، کەنیز بوو شادمان | چون دەبێ، واسڵ، بەئەرباب ئەوزەمان (٢١٧٠)
ئێستەئەرباب هەربەتەنهایە، لەماڵ | توند دەڕۆی بۆ لایی ماڵ زۆر خۆشحاڵ (٢١٧١)
ئارەزووی کۆنی کەنیز بوو بچتەماڵ | غەیری ئەرباب، ماڵ لەگیانداربێ بەتاڵ (٢١٧٢)
توند دەڕۆی بۆ لایی ماڵ ئەو چوارناڵ | دی کەئەرباب هەر بەتەنها یە، لەماڵ (٢١٧٣)
وا لەبۆ شەهوەت ئەوان دوو بوون ئەسیر | گاڵەدانی دەرکەیان، چوو بوو لەبیر (٢١٧٤)
هەردوو یەکتریان لەباوەش گرت شاد | بوو ن بەیەک، دوو ڕووح،خۆیان چوو لەیاد (٢١٧٥)
جا لەناکاو، ژن وەها کردی خەیاڵ | ئەو کەنیزەم، ئێستەمن، بۆ ناردەماڵ؟ (٢١٧٦)
من بەدەستی خۆم پەنبەم خستەنار | من بەرانم کرد لەمەڕ، بۆ خۆم سووار (٢١٧٧)
شوشتی خۆڵ و چوو بەدووی وی دا، بەغار | چارشێوی جار لەسەربوو جار لەخوار (٢١٧٨)
ئەو لەعیشقی گیان هەڵات و، ژن لەبیم | فەڕقی عیشق وفەڕقی بیم بوو، زۆر عەزیم (٢١٧٩)
دەچنەلای شا، عارفان گشت کات و ئان | زاهیدا ن سستن لەڕێگا، کەم تەوان (٢١٨٠)
گەرچی زاهید گەو ڕەیەو شا یستەکار | کوا دەبێ یەک ڕۆژی وی، پەنجا هەزار؟ (٢١٨١)

ئەرزیشی ڕۆژێک لەعومری پیاوی کار گەر بەساڵ تەخمین کرێ، پەنجا هەزار (٢١٨٢)

عەقڵ و ئەوهامی بەشەر لەو ڕازە، مان مات و حەیران و، زەعیف و ناتەوان (٢١٨٣)

بیم لەحاستی عیشق، بوو کەمتر لەموو بوون فیدای ئائینی عیشق، عالەم هەموو (٢١٨٤)

عیشق وەسفی خوایی سوبحان، بیم بەڵام وەسفی عەبدێک تالبی فەرج و تەعام (٢١٨٥)

ئەو دووانەت، خوێند لەنێو قورئان، خۆ هەم ( یحبون ) هەم ( یحبهم ) ئەتۆ (٢١٨٦)

عیشق و حوب وەسفی خودان هەردووکیان بیم نییەوەسفی خودا، زۆر لێک جییان (٢١٨٧)

کوادەبێ وەک وەسفی یەزدان وەسفی خاک؟ وەسفی حادیس کوادەبێ وەک وەسفی پاک (٢١٨٨)

گەر بەیان کەم شەرحی عیشق، من بەردەوام سەت قیامەت دێن و، ئەو هەرناتەمام (٢١٨٩)

چون قیامەت هەیتی بێ شک کات و حەد حەددو کاتی کوادەبێ وەسفی ئەحەد؟ (٢١٩٠)

عیشق، هەیتی باڵ،لەسەت زیاد،یەک بەیەک دا دەپۆشێ فەرشوعەرشوگشت فەلەک (٢١٩١)

زاهیدی خائیف بەغار دەڕوا بەپا عاشقان پەرواز دەکەن توند تر لەبا (٢١٩٢)

کوا دەگا خائیف بەتۆزوگەردی عیشق؟ ئاسمانی خستەژێر پێ، دەردی عیشق (٢١٩٣)

یا مەگەر بۆی بێ عینایەت لای خودا لەو جیهانەو حاڵە، تۆ خۆت کەجودا (٢١٩٤)

خۆت نەجات دەتۆ لەخود خواهی و غروور گەییەلای شا، چونکەشابازی غەیوور (٢١٩٥)

لەو، وتەم مەقسوودەجەبرو ئیختیار غەیری ئەو دوو دانەبوو، خۆ جەزبی یار (٢١٩٦)

ژن کەگەییەماڵ و دەرکەی کردەوە دەنگی دەرکە، هەردوو، بیستیان پێکەوە (٢١٩٧)

ئەو کەنیز، هەستاوەلەو حاڵەی درێژ پیاو هەڵستاو ڕا دەوەستا، بۆ نوێژ (٢١٩٨)

ژن کەنیزی دیت، شێواو حاڵ بوو بێ سەداو سەر کەش، بەچەشنی لاڵ بوو (٢١٩٩)

دی کەشووی وێستاوەلەنوێژ دا بەتەرز کەوتەشک ژن کاتێ دی لەو، لەرزەلەرز (٢٢٠٠)

دامەنی شووی خۆی وەلانا بێ خەتەر دی کەئالوودەی مەنین، بەیزەو، زەکەر (٢٢٠١)

لەو زەکەر دەتکاوەپاشماوەی مەنی ڕان وچۆکی دین، کەپیس بوون، ئەو دەنی (٢٢٠٢)

زللەیێکی محکەمی دا، لەو دەنی پیاو دەنوێژ دا، چۆن دەبێ وا بێ، گونی؟ (٢٢٠٣)

لایقی نوێژ کوا دەبێ وابێ زەکەر؟ ڕان و دەسگای هێندەپیس و پڕ قەزەر؟ (٢٢٠٤)

نامەیەک وا پڕ لەزوڵم وکین کرێ کوا ڕەوایەئەو وەدەستی ڕاس درێ؟ (٢٢٠٥)

گەر سوئال بکرێ لەکافر، ئاسمان کێ ئەوی چاکرد و چاکی کرد جیهان؟ (٢٢٠٦)

ئەو دەڵێ چابوون بەدەستی خوای جەلیل خیلقەتی عام، بۆ خودایی وی دەلیل (٢٢٠٧)

کفروفیسق و، زوڵمی بێ ئەژماری وی کوا موناسب بوو لەگەڵ ئیقراری وی؟ (٢٢٠٨)

کوا لەگەڵ ئیقراری وا ڕاست و سەحیح  بوون موناسب هێندەکرداری قەبیح؟ (٢٢٠٩)

کاری وی تەکزیب دەکا گوفتاری وی  ئەو بەدەرد لایق دەکا کرداری وی (٢٢١٠)

ڕۆژی مەحشەر گشت نیهان پەیدا دەبن  هەر بەخۆیان موجریمان ڕیسوا دەبن (٢٢١١)

دەست و پێ شاهید دەبن زۆر ئاشکار  سەر فەسادی وی لەلای پەروەردگار (٢٢١٢)

دەس دەڵێ وام کرد دزی، من زۆر جار  لێو دەڵێتن من وەهام کرد پرسیار (٢٢١٣)

پا دەڵێ جێی باسەفام، ژێر خۆ دەنا  جێی حەیا ئیزهار دەکا، کردم زینا (٢٢١٤)

چاو دەڵێ کردوومەمن غەمزەی حەرام  گوێ دەڵێ بیستوومەمن، ناحەز کەلام (٢٢١٥)

جا درۆ دەر هات لەسەر تا پایی وی  ئەو دەکەن تەکزیب هەموو، ئەعزایی وی (٢٢١٦)

تویژ کەبۆ قەلبانەمایەی ڕەو شەنی  گون،گەواهی دا، لەفێڵی ئەو دەنی (٢٢١٧)

وا بژی کارت بەبێ قەو لو زەبان  ئەشهەدی ئیمان بێ و، عەینی بەیان (٢٢١٨)

تا هەموو ئەعزای تەنی تۆ ئەی فلان  بینەشاهید هەم لەسوود دا، هەم زییان (٢٢١٩)

بەندەیەک گەرکو، وەدووی مەو لا کەوێ  یانی ئەمری سەر وەری خۆم، من دەوێ (٢٢٢٠)

تا مەکەت ڕەش کەی بەکاری بەد ئەگەر  تۆ، بە، تۆبە، کاری بەد لەو بێخەدەر (٢٢٢١)

گەر عومر کەم ماوەڕیشەی ئەو دەمە  تۆ، بە، تۆبەی ئاو دە، گەر کو، بێ نەمە (٢٢٢٢)

تۆ بەڕیشەی عومری خۆت دە، ئاوی ژین  تا کو داری عومری تۆ بێ سەو زو شین (٢٢٢٣)

کاری پێشووت چا دەبن جا، بێ کەمی  ژەهری کۆن شیرین دەبێ بۆت ئەو دەمی (٢٢٢٤)

سەییئاتی تۆ دەگۆڕێ کردگار  دەبنەتاعەت هەرچی پێشووت کرد،کار (٢٢٢٥)

تۆ ئەمێ تۆ بەی نەسووحی ئەی فلان  زۆر تەلاش کە، هەم بەجیسمت هەم گییان (٢٢٢٦)

شەرحی ئەو تۆبەی نەسووح لێم بلێ بێ  باوەڕیت پێشان کە، بوو، ئێستاش، بێ (٢٢٢٧)

**حیکایەت لە بارەی ئەو مەتڵەبەکەمەر وەکوو شیر کەلەمەمەک هاتەدەر دوو بارەکلێچەکەوتەوە مەمک، ئەو کەسەی کەتۆبەی نەسووحی کردبێ کات لەڕووی مەیل و ڕەغبەت فیکری تێکرلری ئەو گوناهەناکا،**

یەڵکەم لەحزەلەحزەنەفرەتی زیاتر دەبێ وئەو نەفرەتەدەلیلە بۆ ئەوەکەلەززەتی قەبووڵ بوونی تۆبەی دەس کەوتووە، ئەو ئارەزووو شەهوەتی ئەووەڵی بێ لەززەت بووە، و ئەو حاڵەتەی فیعلی لەجێگای حاڵەتی قەبلی قەراری گرتووە، فەرموویانە...

نبرد عشق را جز عشق دگر  چرا یاری نگیرد زو نکوتر؟..

وئەگەر دوو بارەقـەلبی وی بەگوناەموتـەمایل بێ دەلیلەلەسـەر ئەوەکەلـەززەتی قـەبووڵ بـوونی وەدەس نەکـەوتووە، و لـەززەتی قـەبووڵ بـوونی تۆبەلـەجێگای لـەززەتی ئەوگوناهـە، قـەراری نەگرتووە(سنیسرەلليسرى ) بەجێ نەهاتووە، لەززەتی (فسنیسرەللعسرى) لەجێی خۆی باقیە..

**خولاسەی داستان ..**

نەسووح پیاوێک بوو بەقیافەو هەیئەتی ژنانە، ئەو لەحەمامی ژنان دا کاری دەکرد و سەرشۆرو کیسەکێشی مەخسووسی کچی شا بوو و هیچکەس لەجینسییەتی واقعی وی خەبەر دار نەبوو، وزۆر لەمێژ ساڵ بوو کەئەو کارەی دەکرد و لەو ڕێگایەوەئیمرار‌ی مەعاش و ئیرزای شەهوەتی دەکرد گەرچی زۆر تۆبەی دەکرد بەڵام دوو بارەتۆبەی دەشکاند، ڕۆژێک نەسووح بۆ نەجات بوون لەو کارەناحەزەچۆڵای عارفێکی ڕەببانی وپێیکوت بۆمنیش دوعابکە، ئەو عارفەشەخسێکی دڵ ڕوون بوو بێ ئەوەکەداخوازی بپرسێ بەفەڕاسـەت تێگەیشت کەموشکیل و گرفتاری وی چییـە، یـانی لەقـەلبی وی ئاگـادار بـوو، بـەڵام وەڕووی نـەهینا، فەقـەت بزەیـەکی هـاتێ وکـوتی ئینشائەللا تۆبەت نەسیب دەبێ دوعای عارفەکە، قەبووڵ بوو، و ئەسبابی تۆ بـەی نەسووح بـەو جوورەئامادەبوو، ڕۆژێک نەسووح وەک هەمیشـەلەحەمامی ژنـان مەشغووڵی کاربوو، کەلـەناکاو سـەرو سـەدا بڵینـد بـوو و لـەنێو ژنـان جاڕیـان کێشا کـەیکێک لەمورواریـدەکانی گوارەی کچـی شاوون بـووە، دەرکی حـەمام ببەسـتن ونـەهێڵن هیچکـەس وەدەر کـەوێ، تـا لیبـاس و بوخچـەی حـازران بازدیـد بکرێ، بوخچەو لیباسان بەدیققـەت گـەڕان بـەڵام لـەو دانەمورواریدەخەبـەرێک نەبوو، بەناچار کوتیان هـەموو تـان بەتـەواوی ڕووت بن تـا یـەک یەکە، بیان گـەڕێین، نەسووح بەبیستنی ئـەو قسـەیە، بەتـەواوی حاڵی تێک چـوو بـۆ گۆشـەیەکی حـەمام خـزی دەحاڵێـک دا کەبەدەنی وەک دارەبی دەلەرزی، بەتەواوی وجوود ودڵێکی شکاو هاواری خودای کرد و کوتی خودایا، ئەگـەر چی زۆر جـار تۆبـەم شکاندووەبەڵام بـەخاتری مـەقامی ساتتاریت ئـەو چەلـەش ئەوکارەناحەزەی من دا بپۆشەتا لەوەی پاش وەدوای کاری نا حەز نەکەوم، نەسووح ئەوەنـدەی خودایا خودایا تیکرارکرد،کەدەرک و دیوار دەگـەڵ وی هاو سـەدا بوون لـەو کاتـەدا، نۆ بـەی گەڕان و بازدیدی نەسووح هات ژنێک بەنێو ئەوی بانگ کرد بـەڵام هـەر لەگـەڵکو نێوی خـۆی بیست لەترسان بەنـدی دڵی پسا، ولـەنێو حـەمام دا کەوتـەخوارێ و لـەهۆش چـوو لـەو کاتـەدا ژنێک بەدەنگێکی بڵیند کوتی .. مزگێنی مزگێنی، مورواریـد پەیدا بوو، لـەناکاو شـادی کەوتـەنێو حەمام، وژنان بەچەپڵەلێدان خۆشحاڵی خۆیان لەپەیدا بوونی مورواریـد ئاشکرا کرد،ونەسووح

لەکاتی شادمانی دا، وەهۆش هاتەوە، ودیتی کەخەتەر لەوی ڕابوردووە،وئەو ژنانەی کەنیسبەت بەوی بەد گومان بوون مەعزەرەتیان لێ خواست و ئەو دەو واقیعەدا، ئاشکرا لوتف و عینایەتی خوداوەندی دی، ئەوەباعیس بوو کەلەسەرتۆ بەی خۆی سابیت ماوە، وفەو رەن دەستی لەکاری خۆی کێشاوە، پاش چەند ڕۆژێک کەنەچۆ حەمام،کچی شا ئەوی بۆ کار کردن لەحەمامی ژنان دەعوەت کرد، بەڵام نەسووح جوابی داوەکەدەستم دێشێ وناتوانم کەمشت و ماڵ بکەم و ئیدی نەچوو ..

| | | |
|---|---|---|
| یەک نەفەر پیاو، نێو نەسووح بوو، زۆر لەپێش | ئەو لەحەمامی ژنان بووکیسەکێش | (٢٢٢٨) |
| سوورەتی وی بوو بەزاهیر وەک ژنان | پیاوەتی خۆی ئەو دەکرد ئەمما، نیهان | (٢٢٢٩) |
| کیسەکێش بوو ئەولەحەمامی ژنان | بۆ فریوو، مەکرو حیلە، زۆر زان | (٢٢٣٠) |
| کیسەکێش بوو بۆ ژنان ئەو زۆر ساڵ | هیچ کەسێ، حاڵی نەبوو لەو وەزع و حاڵ | (٢٢٣١) |
| وەک ژنانی، ئەو سەداو ڕوخسار بوو | شەهوەتیشی کامیل و بێدار بوو | (٢٢٣٢) |
| خۆی لەژێر چارشێو، ڕوو بەند کرد نیهان | ئەو کوڕەی شەهوەت پەرەستی نەو جەوان | (٢٢٣٣) |
| دەی شوتن بەو فێڵەئەو کیژانی شار | گشتی کیژی سەروەران و شەهریار | (٢٢٣٤) |
| زۆر کەرەت تۆبەی دەکرد، دەکشاوەپاش | نەفسی وی دەی کرد تۆبە، وردو خاش | (٢٢٣٥) |
| هات لەبۆ لای عارفێک ئەو بەد ئەدا | پێیدەکوت یادم بکە، وەختی دوعا | (٢٢٣٦) |
| ڕازی وی حاڵی دەبوو ئەو خۆش ئەدا | نەیدەکرد ئاشکار کەبووی حیلمی خودا | (٢٢٣٧) |
| لێوی قفڵەو قەلبی وی پڕ ڕازەخۆ | لێو خەمۆشەو، قەلبی پڕ ئاوازەخۆ | (٢٢٣٨) |
| عارفان نۆشیان، کەجامی کردگار | بوون بەڕاز، ئاگاو نەیان کرد ئاشکار | (٢٢٣٩) |
| گەر بەهەرکەس یاد بدەن ئەسراڕی کار | تا نەڵێ هیچ،مۆر دەکەن لەو، لێوو، زار | (٢٢٤٠) |
| پاش تەبەسسوم پێیدەکوت ئەی نا لەبار | لەو بەدان، تۆبەت بدا، پەر وەردگار | (٢٢٤١) |

**دەبارەی ئەو مەتڵەبەدا کەدوعای عارفی واسڵ، لەحەق، وەک ویستنی حەق لەخۆیەتی چونکە(کنت سمعا و بصرا ولسانا ویدا ) و قوله ( وما رمیت اذ رمیت ولکن الله رمی ) و ئایات و ئەخبارو ئاسار لەو بارەدا زۆرن،و شەرحی سەبەب سازکردنی حەق تا ئەو جێگایەکەگوێی خەرابکارەدەگرێ و دەی هێنێ تا واداری دەکا، بەتۆ بەی نەسووح ..**

| | | |
|---|---|---|
| ئەو دوعا ڕابرد لەحەوتەم ئاسمان | کاری ئەو بێچارەئاخیر بوو جووان | (٢٢٤٢) |
| چون دوعای شێخ وەک دوعای دی، با، نییە | گفتی وی ئی خوایەئیدی وا، نییە | (٢٢٤٣) |

گـــەر لـــەخۆی داوا بکـــاتن کردگـــار / کوا دوعـای خـۆی لادەنـێ ئـەو بـۆ کـەنار؟ (٢٢٤٤)

چای دەکرد جا، یەک سەبەب، سونعی ئیلاه / بـــەو نـــەجاتی دا، لەنـــەفرین و گونـــاه (٢٢٤٥)

ئەو دەمەی دەی کرد لەحـەممام تەشت پوڕ / لـەو کچـی شـا، ون دەبـوو یـەک دانـەدوڕ (٢٢٤٦)

گـــەو هـــەریکی گوارەکـــانی ون دەبـــوو / جستو جۆیـان کـرد ژنـان، جـا، زوو، بـەزوو (٢٢٤٧)

دەرکـەیان زۆر سـەخت و زۆر محکـەم دەبەست / بـۆ لیباسـیان بـرد، لەئـەووەڵ کـار، دەسـت (٢٢٤٨)

نێـو لیبـاس لـەو دوڕ گـەڕان، پەیـدا نـەبوو / دوڕ دزیـش یـەک زەڕڕە، هـەم، ڕیسوا نـەبوو (٢٢٤٩)

زۆر بەجیـددی جـا، گـەڕان، ئـەو چـەل ژنـان / زارو گـوێ یـان، هـەم کـەلێنو، قوژبنـان (٢٢٥٠)

گشـــت کـــەلێنی ژێـــروژوورو دەو رو بـــەر / جســتوجۆیان کـرد، کەگـەو هـەر بێننـەدەر (٢٢٥١)

وا دەهات دەستوور کە ڕووت بن ئەی ژنان / ئێـوە هـەرچی هـەن، چ پیـر بـن یـا جـەوان (٢٢٥٢)

حاجیبـە ئـەودەم گـەڕا، یـەک یـەک ژنـان / تـا پـەیاکا، گەوهـەری بـێحـەد جـووان (٢٢٥٣)

جـا، نەسـووح ترسـاو لـەبۆ گۆشـێک خـزی / لێـو کـەبوود، ڕوو زەر لەترسـان، وەک دزی (٢٢٥٤)

مـەرگی خـۆی ئـەودەم بـەچاوی خـۆی دەدی / ڕۆی دەلـــەرزی ئـــەو بەچەشـــنی دارەبـــی (٢٢٥٥)

دەیکوت ئەی ڕەب ڕووم لەتۆ کرد، زۆر جار / مـن شـکاندم زۆر کـەڕەت عەهـدو قـەرار (٢٢٥٦)

زۆر کـــەڕەت کردوومـــەکاری نالـــەبار / تـا کوبـۆم، سـێڵاوی وا ڕەش هاتـەخوار (٢٢٥٧)

گـەرکو، بێـتن نۆبـەتی مـن بـۆ گـەڕان / مـن دەکێشـم ڕەنجـی زۆر سـەخت و گـران (٢٢٥٨)

کەوتەجـــەرگم ئـــاگرێکی شـــوعلەوەر / لـەو موناجاتـەم ببینـە، بـۆی جگـەر (٢٢٥٩)

کـافریش لـەو دەردەیـاخوا، بـێ بـەدوور / ڕەحمەتی تۆم من دەوێ ئەی خوای غەفوور (٢٢٦٠)

خۆزگەنـەی بـا، دایکـی مـن، ئـەمنی دزێـو / خواردبـامی، یانـە شـێری دەشـت و کێـو (٢٢٦١)

لایقـی خـۆت کـار بکەئـەی کردگـار / چـون لەگشت کون،دەمگـەزن، ئێستاکە، مار (٢٢٦٢)

چەشنی ئاسن قەلب و، گیانم چەشنی بەرد / دل دەبـوو بـەخوێن دەنـا، لـەو ڕەنـج و دەرد (٢٢٦٣)

تەنگـەکات جـا، تـۆ لـەبۆ مـن یـەک نەفـەس / سـەروەری کـەو، بـۆم ببـە، فـەریاد ڕەس (٢٢٦٤)

ئەو چەلەم سەتتار کەبی، ئەی خوای ئەحەد / کـاری بـەد ناکـەم ئـەمن، تـاکو ئەبـەد (٢٢٦٥)

ئـەو چەلـەش تـۆ بـەم، قـەبووڵ کەئـەی ئیلاه / تـا ئەبـەدناچم بـەدووی جـورم و گونـاه (٢٢٦٦)

ئـەو چەلـەم گـەر کـرد گوناه، ئـەی کردگار / لێم مەکـە، مـەقبووڵ دوعـاو گوفتـار، چ جـار (٢٢٦٧)

ئـەو دەگریـاو، ئـاو لـەچاوی بـوو ڕەوان / وام بـەدس جـەللاد ئـەمن، نامـدا، ئـەمان (٢٢٦٨)

یـاخودا، هـیچ کـافریش وا گیـان نـەدا / شـین، نـەکا، هـیچ مولحـدیش وا، ئـەی خـودا (٢٢٦٩)

بـۆ گییـانی خـۆی دەگێڕا،گەرمەشـین / ڕوویـی عیزڕائیلـی دی، لای خـۆی، یـەقین (٢٢٧٠)

هێـنـدەدەیکوت ئـەی خـودا وو، ئـەی خـودا دەرک و دیـوار، بـوون لەگـەڵ وی هـاو سـەدا (٢٢٧١)
ئـەو دەمـەی دەیکـرد تیکـرار، ئـەی خـودا وا لـەلای تـەفتیش کـەران، ڕا، هـات سـەدا (٢٢٧٢)

**نۆبەی گەیشتنی گەڕان بەنەسووح، وەدەنگ هـاتن کەهـەموو حـازران گـەڕاین ئێستا بـا نەسووح بگەڕێین، وبێهۆش بوونی نەسووح لەترسان، وبوونەوەی گرێی کاری وی، پاش گرێ پووچکەیەکی زۆر شەدید (کما قال رسول ا لله صلی الله علیه وسلم) اذا اصابه مرض او هم ( اشتدی ازمه تنفرجی ) یانی هەر کات نەخۆشیەک یا نا ڕەحەتیەک بۆ پێغەمبەر پێش دەهات دەی فەرموو شەدید بەتا لابچی ..**

نـۆرەیش نۆبـەی گەڕانتـە، ئـەی نەسـووح چـوو لـەهۆش، دەفـڕی لەتـەن ئەوکاتـەڕووح (٢٢٧٣)
چەشــنی دیــواری شــکاو، ئەوکەوتــەخوار عـەقڵ و هۆشی چوو، دەبوو وەک بـەردو دار (٢٢٧٤)
هەرکەهۆشــی ئــەو لــەنێو تــەن دا نــەما بــاتنی چــوو، لای خـودای ئـەرز و سـەما (٢٢٧٥)
چونکـەخاڵی مـاو، نـەی مـا، ئـەو، وجـوود بازی ڕووحی ویست لـەبۆ لای خۆی، وەدوود (٢٢٧٦)
چـون شـکا، بـێ ویسـتنی وی، ئـەو گـەمی کەوتەساحیل بـەحری ڕەحمـەت، ئەو دەمـی (٢٢٧٧)
گیان بەحەق واسڵ بوو گەرچی چوو لەهۆش مـەوجی ڕەحمـەت ئەو دەمی جا، هاتـەجۆش (٢٢٧٨)
چونکـەڕووحی وی تــەنی وی چــوو لــەیاد ڕۆی لـەبۆ لای ئەسڵی خۆی خەنـدان و شاد (٢٢٧٩)
بــازمڕووح و، کــۆڵ و زەنجیــریش تەنــە بــــاڵ شکاو،یەخســـیرە،دووپێی بەســـتەنە (٢٢٨٠)
گـەر کـو هـۆش بـڕوات و، پـێ، بـێ، ئـاوەڵا زوو دەکـا پـەرواز، ئـەو بـاز، لایـی شـا (٢٢٨١)
هـەر دەمێـک دەریـایی ڕەحمـەت بێتـەجۆش بـەر، دەکـا ئـاوی حـەیات وژیـن، نـۆش (٢٢٨٢)
زەرڕەێکـی کـەم دەبـێ جـوان و قـەوی جـوان دەبـێ وەک ئەتلـەس و دیبـا، زەوی (٢٢٨٣)
ســەر لــەگۆڕ دێنێتــەدەر مردوویــی دوور دێوی مـەلعوونیش دەبێ، مەحسوودی حوور (٢٢٨٤)
ڕووی زەوی ســـــەرجەم دەبێتـــەمێرغوزار خونچــەدێنێ جــوان و ناســک، وشــکەدار (٢٢٨٥)
گورگ و مەڕ لای یەک دەبن وەک دۆست و یار نائومێــد خــۆش خـوو دەبێـت و ســازگار (٢٢٨٦)

**وەدی هاتنی گەوهەر، و مەعزەرەت خواستنی خزمەتکاران و کەنیزانی شازادە لە نەسووح**

پلشی ئەو ترسـەی کـەدەیکرد گیـان هـیلاک مژدەهــات پەیـدا بـوو دووڕی تـا بنـاک (٢٢٨٧)
دەنگ لـەناکاو وا دەهـات، ڕۆی تـرس و بیم هـات وەدی ئـەو گـەو هـەری دوڕی یـەتیم (٢٢٨٨)
هــات وەدی ئێمەگــەلێک بــووین شــادمان پــێن دە، مــژدە، دوڕ،کە،کەوتەدەســتمان (٢٢٨٩)
جــا بەچەپڵــەو شـــادمانی و، هەلهەلـــە پـڕ دەبـوو حـەممام نـەما، غـەم ئـەو چەلـە (٢٢٩٠)

هات وە هۆش، هۆشی کەلاچووبوو،نەسووح  دی بەچاو، جا،نووری سەت زیاتر سەبووح (٢٢٩١)

لەو دەیان ویست تا حەڵاڵیان کا، بەعام  دەستی وی دەکرا، لەلای وان، ماچ مودام (٢٢٩٢)

تۆ حەڵاڵمان کە،کەپێت بووین بەدگومان  گۆشتی تۆمان خوارد بەتوهمەت گشتمان (٢٢٩٣)

چونکەخەڵکی زێدەبوو ن بەو بەد گومان  زێدەنیزیک بوو لەوی چون ئەو جەوان (٢٢٩٤)

کیسەکێش و مەحرەمی وی بوو، نەسووح  بەڵکەوەک بۆ دوو تەنان، یەک دانەڕووح (٢٢٩٥)

دوڕ،کەدزرابێت ئەو بردوویە، بەس  چونکەنیزیکتر نەبوو لەو، بەو، چ کەس (٢٢٩٦)

جستوجۆی وی پێش هەموویان بوو مەڕام  عیللەتی تەئخیری وی بوو، ئیحتیڕام (٢٢٩٧)

تا کو ئەو گەو هەر لەجێ یەک، دابنێ  ئەو بەفرسەت غەم لەسەر خۆی لابنێ (٢٢٩٨)

لەو، حەڵاڵ بوونیان دەکرد داوا، ئەوان  مەعزەرەتیان لەو دەویست، تێکڕا، ئەوان (٢٢٩٩)

پێیکوتن ئەو، هات لەبۆم لوتفی خودا  خۆ دەنا بەد تر لەوەم، بۆم بوو ئەدا (٢٣٠٠)

کوا شیاوی وەم، حەڵالیان لێم بوێ؟  ڕۆژگار وەک من بەدی، دەس نا کەوێ (٢٣٠١)

یەک لەسەت بوو، چی بەمن کوتیان بەدی  ڕوونەبۆمن، گەر لەشک دان، ئێدەدی (٢٣٠٢)

کوا لەبۆ کەس غەیری کەم بوو ئاشکار؟  کاری پیسم یەک لەچەندین، جار، هەزار (٢٣٠٣)

ئاشکرایەبۆ من و سەتتاری من  جورمی زۆر و ناحەزی کرداری من (٢٣٠٤)

ئیبلیسم بوو لەئەووەڵ ئوستاد  ئیبلیسم دوایە، دا، با، چوو لەیا د (٢٣٠٥)

کاری پیسی دا دەپۆشیم کردگار  تا نەبم ڕوو زەر، لەبەر پیس بوونی کار (٢٣٠٦)

ڕەحمەتی حەق جورمی پۆشیم ئەو چەلەش  کردمی جا، ئەو لەتۆبەی خۆش، بەبەش (٢٣٠٧)

ئەو بەکاری پیسی من نەی کرد، نەزەر  تاعەتێکی نەمبوو، لای بوو، موعتەبەر (٢٣٠٨)

چەشنی سەروو،گوڵ، منی ئازاد کرد  چەشنی ئیقباڵ دار، منی دڵشاد کرد (٢٣٠٩)

ئەو لەنێو پاکانی نێو نووس کرد، ئەمن  دووزەخی بووم، بۆ بەهەشتی برد، ئەمن (٢٣١٠)

بۆ تەناب، ئاهی کەکێشام، بێ حیساب  شۆڕ،دە بوو بۆ چاهی زیندانم تەناب (٢٣١١)

ئەو تەنابەم گرتو زوو من هاتمە، دەر  شادو خەندان بووم، غەمم لاچوو لەسەر (٢٣١٢)

زۆر بەزیللەت من لەچاهێک بووم ژییان  ئێستەتەنگەبۆژییانی من جیهان (٢٣١٣)

ئافەرین بۆ تۆ لەحەد زیاد، ئەی خودا  ناگەهانت، تۆ کەغەم کرد، لێم، جودا (٢٣١٤)

گەر سەری گشت موویی من، هەیبێ زەبان  شوکری تۆ، بەو حاڵەتەش ناکرێ، بەیان (٢٣١٥)

من دەکەم هاوار لەباغ و کانیاو  خۆزگەئاگابان، قەو می من تەواو (٢٣١٦)

**داواکردنی شازادەلە نەسووح بۆ کێسەکێشی پاش محکەم بوونی تۆبە، و قەبووڵ بوونی تۆبە، و بەهانە هێنانی نەسووح و جواب دانەوە، بەشازادە..**

| | | |
|---|---|---|
| جـا، لەپاشــان قاسـیدێکی کیــژی شــای | هــات کــوتی شــازادە، دەی وێ، بچیــەلای | (٢٣١٧) |
| ئـەی عـەفیف دەی وێت ئێستا کیـژی شای | تــا کــو ســەر شـۆیی، بکــەی تۆبچیــەلای | (٢٣١٨) |
| غــەیری تــۆی ناوێــت کیســەکێش، بــەدڵ | تــا کــو دایماڵێــت، یــا بــی شــوا، بــەگڵ | (٢٣١٩) |
| پێیــــدەکوت نایــــەم، لەدەســــتم نایــــەکار | ئــەو نەســـووحت، ئێســـتەبوو بیمـــارو زار | (٢٣٢٠) |
| بێنـــە، ئێکـــی دیکـــەتۆ زۆر زوو، بـــەغار | دەســـتی مـــن ئێســـتا، لەدەســـتی نایـــەکار | (٢٣٢١) |
| ئـەو بـەخۆی کـوت مـن گونـاهم بـوو زیـاد | کەی دەچێ ئەو ترس و ئەندووهەم، لەیاد؟ | (٢٣٢٢) |
| دەفعەیـــەک مـــردم، گـــەڕاوەبۆم گیـــان | مــن کەچێشــتم تــاڵی مــردن، هــەم نــەمان | (٢٣٢٣) |
| تـــۆ بـــــەیێکم،کرد ڕاس، لای کردگـــــار | تۆبەناشـکێنم لــەوەی پــاش، مــن چ جــار | (٢٣٢٤) |
| جـارەکی دی پـاش هـەموو ئـەو دەردەسـەر | کێ دەچێ بۆ لای خەتەر، جا، غـەیری کەر؟ | (٢٣٢٥) |

**حیکایەت لەبارەی ئەو مەتڵەبە، کە،کەسێک تۆبەی بکا و پەشیمان بێتەوە، ودووبارەئەو پەشیمانیانەی لەبیر بچنەوە، ودوو بارەئیمتیحان کراو ئیمتیحان کاتەوە، ئەو شەخسەبۆ هەمیشەدەخەسارەت و زەرەرو زیا ن دایە، چون تۆبـەی وی سـەباتو قـووەت و شیرین بوونی لەدەس داوە، وەک داری بێ ڕیشەکەڕۆژ لەدوای ڕۆژ وشک تر دەبێ، (نعوذ باللە)**

**خولاسەی داستان ..**

لیباس شۆرێک کـەرێکی لاوازی هـەبوو کەپشتی لـەژێر بـاری گـران برینـدار ببـوو، لەوبیابانـەدا غەیری ئاو هیچ شتێک پەیدا نەدەبوو کـەبی خوا، ئیتتیفاقـەن لـەو دەورو بەرەجەنگـەڵێک هـەبوو کەشێرێک لەوێدا دەژیا، ڕۆژێک ئەو شێرەدەگەڵ فیلێکی قـەوی بەشـەڕهات، لـەو شـەڕەدا شێر برینـدار بـوو ولەپاشـان لـەڕاوی حـەیوانات مـاوە، کاتێـک کەبرسـیتی هێرشـی هێنـا دەسـتووری بەڕێوێک دا کەبچێتـەدەو رو بـەری جەنگـەڵ، ئەگـەر کـەرێکی دی، بـەفێڵ ئـەو کـەرەبۆ لای مـن بێنـێ، تـا خـۆی لەبرسـیتی نـەجات دا .ڕێـوی بەشـێری کـوت ئـەی پاشـا خـەیاڵت ڕاحـەت بێ،کەفێڵبازی و حیلەگەری کاری ئەسڵی منە، ڕێوی ئـەوەی کـوت و، وەڕێ کـەوت، لـەڕێگا دا لەقــەراغ جۆگەیــەک، ڕا دەبــرد، کەکــەرێکی لاوازی دی، چــۆ پــێش و ســڵاوی لێکــرد، بەتـەعجوبێکی ساختەگی بەکـەری کـوت لـەو سـەحرای وشـک و بێ گیـا، چـی دەکـەی؟ کـەر جوابی داوەقیسمەت و نەسیبی منیش ئەوهەیەکەدەی بینی، ڕێوی پێیکوت دەو دونیایەدا، دەبێ

تەلاش بکەی تا بەرزق و رۆزی بگەی . دەنا برسی دەمێنیەوە، بەحس و گفتو گۆیەکی زۆر یان لەو بارەداکرد.. رێوی زانی کەبەبەحس و گفتوگۆ کار جێ بەجێ نابێ،جا دەستی کرد بەفێڵ کردن و تەوسیف و تەعریفی خۆشی ژیا ن دەجەنگەڵ و قامیشەڵان دا، گەرچی کەر زۆر ئیعتیمادی بەتەوەککول دەکرد بەڵام ئەو تەعریفانەی رێوی پێ خۆش بوو خولاسەی کەلام، رێوی وکەرچوونەجەنگەڵ بۆ لای شێری عەلیل ونەخۆش،شێر چونکەزۆر برسی بوو نەی توانی سەبر بکا تا کەردێتەپێش دەستی وی، جا، را پەڕی تا حەملەی بەکەر بکا،بەڵام تا قەت و تەوانی نەبوو،کەر لەگەڵکو رووی بەسام و گرژی شێری دی،هەڵات، وەلەوخەتەرەخۆی نەجات دا شێر بەرێوی کوت جارەکی دیش برۆ لای کەر وئەوی فریو دە، و بی هێنەئێرە. رێوی چۆ لای کەر زۆر قسەی خۆشی بۆکرد و ئیتمینانی دا کەهیچ خەتەرێک ئەوی تەهدید ناکا، بەڵکەم ترس و وەهمێکی کەبۆت پێش هاتووەلەئەسەری غەڵەبەی وەهم و خەیاڵ بووەکەر، زۆر تەلاشی کرد کەقسەی رێوی قەبووڵ نەکا، بەڵام برسێتی و تەماع لەسەر وی غاڵب بوون، بەو خاترەدەگەڵ رێوی بەرەو جەنگەڵ وەرێ کەو تن و هەر دەگەڵکو هاتەپێش شێر، شێر حەملەی پێ کرد، و لەتو پەتی کرد، شێر لەئەسەری ئەوماندوو بوونەدا زۆر تینوو ببوو، بۆ لای کانی چوو تا ئاو بخواتەوە، لەو کاتەدا رێوی لەفرسەت ئیستیفادەی کرد وجەرگ و دڵی کەرەکەی خوارد، کاتێک کەشێر گەڕاوەویستی کەلەئەووەڵەوەجەرگ و دڵی کەرەکەبخوا، بەڵام هەرچەند گەڕا ئەو دووانەی نەدینەوە، جا بەرێوی کوت جەرگ و دڵی کەر کوان؟ رێوی پێیکوت ئەو دەئەسڵ دا نەجەرگی هەبوو نەدڵ، چونکەئەگەر ئەو دوو عوزوانەی هەبان، هیچ کات فریوی منی نەدەخوارد کەبەپێی خۆی بۆ هیلاکەت بوونی خۆی بێت ..

| | | |
|---|---|---|
| یەک لیباس شۆر، بووی کەرێک بێ تاب و تین | زێدەلاواز، زگ بەتاڵ، پشت پڕ برین | (٢٣٢٦) |
| ئەو لەجێ یەک بەردەڵان و بێ گییا | رۆژ هەتا شەو بێنەواو و، بێ پەنا | (٢٣٢٧) |
| غەیری ئاو پەیدانەبوو خۆراک لەوێ | بوو زەلیل ئەو کەر، لەوێ، رۆژ تا شەوێ | (٢٣٢٨) |
| جەنگەڵێک بوو زۆر عەزیم لەو دەورو بەر | لێی دەژی شێرێک کەڕاوی بوو هونەر | (٢٣٢٩) |
| کەوتەدەعوا شێر دەگەڵ یەک فیلی نێر | ما لەڕاو چون بووی برینی زێدە، شێر | (٢٣٣٠) |
| ماوەیەک شێر، ما لەڕاو، نەی ما، کەزۆر | بێ غەزا، مان، گشت دەدی بەرماو خۆر | (٢٣٣١) |
| چونکەبەرماو خۆری شێر بوون گشت ئەوان | رەنجی زۆریان دی کەشێر بوو ناتەوان | (٢٣٣٢) |
| شێر بەرێوی کوت بڕۆ تۆ زوو، بەغار | بۆم بکەیەک کەر لەدەورو بەر شکار | (٢٣٣٣) |

گـەر کـەریکت دی لـەدەوری مێرغـوزار  بێنـەبۆ م ئـەو تـۆ بـەفێڵ و، خـۆش وتـار (٢٣٣٤)

ببوەتـو زۆرم لەگۆشـتی کـەر کـەدی  مـن لەپاشـان زێـدە، دەگـرم سـەیدی دی (٢٣٣٥)

مـن کـەمێکی لـەو دەخـۆم چـی مـا، ئـەتۆ  مـن سـەبەب، رزقـی وەهـات بـێ، تـا، ئـەتۆ (٢٣٣٦)

بـێ کـەرێک یاگایـەکم، تـۆ بێنـەبۆ  بـەو هـەموو فێڵـەی کـەدەیزانی ئـەتۆ (٢٣٣٧)

تـۆ بەمـەکرو فێـڵ، هـەم گوفتـاری خـۆش  بێنەئێرەئـەو، لەسـەروی دەرکـەهۆش (٢٣٣٨)

**تەشبیەکردنی قوتبی عارفی واسیڵ دەموستەمەڕی دان بەخەڵک لەقووت ومـەغفیرەت و رەحمەت تیبقی مەراتبێک کەخودا پێی ئیلهـام دەکـا، بەشێرێک نیسبەت بـەجیرەخۆرو بەرماو خۆری خۆی، بینـا بەمەرتـەبـەی نیزیـک بوونی وان لەشێر، نـەنیزیک بوونی مـەکانی بەڵکـەم نیزیـک بـوونی وەسفی، وئـەو مەتڵەبـەئیحتیاجی بەتەفسیل هەیـە( واللەالهادی )..**

شـێرەقوتب و، ڕاوەکـاری شـیاوی وی  خـەڵکی دی تێکـڕا دەخـۆن بـەرماوی وی (٢٣٣٩)

تـا بەدەسـتت دێ رەزای قوتبـت بـوێ  تا قەوی بێ و، سەیدی وەحشی دەس کەوێ (٢٣٤٠)

گـەر برەنجـێ ئـەو، دەبـن بـێ نـان خـەڵق  چـون بەدەسـتی کامیلـە، ئـەرزاقی حـەڵق (٢٣٤١)

ئـەو دەبـوو بـەرماو، وەجـدی عـام، تـەواو  شـادکەئەو گـەرکو دڵـت دەی وێـت ڕاو (٢٣٤٢)

عەقڵـەو، خـەڵکیش وەکـوو ئـەعزایی تـەن  عەقڵـەکار گـەردانی گشـت کـاری بـەدەن (٢٣٤٣)

زەعفی قوتبـان بـوو لەتـەنیان، نـەک، لـەرووح  رەنگەکەشـتی بـێ، زەعیـف، ئـەمما، نـەنووح (٢٣٤٤)

قوتبـەئـەو کـەس دەوری خـۆی بخـوات خـول  خـول لـەدەوری وی بخـۆن، ئـەفلاک کـول (٢٣٤٥)

گـەر غـولامی خاسـی قـوتبی عالـەمی  یارمـەتی دە، ئـەو لەتـەعمیری گـەمی (٢٣٤٦)

سـوودەبۆ تـۆ گـەر ئـەوت یـاری دەدا  یـاری دەدریـن، گـەرکو یـاری دەن خـودا (٢٣٤٧)

گرمنیچیـر چەشـنی ڕێـوی، بـێ دە، وی  تـا هـەزار نێچیـری دیـت، تـۆ دەس کـەوی (٢٣٤٨)

هـەر وەکـوو ڕێـوی دەکـا سـالیک شـکار  سـەیدی مـردوو ڕاو دەکـا کـەفتاری خـوار (٢٣٤٩)

گـەرکو مـردووت بـردەڵای، دەی بێـت ژیـن  کـود، لـەنێو بێسـتان دەبێـتن سـەوزو، شـین (٢٣٥٠)

جـێ بەشـێر، ڕێـوی کـوتی مـن وا، دەکـەم  فێڵ دەکـەم عـەقڵی لەسـەر، بـەر، بـا، دەکـەم (٢٣٥١)

کـارو شـوغڵی مـن فەقـەت فێـڵ کردنـە  کـاری مـن تـەنها، لـەڕێ، لا بردنـە (٢٣٥٢)

جـێ لەسـەر کێـو، هاتـەلای جـۆ، ئـەو بـەغار  دی کـەرێک مسـکێن و لاوازو نـەزار (٢٣٥٣)

هاتـەپێش کـردی سـەلامێک گـەرم و خـۆش  هاتـەپێش ئـەو سادەلەو حـەی، سـادەهۆش (٢٣٥٤)

پێـدەکوت چـۆنی ئەلـەو سـەحرایی وشـک  خیـزەڵان و بـەردەڵان، جێگـایی، وشـک (٢٣٥٥)

کەر کوتی جێگام بەهەشت بێ، یا نە، غەم — حەق وەهای دا، شوکری وی من، جا، دەکەم (٢٣٥٦)

مـن لـەباش و بـەد، دەکـەم شـوکری ئەحەد — لای قـەزا، چـون زۆر هەیـە، بـەد تـر، لەبـەد (٢٣٥٧)

خـوا دەکـا تەقسـیم و، نـاڕازی، کـەفوور — تۆ سەبوور بە، غەرقی نیعمەت بوو، سەبوور (٢٣٥٨)

بەس خودایەدۆست و، خەڵکی دی عەدوون — شـیکوەلای دوژمـن لەدۆسـت، کارێکـەدوون (٢٣٥٩)

دۆم کـەداتێ، نامهـەوێ مـن، ئەنگـەبین — چون دەگەڵ هەرنیعمەتێک بوو، غەم قەرین (٢٣٦٠)

**حیکایەتی کەری دارفرۆش وئاسایشی ئسپانی ڕەسەن باشی مەخسووس، وئارەزوو کردنی ئەو دەو لەتو نیعمەتەلەدوعاو پاڕانەوەی کەسێک دا، کەنابێ داوا بکا، غەیری مەغفیرەت و عینایەتی خوداوەند چون ئەگەر سەت جوور عەزاب و ڕەنجت لـەپێش دابێ ئەگەر لەززەتی مـەغفیرەت هـەبێ هـەموویان شیرین دەبـن، غـەیری مـەغفیرەت و عینایـەتی خوداوەند، هەر نیعمەت و دەو لەتێک ئارەزوو بکەی عەزابی دەگەڵ دا هەیە، کەئەتۆ ئەوی نابینی، هەر وەکوو دەگەڵ هەردانێک داوێک هەیـە، و داو دیارنییـە، تـۆ دەداوداگیـرت کردووەوئا ڕەزوو دەکەی کەبەو داوەتۆ ڕێ بڕۆی پێت وایەکەئەو دانانەبێ داون ..**

یـەک نەفـەر سـەققا کـەرێکی بـوو نـەزار — بوو بەمیحنـەت پشتی وی وەک دال، خووار (٢٣٦١)

سـەت برینـی زیـاد لەپشـتی کـرد، بـار — مـەرگی خـۆی داوا دەکـرد لـەیل و نـەهار (٢٣٦٢)

جـۆ، کـەهیچ، کاشـی نـەبوو تێـرو تەسـەل — بووی لەپشت، زەخمی نەقیزەو، سەت دومەل (٢٣٦٣)

میری ئاو خوڕ گەر کەری دی، وا پـەرێش — ڕەحمی هات،چون دۆستی ساحەب کەر بوو،پێش (٢٣٦٤)

جـا، سـەلامی کـرد و حـاڵی کـرد سـوئال — بـۆ کەرت،پشـتی چـەماوە، چەشـنی دال؟ (٢٣٦٥)

پێیـدەکوت فـەقرم منـی تەقسـیر کـار — کـرد، کـەنیتی کـاو، جـۆ، ئـەو بەسـتەزار (٢٣٦٦)

پێیـدەکوت بسـپێرەپێم، چەنـد ڕۆژ، ئـەوی — تـا لەسـەر ئـەو ئاو خـوری شـا، بێ، قـەوی (٢٣٦٧)

پێی سپارد کەر، دوایەئەو ڕەحمەت پەرەست — ئـەو کـەرەی سـەرئاخوڕی پاشـا، دەبەسـت (٢٣٦٨)

کەر لەگشت لا دەیدی، ئەسپی باش نیژاد — هەم قەڵەو، هەم باش و، هـەم خاوێن و شاد (٢٣٦٩)

زێـری پـێ یـان، ماشـتراو، پرژێنـدراو — وەختـی خـۆ، بـۆ یـان دەهـات، خـۆراک و ئاو (٢٣٧٠)

دی، دەکەن ئەسپان هەموویەک یەک،ڕنەک — ڕووی دەباڵا کردکوتی ئـەی خـوای فەلـەک (٢٣٧١)

باکـەریش بـم تـۆ منـت هێنـاوەدی — پشـت برینـدار و زەعـیفم بـۆ ئـەدی؟ (٢٣٧٢)

شـەو لەبرسـان و لەبـەر پشـتی بـەئێش — ئـارەزووی مـردن دەکـەم بـۆم بێتـەپێش (٢٣٧٣)

ئـەو هـەموو ئەسپانەشـادن بـۆ ئـەدی — هـەر دبـێ مـن هـەڵگرم دەرد و بـەدی (٢٣٧٤)

ناگـەهان دەنگـی شـەڕو دەعـوا دەهـات — وەختـی زیـن و کـاری ئەسـپان،جا، دەهـات (٢٣٧٥)

زەخمی زۆریان دی، لەتیری دوژمنان     هات لەهەرلاءنێو بەدەنیان تیر ئەوان (٢٣٧٦)

هاتنەوەلەوجەنگەئەو ئەسپانەگشت     چوونەسەرئاو خوڕ دەکەوتن، گشت بەپشت (٢٣٧٧)

جا، لەلاقی یەک بەیەکیان بەست نەوار     ڕا دەوەستان ناڵبەندان، بوون قەتار (٢٣٧٨)

زەخمی ئەسپانیان بەنشتەر هەڵدڕین     بیننەدەر تا، تیر لەنێو زەخم و برین (٢٣٧٩)

کەر کەوای دی دەیکوت ئەیخوای گشت‌کەس     فەقرو ساغیم من دەوێ تەنها و بەس (٢٣٨٠)

من لەزەخم و نیعمەتی وام، زۆر نەفوور     هەرچی ساغی ویست، لەدونیا بوو بەدوور (٢٣٨١)

### بەباش نەزانینی ڕێوی قسەی کەر کەدەیکوت بەبەشم ڕازیم ..

ڕێوی دەیکوت جستوجۆی ڕزقی حەڵاڵ     فەڕزەلای خوای بێ نەزیر و بێ هەواڵ (٢٣٨٢)

هیچ بەدەس نایەت لەدونیا بێ سەبەب     بۆیەئەرزیشمەندەلای عالەم، تەڵەب (٢٣٨٣)

(وابتغوامن فضل ر حمان ) ئەمرەخۆ     وەک پڵینگ تا کو نەبی غاسب ئەتۆ (٢٣٨٤)

دەیکوت ئەحمەد دەرکی ئەرزاق ئەی جەوان     بەستراوە، لێی درا، قفڵی گران (٢٣٨٥)

ئیکتیساب و کۆشش و سەعی و تەلاش     بوون لەبۆ ئەو قفڵە میفتاحێک باش (٢٣٨٦)

بێ کلیل ئەو دەرکەواز نابێ چ ئان     بێ تەڵەب خۆ، خوا بەکەس نادات نان (٢٣٨٧)

### جواب دانەوەی کەر بەڕێوی ..

کەر کوتی هەر سست تەوەککول وا دەکا     خۆ دەنا خوا، نان بەعام، ئیعتا دەکا (٢٣٨٨)

هەرکەسێ پیرۆزی هەم شاهی بوێ     بێ گومان نانی بەکەم دەس نا کەوێ (٢٣٨٩)

زگ لەڕزقی خۆ دەکەن حەیوان پڕ     بێ کەسابەت یا بکەن ئەرزاق، خڕ (٢٣٩٠)

ڕزقی گشتی وان دەدا ڕززاق، بەس     سەهمی هەر کەس دادەنێ ئەو پێش دەس (٢٣٩١)

ڕزق ورۆزی بۆ سەبوورا ن دێت باش     زۆر دەکێشێ ناسەبوور ڕەنجی تەلاش (٢٣٩٢)

### جواب دەنەوەی ڕێوی بەکەر ..

ڕێوی دەیکوت ئەو تەوەککول نادیرە     کەم کەسێک لەوجوور، تەوەککول ماهیرە (٢٣٩٣)

چوون، بەدووی نادیر لەڕووی نادانییە     کوا مویەسسەر،بۆ عموم سوڵتانییە (٢٣٩٤)

گەرچی گەنجی نێو قەناعەت نا، نەبی     بۆ هەموو کەس گەنجی پنهان، کوا دەبی؟ (٢٣٩٥)

تۆ بناسەحەددی خۆت بۆ سەر، مەڕۆ     تا نەکەو یە، نێو نشیوی فیتنە، تۆ (٢٣٩٦)

**جواب دانەوەی کەر، بەرێوی ..**

کەر کوتی مەتڵەب دەکەی مەعکووس بەیان — چـون تـەماع دێنـێ فەسـاد، بـۆ لای گیـان (٢٣٩٧)
قەت قەناعەت هیچ کەسی بێ گیان نەکرد — قـەت حەریسی هیچ کەسی سوڵتان نـەکرد (٢٣٩٨)
هـیچ بـەرازو هـیچ سـەگێک بـێ نـان نییـە — هــەو رو بــاران، کــاری ئینســانان، نییــە (٢٣٩٩)
وەک ئــەتۆ عاشــق بــەرزقی خــۆیی زۆر — عاشــقەرزقیش بــەوەی بــوو رزق خــۆر (٢٤٠٠)

**لـەبارەی مـەعنای تـەوەککول دا، حیکایـەتی ئـەو زاهیدەکەلـەنێو سـەبەبان تـەوەککولی ئیمتیحان دەکرد و لەشار هاتەدەر ولەسەرو سەدای خەڵکی دوور بوو ولەداوێنی کێوێکی دوورلەشار بەبرسێتی سەری لەسەر بەردێک داناو نوست، وبەخۆی کوت تەوەککولم کرد بەسەبەب سازی ورەززاقی تۆ، وئەسبابم وەلا نان، تا سەبەبییەتی تەوەککول ببینم ..**

**خولاسەی داستان ..**

زاهیدێک ئەو فەرمایشەی پێغەمبەری بیستبوو، کەرزقی مەقسووم، ئینسان بیهەوێ یا نەیهەوێ بۆی دێ، ئەو زاهیدەبۆ ئیمتیحان کردنی تەوەککو ل بەبێ رزق و ئازۆقەچۆ بیابانێک، ولەبناری کێوێک نوست، ئیتتیفاقەن لەو دەو رو بەرەدا کاروانێک کە، رێگای لێ ون ببوو بەقەراغ ئەو زاهیدەدا، رۆیشت، ودیتیان کەکابرایەک بەتاقی تەنێ دەو بیبانەدا، درێژ بووە، بەخۆیان کوت بەچ سەبەب ئەو کابرا یەهاتۆتەئێرە؟ مەگەر لەگورگ و دز ناترسێ؟ کاروانچیەکان هاتنەپێش و بەدەس تەکانیان دا، بەڵام عەمدەن هیچ قسەی نەکوت و هیچ تەکانی نەخوارد،کاروانچیەکان کوتیان ئەو کابرایەبێچارەیە، حەتمەن لەبرسان وای لێهاتووە،فەورەن نان و پێخۆرێکیان بۆ هینا، بـەڵام زاهیـد ددانـەکانی محکـەم پێـک وەنـا، وهیچـی نـەخوارد تـا ڕاسـتی و دروسـتی گوفتـاری پێغەمبەر ئیمتیحان بکا کاروانچیەکان دڵسۆزانەبەغار وەسیلەیەکی وەک کاردیان هینا و ددانی محکەم بەستراوی ویان کردەوەو بەزۆری کەمێکیان ئاش دەگەرووی وی کرد و کـەمێکیان نان دەزاری وی هاویشت، ئەو وەختەبـەخۆی کوت سـەداقەت و دروستی گوفتاری پێغەمبـەرم لێ مەعلووم بوو ..

زاهیــدێک بیســتی کەفــەرمووی مســتەفا — دێ یــەقین رۆزی لــەبۆگیان، لای خــودا (٢٤٠١)
بـت هـەوێ یـا نـەت هـەوێتن، رزقـی تـۆ — دێ لـەبۆ لای تـۆ، لەعیشـقت، سـەر بـەخۆ (٢٤٠٢)
جـا لـەبۆ ئـا زمـوون ئـەو کابرایـە، چوسـت — چـۆ بیابانێـک لـەژێـر دارێـک، دە نوسـت (٢٤٠٣)
تــا بــزانم دێــت رزقــی مــن، لــەبۆم — تـا کـو زەنـنم بـێ قـەوی بـۆ رزقـی خـۆم (٢٤٠٤)

کاروانێـک ون بـوو، ڕێـی، چـۆ لایـی کێـو مومتـەحینیان، دی لەخـەودا بـوو، پەشـێو (٢٤٠٥)
حـا دەیـانکوت، ڕووتەئـەو کابرایـەبۆ؟ دوور لـەڕێگاو شـارە، لـەو سـەحرایەبۆ؟ (٢٤٠٦)
زۆر عەجـەب ئـەو مـردووە، یـا ماوەگیـان؟ چۆنەناترسـێ لـەگورگ و دوژمنـان؟ (٢٤٠٧)
هەتتـەپێش، دەسـتیان لەجیسـمی وی، دەدا عامیـدەن هیچـی نـەکوت ئـەو خـۆش ئـەدا (٢٤٠٨)
خۆی نەجوولاند نەی دەدا هەم، سەر تەکان نەیـدەکرد واز،چاو،کـەدەی ویسـت،ئیمتیحان (٢٤٠٩)
حـ دەیـان کـوت ئـەو زەعیفـەی ناتـەوان هـەر لەبرسـان لای نـەمان، هـۆش و زەبـان (٢٤١٠)
ـان و پێخۆریـان لـەبۆ هینـا بـەغار تـا کـو بیرێـژن، لـەنێو حلقـووم و زار (٢٤١١)
حـ بەعەمـدەن محکـەمی بەسـتن ددان تـاکو سیدقی ئـەو حـەدیس لێی بێ عـەیان (٢٤١٢)
ڕەحمیان هات بەو، کەچاو چەن بوو فەقیر برسـێتی کـردی بـەدەس مـردن ئەسـیر (٢٤١٣)
کردیـان کاروانیـان هینـا بـەغار ئـاوەلا کـەن، تـا لـەوی دەنـدان و زار (٢٤١٤)
حـ دەنێـو زاریـان دەکـرد شـۆرباو ئـەوان هەم دەگەڵ شۆر باو دەیان کرد، ورکەنان (٢٤١٥)
نیکوت ئەی دڵ گەرچی ناڵەی هیچ وتار ڕاز دەزانـی نـاز دەکـەی، نـاڵێی بـەزار (٢٤١٦)
ـ کوتی خۆم کرد بەعەمدەن بێ نەفەس مـن دەزانـم ڕازقـم هەرخوایەبـەس (٢٤١٧)
جـۆن دەبێـتن لـەو هـەزیاتر ئیمتیحـان ڕۆزی دەڕوا،شـادمان، لای سـابیران (٢٤١٨)

**جواب دانەوەی ڕێوی بەکەر وتەشویق کردنی کەر، بۆ کسب و کارکردن ..**

ـەکوت ڕێـوی لەداسـتا ن بەسـکەبەس بـۆ تەلاشـی زۆر کـەمیش، تـۆ هەڵکـەدەس (٢٤١٩)
ـ ێ بـەتۆدەس خـوا، ئـەتۆش جا، کار بکـە کەسـب و کارکە،یارمـەتیکی یـار بکـە (٢٤٢٠)
هەرکەسـێک ئـەنجام بـداتن کەسـب و کـار یارمـەتی دێـتن لـەوی، بـۆ دۆسـت و یـار (٢٤٢١)
جوت ئەدەس یـەک شـەخس نایـەت زێدەکار زەڕ گـەری و سـەبزی فرۆشـی و حەملـەدار (٢٤٢٢)
ئـەو جیهانـەبوو بەشـیرکەت، بەرقـەرار بـۆ نیـاز هـەر کـەس، دەدا، ئـەنجام کـار (٢٤٢٣)
موفتـەخۆری، بـوو لـەدونیا ناڵـەبار ڕێـی وشـوێتی مستەفا بـوو، کەسـب وکـار (٢٤٢٤)

**جواب دانەوەی کەر بەڕێوی کەتەوەککول چاکترینی کەسب و کارانەو هەموو کەس نیازی بەتەوەککول هەیە، کەئەی خودایە،ئەوکارەبۆ من ڕاست بێنە، و لەنێو دوعادا تەوەککول هەیەوتەوەککول کەسبێکەکەبەهیچ کەسبی دی نیازی نییە..**

کـەرکوتی مـن وا دەزانـم ڕۆژگـار وەک تەوەککول، نەیدەدی باش، قەت چ کار (٢٤٢٥)
جەشنی شوکری ویم، نەدی من کەسب و کار زیـاد دەکـا ئـەرزاق، شـوکری کردگـار (٢٤٢٦)

گوفتوگۆیـان کـرد گـەلێک زۆر ئـەو دووان تـا لـەجواب وسـوال مانـدوو بـوون و، مـان (٢٤٢٧)
دوایـەرێوی پێیـدەکوت، نێـو مەملەکـە هـات کـەماوین، خـۆ لـەبۆ نێـو مەملەکـە (٢٤٢٨)
ژیـن لـەنێو سـەحرایی وشـک و بـەردەڵان لـەو جیهانـەی وا وەسـیع، دەیکـا، نـەزان (٢٤٢٩)
کـۆچ کـە، لێـرە، تـۆ بـڕۆ لای مێرغـوزار جـا، بخـۆ شـینکە، لـەلێوی جۆیبـار (٢٤٣٠)
مێر غوزارێک وەک بەهەشت دێ، بەر نەزەر شینکەهەسـتاوەلەوێ تـا کـو کەمـەر (٢٤٣١)
خۆش بـەحاڵ حـەیوان، لەوێدا ژیـا، ئەگـەر وشـتریش نێـو شـینکەلێی دیـار نـابێ سـەر (٢٤٣٢)
چـاو لەهەرلایـەک بکـەن کانیـاو ڕەوان خۆش دەژی حـەیوان لـەوێ، هـەیتی ئـەمان (٢٤٣٣)
کـەر نـەفام بـوو، بۆیەنـەیکوت وا، بـەوی ڕاس دەڵـەی گـەر، بۆ زەعیفی، نی، قـەوی؟ (٢٤٣٤)
کوا نیشـات و گۆشـتنیت؟ هـەم بـاوی تـۆ؟ هێنـدەبۆچی لا غـەر و، دامـاوی تـۆ؟ (٢٤٣٥)
گـەر درۆ ناڵـەی لـەبارەی مێـر غـوزار لـەو سـەفای وی، بـۆ نـەبوو، چـاوت خومـار؟ (٢٤٣٦)
ئـەو تـەماعو حاڵەتـەی وا سـواڵکەری دێـن لـەحاڵی سـواڵکەریت نـەک سـەروەری (٢٤٣٧)
گـەر لـەکانی هـاتی بـۆچی وایـی وشـک؟ گـەر تـۆ نـافی ئاسـکی، کـوا بـۆنی موشـک؟ (٢٤٣٨)
لـەو شـتەی دەیکـەی ئـەتۆ بـۆ مـن بـەیان بـۆ لـەتۆ دا، قـەت چ نـابینم نیشـان؟ (٢٤٣٩)

**مەسەل هێنانی وشتر لەبارەی ئەو مەتڵەبەکە کەسێک ئیدیعای دەوڵەت و جاهو جەلال بکا وهیچ نیشانەیەکیش دەوی دا نەبێ جێگای گومان لێکردن وموتتەهەم کردنە، کەلـەو بارەدا موقەللیدە..**

یـەک نەفـەر دی، وشترێک دەیکوت بـەوی تۆ لەکوێ دێی ئەی موبارەک پێ و، قـەوی؟ (٢٤٤٠)
لـەو حـەمامی نێـو مەحەللـەی ئێـوە،دێم پێیـدەکوت بـەو چۆکـو ئـەژنۆت، وایـە، پـێم (٢٤٤١)
مـاری مووسـای دیـت فیرعـەونی نـەزان مۆڵـەتی ویسـت، خـۆی مـولایم دا، نیشـان (٢٤٤٢)
زیرەکـان کوتیـان، لـەبۆ ئـەو ڕەببـی دیـن خـۆی نیشـان مووسـا نـەدا، توند و خەشین؟ (٢٤٤٣)
ئـەژدەها بـێ موعجیزە،یـا مـار، ئەگـەر خەشمی خوایی و کیبریای، چی هات بەسەر؟ (٢٤٤٤)
ڕەببـی ئـەعلی گـەر ئـەوە، نێـو جێـو مـەقام بـۆ لـەبۆ کرمێـک دەکـا وا، لامـەلام؟ (٢٤٤٥)
تاکومەسـتی خـەمری هـەم نـۆغڵانی تـۆ مـا، لەخووشـەی غـەیبی مـەحرووم،گیانی تـۆ (٢٤٤٦)
دیـار دەکـا دیتـت ئـەتۆ، نـووری غـەفوور دوور ببـی گـەر، تـۆ لـەدونیای پـڕ غـروور (٢٤٤٧)
گـەر دەسـووڕێ دەوری ئـاوی سـوێر، مـەلێ چونکەنەیـدی ئـاوی شـیرین ئـەو چـەلێ (٢٤٤٨)
بەڵکـەبۆ تەقلیدەئـەو ئیمـانی وی ڕوویـی ئیمـانی نـەدی قـەت گیـانی وی (٢٤٤٩)
بـوو موقەللیـد، جـا، خەتـەر بـوو زۆر، عـەزیم چەشـنی ڕێگـاو ڕێگـرو، دێـوی ڕەجـیم (٢٤٥٠)

ئـاوی ئـەو خۆراکـە، ئـاوی ڕوویـی عـام ئـەو سـەگی شـەیتا ن، لەوی دەی بێ تـەعام (٢٩٤٧)

ئـەو بـەلوتفی خـوا، دەمـا جـا، گیـانی وی چـۆن نـەبێ قوربـان لـەبۆ فـەرمانی وی؟ (٢٩٤٨)

دەستەدەسـتەباش و بـەد، دۆسـت و نـەیار چوونەبەر دەر، چەشنی سەی ئەسحابی غار (٢٩٤٩)

دێتـەدەرکی غـاری خـوایی وەک سـەگان مونتـەزیر ئـەمرن بـەگیان و دڵ، ئـەوان (٢٩٥٠)

ئیمتیحان کە، ئەی سەگی شەیتان کەچۆن دێـن هـەموو عالـەم بـەڕێی مـن دا دەڕۆن (٢٩٥١)

پێشـگری کـەو، حەملەکـەو، بنـوارە، تـا بـاش و بـەد بـۆ تـۆ دەبـن، لێکتـر جـودا (٢٩٥٢)

جا (اعوذ) ئەو دەم دەخوێنێ سەگ ئەگەر تونـد و تیـژ حەملـەی بکـا، سـەر ڕەهگـوزەر (٢٩٥٣)

ئـەو (اعـوذ)یـانی کەئـەی تـورکی خـەتا ئـەو سـەگەت گـاز کـە، وەبـێ، ڕێگـا هـەتا (٢٩٥٤)

تـا کـو بـێم ڕاس، مـن لـەبۆ دەرگـایی تـۆ سـوود ببـەم لـەو جـوودی زۆر والایـی تـۆ (٢٩٥٥)

لەو هجوومـەی سەگ، تورک گەربوو قەتیز ئـەو(اعـووذ)ەو،ئـەو فیغانـەبوون نـەچیز (٢٩٥٦)

جـا دەکـا تـورکیش(اعـوذ)، وەک وی بـەیان مـن لـەماڵی خـۆم لـەدەس سـەم، ناتـەوان (٢٩٥٧)

نـاتوانی تـۆ کـەبێی، بـۆ لایـی دەر خـۆمنیش نـا یـەت لەدەسـتم، بێمـەدەر (٢٩٥٨)

تـورک و میـوان ئێسـتەخۆڵیان بـوو، وەسـەر گرتی ئەستۆی هەرددو، یەک سەی بێ هونەر (٢٩٥٩)

حاشـە، لـیللا، بانـگ بکـا ئـەو توورکـە، گـەر سەگ کەهیچ،شێر، قەلب و جـەرگی دێتـەدەر (٢٩٦٠)

ئـەی ئـەوەی خـۆت نێـو دەنـا، شێری قـەدیر زۆر لەمێژ ساڵە، بەدەس یەک، سەی ئەسیر (٢٩٦١)

چـۆن دەکـاتن ئـەو سـەگە، بـۆ تـۆ شـکار؟ چونکەبۆ سەگ، بووی شکار، خۆت، ئاشکار (٢٩٦٢)

**جواب دانەوەی موئمینی سوننی بەکافری جەبری و دەلیل و بورهان کوتن بۆ ئیسباتی ئیختیاری بەندە.. سوننەت ڕێگای پێغەمبەرانە(علیهم السلام )لەلای ڕاستی ئەو ڕێگایە، بیابانی جەبرە، کەئیختیار بۆ خۆی نابینێ و ئەمرو نەهی ئینکار دەکا،و تەئویل دەکا، و لەئینکاری ئەمرو نەهی ئینکاری بەهەشت لازم دێ کەبەهەشت پاداشی موتیعانی ئەمرە، و دوو زەخ جەزای موخالیفانی ئەمرە.. و زیاتری لەسەرناڕۆم چونکەبۆ عاقڵ یەک ئیشارە، بەسە، ولـەلای چـەپی ئـەو ڕێگایـە، بیابـانی قـەدەرە، کەقودرەتی خـالق مـەغلووب و مـەقهووری قـودرەتی مـەخلووق دەزانـێ کـەزۆر فەسـاد لـەو حاڵـەدا، بـەوجوود دێـن کەئەومو غەی جەبری بەیانیان دەکا ..**

ڕووی لەجـەبری کـرد مـوئمین ئێسـتەتۆ بگرەگوێ،بـۆ جـوابی ئـەو گوفتـاری خـۆ (٢٩٦٣)

کایەکـەی شـەترەنجی خـۆت، خـۆ دیوەتـۆ چـاک ببینەئێسـتە، کایـەی خەسـمی خـۆ (٢٩٦٤)

زۆر لـەبۆ ئیسـباتی جـەبرت کـوت دەلیـل بـۆ دەلیلی مـن، مەکە، گوێی خـۆت عـەلیل (٢٩٦٥)

بۆ قەزات زۆر نوکتەکوت، وەک جەبریان     بۆت دەکەم ئەو ڕاز، لەنێو گوفتار بەیان (٢٩٦٦)

ئیختیارێکمان هەیە، خۆ، بێ گومان     ناکرێ، تۆ مونکری حیس بی، عەیان (٢٩٦٧)

کەس بەبەر، ناڵێ وەرەلام، تۆ بەغار     کەس لەبەر، نای بێ، ئیتاعەت ئینتیزار (٢٩٦٨)

کەس بەکەس ناڵێ، لەتۆم ویست هەڵفڕین     کەس لەکوێر نای وێت، چاوی تیژ بین (٢٩٦٩)

خوا کوتوویە( ما علی الاعمی حرج )     چۆن حەرەج بۆ کەس دەدا، ( ڕەببولفەرەج) (٢٩٧٠)

کەس بە، بەرەناڵێت دێر هاتی ئەتۆ     یانەئەی دار تۆ کەلێت دام، بێژە، بۆ؟ (٢٩٧١)

کەس بەمەجبوورێک دەڵێتن وا وُتار؟     یا نەکەس مەعزوور دەدا، ئازار، چ جار؟ (٢٩٧٢)

ئەمر و نەهیی و خەشم و تەشریف و، عیقاب     خوا لەبۆ موختاری ناردن ئەی جەناب (٢٩٧٣)

ئیختیارێکمان هەیە، بۆ مەزلەمە     من لەنەفس و دێو مەڕامم بوو، ئەمە (٢٩٧٤)

ئیختیارت نێو دەروون مەو جوودەتۆ     یوسوفی دی، ژن بڕی،جا دەستی خۆ (٢٩٧٥)

ئیختیارو داعیە، نێو نەفس، بوون     ئاشکرا بوون، ژن کەدیتی ڕوویی ڕوون (٢٩٧٦)

سەگ دەخەو دا، ئیختیاری چۆ، نەمان     گەر شکەنبەی دی، دەدا، کلکی تەکان (٢٩٧٧)

ئەسپ حیلەی دێ، کەدیتی، جۆ بەچاو     گۆشت کەجوو لا، دێ لەگوربە، میا وەمیاو (٢٩٧٨)

دیتنە، تەحریک دەکاتن ئیختیار     هەر وەکوو فوو، زیاد دەکاتن، گڕ، لەنار (٢٩٧٩)

ئیختیارت دێتەجونبش، گەر بلیس     بێ،بەدەڵلال، بێنێ، بۆت، پەیغامی ویس (٢٩٨٠)

ئەو بەخەڵکی گەر کو دای مەتڵەب نیشان     ئیختیاری نوستو، دەخواتن، تەکان (٢٩٨١)

ئەو فریشتەی خێر دەداتن باش نیشان     بەرخیلافی دێو، دەکا دڵ، شادمان (٢٩٨٢)

تا لەبۆ خێرت بجووڵێ، ئیختیار     پێش نیشاندان، ئەو دوو، خۆ بوون، نادییار (٢٩٨٣)

جا، فریشتەو دێو، دەدەن، مەتڵەب، نیشان     تا عڕووقی ئیختیار، بخوا تەکان (٢٩٨٤)

زیاد دەکەن ئیلهام و وەسواس زیاد لەحەد     ئیختیار بۆ کاری باش و کاری بەد (٢٩٨٥)

بۆیەئەو دەم گەر دەبێتن نوێژ تەمام     بۆ فریشتان لازمەبکرێ، سەلام (٢٩٨٦)

ئەو دوعاو ئیلهامتان وای کرد کار     من بکەم ئەو نوێژەبۆ خۆم ئیختیار (٢٩٨٧)

تۆ دەنێری پاش گوناە، لەعنەت، هەزار     بۆ بلیس، پشتت بەوی، بوو، چونکەخوار (٢٩٨٨)

ئەو دوو زیددە، هەردوو، ژێر پەردەی نیهان     یەک دەداتن، باش و،ئێکیان، بەد نیشان (٢٩٨٩)

گەر کو ئەو پەردەی نیهانی لا برا     ڕووی دەڵا لان تۆ دەبینی، ئاشکرا (٢٩٩٠)

جا لەگفتی وان دەبێ، بۆت ئاشکار     ئەو هەبوون، ئەو وێژەرانی نادیار (٢٩٩١)

ئەی ئەسیری تەبع و تەن، شەیتان دەڵێت     لێم نەکردی زۆر، نیشانم داوەپێت (٢٩٩٢)

ئەو فریشتەش پێت دەڵێتن، خۆ ئەمن    پێم کوتی، پاش ئەو سرووڕەی تۆ، غەمن (٢٩٩٣)

من فلان ڕۆژەی مەگەر نەمدا، نیشان    ڕێگەبۆت بۆ لای بەهەشتی جاویدان (٢٩٩٤)

ئێمەدۆستی ڕووحی زۆر والایی تۆین    ساجیدی موخلیس، لەبۆ بابایی تۆین (٢٩٩٥)

ئێستەکەش خزمەت بەتۆ زۆر، چا دەکەین    تۆ سەدا بۆ لای خودای، یەکتا دەکەین (٢٩٩٦)

ئەو گرووهی دیکەبۆ بابت، عەدوو    ئیمتیناعیان کرد، لەئەمری ( اسجدوا ) (٢٩٩٧)

قەولی وانت گرت و قەولی ئێمە، نا    حەققی خزمەتکاری مەت، ژێر پێ دەنا (٢٩٩٨)

ئێستەبنوارەلەهەردووکمان عەیان    جا بمان ناسە، لەگوفتارو بەیان (٢٩٩٩)

تۆ کەڕازێکت لەدۆست بیست نیوەشەو    ئەو دەناسی، ڕۆژ کەبیستت، دەنگی ئەو (٣٠٠٠)

دوو نەفەر گەر شەو ببێژن بۆت وتار    ڕۆژ بەگوفتاریان دەبن، بۆت ئاشکار (٣٠٠١)

دەنگی شێرو سەگ، بەشەو گەر هاتەگوێت    گەر لەتاری،ڕوون،نەبوو،ڕوویان لێت (٣٠٠٢)

ڕۆژ کەهات، دیسان ئەگەر کردیان هەرا    بۆی دەبن بەو دەنگە، هوشیار ئاشکرا (٣٠٠٣)

وەسوەسەی شەیتان و ئیلهامی مەلەک    دوو دەلیل بۆ ئیختیارن، یەک بەیەک (٣٠٠٤)

ئیختیارێک نێو وجوود مان نا دیار    گەر کو دیتی خێر و شەڕ، بوو ئاشکار (٣٠٠٥)

ـدەدا، ئوستاد لەمندالّ، جارو بار    کوا لەبۆ، بەر، ئەو ئەدەب دێتن بەکار؟ (٣٠٠٦)

کوا دەلّەی سۆزی ورە، تۆ قەت، بەبەر    گەر نەیەی،زۆر دەردو ڕەنجت،دێ بەسەر (٣٠٠٧)

کوا لەسندەگڵ دەدا عاقڵ چ کات؟    کوا کەسێک بەردێک عیتاب و لۆمەکات؟ (٣٠٠٨)

بەد ترین جەبری لەخواهانی قەدەر    چونکەحیس لای جەبریان نا موعتەبەر (٣٠٠٩)

مونکری حیس نینەهیچ ئەهلی قەدەر    نینەمەحسووس کارو باری خوای لەسەر (٣٠١٠)

ئەو کەسەی ئینکاری کاری خوا، دەکا    مونکری زاتی خودایە، وا دەکا (٣٠١١)

ئەو دەڵێ دوو کەڵ، هەیە، بێ بوونی نار    نووری شەمعێک، بێ شەمێکی شوعلەدار (٣٠١٢)

ئاشکرا جەبری دەبینێ ئاگری    ئەو دەکا مەنفی، دەبێتن مونکری (٣٠١٣)

مونکری نارێکەلێی سووتاند لیباس    مونکری دەرزێکە، بەو دەدرووی کراس (٣٠١٤)

جا لەواقیع بوو بەدوور، گوفتاری جەبر    بۆیەبەد تر بووگەلێک زۆر، ئەو لەگەبر (٣٠١٥)

لای گەبر مەو جوودەدونیا، خوانییە    خوا ی دەکا هاوار و پێی بڕوا نییە (٣٠١٦)

جەبری لای وایەکەهیچ دونیا نییە    کەوتەگێژاو، هەرچی سەو فەستائییە (٣٠١٧)

ئیختیار بوو نێو هەموو عالەم عەیان    ئەمرو نەهیی، دائیمەن، تێدا جیهان (٣٠١٨)

جەبری لای وایەکەئەمرو نەهیی (لا) ن    ئیختیار چون هیچ نییە، گشت ئیشتیبان (٣٠١٩)

حیس لەلای حەیوان عەیانەئەی ڕەفیق     خۆ بەڵام دەرکی دەلیل، زۆر بوو دەقیق ٢٠)
فیتریەچون بۆ هەموو یان ئیختیار     چاکەبۆ ئینسان هەبێ، تەکلیفی کار ٢١)

**دەرکی ویجدانی وەک ئیختیارو وئیزتیراروخەشم وبرسێتی وتێریەتی وەک حیسسی زاهیری وایەکەفەرق دەکا بەینی زەردو سوور وچووکەو گەو رەو، تاڵ و شیرین و عەترو پەین و، زوورو، نەرم بەحیسسی لامیسە، وگەرم و سارد، و سووتێنەر لەشیرەو تێن، وتەڕ لەوشک، و لەمسی دیوار لەلەمسی دار، جا لەواقیع دا، مونکیری ویجدانی مونکری حیسسە، بەڵکەم زیاتریش، چونکەحیسسی ویجدانی لەحیسسی زاهیری موشەخخەسترە، چونکەدەکرێ، کەحیسسی زاهیری لەئیحساس مەنع بکرێ بەڵام مەنع کردنی حیسسی ویجدانی لەئیحساس غەیرەمومکینە(العاقل تکفیة الاشارە)..**

دەرکی ویجدانی وەکوو، حیس، مامەگیان     چون بەیەک جۆ دا دەڕۆن هەردووکیان ٢٢)
خۆش دەبێ ئەو دەم لەبۆ ئینسان، ڕاس     ئەمرو نەهیو،ما جەرا، هەم باس و خواس ٢٣)
گەر دەڵەی سۆزی دەکەم، ئەو جوورەکار     ئەو وتارەت، بۆ دەلیلی ئیختیار ٢٤)
تۆ لەکارێکت پەشیمانی، کە، دی     ئیختیارت بوو،کەوابووی، موهتەدی ٢٥)
نەهیو فەرمان زۆر لەنێو قوڕئا ن، هەنە     نەهیو فەر مان، کوا لەبۆ بەردان، هەنە؟ ٢٦)
کوا دەبێتن عاقڵی ڕووناک دڵ؟     دوژمنی خوێن خۆری بەردو سندەگڵ ٢٧)
کاری زۆرم ویست لەئێوەی بێ گییان     بۆ، نەتان دا، ئێوەئەنجام، هیچیان؟ ٢٨)
کەی عەقڵ فەرمان دەدا، سەر بەردو دار؟     عەقڵ ناکا، حەملەسەر نەقش و نیگار ٢٩)
ئەی غولامی دەست، بەستەی، پێ، شکاو     نێزەبگرەدەس، بڕۆ بۆ شەڕ بەتاو ٣٠)
ئەو خودای چای کرد ستێرەو ئاسمان     چۆن دەکاتن نەهیو فەرمان وەک نەزان؟ ٣١)
تۆ بەزاتی خوات نەکوت، خۆ، ناتەوان     بەڵکەدەت کوت تۆ بەوی،گێژ و نەزان ٣٢)
لای قەدەر خوا، قادرە، نەک ناتەوان     جاهیلی بەد تر لەعەجزە، بێ گومان ٣٣)
وا بەمیوانان دەڵێتن تورکەمان     بێ سەگ و بێ خەرقەوەرنە، دەرکەمان ٣٤)
تۆ فلان ڕێ بگرەبێرە، با ئەدەب     وازنەکا تا لێت سەگم، دەندان و لەب ٣٥)
چون خیلافی ئەمری من تۆ کار دەکەی     خۆ ت بریندار ی دەسی سەی هار، دەکەی ٣٦)
تۆ بەڕێ یەک دا، بڕۆ، ڕێی، بەندەگان     جا لەگەڵ تۆ سەگ دەبێتن میهرەبان ٣٧)
گەر ببن سەو ڕێوی وەختی چوون، پێت     سەگ دەبێ توورەو دەکاتن، حەملەپێت ٣٨)
گەرکونەی بێ، غەیری حەق، کەس ئیختیار     موجریمان نابێ، سزا بدرێن، چ جار ٣٩)

تۆ، لەبۆ دەت بێ لەدوژمن خەشم و کین؟ ناحەزی وجورم وگوناهت لەو، کەدین (٣٠٤٠)

گەر لەسەقفی ماڵ، دارێک بێتەخوار تۆ برینـدار کات و بت کا دەردەدار (٣٠٤١)

تۆ دەبی لەو دارە، هیچ کات، خەشمەگین؟ هیچ دەکەی تۆ فکری تۆڵە، لەو بەکین؟ (٣٠٤٢)

بۆچی لێی دام بۆ شکاندی دەستی من؟ دوژمنەئەو بۆ وجوودو هەستی من (٣٠٤٣)

بۆ منالان تۆ دەدەی ڕەنج و عەزاب؟ بۆ ئەدی ناکەی ئەتۆ، بالغ، عیتاب؟ (٣٠٤٤)

گەر لەماڵت دز، وەسائیل هەلگرێ خۆشەلای تۆ گەر کو، ئەو کەیفەر درێ (٣٠٤٥)

قەستی ناموست بکا، هەرکەس یەقین تۆ دەبی نیسبەت بەوی بێ حەد، بەقین (٣٠٤٦)

گەرباسێلاو ماڵی تۆ هەموو کوا دەبێ عاقڵ لەبۆ سێلاو عەدوو؟ (٣٠٤٧)

گەر کو، بێ، با، جا، کڵاوی تۆ ببا کوا دەبی ئەو دەم ئەتۆ، دوژمن بە، با (٣٠٤٨)

قەهرو خەشمت بۆ دەلیلی ئیختیار چەشنی جەبری هیچ مەڵێ،تۆ، ئیعتیزار (٣٠٤٩)

دار لەیەک وشتر بدا، گەر سارەبان ئەو شتور حەملەی دەکا، سەر سارەبان (٣٠٥٠)

کینی وشتر بوو لەساحەب دار، نەدار وشتریش جا، دیارەهەیتی ئیختیار (٣٠٥١)

گەرکو بەردێک تۆلەیەک سەگ دەی لەدوور پێت دەکا هێرش،دەکا خۆی جەمع وجوور (٣٠٥٢)

سەگ بەرق بەردت بەزار، گەر ڕا دەکا زۆر لەتۆ کین دارە، بۆیەوا دەکا (٣٠٥٣)

عەقڵی حەیوانی کەهەیتی ئیختیار با ببێ نافی لەئینسان، شەرمەزار (٣٠٥٤)

وایەئەمما تامیعی ئەکلی سەحوور تا کو بخوا زۆر، دەبەستێ چاو لەنوور (٣٠٥٥)

چونکەمەیلی خواردنەهەم خوارنەوە ڕوو دەتاریکی دەکا، یانی شەوە (٣٠٥٦)

ئەو تەمەعکارەی کەڕۆژ پنهان دەکا سەهل و سادە، پشت لەگشت بورهان دەکا (٣٠٥٧)

**حیکایەت لەبارەی تەوزیح وتەقریری خەڵق، وبەیانی ئەو مەتڵەبەکە قەزاو قەدەر سەلبی ئیختیار نا کەن (مونافی ئیختیارنین )..**

دز، بەدارۆغەی دەکوت ئەی پاسەوان گەر دزیم کرد، وای لەمن ویست خوای جیهان (٣٠٥٨)

پاسەوان دەیکوت هەچی ئیجرادەکەم حوکم و دەستووری خودایەوا دەکەم (٣٠٥٩)

گەر لەدووکان دز، بەرێ، یەک دانەتوور جا بڵێ دز، وای لەمن ویست، خوای غەفوور (٣٠٦٠)

لێی دەدەی تۆ، جا، دەڵەی ئەی نالەبار دای بنێ، جێی خۆی،کەوای ویست کردگار (٣٠٦١)

گەر کو عوزری وا، لەبەر یەک دانەتوور بێ لەلای بەقڤاڵ،لەمەقبووڵ بوون بەدوور (٣٠٦٢)

چۆن دەبێ مەقبووڵ لەلات عوزری وەها دەت هەوێ،تۆ بێتەلات، یەک ئەژدەها (٣٠٦٣)

بەو بەهانەئەی نەفامی بێ کەماڵ ماڵ و ژن هەم خوێنی خەڵکت کرد حەلاڵ (٣٠٦٤)

هەرکەسێک ویستی ئەتۆ ئازار دەدا     بەو بەهانەچونکەوای ویست، لێم خودا (٠٦٥

گەر بەهانەت، بوو ئەتۆ حوکمی ئیلاه     فێری میش کە، تا بکەم وەک تۆ گوناه (٠٦٦

چونکەویست و شەهوەتم هەن بێ ژمار     دەستی بەستم ترس و خەو فی کردگار (٠٦٧

تۆ بەلوتفت یاد بدەئەو عوزرە، پێم     واز بکەجا، ئەو گرێیەی دەست و پێم (٠٦٨

فکرو بیرێکت ئەتۆ هینا بەکار     یانی فیکری خاسی خۆم کرد ئیختیار (٠٦٩

بۆ دەنا تۆ فکری خۆت کرد ئینتیخاب؟     لەو هەموو ئەفکارو بیرەئەی جەناب (٠٧٠

هەردەمێک نەفس و هەوای تۆ بێنەکار     تۆ لەسەت کەس زێدەدەت بێ ئیختیار (٠٧١

گەر کەمێک سوود هەلگرێ لێت، یاری تۆ     ئیختیاری جەنگ دەبێتەکاری تۆ (٠٧٢

گەر کو بێتن نۆبەتی شوکری نیعمەم     ئیختیارت هیچ کەنایێ، زۆرو کەم (٠٧٣

پێت دەڵێ دووزەخ کەمەجبوور بووم ئەمن     گرِ بدەم تۆ، چونکەمەعزوور بووم ئەمن (٠٧٤

چون نەبووی هیچ بەو دەلیل، مەعزوور ئەتۆ     هەم لەدەس جەللاد نەبووی هیچ دوور ئەتۆ (٠٧٥

ئەو جیهانەی مونتەزەم کرد ئیختیار     حاڵی دونیای دیش لەبۆت بوو ئاشکار (٠٧٦

**حیکایەت هەم لە جوابی جەبری و ئیسباتی ئیختیار و سەحیح بوونی ئەمرو نەهی و بەیانی ئەو مەتڵەبەکەعوزری جەبری لەلای هیچ میللەتێک و هیچ دینێک قەبووڵ نییە و سەبەبی نەجات بوون لەسەزای ئەو کارەی کەکرد ویەتی نییە، وەکوو ئیبلیسی جەبری کە کوتی (بما اغویتنی) و (القلیل یدل علی الکثیر)..**

**خولاسەی داستان ..**

شەخسێک چۆ سەردارێک و لکەکانی ئەو دارەی بەشیددەت تەکان دەدا و میوەکانی دەخوارد و دەی خستنەخوار، ساحەبی باغ هات کوتی خەجاڵەت بە، ئەوە، چ دەکەی؟ ئەو شەخسەزۆر بەپڕ ڕوویی پێیکوت بەندەیەک لەبەندەگانی خودا دەی هەوێ لەباغی خودا بخوا، ئەو کارەچ ئیرادێکی هەیە؟ساحەب باغ زانی کەبەحس و جەدەل دەگەڵ وی هیچ فائیدەیەکی نییە، جا،غولامی تورکی خۆی بانگ کردوپێیکوت ئەو دارو تەنافەبێنەتا جوابێکی موناسب بەو دزە، بدەمەوە، دەست و، پێیان بەست و ساحەب باغ بەدار بەشیددەت لێیدا، دز، دەیکوت ئاخر لەخودا حەیا بکە، بۆ چی لەمنی بێ گوناەدەدەی؟ ساحەب باغ جوابی داوە،، ئەمن هیچ کارەنیم، بەندەیەکی خودا، بەداری خودا لەبەندەیەکی خودا دەدا، دز، کەنەی توانی دەرد و ئێشی شیددەتی لێدانی ساحەب باغ تەحەممول بکا، کوتی.. لەبەهانەهێنانەوەی جەبریان، تۆ بەم کرد، وئیقرار دەکەم کەدەکاری ئینسانان دا، ئیختیار هەیە، ئیختیار هەیە، ئیختیار هەیە..

یەک نەفەر وەک دز، دەچوو باڵا یی دار ‌ ‌ ‌ دەی تەکانــدن میــوە، تاکوبێنــەخــوار (٣٠٧٧)

ـنحەبی باغ هات کوتی ئەی بێ حەیا ‌ ‌ ‌ چی دەکەی؟ شەرمت ئەدی لەخوا، کوا؟ (٣٠٧٨)

ێدەکو ت لەو باغی خوا، بەندەی خودا ‌ ‌ ‌ گەر کو میوەی خوارد، خودا پێی کرد، عەتا (٣٠٧٩)

ـەک عەوام بۆ چی دەکەی لۆمەی ئەوی؟ ‌ ‌ ‌ بووی خەسیس سەر خوانی خوای باڵاو نەوی (٣٠٨٠)

ـعیکوت ئەی ( ئەیبەک) لەبۆم بێنەڕەسەن ‌ ‌ ‌ تــا ببێــژم مــن جــەوابی بولحەســەن (٣٠٨١)

حـ لەداری ئەو دەمی محکەم دەبەست ‌ ‌ ‌ جا، بەدار دەیدا، لەپشت و لاق و دەست (٣٠٨٢)

ێدەکوت ئاخر لەخوا، بە، شەرمەزار ‌ ‌ ‌ بێ گوناهم دەمکوژی تۆ، بۆ بەزار؟ (٣٠٨٣)

ێدەکوت بەو داری خوا عەبدی خودا ‌ ‌ ‌ چاک لەپشت، عەبدێکی دیکەی خوا، دەدا (٣٠٨٤)

ـرپشت و خاڵەگەم، ئی وین، تەمام ‌ ‌ ‌ من سەبەب بۆ ویمە، هەم ئەمرو، غوڵام (٣٠٨٥)

ـدەکوت جەبرم ئەمن، لانا، کەنار ‌ ‌ ‌ ئێستە سابیت بوو، هەیە، بۆم، ئیختیار (٣٠٨٦)

ێختیـاری وی دەکـا، چـاک، ئیختیـار ‌ ‌ ‌ ئیختیـاری وی، ســوارێک، نێــو غوبــار (٣٠٨٧)

ێختیـــاری، ئیختیارمـــان چادەکـــا ‌ ‌ ‌ ئیختیــار بــۆ مــەنع و فــەرمان، موتتــەکا (٣٠٨٨)

ـەرچی مەو جوود بێت هەیتی ئیقتیدار ‌ ‌ ‌ ســەڵتەنەت کــا، سەرشــتی بــێ ئیختیــار (٣٠٨٩)

ـ بەدووی خۆ، دا بکێشن، بێ ژمار ‌ ‌ ‌ ئــەو کەســانەی هــیچ نیبانــە، ئیختیــار (٣٠٩٠)

ـیجرەتی وی بێ سەبەب، ئەی ڕەندو مەند ‌ ‌ ‌ ئیختیــاری وان دەکــا، بــۆ وان، کەمەنــد (٣٠٩١)

ێختیاریــان بەنــدیان بــۆ چــا دەکــا ‌ ‌ ‌ بێ سەگ و داوڕاوی، وان، خواجا، دەکا (٣٠٩٢)

ـکمن نەججار و نەققاش هەر دووان ‌ ‌ ‌ یەک بەسەر دار، یەک بەسەر نەقشی جووان (٣٠٩٣)

ـاکمی ســەر ئاســنان، ئاســنگەرە ‌ ‌ ‌ بــۆ وەســیلەی کــار، بــەننا، ســەر وەرە (٣٠٩٤)

ـەر عەجیبــە، مــن دەبیــنم بــێ ژمــار ‌ ‌ ‌ ســاجیدن بــۆ ئختیــاری وی، خیــار (٣٠٩٥)

ـەر جەمادات گەر بکەی تۆ سەر وەری ‌ ‌ ‌ کوا، جەماد، بوونیان، دەشێی، تۆ لا بەری؟ (٣٠٩٦)

ـەر وەهایــەقودرەتی پــەروەردگــار ‌ ‌ ‌ نــاگرێتن، قــەت لەبەنــدا ن، ئیختیــار (٣٠٩٧)

ـۆ بەتــەکمیل بێژەویســتی زولجــەلال ‌ ‌ ‌ تا نەدەن پێت، نیسبەتی جەبری و زەلال (٣٠٩٨)

ـەر بڵەی تۆ،کفری لێم ویست کردگار ‌ ‌ ‌ خــۆت دەزانــی، تــۆ کــەنی،بێ ئیختیــار (٣٠٩٩)

ـری تۆ بێ ویستی تۆ، مومکین نییە ‌ ‌ ‌ کفــری بــێ ویســتن، تــەناقوز، گووئیــە (٣١٠٠)

ـع و فەرمان بۆ زەعیف،پیسەو زەمیم ‌ ‌ ‌ لەو خەراپتر، تووڕەبی، لەو خوای ڕەحیم (٣١٠١)

ـنعەن لەو گا یە، نەچتەژێر نیر ‌ ‌ ‌ گا کە، نەفرێ، کوا دەبێ پەست و حەقیر؟ (٣١٠٢)

عوزری گای سەرکەش نەبێ مەقبووڵ ئەگەر ‌ ‌ ‌ عوزری ساحەب گا، دەبێ مەقبووڵ،مەگەر؟ (٣١٠٣)

گەر نەخۆش نی، بۆ دەبەستی ئەو سەرە؟ ... تۆی کەموختار، بۆ دەکەی خۆت مەسخەرە؟ (٣١٠٤)

تـۆ تـەلاش کـە، بگـری جـامی کردگـار ... جا،لـەخۆچی، هـەم ببـی بـێ ئیختیـار (٣١٠٥)

ئیختیـار دەگرێـت ئـەو مـەی جـا بەدەسـت ... تۆ دەبی مەعزووری موتڵەق، چەشنی مەست (٣١٠٦)

ئـەو دەمـی جـا، هـەرچی بیکـەی ئـەی سـەنی ... بـێ گومـان ئـەو مـەی دەکـا وا، تـۆ کـەنی (٣١٠٧)

کەی دەکا،غـەیری عەداڵـەت هـەم سـەواب؟ ... ئەوکەسـەی خواردی لـەجامی حـەق شـەراب (٣١٠٨)

سـاحیران کوتیـان بەفیرعـەون،ڕا گرەدەسـت ... چونکەناترسـێ لـەلاق و دەسـت، مەسـت (٣١٠٩)

دەست و پێمان ئەو مەیەی خوای لەو سەرە ... دەسـتی زاهیـر، بـێ ڕەواجـەو سـێبەرە (٣١١٠)

**مانای (ماشاءاللەکان ) یانی ویست فەقەت ویستی خودایەوڕەزا فەقەت ڕەزای خودایەجا، ئێوە تەلاش بکەن کە تیبقی ویست و ڕەزای خودا کار بکەن .. کەلیمەی (کان ) ئەگەرچی مازییەبەڵام دەکاری خودا، دا، مازی و ڕابوڕدو، وجوودی نییە(لیس عنداللـە صباح و مساء )..**

قـەولی بەنـدان، هـەرچی ویسـتی خـوا دەبـێ ... بـۆ کەسـێکی سسـت و تەنبـەڵ، کـوا دەبـێ؟ (٣١١١)

بەڵکـە تەشـویقە لـە سـەر ئـیخلاس و جیـد ... تـا لەتاعـەت زێـدەتر بـێ، موسـتەعید (٣١١٢)

گـەر بڵـێن تـۆ ئـارەزووت بێـتن، هـەچی ... دێتەدەستت بێ کـەمی و کەسری و کـەچی (٣١١٣)

لایقـی بـۆ تەنبـەڵی تـۆ، ئـەو دەمـی ... چونکەویسـتت دێتەدەسـتت بـێ کـەمی (٣١١٤)

گەر بڵێن پێت، هەرچی ویستی خوا، دەبێ ... حـوکم و فـەرمان ئـی وییـە، هـەروا، دەبـێ (٣١١٥)

تاعـەتی وی بـۆ ئـەدی ناکـەی زییـاد؟ ... غـەیری ویـت بـۆ چـی ئـەدی ناچێ لـەیاد؟ (٣١١٦)

گەر بڵێن، چی ویست، وەزیر، بۆی دێتەدی ... چونکەفـەرمان ئـی وییـە، نـەک ئیـدەدی (٣١١٧)

تـۆ لـەدەو ری وی دەسـووڕێی زێـدەکات ... تا کـو پێـت ئیحسـان و جـوود ئیعتـا بکـات (٣١١٨)

یـا لەدەسـتی ئـەو وەزیـرە، ڕادەکـەی؟ ... کـوا بـەڕاکردن، عەتا،پەیـدا دەکـەی؟ (٣١١٩)

عەکسـی مەتڵـەب، تێگەیشـتی، لـەو وتـار ... تـۆ لەبۆیەتەنبـەڵیت،کرد ئیختیـار (٣١٢٠)

ئێستەئەمری گرت، فلان سەروەر بەدەس ... یـانی هـاو دەم بگرەئـەو تـەنها وو، بـەس (٣١٢١)

دەوری ئەو سەروەر،نەکەی بەردەی، چ کات ... قـاتڵی دوژمـن، دەدا دۆسـتان نـەجات (١٢٢)

هەرچی بی وێ،هەر ئەووت،تۆش دێتەدەس ... تـۆ بەغـەیری وی،مەکە،خزمـەت بەکـەس (١٢٣)

نـەک بـەدووی وی دا، بـڕۆی چـون حاکمـە ... هـەرچی وای کـرد، شـەر مـەزارەو، نادمـە (١٢٤)

ڕاسـتەتەئویلێک بکـا، تـۆ، زۆر زییـاد ... شەرمەزار، ئومێد وار، هەم چوست و شاد (١٢٥)

گـەرکو سسـتت کـا، یـەقینت بـێ، لـە، لا ... ئـەو نەتـەئویل، بەڵکـە، تەبدیلـەو خـەتا (١٢٦)

بۆ ئومێدی نا ئومێدا ن ئەو وتار — تا بەلوتفی خوا، ببن، ئومێدوار (٣١٢٧)

مەعنی قورئان هەر لەقورئا ن، پرسەبەس — یا لەشەخسێک ئاگری بەردا، هەوەس (٣١٢٨)

خوارە، لای قورئان هەم قوربانە، ئەو — عەینی رووحی ئەو دەمی قورئانە، ئەو (٣١٢٩)

گەر کو کامیل تێکەڵی گوڵ بێت، رۆن — بێ تەفاوەت رۆن و گوڵ، دەکرێن بۆن (٣١٣٠)

**هەروەها (جف القلم وكتب لا يستوى الطاعه والمعصيه ولا يستوى الاما نه والسرقه، جف القلم ان يستوى الشكر والكفران، جف القلم ان الله لايضيع اجرالمحسنين )**

ترجمە: حەقیقەتەن قەڵەم وشک بوو (موقەددەر بوو) کەتاعەت و نافەرمانی ودروستکاری و دزی بەرا بەر نین.. قەڵەم وشک بوو(موقەددەربوو )کە سپاسگوزاری وناسپاسی بەرابەر نین ..قەڵەم وشک بوو، (موقەددەر بوو) کەحەقیقەتەن خوداوەند پاداشی کارچاکان زایع ناکا، (نادیدەناگرێ )..

وایەجا، تەئویلی (قد جف القلم ) — تاکو تەشویق بێت بۆ کاری ئەهەم (٣١٣١)

جا قەڵەم نووسی هەچی بێ کا، بەشەر — لایقی وی هەیتی پاداش و ئەسەر (٣١٣٢)

گەر بڕۆی خوار،خوار دەنووسێ بۆت قەڵەم — راس کەبی، بۆت زیاد دەکا، لوتف وکەرەم (٣١٣٣)

زاڵمی بەد بەخت کرد ( جف القلم ) — عادڵی سەر تەخت برد،( جف القلم ) (٣١٣٤)

گەر لەدز، دەبڕێت دەست، (جف القلم ) — بادەخۆر گەر بوو بەمەست،( جف القلم ) (٣١٣٥)

کوا رەوایەتۆ بکەی، پەر وەردگار — لەو هەموو کاری ئەزەل بووی، بەر کەنار؟ (٣١٣٦)

تا بڵێ کارم لەدەس چوو، کردگار — ئەی عیباد، لای من، مەکەن شیوەن، چ جار (٣١٣٧)

بەڵکەمەعنای بوو وەها ( جف القلم ) — نینەلای من چەشنی یێک،عەدڵ و ستەم (٣١٣٨)

فەرقی خێر و شەڕ ئەمن کردم دیار — فەرقی بەد گەڵ بەد ترم کرد، ئاشکار (٣١٣٩)

گەرلەکەس یەک زەڕەزێدەت بێ ئەدەب — ئەولەبۆت دەکرێ حیساب لای فەزڵی رەب (٣١٤٠)

پێت دەدا پاداش بەقەد، ئەو زەڕە، خوات — زەڕەچەشنی کێو، لەبۆخۆی دێتەلات (٣١٤١)

ئەو شەهەنشایەی لەبەر دەرگایی خۆی — نەکرێ فەرقی عادڵ و زاڵم، لەبۆی (٣١٤٢)

یەک نەفەر بۆ وی دەکا مەدح و سەنا — یەک نەفەر ناکا بەوی هیچ ئیعتینا (٣١٤٣)

گەر تەبن لای وی جیا، ئەو دوو نەفەر — شا نییەئەو، خاکی دونیای بێ وەسەر (٣١٤٤)

زەڕیەک،گەر زێدەبت بێ، تۆ تەلاش — ئەو دەخاتەنێو تەرازوو، بۆت، خوداش (٣١٤٥)

خۆت دەکەی قوربانی بۆشایان، بەڵام — وەک یەکن لای وان غەدرو ئیحتیرام (٣١٤٦)

یەک موفەتتین گەربەدی تۆ، کا، ئەدا — خزمەتی چەن ساڵی تۆ، بەر با، دەدا (٣١٤٧)

لای شەهێکی ساحەبی سەمع و بەسەر — قەت بەگفتی فیتنەگێڕ، نادرێ ئەسەر (٣١٤٨)

فیتنەگێڕان جا دەبن،مەویووس، لەوی — دێتەلای ئێمە، بەپەندی زۆر، قەوی (٣١٤٩)

جا دەڵێن، بۆمان، بەدی شامان، بەجەم — کەم وەفا دار بن بەوی( جف القلم ) (٣١٥٠)

کوانێ مەعنای والەیە، ( جف القلم ) — وەک یەکن، جەورو، وەفا، بێ زیاد و کەم (٣١٥١)

بەڵکەجەو ری دا، جەفا، ( جف القلم ) — بۆ وەفاشی دا، وەفا،(جف القلم ) (٣١٥٢)

گەرچی بەخشین بۆ بەدان لای خوا دەبێ — وەک ئومێدی ئەهلی تەقوا، کوا دەبێ؟ (٣١٥٣)

بۆ دزێک بەخشینەگەر نەی دەن لەدار — کوا دەبێتەیەک وەزیر یا خەزنەدار؟ (٣١٥٤)

بێرەئێرەئەی ئەمینی دینی خوا — خۆ ئەمانەت، چا دەکا، تاج و لیوا (٣١٥٥)

گەر بەشا هەنشا، خەیانەت کا، کوڕی — تۆ دەبینی وەک مەڕی، لەو سەر بڕی (٣١٥٦)

گەرغولامی هیندی بەو بێ، با وەفا — بۆ بەقای عومری دەکا، ئیقباڵ، دوعا (٣١٥٧)

نەک غولام، بەڵکە، سەگیش، هەیبێ وەفا — ساحەبی سەگ لەو گەلێک، دەیبێ ڕەزا (٣١٥٨)

زاری یەک سەی با وەفا، ماچ گەر دەکا — چی لەشێری باوەفای بەر دەر، دەکا؟ (٣١٥٩)

گەر دزێک تۆبەی بکاتن وانییە — بێ نەسیب قەت، ئەو لەڕەحمی خوا نییە (٣١٦٠)

وەک فوزەیلی جەردەکاری چاک کرد — چون لەبەد، تۆبەی گەلێک چالاک کرد (٣١٦١)

یا وەکوو ئەو ساحیرانی با وەفا — هەم سەبوور، فیر عەونیان کرد ڕوو سیا (٣١٦٢)

دەست وپی یان چوون، بەتۆڵەو ئینتیقام — کوا دەدا سەت ساڵ عیبادەت، وا مەقام؟ (٣١٦٣)

گەرعیبادەت کەی،گەلێک ساڵ بۆ خووا — سیدقی وا کەی دێتەدەستی تۆ،کووا؟ (٣١٦٤)

**داستانی ئەو دەروێشەی کەلەشاری هیڕات غولامەکانی ئاڕاستەو ڕێک و پێکی عەمیدی خوڕاسانی دیتن کەهەموو یان سواری ئەسپی عەرەبی بوون، و عەبای ڕازاوەبەزێڕیان دەبەر دا بوو، وکڵاوی ڕازاوەبەزێویان لەسەربوو، وزۆر شتی دیکەش، پرسی کەئەوانەکامەیان ئەمیرو شایە؟ پێیان کوت ئەوان هیچ کامیان ئەمیر نین،ئەوانەغولامی عەمید ی خوڕاسانن،ڕووی دەئاسمان کردوکوتی ئەی خودا، غولام بەخێو کردن لەعەمید فێر بە،... لەوێ بەکەسێک دەڵێن عەمید کەعوایدی مالیاتی موحاسەبەبکا ..**

**خولاسەی داستان ..**

یەکێک لەفەقیرانی خۆش زەوقی شاری هیڕات کەدەسەرمای شەدیدی زستان دا لەبەر بێ لیباسی دەرەنج و عەزاب دابوو، کاتێک کەچاوی بەغولامانی عەمید (یەکێک لەکار بەدەستانی

مەزنی دەوڵەتی سەلجووقی ) کەوت، و دیتی کەئەوان (هەرچەند کەغولام بوون) لیباسی جوان و باش و هەریریان دەبەر دابوو، و کەمەر بەندی زێڕیان لەقەد بەستبوو، موتەئەسسیر بوو، وڕووی دەئاسمان کرد وبەحەسرەتێکی تەواو کوتی .. ئەی خودا، بەندەبەخێو کردن لەعەمید فێربە، چەن ڕۆژێک بەوجووره گوزەرا کەلەناکاو شا، عەمیدی بەجورمێک موتتەهەم کرد وخستیەزیندان وغولامەکانی وی، وەبەر کوتەک، دان،ولەوانی ویست کەهەرچی زووترەخەزێنەی عەمید نیشان بدەن،غولامەکان زۆر پیاوانەماوەی یەک مانگ شکەنجەی شەدیدی شایان تەحەممول کرد، بەڵام هیچ قسەیەکیان نەکرد، وڕازی وەلی نیعمەتی خۆیان ئاشکرا نەکرد، تاکو شەوێک ئەو فەقیرەدەخەودا، دیتی کەدەنگێکی غەیبی بەو دەڵێ، ئەی پڕ ڕوو، تۆش بەندەگی، لەغولامانی عەمید فێر بە..

یەک نەفەرپڕ ڕوو لەنێو شاری هیرات | گەر غولامی مەزنەکی بەرچاو دەهات (٣١٦٥)

بەو لیباسی ئەتڵەس و زێڕین کەمەر | ڕووی دەئاسمان کرد،کوتی، ئەی خوای لەسەر (٣١٦٦)

تۆ، لەبۆ هەر دووجیهانان سەر وەری | لەو ئەمیرەفێر بە، بەندەپەر وەری (٣١٦٧)

فێر بە، بەندەپەر وەری ئەی کردگار | لەو ئەمیری ئیختیارمان کرد لەشار (٣١٦٨)

ڕووت و قووت وبێ مەکان وهیچ نەدار | وەختی زستانان دەلەرزی تا بەهار (٣١٦٩)

ئەو فەقیرەی هیچ نەزان، بێ زار لەخۆ | زۆر جەسوور شۆخی دەکرد، ئیزهار لەخۆ (٣١٧٠)

زۆر لەلای وی موعتەمەد بوون، مەو هیبەت | چون نەدیمی خوانە، ئەهلی مەعریفەت (٣١٧١)

گەر کو پڕ ڕوو بێ، نەدیمی شەهریار | بێ دەلیل تۆ قەت نەکەی ئەو جوورەکار (٣١٧٢)

قەت، بەنێو قەد، خوا کەدا ی ناگا،کەمەر | گەر کەسێک تاجی دەدا، ئەو دایی سەر (٣١٧٣)

تا کو ڕۆژێک لای شەهەنشا،ئەو ئەمیر | موتتەهەم بوو،دەست و پێی،بەست،وەک ئەسیر (٣١٧٤)

ئەو غولامانەی عەزاب دان تا بەوان | گەنجی پنهانی ئەمیر، بەو دەن نیشان (٣١٧٥)

پێم بڵێن ئەی خوێڕیان ڕازی وی زوو | من دەنا دەبڕم زبانتان هەم گەروو (٣١٧٦)

موددەتی یەک مانگ عەزابی دا بەوان | ڕۆژو شەو،ئازار و ئەشکەنجەی گران (٣١٧٧)

سەت لەتی کردن غولامان شەهریار | هیچ نەیان کرد ڕازی میریان، ئاشکار (٣١٧٨)

هاتفێک پێیکوت دەخەو دا، ئەی فلان | فێر ببە، تۆش بەندەگی، لەو نۆکەران (٣١٧٩)

ئەو کەسەی ئازار دەدا پاکان، ئەگەر | دی عەزاب، خۆی باعیسەوای هات بەسەر (٣١٨٠)

بیخەبەرخۆت، چت، چنی هەرساڵ، ئەتۆ | هەرچی چاندت تۆ هەموو ساڵ، ئەو بخۆ (٣١٨١)

خۆت سەبەب،گەردێن لەبۆت غەم،دەمبەدەم | ئەوهەیەمانایی، (قد جف القلم ) (٣١٨٢)

ڕەسمی ئێمە هەر وەهایە، تا ئەبەد  باشی بۆ باش و بەدی دەدریٚ بە بەد (۱۸۳

تۆ تەلاش کەتا سولەیمان زیندەیە  تا تۆ دێو بی، تیغی وی بوڕڕەندەیە (۱۸۴

هەر کەسێکی بۆ مەلەک، دەی بیٚ، ئەمان  لای سولەیمان نایە، بۆ وی هیچ زییان (۱۸۵

حوکمی وی چون بوو،لەسەردێو،نەک مەلەک  عەردە،جێگای دەردو ڕەنجان،نەک فەلەک (۱۸۶

فیکری جەبری پووچە، دەرخە، ئەو لەسەر  تا لەڕازی جەبر، بت بێتن، خەبەر (۱۸۷

تۆ ڕەها کەجەبری سست و تەنبەڵان  تا خەبەر داربی، لەجەبرێک، چەشنی گیان (۱۸۸

ئەی ئەوەی پێت وایەتۆ، زۆر فایقی  بەردە، مەعشووق بوون و، بگرەعاشقی (۱۸۹

ئەی دەباتین دا لەشەو خامووش تری  دەت هەویٚ بۆ گفتی خۆت تۆ، موشتەری (۱۹۰

سەر دەدەن لای تۆ بەخاتر، تۆ تەکان  عومری خۆت دانا، کەگویٚ بگرن ئەوان (۱۹۱

ڕەنگەپێت وابیٚ کەمن ئێستام حەسوود  کوا حەسوود بوو،ئەو کەسەی نەی‌ویست سوود؟ (۱۹۲

هەرچی تەعلیم دا، بەدانی، گەندەدڵ  وەک بکێشی، نەقشی جوان، سەر سندەگڵ (۱۹۳

عیشق و بینیش فێر بەتۆ، ئەی خۆش نەزەر  چونکەنەقشی سابیتن ئەودوو، لەبەر (۱۹۴

خۆت بەدەردی خۆت دەخۆی تەنهاوو، بەس  غەیری خۆت دەڕوات و نامێنیٚ، چ کەس (۱۹۵

غەیرو بێگانان دەکەی تۆ، موحتەرەم  خۆت دەکەی تۆ پووچ و بەد ئەخلاق و کەم (۱۹۶

گەر دڵت واسڵ بیٚ بەو مەعدەنە  بێژە، بیٚ بیم، زۆر حەقایق لات هەنە (۱۹۷

ئەمری (قل) هات بۆ ڕەئیسی کائینات  یانی بێژە، نابیٚ، لەو یەم، کەم، چ کات (۱۹۸

(ا نصتوا ) یانی مەدە، ئاوت هەدەر  چون لەباغ، موحتاج بەئاون، گشت شەجەر (۱۹۹

لەو وتارەبەسکە، دوایی نایەقەت  ئەی عەزیزم بێنەبەرچاو، عاقیبەت (۲۰۰

من حەسوود نیم گەمورید لات بوونەکۆ  نینەعاشق، پێکەنینیان دیٚ، بەتۆ (۲۰۱

عاشقانی تۆ لەژێر پەردەی کەرەم  تۆ دەکەن گاز، لەحزەلەحزە، دەمبەدەم (۲۰۲

عاشقانێک بن، عەشیقت، نادییار  عاشقی پێنج ڕۆژەلا بە، بۆ کەنار (۲۰۳

چون بەفێڵ و مەکر و حیلان تۆ دەخۆن  قەت لەچاکەی وان نەهات، بۆ تۆ، چ بۆن (۲۰۴

تا مورید کۆ کەی، دەکەی تۆ، زۆر تەلاش  شەل دەکەی لەو ڕێگە،دوو پێی خۆت،بەلاش (۲۰۵

وەختی خۆشی، یاری تۆنەو، هاو نەفەس  وەختی غەم، هاو دەم، بەتەنیا، خوایە بەس (۲۰۶

ئەو دەمەی کە، دێشیٚ چاوت، یا ددان  کۆ مەکی تۆ، کێیە، غەیری خوای جیهان؟ (۲۰۷

ئەو نەخۆشی و ئێش، لەبیر ناڕوا، چ جار  وەک ئەیاز گرتی لەخەرقە، ئیعتیبار (۲۰۸

خەرقەحاڵی دەردو بیماری تووە  گەر بەدەستی خۆی ئەیاز، ئەو گرتووە (۲۰۹

**دوو بارەجواب دانەوەی ئەوکافرەی جەبری بەو سوننییەی کەدەعوەتی بەئیسلام دەکرد و بۆ تەرکی ئیعتیقاد بەجەبر، دەعوەتی دەکرد، ودرێژ بوونی بەحس و مونازەرە، لەهەر دوو تەرەف، چونکەفەلەت عیشقی حەقیقی ماددەی ئیشکال و جواب دەبڕێ، کەئەو جەبریە، هیچ مەیل و ڕەغبەتی بەوی نەمابوو (وذلک فضل الله یو ئتیه من یشاء ) ئەو فەزلی خوایەبەهەرکەس بیهەوێ، دەی دا ..**

دلی جەواب جەبری بەسوننی زۆر عەجیب مات دەما لەو جوابە، ئەو سوننی ئەدیب (٣٢١٠)

گەریکەم ئەوجواب و سوال، سەرجەم بەیان کەم دەبێ وەختم کەمەتڵەب،کەم بەیان (٣٢١١)

زۆر موهیمترمان لەوی گوفتار هەس تۆ بەوانت، زێدەتر، سوود،دێتەدەس (٣٢١٢)

من کەمێک لەو باسەزۆرەم کرد بەیان چون نموونەی کول، کەمێکە، ئەی فلان (٣٢١٣)

ئەو وتارەتاکو مەحشەر، بەرقەرار بەینی ئەهلی جەبر و ئەهلی ئیختیار (٣٢١٤)

هەرچی نەی کرد خەسمی خۆی، زوو تار و مار ئەو لەپێشتر، چوو لەسەفحەی ڕۆژگار (٣٢١٥)

گەر هەیان با، بۆ نەجات بوونیان جەواب کوا دەیان کرد ڕێی، هیلاکەت، ئیتیخاب؟ (٣٢١٦)

چون قەزا ویستی ئەوان بن پایەدار چادەکا، بۆ وان دەلائیل، بێ ژمار (٣٢١٧)

تا ئەوی مەغلووب نەکا،ئیشکالی خەسم تا نەبینێ هیچ کەڕەت،ئیقباڵی خەسم (٣٢١٨)

تا کو ئەو حەفتاد و دوومیللەت، مودام بەرقەرار بن، تا کو دێ، ڕۆژی قییام (٣٢١٩)

چون جیهان تاریکەجێگای ئیستیتار بۆ بەقای سێبەر، زەمین بوو، پایەدار (٣٢٢٠)

تاکو مەحشەر، هەن، ئەوان، حەفتادو، دوو موبتەدیع بۆ،گوفتو گۆ، چی کەم نەبوو (٣٢٢١)

قەدری مەخزەن ئەو دەمەی بوو ئاشکرا گەر کو قفڵی زۆر گرانی لێدرا (٣٢٢٢)

عیززەتی مەقسەد، دەکەن سێ شت عەیان خوارەپێچەی ڕێگە، بستوو و، ڕێ گران (٣٢٢٣)

بۆ بەهاو ئیعزازی کابەن، دوو دەلیل ڕێگرانی عارەب و، سەحرای تەویل (٣٢٢٤)

ڕێی وشوێنی پیس و ناحەز، چی، هەنە مانیعن، هەم ڕێگرن، هەم گەردەنە (٣٢٢٥)

بۆ عەدوو، ئەو ڕێگەبوو، ڕێگایی دی ما، موقەللید مات و حەیران، ڕێی نەدی (٣٢٢٦)

سیدقی هەر دوو لا، عەیان بوو، ئەو لەبۆی هەرگرووهێک، شاد بەفیکرو، خوویی خۆی (٣٢٢٧)

گەر یەکێک نەی بێ جەواب، دەعوا دەکا لەو دەمی تا ڕۆژی مەحشەر، وا، دەکا (٣٢٢٨)

ڕەهبەرانمان، چاک دەزانن خۆ، جەواب گەرچی ئێمە، وُن بوو لێمان، ڕێی سەواب (٣٢٢٩)

وەسوەسەو جادوو بەتاڵ کەر، عیشقەبەس کوا دەنا، باتڵ دەبێ، وەسواس، بەکەس؟ (٣٢٣٠)

عاشقی مەعشووقی زۆر جوان بە، ئەتۆ جا مراوی ڕاو کەئەو دەم، جۆ بەجۆ (٣٢٣١)

کـوا دەدا، ئاوێـک دەبـا تـۆ، پێـت سـوود؟ فـام کـەخواردی فـامی تـۆ، نـای بێـت سـوود (٣٢
غـەیری ئـەو مەعقوولـە، مـەعقوولات، زیـاد بـوون لەعیشـقی باسـەفاو جـوان، موسـتەفاد (٣٣
غـەیری عـەقڵت عـەقڵی دی چـاکرد خـودا هەڵدەسـووڕێتن بـەوی کـاری سـەما (٣٤
تـۆ بەعـەقڵت، ڕزق و ڕۆزیـت دێ بـەدی دیتـەژێر پێـت ئاسـمان، بـەو عـەقڵی دی (٣٥
گـەر بـدەی عـەقڵت لـەڕێی عیشـقی خـودا دەه بەرابـەر، یانەحـەو سـەت، پێـت دەدا (٣٦
چـون نـەیان مـا، ئـەو ژنـان عـەقڵ و شـعوور گشت لەکاخی عیشقی یووسوف، چوونەژوور (٣٧
عـەقڵی وانـی بـرد، دەمێـک، سـاقی تەمـەن تێـر لەعـەقڵ و فـام دەبـوون، بـاقی تەمـەن (٣٨
سـەت لەیووسـوف جوانترەخـوای بێ هـەواڵ ئـەی لـەژن کـەمتر، فیـدا بـە، بـەو جـەماڵ (٣٩
لابـەری گشـت قیـل و قـالان، عیشـقەبەس چـون لـەگوفتوگۆ فەقـەت ئـەو، دادڕەس (٤٠
گـەر ئـەوین بـێ، قفڵـی لـێ دەدرێ، زەبـان جورئـەتێک ناکـا، کەمەتڵـەب، کـا، بـەیان (٤١
چـون دەترسـێ، ئـەو کەمەتڵـەب کـا، بـەیان لێـو وەدەرخـا، گـەو هـەرێکی زۆر گـران (٤٢
ئـەو لـەخێر و شـەڕ دەبەسـتێ، لێـو، قـەوی دەرنەیـەن تـا، دوڕ، لـەزارو لێـوی، وی (٤٣
وەک کـوتی ئـەو یـاری پـاکی موسـتەفا گـەر نـەبی دەیکـرد وتـار، بۆمـان، ئـەدا (٤٤
وەختی دەیکرد ئەو ڕەسوول، گەو هەر نیسار دەیهەویسـت لێمـان مەتانـەت، هـەم ویقـار (٤٥
وەک لـە سـەرتۆ،گرتبێ، تـەیرێک قـەرار تـرس و لـەرزت بـێ، نـەکا ئـەو کـا، فیـرار (٤٦
جـا لەترسـان هـیچ نـاخۆی، تـۆ تـەکان تـا نـەوەک ئـەو تـەیرەبڕوا، ئاسـمان (٤٧
تۆ لەسینەت بەن دەکەی کۆخـەو نـەفـەس تـا نـەکا، ئـەو تـەیرەبۆ پـەرواز هـەوەس (٤٨
گـەر ببیسـی خـۆش یانـا خـۆش لەکـەس تـل، لەسـەر لێـو دا دەنێـی، یـانی کەبـەس (٤٩
حیـرەت ئـەو تـەیرە، ئـەتۆ خـامۆ ش دەکـا دا دەنـێ سـەر دیـگ و، تـۆ پـڕ جـۆش، دەکـا (٥٠

**پرسیاری پاتشا لەئەیاز، عەمدەن،کەبۆچی ئەو هەموو،غەم و شادییەنیسبەت بەو کاڵەو خەڕقە،کەجەمادن ئیزهار دەکەی؟ تا ئەیاز قسان بکا ..**

بێژەبـۆمن ئـەی ئـەیاز، ئێسـتاکەبۆ وەک سـەنەم خۆشـت دەوێ ئـەو کاڵـەتۆ (٥١
وەک لەلـەیلا چـاکی کـرد مـەجنوون بـوت واش ئـەیاز چـای کـرد لەکاڵـەموون بـوت (٥٢
دوو شـتی کۆنـت حـەبیبن وەک گییـان ئاوێزانـت کـرد لـەحوجرێک دا ئـەوان (٥٣
گەڵ دووکۆن، تاکەی قسەی نوێ چادەکەی؟ نێـو جـەماد، ئەسـراری کـۆن، ئیلقـا دەکـەی (٥٤
وەک دەکـەن ئـەعراب دەگـەڵ وێرانـەباس زیـاد دەکـا، عیشـقت، وتـارت، ئـەی هـەیاس (٥٥
کاڵەکـەت پاشـماوەیی، کـام ئاسـەفە خەڕقەکـەت، عەینـەن، کراسـی یـوو سـوفە (٥٦

وەک مەسیحی لای کەشیش، دەیکا، حیساب    هەرچی کردی ساڵی پێش، کاری خەراب (٣٢٥٧)

تا ببەخشێتن کەشیش لەو کاری بەد    عەفوی،وی، لا، عەینی عەفوی خوای ئەحەد (٣٢٥٨)

ئەو کەشیش نیتی خەبەر لەو جورم و داد    ساحیرن، ئەمما، ئەوین و ئیعتیقاد (٣٢٥٩)

عەم و،حوب،یووسوف گەلێک زۆرچا دەکەن    سیحری وا،هارووت و ماڕووت،کوا دەکەن؟ (٣٢٦٠)

سوورەتێک پەیدا دەکاتن،یادی یار    تۆ دەبێ بەو سوورەتە، شیرین وتار (٣٢٦١)

جا لەلای سوورەت دەڵەی ڕاز، سەت هەزار    وەک بڵێتن یار، ڕازی خۆی، بەیار (٣٢٦٢)

ئین دموی دا سوورەت و، پەیکەر دیار    دێ( ئەلەست )لای وان،(بلی )ی، جوابیش هەزار (٣٢٦٣)

جەشنی دایکێک دڵ بەداغ و، پڕ برین    سەر لەگۆڕی تازەمردووی دا، بەشین (٣٢٦٤)

ئەدڵی ئەسرار و، هەرچی کردووە    وا دەزانێ، زیندووەئەو مردووە (٣٢٦٥)

جا بەزیندوو دا دەنێتن خاک ئەو    چاوو، گوێی دین، بۆ خەس و خاشاک ئەو (٣٢٦٦)

و دەزانێ، خاکی ئەو گڵکۆ، تەواو    گوێی هەیەو هۆشی هەیە، هەم لێوو، چاو (٣٢٦٧)

وەدەزانێ، خاکی ئەو گۆڕ گوێ،گرە    جا بزانەتۆ، ئەوین، چەن، ساحیرە (٣٢٦٨)

تەختی سەر خاکی ئەو گڵکۆی عەزیز    ڕوو، بەفرمێسکی گەلێک ڕوون و، تەمیز (٣٢٦٩)

ئەی نەنابوو، قەت وەها، وەختی ژیان    ڕوو لەسەر، ڕووی ڕۆڵەکەی خۆی وەک گیان (٣٢٧٠)

چەند ڕۆژێک پاش عەزاو گریان و شین    ئاگری ئەو عیشقەنای مێنێ، چ تین (٣٢٧١)

چونکەنایێ عیشقی مردوو، پایەدار    ئینتیخاب کە، عیشقی حەیی، کردگار (٣٢٧٢)

دەچتەخەو دوایە، لەسەر ئەو گۆڕە، زیاد    چون جەماد پەیدا دەبێتن، لێی، جەماد (٣٢٧٣)

چون ئەوین ئەفسوونی خۆی برد، چوو،لەپێش    ما،لەپاش ئاگر،کەڕۆی زوو،خۆڵەمێش (٣٢٧٤)

هەرچی نێو ئا وێنەدیتی یەک جەوان    پیر هەمووی نێو خشت دەبینێ، بێ گومان (٣٢٧٥)

مووی سپی،نا، عیشقەتەنها، بۆت پیر    بۆ هەزاران، نائومێد، ئەو دەستگیر (٣٢٧٦)

وەختی فیرقەت، بۆ ئەوی هەن، زۆر سووەر    وەختی دیدار، بێ سووەر، دێت بەر نەزەر (٣٢٧٧)

جا دەڵێ ئەسڵم ئەمن، بۆ هۆش و مەست    سوورەتان جوانیان لەجوانیم کەو تەدەست (٣٢٧٨)

پەردەهەرچی بوون، هەمووم من لا دەبرد    حوسنی خۆم بێ واسیتەئاشکار دەکرد (٣٢٧٩)

چونکەدیتت، مەزهەری من، زۆر جار    ئێستەوەختە، خۆم ببینی ئاشکار (٣٢٨٠)

چونکەجەزبەم بوو لەمەزهەر، ئاشکار    تازەنای بێ، لای کەشیش ئەو هیچ کار (٣٢٨١)

ئەو لەژێر پەردە، لەلوتفی خوای کەریم    مەغفیرەت خوازە، لەبەر زەنبی عەزیم (٣٢٨٢)

گەر لەبەردێک کانیاوێک بێتەدەر    ون دەبێ نێو ئاوی ئەو کانیاوە، بەر (٣٢٨٣)

کەس لەوەی پاش، بەو بەرەی ناڵێت بەر چونکەئاوی ڕوون و جوان لەو هاتەدەر (٣٢٨٤

چەشنی زەرفان بن، لەلای تۆ، ئەو سووەر چی دەوان کرد، حەق، بەوی بوون موعتەبەر (٣٢٨٥

**کوتنی خزم و کەسی مەجنوون بەمەجنوون کەلەیلا زۆر جوان نییە، لەوی جوانترلەشاری ئێمەدا زۆر هەنە، چەند نەفەرێکت پێ نیشان دەدەین یەکێک لەوان ئینتیخاب بکە، هەم ئێمەو هەم خۆت لەپەرێشانی نەجات دە، وجواب دانەوەی مەجنوون بەوان ..**

**خولاسەی داستان ..**

خزم و کەسی مەجنوون، مەجنوونیان بە خاتری ئەو عیشقە کە بە لەیلای بوو، سەرزەنیش کرد و دەیانکوت ئاخر ئەو هەموو عیشقە و عەلاقە بە لەیلا لەبەر چییە؟ ئەو کەزۆر جوان نییە، مەجنوون کوتی ئێوە فەقەت زاهیر دەبینن، بەڵام ئەمن باتین دەبینم، ئەگەر ئێوەش بەچاوی من لەوی بنوارن جوانی ویتان لەلا، خاریقولعادەدەبێ ..

ئەبلەهان کوتیان بەمەجنوون ئەی عەشیق هێندەلەیلا خۆ نییەجوان و ڕەقیق (٣٢٨٦

شاری ئێمەکیژی تێدان بێ ژمار جوان و ڕوو گەش، چەشنی مانگی دەو چووار (٣٢٨٧

پێیکوتن، جوانی مەیەو، گۆزەن سووەر مەی لەگۆزەی وی دەدا، پێم، خوای لەسەر (٣٢٨٨

دای لەگۆزەی وی، بەئێوە، سرکە، تا عیشقی وی ئێوەلەبۆ لای خۆی، نەبا (٣٢٨٩

دەستی زاتی بێ نەزیری کردگار دێ، لەێنیک گۆزە، دەدا، هەنگوین و ژار (٣٢٩٠

تۆ دەبینی گۆزە، ئەمما ئەو شەراب دیار ناکا قەت، بەچاوی ناسەواب (٣٢٩١

چەشنی حۆریانی بەهەشتن زەوقی گیان غەیری شوویان خۆ بەکەس نادەن، نیشان (٣٢٩٢

(قاصرات الطرف) ە، بێ شک ئەو مودام جیسمی زاهیر، بێ گومان بوو، وەک خییام (٣٢٩٣

خێوەتێکەیەم، کەتێی دایەحەیات بۆ مراوی، بۆ کەلاغانیش مەمات (٣٢٩٤

ژار لەبۆ مار قووت و خۆراکی ژییان غەیری وی، ژار دەردو ڕەنجە، هەم نەمان (٣٢٩٥

سوورەتی گشت نیعمەت و میحنەت، یەقین یەک نەفەر خۆشحاڵ دەکاو، ئێکیش غەمین (٣٢٩٦

زاهیری ئەشیا، لەئێوە، بوو دییار سەمم و قووتی وان نابینن چ جار (٣٢٩٧

چەشنی کاسەو گۆزەنە، ئەجسام، بەعام پڕ لەژەهرن هەم لەخۆراکی بەتام (٣٢٩٨

کاسەدیارە، قووت لەنێو، وی دیار نییە هەر خورەندەچاک دەزانێ، ئەوچییە (٣٢٩٩

سوورەتی یوو سوف وەکوو، جامێک، جووان باب، لەوی دەخوارد شەراب، بوو شادمان (٣٣٠٠

بۆ برایان ئەو، بەڵام، ژاراو، بوو چون سەبەب، بۆ خەشمی وان، ئەو لاو، بوو (٣٣٠١

بوو بەشەکراو، بۆ زولەیخا جامی وی    جوورەکی دی کرد، زولەیخا، تامی وی (٣٣٠٢)

غەیری ئەو تامەی کەیەعقووب، دی لەوی    تامی یەعقووب دی لەوی، بوو، مەعنەوی (٣٣٠٣)

جوور بەجوورن شەربەتان و،گۆزە، یەک    تا لەمەی غەیبت ئەتۆ، نەت بێ، چ شەک (٣٣٠٤)

گۆزە، لەو دونیا یەدا، مەی، نادیار    نا دیارەمەی، دەگۆزەی ئاشکار (٣٣٠٥)

تا دیارەئەو لەلای نامەحرەمان    مەحرەمان، ئەمما دەبینن ئەو، عەیان (٣٣٠٦)

یا ئیلاهی ئێستەمەستن، چاومان    مەگرەلێمان ئەو گوناهانی گران (٣٣٠٧)

ئەی نیهان تۆ، شەرق و غەرِبت پڕ دەکرد    نووری شەرقو نووری غەرِبت سڕ دەکرد (٣٣٠٨)

تۆ سوورێکی کاشفی ئەسراری مە    تۆ بەیانەی، ڕێکەری ئەنهاری مە (٣٣٠٩)

ئەی نیهان زات، و عەتات، بینراوەباش    تۆ بەچەشنی ئاوی، ئێمەش بەردی ئاش (٣٣١٠)

تۆ بەچەشنی باوو، ئێمەش وەک غوبار    نادیارەبا، غوبار بوو ئاشکار (٣٣١١)

ئێمەباغی سەو زوجوانین، تۆش بەهار    تۆ، نیهانی، بەخششی تۆ ئاشکار (٣٣١٢)

تۆ وەکوو، ڕووح، ئێمەچەشنی پاوو، دەس    وازو بەستی دەس، شیاوی ڕووحە، بەس (٣٣١٣)

تۆ بەچەشنی عەقڵی، ئێمەش وەک زەبان    عەقڵەباعیس، گەر زەبان لێی دێ، بەیان (٣٣١٤)

تۆ بەچەشنی شادی، ئێمەش، پێکەنین    شادمانی، خۆش دەکاتن، بۆمە، زین (٣٣١٥)

هەر تەکانێک دێ لەئێمە، شاهیدە    سەر وجوودی ئەو خودایەی واحیدە (٣٣١٦)

چەرخیشوسووڕانی بەردی ئاسیاو    شاهیدن خۆ، بۆ، هەبوونی جۆیی، ئاو (٣٣١٧)

ئەی لەخاریج وەهم و قال و قیلی من    خاک بەسەر من، هەم بەسەر تەمسیلی من (٣٣١٨)

بەندەتەسویری قەشەنگی تۆی دەوێت    هەر دەڵێ گیانم فیدا، بۆ خاکی پێت (٣٣١٩)

چەشنی ئەو شوانەی کەدەیکوت ئەی خودا    بێرەلام، من، دۆستی تۆم زۆر باسەفا (٣٣٢٠)

تا کراسی تۆ لەئەسپێ، پاک بکەم    دامەنت ماچ،کاڵەشت، بۆ چاک بکەم (٣٣٢١)

کەس نەبوو وەک وی عەشیقی کردگار    نا تەوان ئەمما، لەتەسبیح و، وتار (٣٣٢٢)

عیشقی وی خەیمەی لەسەر ئاسمان بوو    گیان لەبۆ ئەو خەیمە، سەی، دەر بان بوو (٣٣٢٣)

بەحری یەزدان ئەو دەمەی کە، هاتەجۆش    قەلبی وی داگرت و، هاتەگوێی تۆش (٣٣٢٤)

**حیکایەتی جوحا، کەچارشێوی بەسەر دادا، ولـەنێو ژنـان دانیشت وحەڕەکـەتێکی کرد ژنێک ئەوی ناسی کەپیاوەوهاواری کرد ..**

**خولاسەی داستان ..**

یەکێک لەواعیزان دەحاڵی قسەکردن دابوو، عیددەیەک پیاو و ژن گوێیان دابوو قسەکانی وی .. پیاوێک بەنێوی جوحا بە چارشێوو، ڕوو بەند، بەجوورێکی نەناسراو هات لە نێو ژنان دانیشت لەو کاتەدا، نەفەرێک لـە واعیزی پرسی، ئایا مووی بەرگەدە، بۆ نوێژ ئیشکالی هەیـە؟ واعیـز کوتی مەعلوومە کە ئیشکالی هەیـە.. ئەگـەر مووی بەرگەدە، بەقـەد یـەک دەنکە جۆی لێ بێ کەڕاهەت ئیجاد دەکا، لەو کاتەدا جوحا بە ژنێکی کە لە قـەراغ وی دانیشتبوو کوت.. خوشکێ، تەماشا کە بزانە مووی بەرگەدەی من، بە ئەندازەی کەڕاهـەت گەیشتووە یا خێر؟، ئـەو ژنـە دەستی دەنێـو شاڵواری جوحـا نـا، وە دەسـتی وە ئـەدەبی هەسـتاوی وی کـەوت، لـە شـیددەتی هەیەجان هاواری کرد، واعیز کە پێی وابوو کەقسەکانی وی لـەو ژنـەدا تەئسیری کردووە، ئـەو ژنەی تەحسین کرد و کوتی .. دەڵەی قسەکانم وەدڵی ئەو ژنە کەوتووە، جوحا کوتی نەخێر، وە دڵی نەکەوتووە، وە دەستی کەوتووە، ئەگەر وە دڵی کەوتبا، واوەیلا بوو ..

واعیزێـک دەیکـوت وتـاری زۆر جـووان ژێـری مینبـەر، بـوون، پیـاوان و ژنـان (۳۳۲۵)

ڕۆی جوحا، چار شێو لەسەر، ڕوو بەن، لەڕوو نێوژنـان ناسـراو لـەبۆ هیچیـان نـەبوو (۳۳۲۶)

وای لـەواعیز پرسـیارکرد یـەک نەفـەر نـوێژ دەکـا نـاقیس، بڵێ پێم، مـوویی، بـەر؟ (۳۳۲۷)

پێیـدەکوت واعیـز کـەمووی، بـەر، بێ درێـژ چـا دەبێـتن، لـەو، کەڕاهـەت، بـۆ نـو وێـژ (۳۳۲۸)

یـا بەئاهـەک یـا بـەتیغ، مـوو لابـە، تـا نـوێژی پاکـت، لـێ قـەبووڵ کـاتن خـودا (۳۳۲۹)

پێیـدەکوت سـائیل، کـەموو، چـەن، بێ درێـژ چادەکاتن،نـەقس و کـەمبوود، بـۆ نـوویژ؟ (۳۳۳۰)

پێیـدەکوت گـەربوو بەقـەد، یـەک دەنکـەجۆ فـەرزەلای بـەی، ئـەو دەمـی ئـەو موویـەتۆ (۳۳۳۱)

زووی بەیـەک ژن کـوت جوحا، ئـەی سـەروەرم تـۆ بزانەگەییـە، ئەوحـەد مـووی، بـەرم؟ (۳۳۳۲)

بـۆ ڕەزای خـوا، بێنـەپێش دەس، چاوەکـەم جـا بزانـە، نـوێژ دەکـەن، ئـەو موانـە، کـەم (۳۳۳۳)

دەسـتی نـا، ئـەو ژن، دەنێـو شـاڵواری وی کەوتەدەسـتی، کیـری وەک بزمـاری وی (۳۳۳۴)

نـا ڕەتـەی لێـدا شـەدید ئـەو کاتـەژن دای لـەدڵ، واعیـز کـوتی، ئـەو گفتـی مـن (۳۳۳۵)

پێیـدەکوت، نەیـدا لـەدڵ، بـەل دای لـەدەس گـەر لـەدڵ دابـای، دەمـا، ئـەو بـێ نەفـەس (۳۳۳۶)

دای لەقـەلبی سـاحیران، عیشـقی خـودا دەسـت و دار، لای وان، نـەبوون لێکتـر جـودا (۳۳۳۷)

ئـەی ئـەمیر، بگـری، لـەپیرێک گـەر عەسـا زێندەدەی بێ، غـەم لـەوان، بۆ، دەسـت و پـا (۳۳۳۸)

| | | |
|---|---|---|
| نارەتـــــەی(لا ضــــــیر )ەگەییەئاســــــمان | جا نـەجاتی هات لـەدەس، میحنـەت، گیـان | (٣٣٣٩) |
| ئێمەتـەنها، تـەن کـەنین، لـێن بـوو، عـەیان | غـەیری تـەن، ئێمـە، بەحـەقمان بـوو، ژیـان | (٣٣٤٠) |
| خۆش بەحاڵ ئەو کەس کەناسی زاتی خۆی | لای خودا،دیـــاری کـــرا، کاخێــک لـــەبۆی | (٣٣٤١) |
| شـین، دەکـا بـۆ گـوێزو بـۆ مێـوژ، منـاڵ | سەهلەبێ حـەد، لای کەسێک ساحەب، کەماڵ | (٣٣٤٢) |
| مێـوژو گـوێزن تـەن، لـەلای سـاحەب دڵان | کـوا منـاڵ دەی بێـت، عیلمـی کـاملان؟ | (٣٣٤٣) |
| هـەر چی نـەی ناسی، حەقیقـەت بـوو، منـاڵ | مەردەئـەو کـەس، سـەر لەتەردیـد کـا، بـەتاڵ | (٣٣٤٤) |
| ڕیشـــو خایە،گـــەر نیشـــانەی پیـــاوەتین | پیـاوە، نێری،چونکەئـەو دووی، هـەن، یـەقین | (٣٣٤٥) |
| ڕەهبەرەئـەو نێرییـەی بـێ حـەد خـەراب | چـون دەبـا، یـارانی خـۆی، بـۆ لای قەسـاب | (٣٣٤٦) |
| ڕیـش دەکـا شـانە، دەڵـێ مـن پێشـەوام | پێشـەوای تۆبـۆ نـەمان و، غـەم، بـەلام | (٣٣٤٧) |
| ڕێی دروسـت تـۆ، بگـرە، تـەرکی ڕیـش کـە | تـەرکی ئـەو ئێمـەو، مـن و، تەشـویش کـە | (٣٣٤٨) |
| تـاکو بـۆنی گـوڵ، لـەبۆ دڵـدار بـێ | ڕەهنومـــاو، ڕابـــەر لـــەبۆ گـــوڵزار بـــێ | (٣٣٤٩) |
| بـۆنی گـوڵ، مەقسـوود، بـۆنی عـەقڵی جـوان | ڕێنمـــوونی ڕێـــی مـــوڵکی جاویـــدان | (٣٣٥٠) |

**جارەکی دیکە، دەستوور دانی،شا، بەئەیاز کەڕازی خەرقـەو کاڵـە، ئاشکرا، بلـێ، تـا غولامانی شای تۆ لەو بەیان و تەو زیحەپەند، وەربگرن چونکە (الدین النصیحە)..**

| | | |
|---|---|---|
| ڕازی کاڵـە، تـۆ بـەیان کـە، ئـەی ئـەیاز | تـۆ دەگـەڵ کاڵەدەکـەی تاکـەی نیـاز؟ | (٣٣٥١) |
| تـا بـبن حـاڵی، غـولام و دەو رووبـەر | ڕازی کاڵـەو ڕازی خەرقـەی بـێ سـەمەر | (٣٣٥٢) |
| ئـەی ئـەیاز نـوورت ئـەتۆ دا، نۆکـەری | نووری جێ نزمت، سەمای، ناپشت سەری | (٣٣٥٣) |
| ئـارەزووی ئـەحراڕە، ئێسـتا، نۆکـەری | چـون لـەتۆ، بـۆ نۆکـەری هـات، سـەرەوەری | (٣٣٥٤) |
| موئمین ئەوکەس بوو، لەجەزر و مەددی ژین | ئـارەزووی ئیمـانی وی کـا، زیـددی دیـن | (٣٣٥٥) |

**حیکایەتی ئەوکافرەی کەدەدەورانی بایەزید دا پێیا نکوت موسەڵمان بە،وجواب دانەوەی وی بەوان..**

**خولاسەی داستان ..**

دەزەمانی حەزرەتی بایەزیدی بەستامی دا، (نورالله مضجعه) بەکافرێکیان کوت موسەڵمان بەتا ڕەزگار بی،کافر کوتی ئەگەر دین و ئیمان ئەوەیە، کەبایەزید هەیتی تاقەت و تەوانایی ویم نییە، وئەگەر دین و ئیمان ئەوەیەکەئێوە، هەتانەهیچ مەیل و ڕەغبەتێکم بەوی نییە..

یەک نەفەر کافر لەعەهدی بایەزید — وای بەوی کوت یەک موسەڵمانی سەعید (٣٣٥٦)

چی دەبێ ئیسلامێ بێنی تۆ مەگەر؟ — تا نەجات بی و، تاجی شاهیت بێتەسەر (٣٣٥٧)

پێیدەکوت قەست و مەرامت ئەی مورید — گەر ببێ، ئیمانی هەیتی، با یەزید (٣٣٥٨)

من لەبۆ وی نیمەهیچ تاب و تەوان — چونکەپێی ناکرێ، تەلاشی والە، گیان (٣٣٥٩)

دین و ئیمان گەرچی لای من بێ ئەسەر — لام بەڵام، ئیمانی وی زۆر موعتەبەر (٣٣٦٠)

من لەلام وەک وی، چ کەس والا، نییە — زۆر لەتیفە، موحتەشەم، نوورانییە (٣٣٦١)

موئمینی ئیمانی ویمە، من نیهان — گەرچی نای کاتن زبانم، ئەو بەیان (٣٣٦٢)

گەر موڕادئیمانەکەی خۆتانەمن — نامهەوێ هیچ کات، ئەو ئیمانەمن (٣٣٦٣)

ئەوکەسەی بەدوایی ئیمان هەڵوەدا — گەر کو ئێوەی دی، دەئیمان، هەڵدەدا (٣٣٦٤)

چونکەئەو نێو، نیتی مەعنای خۆی لەکۆڵ — وەک مەفازە، بێ بەمەعنای دەشت و چۆڵ (٣٣٦٥)

سیس دەبێتن ئەو لەدینداری ئەگەر — دینی ئێوەی، چاک، بێتەبەر نەزەر (٣٣٦٦)

**حیکایەتی ئەو موئەززینە دەنگ ناخۆشەی کەلەنێو کافران بانگی نوێژی دەدا .. وپیاوێکی کافر دیاری و هەدیەی دایە..**

**خولاسەی داستان ..**

شەخسێکی دەنگ ناخۆش کەمیسداقی (ان انکرالاصوات لصوت الحمیر) بوو، دەنگی خۆی زۆر پێ خۆش بوو، لەمحەللەی کافران مەشغووڵی بانگ دان بوو، وەختێک موئمینانی موخلیس دەنگی بانگی ویان گوێ لێبوو، بەپەلەهاتنەلای وی و بەخواهیش پێیانکوت، ترسی ئەوەمان هەیەکەبانگی تۆ بەو دەنگ و سەدایەت کافرانی محەللەدەگەڵ ئێمەبەشەڕ بدا، وزۆر فیتنەچا بن، بەخاتری خودا بانگ مەڵێ، بەڵام موئەززین گوێی نەدانێ، و هەر وەها مەشغووڵی بانگ دان بوو،موئمینان مونتەزیری ئاشووب و غەوغای کافران بوون کەلەناکاو دیتیان کافرێک بەڕوویەکی شادوپێکەنین و بەدیاری وهەدیەی زۆر لەموئەززین دەگەڕا،و دەیکوت ئەو موئەززینەدەنگ خۆشەلەکوێیە؟پێیانکوت چ کارت بەو موئەززینەیە؟کوتی کچێکم هەیەزۆر لەمێژ بوو دەی ویست کەموسەڵمان بێ، ئەمنیش بەو خاترەبێ حەد نارەحەت بووم، نەسیحەتی هیچکەسی قەبووڵ نەدەکرد، تاکو ئەو موئەززینەدەستی بەبانگ دان کرد، وبۆ هەمیشەئەمنی لەنارەحەتی نەجات دا .. ماجەڕا بەو جوورەبوو کەوەختێک دەنگی بانگی وی لەمەعبەدی ئێمەبیسترا، کچەکەم کوتی ئەو دەنگەناخۆشەچییە؟کەدەی بیسم کچەکی دیکەم بەوی کوت

ئەوەدەنگی بانگی موسەڵمانانەکچەکەم باوەڕی نەکرد ولەنەفەرێکی دیکەی پرسی ئەویش هەرواى جواب داوە،کچەکەم موتمەئین بوو کەئەو دەنگەبەراستی دەنگی بانگی موسەڵمانانە، لەموسەڵمان بوون پەشیمان بۆوەوئاگری ئیمان بەئیسلام لەموحیتی قەلبی وی کووژاوە، ولەو وەختەدڵم ئاسوودەبووەولەژێرباری گرانی غەم ونارەتی نەجاتم بووە، وبەشوکرانەی ئەو نەجات بوونەچەن هەدیەک دەدەم بەو جەنابی موئەززین ..

یەک موئەززین دەنگی ناخۆش بوو گەلێ    دای لە(دارالکفر ) بانگی نوێژ، چەلێ (٣٣٦٧)

زۆر دەیان کوت، بەو، مەڵێ بانگی نوێژ    تا نەبێ جەنگ و خسوومەت، زۆر درێژ (٣٣٦٨)

گوێی نەدا، وان خۆی لەوان کرد،گێژ و وێژ    دای لە( دار الکفر) جا، بانگی نوێژ (٣٣٦٩)

خەلک بوویان زۆر لەفیتنەی عام، هەراس    کافرێک هات بوو،بەدەس وی، یەک کراس (٣٣٧٠)

شەمع و هەڵوا،گەڵ کراسی وا، ڕەفیق    هەدیەبوو، هینایی، ئەو وەک یەک ڕەفیق (٣٣٧١)

هات بە پرسین، کوا موئەززین ،جێی ئەدی؟    دڵنشینە، دەنگی خۆشی بێ‌حەدی (٣٣٧٢)

کوانێ کوێی بوو دڵنشین، ئەو دەنگی پیس؟    ئەوکوتی هات دەنگی وی بۆ نێو کلیس (٣٣٧٣)

من هەمەیەک کچ، لەتیف و زۆر سەنی    زۆر لەمێژ بوو ئارەزووی بوو، موئمینی (٣٣٧٤)

هەر ئومێدی بوو کەموئمین بێت ئەو    کافران پەندیان دەدا، زۆر، ڕۆژو شەو (٣٣٧٥)

نێو دڵی وی گرتبووی ئیمان قەرار    من وەکوو عوود، ئەو غەمەم بوو، جێگەنار (٣٣٧٦)

من بەدائیم بووم، شکەنجەو دەردو غەم    عیشقی دینی زیاد دەبوو، ئەو دەمبەدەم (٣٣٧٧)

من لەبۆ وی نەمدەدی چارێک نیشان    تاکو بیستی لەو موئەززین، ئەو ئەزان (٣٣٧٨)

جا، کچم دەیکوت، چییەئەو دەنگی بەد؟    دێتەگوێم ناخۆشەئەو، زیاتر لەحەد (٣٣٧٩)

من وەتی هەم، دەنگی وا ناخۆش و پیس    نێو کلیساو دێر هیچ کات نەم دەبیس (٣٣٨٠)

خوشکی پێیکوت بەو سەدا بێژن ئەزان    هەم عەلامەت هەم شیعاری موئمینان (٣٣٨١)

نەی دەکرد باوەڕ، لەئیدی کرد، سوئاڵ    جواب دراوە، هەر وەها، بێ قیل و قال (٣٣٨٢)

ئەو کە دیتی وایە ڕەنگی زەرد بوو    زۆر لە موسلیم بوونی خۆی دڵسەرد بوو (٣٣٨٣)

من نەجاتم هات لەدەس ڕەنج و عەزاب    دوێ شەوێ نوستم، بەبێ خەونی خەراب (٣٣٨٤)

دەنگی وی بوو ڕاحەتی وا، داوەمن    بۆیەهەدیەم پێیە، بۆ ئەو پیاوەمن (٣٣٨٥)

هەرکەدیتی پێیدەکوت، ها، بگرەلێم    هەدیە چونکە ڕاحەتیت تۆ داوە پێم (٣٣٨٦)

تۆ لەگەڵ من چونکەچاکەت کرد و بیر    بوومە، بەندەت،تاکو هەم، من موستەمیر (٣٣٨٧)

پووڵ و ماڵم گەر هەبا،من بێ ژمار    بۆم دەکردی پڕ لەزێڕی سوور، زار (٣٣٨٨)

مەکرو فێڵ و حیلەیە، ئیمانتان ڕێ لەدین دەگرێت چەشنی ئەو ئەزان (٣٣٨٩)

حەسرەتم ئەمما هەیە، بێ حەد مەزید بۆ هەمان ئیمان و سیدقی، بایەزید (٣٣٩٠)

چەشنی ئەوخاتوونی دیتی گانی کەر حەسرەتی خوارد و کوتی خاکم وەسەر (٣٣٩١)

گان کەوابێتن، بەرەنەدەن کەر،یەقین مێر دەکانمان، دێن دەنێو قوزمان دەڕین (٣٣٩٢)

حەققی ئیمانی ئەدا کرد، بایەزید ئافەرینی زۆر، لەو شێری وەحید (٣٣٩٣)

بچتەیەم ئیمانی وی قەترێک ئەگەر یەم دەبێ پنهان و، نای مێنێ، ئەسەر (٣٣٩٤)

وەک لەنێو جەنگەڵ کەوێ، یەک زەڕڕە، نار گشت لەنێو ئەو زەڕڕەفانین،گیاوو دار (٣٣٩٥)

وەک خەیاڵی لەشکرێک یا شەهریار وەختی شەڕ دوژمن دەبێ بەو تار ومار (٣٣٩٦)

کەو کەبێک خۆی دانیشان، نێو ئەحمەدی تا فەنابێ، گەو هەری کفرو بەدی (٣٣٩٧)

هەرچی ئیمانی هەبێ دەی بێ، ئەمان کفری خەڵکی دیکەما، نێو دووگومان (٣٣٩٨)

کفری مەحزی پێشوواں، نەی ما تەوان یانەئیسلام هاتەجێی، یا، بیمی وان (٣٣٩٩)

من میسالم کوت کەمەتڵەب کا، زهوور نین میسالانم، نەزیری، زەڕڕە، نوور (٣٤٠٠)

زەڕڕەیانی شەیئی چووکی، مونجەسیم زەڕڕەنایێ، شاریقی لا یەنقەسیم (٣٤٠١)

من کەزەڕڕەم کوت مەرامم بوو خەفی تۆ کەمەحرەم نی بەیەم، هێستا کەفی (٣٤٠٢)

ئەو هەتاوی نەیبیری ئیمانی شێخ گەر نیشانداز،زوو، لەشەڕقی گیانی شێخ (٣٤٠٣)

ئەو جیهانەگەنج دەبێ تا ژێر زەمین ئەو جیهانی دیش دەبێ، خولدی بەرین (٣٤٠٤)

ئەسڵ و ڕیشەی گیانی وی نووری مونیر ئەسڵ و ڕیشەی جیسمی وی، خاکی حەقیر (٣٤٠٥)

ما عەجەب لەو دووانە، ئەو بوو،کامەیان موشکلێکەحەل نەبوو بۆم، مامە، گیان (٣٤٠٦)

ئەو کەجیسمە، ئەی برا، چی بوو، گییان پڕ بەنووری وی دبن، حەو ئاسمان (٣٤٠٧)

ئەو تەنەی ئاخرچییە؟ گەر گیانەئەو مام عەجەب من، کامەیە، لەو دووانەئەو (٣٤٠٨)

**حیکایەتی ئەو ژنەی کەبەمێردەکەی کوت پشیلەگۆشتەکەی خوارد، مێرد پشیلەکەی بەتەرازوو کێشا، نیوەمن بوو، کوتی ئەی ژن گۆشتەکە، کەمێک لەنێو مەن زیاتربوو، ئەگەر ئەوەگۆشتەکەیەپشیلەکوا؟ وئەگەر ئەوەپشیلەیە، گۆشتەکەکوا؟..**

**خولاسەی داستان ..**

کابرایەک ژنێکی فێڵبازی هەبوو ڕۆژێک کابرا نیومەن گۆشتی کڕی و بۆ ماڵی بردەوە تاژنەکەی غەزایەک ساز بکا، وبەزیرایی لەمیوان بکا، ژن کەزۆرخۆرو نەو سن بوو، گۆشتەکەی کردەکەباب و بەدزی خواردی، پاش ماوەیەک کابرا هاتەوەوکوتی زوو بڕۆ بەو گۆشتەی

کەکرپومەغەزایەک دروست بکە، کەئێستا، میوان دەگەنێ، ژن زۆر بەئارامی و لەسەرخۆیی کوتی پشیلەگۆشتەکەی خواردووە، برۆ گۆشتی دی بکڕە، کابرا کەژنەکەی خۆی چاک دەناسی، بانگی نۆکەرەکەی کردو پێیکوت برۆ تەرازوو یەک بێنەتا ئەو پشیلەبکێشم، پشیلەکەی کێشا، وەزنی پشیلەکەش نیومەن بووکابرا زۆر بەتووڕەیی بەژنەکەی کوت، ئاخر ئەی ژن وەزنی پشیلەنیو مەنە، گۆشتەکەش نیو مەن بوو، ئەگەر ئەوەپشیلەیەئەدی گۆشتەکە، کوا؟ و ئەگەر ئەوەگۆشتەکەیە، ئەدی پشیلەکوا؟..

یەک نەفەرپیاوی سەبوورو بوردبار — یەک ژنی بوو فێڵەبازو نابەکار (٣٤٠٩)

هەرچی دەی هیناوە، دەیکرد ژن تەلەف — پیاو بەناچار نەیدەکوت هیچ، بەو تەرەف (٣٤١٠)

گۆشتی بۆ میوان کڕی ئەو خاسەمەرد — هات گەڕاوە ماڵ بەدوو سەت ڕەنج و دەرد (٣٤١١)

ژن هەمووی،برژاندو خواردی گەڵ شەراب — پیاو کەپرسی، جوابی داوە، ناسەواب (٣٤١٢)

پیاو کوتی میوان کەدین، گۆشت کوا ئەدی؟ — چۆن دەبێ میوان غەزا نەخوا، ئەدی؟ (٣٤١٣)

ژن کوتی خواردی پشی، ئەو گۆشت، هەموو — بکڕەگۆشتی دی، ئەگەر لازمتەزوو (٣٤١٤)

نۆکەری گازکرد،تەرازوو، بێنەتا — بەو بکێشم، ئەو. پشیلەی بێ خەتا (٣٤١٥)

نیو مەنێک بوو ئەو پشی کێشا، ئەگەر — رووی لەژن کرد جا،کوتی ئەی حیلەگەر (٣٤١٦)

گۆشت نیو مەن بوو لەگەڵ یەک دانەسیر — ئەو پشیلەش نیو مەنە، ئەی پاک زەمیر (٣٤١٧)

گەر پشیلەئەوەهەیە،گۆشت کوا، ئەدی؟ — گەرکو گۆشتە، کوا پشیلەم، بۆ نەدی؟ (٣٤١٨)

ڕووح چییەگەر بایەزید، تەنها تەنە؟ — کێ یەئەو تەن؟ ئەو کەڕووحی ڕەو شەنە (٣٤١٩)

زۆر تەعەججوب ئاوەرە، ئەی یاری مەن — کاری تۆ نابێ وەها، هەم کاری مەن (٣٤٢٠)

هەردوو ئەو بوون، خۆ بەڵام بۆ زۆری زەرع — دانەئەسڵە،هەرچی،کا، بێ بوو بەفەرع (٣٤٢١)

وەسڵی ئەزداد حیکمەتی زاتی خودا — ڕان و ئەستۆ، پێکەوە، قەسساب دەدا (٣٤٢٢)

ڕووح بەبێ قاڵب لەدەستی نایەکار — قالبیش بێ ڕووح دەبێتن سست و سار (٣٤٢٣)

جیسمی تۆ ئاشکار وگیانی تۆ نیهان — ڕاس دەبێ بەو دوانە، ئەسبابی جیهان (٣٤٢٤)

گەر لەیەک سەر، دەی،بەئاو، تۆ،یا بەخاک — ناشکێتن ئەو سەرەو، نای بێ، چ باک (٣٤٢٥)

بت هەویتن تۆ، کەبشکێنی سەرێک — خاک و ئاو دێنی، دەدەی ئەو دوانەلێک (٣٤٢٦)

گەر شکاندت،سەر، دەچێ ئاو لایی، ئەسڵ — خاک لەبۆ لای خاک دەچێتن،ڕۆژی فەسڵ (٣٤٢٧)

حیکمەتێکی بووی خودا، لەو ئیزدیواج — هاتەدی، چون بوو نیاز، هەم بوو لیجاج (٣٤٢٨)

هەن لەنێو ئەزداد، زۆر پەیوەندی دی — وەک ئەوانی گوێ نەبیست و چاو نەدی (٣٤٢٩)

کوا دەما گویێ، بیستبای گەر گویێ، ئەوان؟ کوا دەخۆی دا، ڕا دەگرت، گفت و بەیان؟ (۳۴۳۰)
گەر کو دیبایان هەتاو، بەفرو سەهۆڵ فیکری یەخ بوونیان دەنا، ژێر خاک و خۆڵ (۳۴۳۱)
دەبینەئاوی جوان و ساف و بێ گرێ چادەکا داوودی( با ) لەو ئاو زرێ (۳۴۳۲)
جا دەبوو دەرمانی گیانی گشت دار دار دەبوون بەو ئاوەشادو، بەختیار (۳۴۳۳)
ئەو سەهۆڵەی هەر سەهۆڵ ما،سەخت و، سار (لامیساسی ) بوو لەگەڵ، داران، وتار (۳۴۳۴)
جیسمی وی زۆر بوو،لەئولفەت مونزەوی شوحجی نەفسی خۆیی، بەس بوو،سەهمی وی (۳۴۳۵)
سوود دەدا، جار جار، دەکا، فێنک، جگەر ئەو لەشین کردن، بەڵام، نیتی خەبەر (۳۴۳۶)
ئەی ئەیاز ئەستێرەکەت، زۆر عالییە ڕێگەلایق بەو، هەموو، بورجێک نییە (۳۴۳۷)
گشت وەفای کوا،لا،پەسەندن، هیممەتت؟ گشت سەفای کوا،مونتەخەب لان،سەفوەتت؟ (۳۴۳۸)

**داستانی ئەو ئەمیرەی کەبەغولامەکەی کوت، شەراب بێنە، غولام چوو گۆزەی شەرابی هینا لەڕێگا دا زاهیدێک هەبوو ئەمر بەمەعرووفی دەکرد، بەردێکی لەگۆزەکەدا،گۆزەکەی شکاند ئەمیر بیستی، وویستی کەزاهید تەنبێ بکا، وئەو داستانەدەزەمانی عیسا،( علیەالسلام ) دابوو، کەهێستا شەراب حەرام نەکرا بوو، بەڵام ئەوزاهیدەنەفرەتی لەپەلیدی و لەززەت و،خۆشگوزەرانی هەبوو..**

**خولاسەی داستان ..**

دەزەمانی پێشوو دا ئەمیرێک شەراب خۆر هەبوو، شەوێک لەناکاو میوانی بۆ هات، ئەمیر بەغولامەکەی کوت گۆزەیەک هەلگرەوبرۆ لای فڵان مەسیحیە، و شەرابێکی زۆر باش بکرە، وبی هێنەئێرەغولام بەپەلەچوو شەرابی کری وبۆ لای ماڵی ئەمیر گەڕاوە، لەڕێگادا زاهیدێک تووشی ئەو غولامە بوو و لێی وەشک کەوت، کوتی ئەی غولام چیت دەگۆزەدا یە؟ غولام کوتی شەرابێکم کڕیوەو بۆ فڵان ئەمیرەی دەبەم، زاهید کوتی مەگەر پیاوی خودا، شەرابیش دەخواتەوە؟ جا بەردێکی هەلگرت و لەگۆزەکەی دا، و شەراب، ڕژا سەر عەرزی وغولام بەترسی زۆر و دەستی خاڵی بۆ ماڵی ئەمیر هەڵات ئەمیر زۆر بەتەعەججوب لێی پرسی کوا شەراب؟ غولام بەسەرهاتی خۆی وزاهیدەکەی بۆ گێڕاوە.. وەختێک کەئەمیر ئەو بەسەر هاتەی بیست زۆر تووڕەبوو، ولەجێی خۆی ڕاپەڕی، وبەغولامی کوت پێم بڵێ بزانم ماڵی زاهید لەکوێ یە؟ماڵەکەی ویم پێ نیشان دە، تا بەگورزی گران لەسەری بدەم ئەمیر بەهەڕەشەو گوڕەشە،هاتەدەرکی ماڵی زاهید، زاهید لەترسان خۆی شاردەوە،خەڵکی ئەو مەحەللەوەختێک

ئاگرێک لازم بوو ئاوی خوای لەسەر     چەشنی یووسوف، خوای پەنا، وەختی خەتەر (٣٨٧٣)

لەو زولەیخای وا لەتیف و شۆخ و شەنگ     لای دەدا خۆی چەشنی شێرانی زرەنگ (٣٨٧٤)

جا گەڕاوەلای وەتەن، ئەو زۆر مەدار     مەنزڵێکی ویست، بخا، نێو لێڕەوار (٣٨٧٥)

عیشقی وی هێندەی هەبوو گەرماوو، تین     بۆی نەدەکرا، فەرقی ئاسمان و زەمین (٣٨٧٦)

ئەو لەخێوەت ویستی بچتەلای کەنیز     عەقڵ و ترسیش لەو خەلیفە، جا، نەچیز (٣٨٧٧)

شەهوەتت لێدا دەهۆڵ گەر کو لەچۆل     چی لەدەس دێ، عەقڵی تۆ، ئەی گێژو حۆل (٣٨٧٨)

سەت خەلیفەی، لا، وەکوو، یەک مێش فەقیر     ئەوکەسەی بۆ شەهوەتی خۆی بووئەسیر (٣٨٧٩)

ئەو دەمەی دانیشت بەڕووتی پاڵەوان     نێو دوولاقی ئەو کەنیزەی زێدەجوان (٣٨٨٠)

ئەو دەمەی ئالەت دەچێی خۆی دا دەبوو     هەنگەمەو، غەو غا، لەلەشکر چادەبوو (٣٨٨١)

ڕاپەڕی قوون ڕووت دەهات بۆ لایی سەف     شێری تیژی چەشنی ناری بوو بەکەف (٣٨٨٢)

دی کەشێرێک نێر و ڕەنگ ڕەش، نێو، نەیان     هاتووە کردوویە هێرش، ناگەهان (٣٨٨٣)

جا لەئەسپان حیلەحیل پەیدا دەبوو     گشت تەویلەو خێوەتان،تێک چوون هەموو (٣٨٨٤)

شێر لەبۆسەڕاپەڕی بۆ لایی جەم     بیست گەزان چوو بۆ حەوا، وەک مەوجی یەم (٣٨٨٥)

پاڵەوان زۆر مەردو زۆر بێ باک بوو     هاتەپێش وەک شێری مەست، چالاک بوو (٣٨٨٦)

جا سەری لەت کرد بەشیر، مەردانە، ئەو     جا،دەچۆ لای خێوەتی ئەو جوانە، ئەو (٣٨٨٧)

گەر گەڕاوەلای کەنیزەک ئەو دلێر     هێستە، دەسگای ڕوو بەژوور بوو، نەک بەژێر (٣٨٨٨)

کەوتەشەڕ گەڵ شێری زۆر چالاک و چوست     ئالەتی وی هەر لەسەر پێ ما، نەنوست (٣٨٨٩)

ئەو بوتی جوان چەشنی مانگی ئاسمان     مات دەما، لەو پیاوەتی ئەو قارەمان (٣٨٩٠)

جووت دەبوون ئەو دوو، بەشەهوەت ئەو زەمان     بوون بەیەک جا،ئەودەمی ئەودووگیان (٣٨٩١)

گەرکو وەسڵی یەکتری بن دووگیان     دێ لەغەیبی، گیانەکی دی، بێ گومان (٣٨٩٢)

گەر نەبێ مانیع یەقین خۆ، وا دەبێ     گیانەکی دیکەش، لەژن پەیدا دەبێ (٣٨٩٣)

هەردەمێک دوو کەس بەدۆستی یا بەکین     کۆ وەبن، پەیدادەبێ، سێهەم، یەقین (٣٨٩٤)

جا دەبێ مەو لوود لەغەیبی، ئەو سووەر     لەو جیهانی دیت، ئەوان دێن، بەر نەزەر (٣٨٩٥)

ئەو نەتایج گشتی مەولوودی قەرین     هەرقەرینێک پێی نەبی شاد، ئەی وەزین (٣٨٩٦)

ئینتیزارت بێت، ئەو میقات ئەتۆ     بگرەڕاس، ئیلحاقی زووڕییات ئەتۆ (٣٨٩٧)

گشتییان مەولوود لەئەسباب و لەکار     بۆ هەموویان هەیئەت و شکڵ و، وتار (٣٨٩٨)

جا لەجەننەت دێ سەدای وان، دەمدەمە     وەرنەلان، زوو،ئێوە، ئەی غافڵ لەمە (٣٨٩٩)

گیـــان لـــەدونیای دیکەهـــەیتی ئینتیـــزار خـــۆت مەگنخێنـــەو،وەرە، دەی زوو، بـــەغار (٠٠

پاڵـەوان ڕێـی ون بـوو، بـەو سـوبحی درۆ چەشـنی مێشـێک بـوو، کەکەوتـەدیگی دۆ (٠١

**پەشیمان بوونەوەی ئەو سەر لەشکرەلەو جینایەتـەی کەکردی وسوێند دانی وی ئەو کەنیزەکەئەو بەسەرهاتەبەخەلیفە نەڵێ ..**

چەنـد ڕۆژێـک پـاش، کـەوای کـرد پاڵـەوان زۆر پەشـیمان بـۆ وە، لـەو جـورمی گـران (٠٢

ســـوێندی دا، وا، ئەکـــەنیزەی مەهلـــەقا لای خەلیفـــەهیچ مـــەڵێ لـــەو ماجـــەڕا (٠٣

گەر خەلیفـەش دی کـەنیز،زوو بوو،بەمەست بـوو بەڕیسـوا،عەقڵ و هۆشـی چوو،لەدەسـت (٠٤

جـوانتری دی زۆر لـەوەی بـۆی بـوو بـەیان خـۆ، وەکـوو دیـتن نییـە، بیسـتن، چ ئـان (٠٥

وەسـف، تەسـویرەفەقەت بـۆ چـاوی هـۆش ســووڕەتیش بــۆ چــاو بزانــەتۆ، نــەگۆش (٠٦

یـەک نەفـەر کـردی لەیـەک زانـا سـوئال حـەق چییـەو، باتـڵ چییەئـەی خـۆش مـەقال (٠٧

گـوێی دەگـرت، پێیکـوت کەئـەو هـە، باتڵـە چاوحەقـــە، چونکەیـــەقین بـــەو حاســـڵە (٠٨

گـوێ بەنیسـبەت چـاو باتـڵ بـوو، یـەقین ئەغلـەبی گوفتـار نیسـبین، ئـەی ئـەمین (٠٩

خـۆ، لـەنووری خـۆر، خوففـاش بـێ بەشـە نێـو خـەیاڵی وی هـەتاوی گـەش، هەشـە (١٠

پـــڕ دەکـــاتن بـــیم خـــەیاڵی وی لـــەتاو ئـــەو خـــەیاڵ دەیباتـــەنێو زوڵمـــەت بـــەتاو (١١

جـــا، خـــەیاڵی نـــوور دەترســـێنێت ئـــەو بۆیـــەلای وی خۆشـــەزۆر، تاریکەشـــەو (١٢

چـون لـەدوژمن زۆر هەتـە، فیکـرو خـەیاڵ ئینتیخابـت کـرد ئـەتۆ، دۆسـت و هـەواڵ (١٣

کەشـفت ئـەی مووسـا لـەکێوی دا، کـەمێ بـۆ خەیاڵـدار، سـەختەحەملی کـا، دەمـێ (١٤

تـۆ مەبـە مـەغروور، بڵـەی مـن قـابلم بـەو خەیاڵانـەی هـەمن، مـن واسـڵم (١٥

قـەت خـەیاڵی جـەنگ، نـەی ترسـاند کـەس (لاشـــــەجاعەقەبلەحەڕبین ) بگـــــرەدەس (١٦

شەخسی حیزیش گەر کو بووی بۆ جەنگ خەیاڵ خـۆی دەدا نیشـان،وەکوو، فەرزەنـدی زاڵ (١٧

حەملـەبۆ سـەر نەقشی ڕۆستەم، نێـو حـەمام سـەهلەبۆ هـەر شەخسـی گێـل و گێـژو خـام (١٨

ئـەو خـەیاڵی سـەمعی موبســەر بێ،ئەگـەر حیز،کە، هیچ، خۆ، ڕۆستەمیش دەی بێ، حـەزەر (١٩

تـۆ تـەلاش کـە، چیـت لـەگوێ دا، بێتـەچاو تـاکو باتـڵ، بـێ بەحـەق، نـاقیس تـەواو (٢٠

ئەو دەمی دووگوێت دەبن وەک چاو دەقیق دەبنەگـەو هـەر بێگومـان، دوو گـوێی عـەقیق (٢١

دەبنەئاوێنەهـــەموو ئـــەعزایی خـــۆت دەبنەچاووگـەو هـەری نێـو سـینە، بـۆت (٢٢

گـوێ، خـەیاڵێک نێـو وجـوودت، چادەکـا ڕێنمـــوونی وەســـڵی زاتـــی خـــوا، دەکـــا (٢٣

تـــۆ تـــەلاش کەزێـــدەبێتن ئـــەو خـــەیاڵ تـــا بەمـــەجنوون ڕێ نیشـــان داتـــن دەلاڵ (٢٤

ئـەو خەلیفــەی گێـل و گێــژو بــێ هونــەر ماوەیـەک خـۆ ش، گـەڵ کـەنیزی بردەسـەر (٣٩٢٥)
گەرکو موڵکت بێت بەینی غـەرب و شـەرق چونکــەدەڕوا، بگرەئــەو، تۆ،چەشــنی بــەرق (٣٩٢٦)
مەملەکــەت گــەر کــو نــەبێتن جاویــدان چەشـنی خـەونی بگرەتـۆ، ئـەو، ئـەی نـەزان (٣٩٢٧)
چیت لەدەس دێ، ئەو غـرورەی تۆ کەبووت؟ بێــت وبگرێ،چەشــنی جەللادێک،گــەرووت (٣٩٢٨)
مەئمــەنێکیش خــۆ لــەنێو دونیــا هەیــە گەر چی دوو ڕوو، پێت دەڵێتن، کوا هەیە؟ (٣٩٢٩)

## حوججـەتی مـونکیرانی ئـاخیرەت و بـەیانی زەعفـی ئـەو حوججەتـە، چـون خولاسـەی حوججەتی وان ئەوەیە، کەئێمەئەو مەتڵەبەنابینین ..

حوججــەتی خــۆ، وا دەکــا ئاشــکار تــەواو گەر شتێک مەو جوود هەبا، دەمدی، بەچاو (٣٩٣٠)
گـەر نـەبینێ یـەک منـاڵ، ئـەحواڵی عــەقڵ کـوا دەکـا عاقـڵ، لەعــەقڵی بـاش نـەقڵ؟ (٣٩٣١)
حــاڵی عیشــقی گــەر نــەزانی عاقڵێــک قــەت لـەباغی عیشـق، کـەم نـابێ، چڵێـک (٣٩٣٢)
گـەر نـەیان دی جـوانی یووسـوف، هـیچ بـرا نێـو دڵـی یـەعقووب، هـەبوو، ئـەو وەک چـرا (٣٩٣٣)
چاوی مووسا دی عەسای خۆی هـەر بـەدار دی بەئــەفعی و کێشــە، چــاوی کردگــار (٣٩٣٤)
چاوی سـەر،گەڵ چـاوی سیر، دەعـوایی بـوو چـاوی سـیر، پیـرۆز، حوججـەت لایـی بـوو (٣٩٣٥)
چاوی مووسا دەستی خۆی دەس دی، نەنوور چونکـەنووربوو، دی بـەنوور، چـاوی غـەفوور (٣٩٣٦)
ئــەووتارەبێ بنــە، ئــەی بــا کــەماڵ لای کەسێک بێ بەش لەڕاز، بوو وەک خـەیاڵ (٣٩٣٧)
چون حەقیقـەت لای ئەوی، فەرجـەو گـەروو تـۆ لـەلای وی کـەم بڵـێ، ئەسـراڕی ( هـوو) (٣٩٣٨)
ئێمـەلان فـەرج و گـەروو هـەردوو، خـەیاڵ بۆیــەدەنوێنێت هــەردەم، گیــان، جــەماڵ (٣٩٣٩)
ئەو کەسەی فەرج وگەرووی کرد خوویی، خۆی ئـەو( لکـم دیـن ولـی دیـن ) هـات لـەبۆی (٣٩٤٠)
ئــەی موحەممــەد مــونکیری وا، وێڵکــەتۆ کـەم لەگـەڵ گوفتـاری کـۆن کـە، گوفتـو گـۆ (٣٩٤١)

## هاتنی خەلیفەبۆلای ئەو کەنیزەجوانەبۆ جیماع ..

ئــەو خەلیفــەکردی قەســتی ئیجتیمــاع چـوو لـەبۆ لای ئـەو کـەنیزەک، بـۆ جیمـاع (٣٩٤٢)
یــادی وی کــرد و بڵینــدی کــرد زەکــەر ویســتی بنوێــت و کــەنیزی، بــێ، لەبــەر (٣٩٤٣)
هەر کەدانیشت نێو دووپای خاتوونی مەست هـات قـەزا، ڕێگـایی عەیشـی وی دەبەسـت (٣٩٤٤)
خش خشی مشکێک، وەگوێی وی کـەووت شـەهوەتی چـوو، ئالەتیشـی، لێـی خــەووت (٣٩٤٥)
ئــەو لــەلای وابــوو کــەمارە، ئــەو ســەدا ژێـر حەسـیر، زوو، تونـد، تـەکانی خـۆی دەدا (٣٩٤٦)

## پێکەنینی ئەو کەنیزە لەزەعفی شەهوەتی خەلیفە و قووەتی شەهوەتی ئەو ئەمیر و حاڵی بوونی خەلیفە لە پێکەنینی کەنیز ..

| | | |
|---|---|---|
| زۆرعەجەب ما ژن، کەوای دێ، ناتەوان | جا بەقاقا، پێکەنی هەر ئەو زەمان | (٣٩٤٧) |
| هاتەبیری، پیاوەتی ئەو پاڵەوان | ئەو کەشێری کوشت و، دەسگاش، وەک سینان | (٣٩٤٨) |
| پێکەنی زیاتر لەحەد، خاتوونی مەست | قەتعی خەندەی خۆی نەهات خاتوون لەدەست | (٣٩٤٩) |
| پێکەنینی بوو شەدید، وەک بەنگییان | نەیدەزانی ئەو دەمی سوودو زیان | (٣٩٥٠) |
| پێکەنینی زیاد دەبوو گشت کات و ئان | چەشنی سێلاو بەند کەبپسێ، ناگەهان | (٣٩٥١) |
| نێو دڵان شادی و کەنین و حوزن و شین | لێک جییان،جێی و مەعدەنی هەموان، یەقین | (٣٩٥٢) |
| مەخزەنی شادی وغەمان زۆر لێک جییان | بەس بەدەس فەتتاحەمیفتاح، بێ گومان | (٣٩٥٣) |
| پێکەنینی لەحزەیەک ساکین نەبوو | جا، خەلیفەتووڕەبوو، زۆر توند خوو | (٣٩٥٤) |
| زوو دەری هێنا لەنێو کالان شێر | بێژەخەندەت بۆچییەتۆ ئەی حەقیر؟ | (٣٩٥٥) |
| قەلبی من بوو لەو کەنینەی تۆ، زەنین | بێژەڕاستی، من فریونادەی، یەقین | (٣٩٥٦) |
| گەر فریوم دەی بەگوفتاری درۆ | یانەبێنی بۆم بەهانەو فێڵ ئەتۆ | (٣٩٥٧) |
| من دەزانم، نێو دڵم، چون ڕەو شەنە | بێژەگوفتاری زەروورییەت، چی هەنە | (٣٩٥٨) |
| مانگە، دڵیان ئەو شەهانی نامدار | گەرچی هەن ژێر هەوری غەفڵەت جارو بار | (٣٩٥٩) |
| یەک چرایان وا، لەدڵ دا، وەختی گەشت | وەختی خەشم و ئاز،دێتەژێری تەشت | (٣٩٦٠) |
| ئەو فەڕاسەت ئێستەبۆ من، یارەخۆ | گەر ئەوەی لازم بوو، نەی لەی، ئێستەتۆ | (٣٩٦١) |
| من بەئەو شەمشێرەدەبڕم گەردەنت | بەهەرەنادا بۆ ت بەهانەگرتنت | (٣٩٦٢) |
| گەر بڵەی ڕاس من ئەتۆ ئازاد دەکەم | ئەزیەتت ناکەم، بەحەق تۆ شاد دەکەم | (٣٩٦٣) |
| حەو عەدەد قورئانی سەر یەک دا دەنان | بۆ کەنیز سوێندی ئەدا کرد، ئەوزەمان | (٣٩٦٤) |

## ئاشکرا کردنی ئەو کەنیزەئەو ڕازەلەلای خەلیفەلەترسی زەخمی شەمشێر ومەجبوورکردنی خەلیفەئەو کەنیزەکەڕاس بڵێ، بۆ پێدەکەنی، دەنا دەت کوژم ..

| | | |
|---|---|---|
| ژن کەعاجز ما، کوتی ئەحواڵ بەوی | پیاوەتی ئەو ڕۆستەمەی بێ حەد قەوی | (٣٩٦٥) |
| شەرحی ئەوحیجلەی لەڕێ دیتی کەنیز | بۆ خەلیفەی کرد بەیان، یەک یەک،تەمیز | (٣٩٦٦) |
| کوشتنی شێر، هاتنەوەی لای خێوەتی | چەشنی شاخی کەر گەدەن مان، ئالەتی | (٣٩٦٧) |
| هەر وەهاسست بوونی ئەوناموس خوواز | خش خشی مشکێک، نەی هێشت، بۆی چ واز | (٣٩٦٨) |
| گشت ڕاز ئاشکار دەکاتن، خوای ئەحەد | چون دەبێ شین، تۆ مەچێنە، تۆوی بەد | (٣٩٦٩) |

ئاوو، هەورو،ئاگرو، ئەو ڕۆژی بەرز — دێنەدەر، ڕازان لەژێر ئەو خاکی عەرز (٣٩٧٠)

پاش گەڵا ڕێزان کەدێتن نەو بەهار — بۆ وجوودی حەشرە، بورهان ئاشکار (٣٩٧١)

گەر بەهار هات ڕاز دەبن ئاشکاربەعام — چی زەوی خواردوویەدێتەدەر تەمام (٣٩٧٢)

دەر دەخا، چی خواردبێ سەرلێوو، زار — تا دەروون و مەزهەبی بێ، ئاشکار (٣٩٧٣)

ڕازی گشت خۆراکی دارو بیخ و بن — گشت لەسەر ئەو دارە، جوان زاهیر دەبن (٣٩٧٤)

هەرغەمێکی دای بەقەلبت دەرد و ئێش — لەو خوماری مەی بوو، تۆ خواردووتەپێش (٣٩٧٥)

لێت عەیان نابێ، بەڵام بێ شک، چ جار — هات لەکام مەی، بۆ تۆ ئەو ڕەنجی خومار (٣٩٧٦)

ئەو خوماریەی دا گوڵی، ئەو دانەیە — ئەودەناسێ، ئەو کەسەی، فەرزانەیە (٣٩٧٧)

تێن لک و گوڵ هیچ شەبیهی دانەخۆ — نوتفەنابێ وەک تەنی مەردانە،خۆ (٣٩٧٨)

وەک هەیبولا خۆ، چ کات نابێ ئەسەر — کوا دەبێتن دانەقەت چەشنی شەجەر؟ (٣٩٧٩)

ئەسڵی نوتفە، نانەکوا بوو چەشنی نان — ئەسڵی عالەم نوتفە،کوا وەک وین ئەوان؟ (٣٩٨٠)

ئەسڵی جیننی‌نارە کوا بوو، چەشنی نار؟ — ئەسڵی هەوران بوو بوخار، نین وەک بوخار (٣٩٨١)

چا دەبوو عیسا لە نەفخەی جەبرەئیل — کوا لەبۆ جەبریل بەسوورەت، بوو مەسیل؟ (٣٩٨٢)

ئەسڵی ئادەم خاکە کوا بوو، چەشنی خاک؟ — قەت ترێ نابێ بەسوورەت، چەشنی تاک (٣٩٨٣)

کوا بەسوورەت بوو، دزین وەک ژێری دار؟ — کەی بوو تاعەت وەک بەهەشتی پایەدار؟ (٣٩٨٤)

قەت چ ئەسڵێک خۆ، نییەچەشنی ئەسەر — بۆت نییەمەعلووم ئەسڵی دەردەسەر (٣٩٨٥)

خۆ بەڵام بێ ڕیشەنابێتن جەزا — بێ گونا ە، کوا، خوا کەسێک ئازا ڕدەدا؟ (٣٩٨٦)

جا ئەوەی ئەسڵەلەبۆ ئەسڵی عەزاب — گەرچی نەش بێ وەک وی، بەو بوو، ئیجتیزاب (٣٩٨٧)

تێ بگەڕەنجت بەخاتر زەللەتە — مەنشەئی ئەو زەللەتەش، یەک شەهوەتە (٣٩٨٨)

ئەو گوناهەت لێ نەبێ مەعلووم ئەگەر — شێن وئیستیغفار بکەی لای دادگەر (٣٩٨٩)

سەجدەکەو، سەت جار بڵێ ئەی خوایی من — لایقم من، میحنەتی وام هەر هەبن (٣٩٩٠)

ئەی مونەززەه،تۆ لەگشت زوڵم و ستەم — بێ گوناەکوا، گیان دەخەیتە،دەردو غەم (٣٩٩١)

من گوناهی خۆم لەلا، مەعلووم نییە — بێ گوناەئەمما،چ کەس، مەغمووم نییە (٣٩٩٢)

چون دەکەی ئەسباب لەبەر عیبرەت نیهان — سەتری جورمانیش کە،ئەی خوای دوو جیهان (٣٩٩٣)

ئاشکرابوونی گوناهی من جەزام — کەیفەرم ئاشکار دەکا جورمم تەمام (٣٩٩٤)

**کاتێک کە خەلیفە لەو خیانەتە ئاگادار بوو تەسمیمی گرت کە بۆی داپۆشی و لێی خۆش بێ و زانی کە ئەو ماجەڕایە جەزای وی بوو، کە، ویستی زوڵم لە ئەمیری موسڵ بکا، (ومن اساء**

فعليها وان ربک لبالمرصاد) هەر کەس خەراپەی بکا دەگەڵ خۆی کردووە، و حەقیقەتەن خوداوەند دە کەمین دایە و ترسا کە ئەگەر تۆڵە بستێنێ بەڵای دی بەسەر بێ، وەک لەو زوڵمە، بەسەری هات ..

گەر وەخۆهات کردی ئیستیغفار شا — کەوتەبیر ئیسرارو جورم و ئیشتیبا ٥)

جا، بەخۆی کوت هەرچی کردم من بەدی — گیانی من ئا خیر جەزای وی هەر دەدی ٦)

چون بەدیم ویست من لەناموسی دەدی — وام بەسەر هات من، وەکوو دیتم بەدی ٧)

من لەدەرکی ماڵی شەخسی دیم دەدا — دای لەدەرکەم پاڵەوانی بەد ئەدا ٨)

هەرچی فیسقی ویست دەگەڵ ئەهلی دەدی — خۆی دەکێشێ ئەهلی خۆی بۆ لای بەدی ٩)

چون جەزای وی غەیری وی، وەک وی نەدی — چون موجازات بۆ بەدی هەر بوو، بەدی ٠)

فیسقی کردت، تۆ بەسەر خۆت دا بەشی — زیاتریش دەودا، بەشی، چون جاکەشی ١)

من لەشای مووسڵ کەنیزم ساند،تەمیز — لێی ستاندم پاڵەوانێک، ئەو کەنیز ٢)

یاری من بوو هەم ئەمانەت داری من — چون غەیان بووم، بۆ غەیانەتکاری من ٣)

ئێستەوەختی کین نییەهەم ئینتیقام — من بەدەستی خۆم، کردم خۆم،خام ٤)

لەو کەنیزەو میرەبگرم کین ئەگەر — بێ گومان من ئەو جەفاشم دێتەسەر ٥)

چون جەزای کاری بەد م دی من عەیان — تازەنای کەم هیچ چەلی دی ئیمتیحان ٦)

دەردی شای مووسڵ شکاندی گەردنم — تازەنادەم، ڕەنجی دۆست و دوژمنم ٧)

خوا لەکەیفەر وای دەکردین باخەبەر — گەر بەدی کەن هەر بەدی تا ن دێتەسەر ٨)

زێدەبوونی جورم و بەد هیچ سوود نییە — غەیری سەبرو مەرحەمەت مەحموود نییە ٩)

کردمان ئێمەستەم ئەی کردگار — زۆرەڕەحمەت، ڕەحمی تۆمان ئینتیزار ٠)

من عەفووم کرد، تۆش عەفوو کەجا ئەمن — لەو گوناهی کۆن و نوێ هەرچی هەمن ١)

شا کوتی جا، ئەی کەنیزی خۆشەویست — کەس نەبیسی لێت، وتەی لێتم، دەبیست ٢)

پێیدەکوت دەت کەم دەگەڵ میر هاو نەفەس — ئەو وتارەتۆ مەڵێ تۆخوا، بەکەس ٣)

تا نەبیتن ئەو لەلای من شەرمەزار — چونکەکردی بەد، چەلێک، باش، سەت هەزار ٤)

زۆر کەرەت کردوومەمن ئەو ئیمتیحان — من بەویم ئەسپارد لەتۆ زیاتر جووان ٥)

زۆر ئەمینم دیت نەم دی، قەت غەیان — ناحەزی من بو و، قەزاکردی عەیان ٦)

جا، ئەمیری گاز دەکرد ئەو شەهریار — خەشمی خۆی ون کرد نەیکرد ئاشکار ٧)

یەک بەهانەی بۆ ئەمیر کوت دڵپەزیر — من دڵم زۆر لەو کەنیزەک بوو نەفیر ٨)

هلو سەرم چون بەو کەنیزەک بوو حەسوود ... چاکەنەم بێ لەو کەنیزەم، من چ سوود (٤٠١٩)

هلوسەری من زۆر ەحەققی، لام نەکەم ... بۆیەنابێ، من ئەوی ئازار بدەم (٤٠٢٠)

خوێتی دڵ دەخوا لەبەر دەردی حەسەد ... بەد بوو حاڵی بەو کەنیزە، زیاد لەحەد (٤٠٢١)

تعهەوێ بیدەم بەشەخسێک ئەو کەنیز ... من لەتۆم چاتر نەدی خۆ ئەی عەزیز (٤٠٢٢)

چون فیداکاریت کرد بۆوی زیاد ... چاک نییەخۆ غەیری تۆ بەو بێت شاد (٤٠٢٣)

ئەو کەنیزەی دا بەمیر، پاشایی، باش ... حیرس و ئازو خەشمی خۆی کرد وردو خاش (٤٠٢٤)

گەرچی نەی بوو شەهوەتی زۆر، وەک کەران ... پیاوەتی بوو پیاوەتی پێغەمبەران (٤٠٢٥)

تەرکی خەشم و شەهوەت و ئاز هێنەری ... بوون هەموویان خەسڵەتی پێغەمبەری (٤٠٢٦)

ێژە دەو دا، با نەبێتن خوویی کەر ... بۆ سەران ئەو سەروەرە، لای دادگەر (٤٠٢٧)

بش مرم، گەر لێم بنۆڕێ کردگار ... چاکترەنەی وێم، خوداو، بم گیاندار (٤٠٢٨)

تەرکی شەهوەت تۆ لەبۆ جەننەت دەبا ... تۆ لەبۆ دوو زەخ، یەقین، شەهوەت دەبا (٤٠٢٩)

دوری جەننەت دەرد و ڕەنج و زەحمەتە ... دەوری دووزەخ هەر هەوایە و شەهوەتە (٤٠٣٠)

ئەی ئەیاز ئەی دێو کوژ ئەی نێرەشێر ... ئەی بەشەهوەت کەم، بەعەقڵ و هۆش بەخێر (٤٠٣١)

گوشتەی گەوران دەوی ناگەن چ کات ... چەشنی بازیچەی منالەئەو لەلات (٤٠٣٢)

ئەی تۆ دیتت لەززەتی ئەمرم عەیان ... بۆ وەفاو ئەمرم نیسارت کرد گیان (٤٠٣٣)

یسی خۆشی ئەمرو تەو فیقاتی وی ... گوێ دەیەتۆ، نێو بەیانی مەعنەوی (٤٠٣٤)

**گەوهەردانی شا، لەمەجمەعی ئەرکانی دەو ڵەت بەدەستی وەزیر کەئەوگەو هەرەقیمەتی چەندە؟وموبالەغەکردنی وەزیر دەقیمەتی ئەوگەوهەرەدا، ودەستوور دانی شا، کەئێستا ئەو گەو هەرەبشکێنەوکوتنی وەزیر کەچۆن ئەو گەوهەرەبشکێنم؟ الی اخر القصه ..**

**خولاسەی داستان ..**

ڕۆژێک سوڵتان مەحموود چۆ مەجمەعی حکوومەتی، دەحاڵێک دا کەتەواوی ئەرکانی دەو ڵەت لەوێ حازربوون، شا گەو هەرێکی گران قیمەتی لەگیلفان هینادەر، ودای بەوەزیر و پێیکوت، قیمەتی ئەو گەو هەرەچەندە؟ وەزیر کوتی زیاتر لەسەت خەلوار زێڕ، دەو کاتەدا، شا، پێیکوت ئەو گەوهەرەبشکێنە، وەزیر کەشکاندنی ئەو گەوهەرەی پێ حەیف بوو، نەی شکاند، شا ئافەرینی بەو وەزیرەکوت وخەڵاتی کرد لەپاشان بەپەردەداری کوت کەئەو گەو هەرەبشکێنە، ئەویش چون پێی حەیف بوو نەی شکاند، شا، ئەویشی خەڵات کرد، بەو تەریقەتەواوی

ئەفرادی حکوومەتی عالی مەقامی،ئیمتیحا ن کرد،تاکو نۆبەی ئەیاز هات، ئەیاز کوتی ناتوانم قیمەتی ئەوگەوهەرەبەیان بکەم بەڵام چون شا، دەستووری بەشکاندنی وی دا، دەی شکێنم، دەوکاتەدا دوو دانەبەردی لەئەنگوچکی خۆی هینا دەر وئەوگەوهەرەی وردو خاش کرد،ئەمیران بەخاتری ئەوکارە، ئەیازیان سەرزەنیش کرد، بەڵام ئەیازکوتی ئیتاعەت لەشا، لەوەگەوهەرە،باڵاترە، شا ویستی کەئەمیرەکان بەخاتری نا فەرمانی بکوژێ، بەخواهیش و شەفاعەتی ئەیاز ئەو کارەی نەکرد ..

ڕووی دەدیوان کرد ڕۆژێک شەهریار — دی لەوێ ئەرکانی دەو لەت بوون دیار (۳۵-

گەو هەرێکی دانیشان، ئەو، موستەنیر — دای دەنا زۆر زوو لەنێو دەستی وەزیر (۳۶-

پێیدەکوت ئەو گەوهەرەدێنێت چەند؟ — پێیدەکوت سەت بار زێڕی دڵپەسەند (۳۷-

پێیدەکوت بشکێنە، دەیکوت، نا، لەبۆ؟ — خێرخوازی گەنج و مولکی تۆمە،خۆ (۳۸-

کوارەوایەگەو هەرێکی هێندەباش؟ — پڕ بەها، بێ وێنە، بی کەم وردو خاش (۳۹-

ئا فەرینی کوت بەوی، پێیدا خەڵات — گەوهەری لێ ساندەوەشای خۆش سیفات (۴۰-

ئەو شەهی جوودو کەرەم دای بەو وەزیر — گشت لیباسی بوو، دەبەر خۆی، کەم نەزیر (۴۱-

ماوەیەک مەشغووڵی کردن شا، ئەوان — ڕازی کۆن و نوێی، لەبۆ کردن بەیان (۴۲-

جا لەپاشان دای بەدەستی حاجبی — پێیدەکوت چەن قیمەتی گەوهەر دەبی؟ (۴۳-

نیسفی موڵکت قیمەتی ئەو گەو هەرە — لەو بەدوور کاتن بەدی، خوای لەو سەرە (۴۴-

شاکوتی بشکێنەپێیکوت حەیفەحەیف — گەوهەری وا، ورد کرێ، ئەی تیژ سەیف (۴۵-

وێڵ کە، قیمەت چاو کەچەندەڕوونەئەو — نووری خۆری زۆر لەلا،خۆ دوونەئەو (۴۶-

بۆ شکانی دەس بەرم چۆن جا، ئەمن؟ — نیمەدوژمن، خۆ بەگەنجی شا، ئەمن (۴۷-

دای خەڵات بەو،بۆی حقووق کرد زۆر زیاد — مەدحی وی کرد، زیاد لەحەد، شای عەدڵ وداد (۴۸-

دای بەدەس قازیلقوزات، جا دوایە، شا — گەوهەری بێ حەد جووانی دڵگو شا (۴۹-

جا ئەویش دەیکوت وەکوو میرانی دی — گشت خەڵاتی پڕ بەها یان لەو دەدی (۵۰-

بۆ هەموویان موستەمەڕڕی زیاد دەکرد — ئەو خەسیسانەی لەڕێگا، لا دەبرد (۵۱-

والەجوابیان داوەپەنجا شێست ئەمیر — چونکەبوویان، گشتی تەقلیدی وەزیر (۵۲-

گەرچی تەقلید بۆ جیهانی دوون ستوون — گشت موقەللید، بوونەڕیسوای ئازموون (۵۳-

**گەیشتنی گەوهەر، پاش دەست بە دەست بوون،بە دەستی ئەیاز و هوشیاری و تەقلید نەکردن لەوان و فریو نەخواردنی وی بە مەکر و فێڵ و ماڵ دانی شا، و خەڵات و بەرات زیاد کردن و مەدحی عەقڵی خەتا کاران ..چونکە شایستە نییە کە موقەللید موسەڵمان بزانرێ، موسەڵمان دەبێ، بەڵام کەم دەبێ کە لە سەر ئەو عەقیدە سابیت بمێنێ، و موقەللید بەسەلامەت لەو ئیمتیحانە دەربچێ چون سەباتی بینایانی نییە.. (الا من عصمه الله ) مەگەر کەسێکی کەخوداوەند ئەوی لەئیشتیبا مەحفووز بکا، چونکەحەق یەکە، وزیدد و مشابیهی حەق زۆرن، موقەللید چونکەئەو ئەزدادانە نا ناسێ، ئەگەر حەق ئەوی مەوریدی عینایەتی خۆی قەرا ر بدا، ئەو نەناسینەزیانێک بەو نادا ..**

ئـــەی ئـــەیاز تـــۆ بێژەبـــۆمن ئاشـــکرا چەنـدەدێتێ ئـەو دوڕەی وەک شـەو چـرا؟ (٤٠٥٤)

ئـەو کـوتی مـن هـەرچی بـی لـەم زیـاترە شـا، کـوتی ئـەو وردو خـاش کـەچاترە (٤٠٥٥)

وردی کـرد بـەو بـەردی نێـو ئـەنگوچکی زوو چـون لـەلای وی وا سـەحیح و بـاش بـوو (٤٠٥٦)

ڕەنگـەدی بـی، ئـەو دەخـەونی دوور لەگـەرد دای دەنـــا نێـــو باغـــەڵی، دوو دانەبـــەرد (٤٠٥٧)

چەشنی یووسوف ئەو دەمەی بوو ژێری چاە ئـاخری کـاری عـەیان کـرد لـەو ئـیلاە (٤٠٥٨)

هەرکسێک فـەتحی بـدا خـوای عـەدڵ و داد وەک یـــەکن لای وی مـــوڕاد و نـــاموڕاد (٤٠٥٩)

هەرکەسێک زامـین بـوو بـۆ وی وەسڵی یـار کـوا دەبێ، بۆی، غـەم شکەست و، کارزار؟ (٤٠٦٠)

گـەر یـەقینی بـوو، تـەرەف دەکرێـت مـات فـەوتی ئەسـپ و فیـل ئـەو دەم توڕڕەهـات (٤٠٦١)

ئەسـپی وی گـەر ویسـت ببـا ئـەو، بـا، ببـا عاقیبـــەت ڕەنجـــی تـــەرەف دەڕوا بـــەبا (٤٠٦٢)

کوا دەگەڵ ئەسپ، پیاو دەبێتەقەومو خوێش؟ پیـــاو لەئەســـپی بـــەس دەوێ، بڕواتـــەپێش (٤٠٦٣)

خـــۆت مـــەدەئازار بـــەخاتر زاهیـــری لابـــەزاهیر چاکەهـــەر مـــەعنا گـــری (٤٠٦٤)

هـەیتی زاهیـد غـەم لەبـەر پایـانی کـار چـی بەسـەر دێ، ئـاخۆ، ئـەو ڕۆژی ژمـار (٤٠٦٥)

هەرلەئـــەووەڵ عارفـــان بـــوون هووشـــیار بـــوون لـــەفیکرو حـــاڵی ئـــاخیر ڕەســـتگار (٤٠٦٦)

عـارفیش هـەبیوو هـەوەڵ، خـەو ف و ڕەجـا ئـەو خەبـەر دار بـوو، نـەمان ئـەو دووانـە،جا (٤٠٦٧)

چونکـەعارف دی کەچانـدی مـاش بـەس چـــاک دەزانـــێ، هەرئەویشـــی دێتـــەدەس (٤٠٦٨)

چونکـەعارف بـوو لەخیلقـەت بـا خەبـەر تـــرس و بیمـــی وی، لەدڵـــدا، چوونـــەدەر (٤٠٦٩)

هـــەبیوو ئـــەو تـــرس و ئومێـــدی کردگـــار ترســـی ڕۆیشـــت و ئومێـــد بـــوو ئاشـــکار (٤٠٧٠)

گەر شکاندی گەو هەری خاس ئەو زەمـان نێـو ئـەمیران چـۆ حـەوا، بانـگ و فیغـان (٤٠٧١)

هێنـــدە بـــۆ بـــێ باکـــە، وەڵـــڵا، کـــافرە هـەرچی وردی کـرد ئەوجوان،گـەو هـەرە (٤٠٧٢)

ئەوگرووهـــەکوێروجاهیل بـــوون کـــەوا وردیـــان کـــرد گەوهـــەری فـــەرمانی شـــا (٤٠٧٣)

دوورەکـی چـا بـوو بەعیشـقی شـەهریار بـۆ لەقـەلب وزیهنـی وان بـوو، نادیـار؟ (٤٠٧٤)

**بەخەراپ زانینی ئەمیران کاری ئەیاز وجواب دانەوەی ئەیاز بەوان ..**

وای بـەمیران گـوت ئـەیازی هووشـیار باشـەگەو هـەر یانەئـەمری شـەهریار؟ (٤٠٧٥)

کامـە باشـە، ئێـوە لاو، ئێـوە و خـودا گەوهـەری وا جـوان وباش، یـا ئـەمری شا؟ (٤٠٧٦)

ئـەی ئەوانـەی دەو هـەوێ گەوهـەر، نەشـا غوولەقوبڵـەی ئێـوە، ڕێگـای ڕاس،کـەنا (٤٠٧٧)

مـن لەشـا، هـەڵناگرم هـیچ کـات نـەزەر چەشـنی موشـریک نیمـە، بنوارمـە، حەجـەر (٤٠٧٨)

بێ‌نەسەب ڕووحێک کەبەردی ڕەنگ‌بەڕەنگ ئینتیخـاب کـاو، لابنـێ پاشـا، لەچـەنگ (٤٠٧٩)

ئـەو بـوتی ڕەنگـین بـاوێ پشـتی سـەر خـالقی ئـەو ڕەنگەبێنەبـەر نـەزەر (٤٠٨٠)

بێرەنێـو جۆگـەو، لـەگـۆزە، بـەر بـدە تـۆ دەرەنـگ و بـۆن، ئـاگر بـەر بـدە (٤٠٨١)

گـەر لـەڕێی دیـن نـی لەجوملـەی ڕێگـران عەبدی ڕەنگ و بۆن مەبە، وەک ژن چ ئان (٤٠٨٢)

بـوون لـەکاری خـۆ ئـەمیرا ن شـەر مـەزار کردیـان لـەو غەفڵـەتی خـۆ ئیعتیـزار (٤٠٨٣)

جا لەدڵیان هات دوو سەت ئاه، ئەو زەمان هـەروەکوو دوو کـەڵ،دەچوو، تـا ئاسـمان (٤٠٨٤)

وای دەدا دەسـتوور بەجـەللاد شـەهریار دوورکە، لێم تۆ، ئەو خەسانەی بەد قەرار (٤٠٨٥)

نینـەلایق بێنـەلای مـن ئـەو خەسـان ورد دەکـەن ئـەمرم، لـەبۆ بـەردێک ئـەوان (٤٠٨٦)

ئـەمری ئێمـەی لا، وەهـا، ئـەهلی فەسـاد بـۆ بـەرێک، ڕەنگـین، دەبـێ خـوارو کەسـاد (٤٠٨٧)

**قەست کردنـی شـا، کوشتنی ئـەمیران وشـەفاعەت کردنـی ئـەیاز لـەپێش تـەختی شـا، کە(العفواولی)..**

ڕاپـەڕی جـا، ئـەو ئـەیازی میهرەبـان چـو لـەبۆ پـێش تـەختی ئـەو پاشای زەمـان (٤٠٨٨)

ئەوگەرووی خۆی گرت پاشی سەجدەیەک ئەی شەهی لێت مان عەجەب چەرخوفەلەک (٤٠٨٩)

ئـەی لـەتۆیان گـرت هـەموویان فـەڕڕوخی ئەی لەتۆ یان گرت سەخاوەت،گشت سەخی (٤٠٩٠)

ئـەی کـەریمێکی کەگشـت جـوودی جیهـان لای عـەتاو جـوودت دەبـن فـانی و نیهـان (٤٠٩١)

ئـەی لـەلوتفت سـوورەگوڵ بـوو شـەرمەزار دای دڕی ئێقـەو بـەرۆکی تـاکو خـوار (٤٠٩٢)

تـۆ غـەفووریت کـردی غـوفران چـاو، تێـر عـەفـوی تـۆ مـەغلووبی ڕێـوی کـرد، شـێر (٤٠٩٣)

ئـەو کەسـەی ژێـر پـێ دەنـێ فـەرمانی تـۆ تەکیـەگای وی بـوو فەقـەت غـوفرانی تـۆ (٤٠٩٤)

موجریمـان بـوون، بۆیـەغافڵ هـەم جەسـوور چونکەتۆ بووی زیاد لەمـەرزو حـەد غـەفوور (٤٠٩٥)

خـۆ جەسـارەت غەفڵـەتی دڵ چـا دەکـا سـاغەچاوی هـەرچی، تـەعزیم خـوا، دەکـا (٤٠٩٦)

چی لەغەفلەت یا لەنیسیان فێر بوو  ئاگری تەعزیم دەی سووتێنێ، زوو (٤٠٩٧)

هەیبەتی وی هۆش و هوشیاری دەدا  سەهوو نیسیانی، لەدڵ، تاری دەدا (٤٠٩٨)

وەختی تاڵان کردنان نانوون خەڵق  تاکو کەس نەدزێ لەوان، هیچ ڕەخت و دەڵق (٤٠٩٩)

گەر وەلاچێ خەو لەترسی ڕەخت و دەڵق  چۆن خەوی نیسیان دەبێ، گەڵ ترسی حەڵق؟ (٤١٠٠)

(لاتوا خذ ا ن نسینا) بوو گەواه  بۆ ئەوەی نیسیان بەوەجهێک بوو گوناه (٤١٠١)

چون بەکامیل نەیدەکرد تەعزیم چ جار  نەی دەبوو نیسیان دەنا، قەت وەختی کار (٤١٠٢)

گەرچی نیسیان حەتمی هەم ناچار بوو  خۆ لەنێو ئەسباب بەشەر موختار بوو (٤١٠٣)

هەرکەسێک سست بێ لەتەعزیمی خودا  دێ لەبۆی نیسیان، یا سەهوو، خەتا (٤١٠٤)

چەشنی مەستێکی جینا یەتکارەئەو  خۆی بەمەعزوور دادەنێ ئەو جارە، ئەو (٤١٠٥)

پێی دەڵێن عیللەت بەڵام ئەی نا لەبار  هەر لەخۆت بوو گەر لەدەس چوو ئیختیار (٤١٠٦)

خۆی نەهات بێ هۆشی، بەل هینات ئەتۆ  ئیختیار لاچوو، بەتۆ، نەک سەر بەخۆ (٤١٠٧)

بێ تەلاش هاتبا لەبۆت مەستی ئەگەر  حیفزی عەهدی تۆی دەکرد ئەو خوای لەسەر (٤١٠٨)

خوا دەبێتن ئەو دەمی بۆ تۆ پەناه  من غولامی لەغزیشی مەستی ئیلاه (٤١٠٩)

لەو تەجەللیت گشتی ئیحسانات کەمێ  لەو تەجەللیت عەفوی گشت عالەم نەمێ (٤١١٠)

مەدحی عەفوی تۆ دەکەن عەفوان هەموو  بێ نەزیرە(ایها الناس اتقوا ) (٤١١١)

دوور نەبێ با لێت،ببەخشەگیانیان  چونکەشیرین کامی تۆن،ئەو جانییان (٤١١٢)

خۆشەڕەحمەت بەو کەسەی تۆی دی، درێ  فیرقەتی تاڵت بەوی هەڵناگرێ (٤١١٣)

بلەی هیجران و فیراق تۆ جا، مەکە  هەرچی دەت وێ بیکەئەمما، وا مەکە (٤١١٤)

مەرگی تاڵی توێ توێ، دووسەت هەزار  وەک فیراقی ڕۆیی تۆ تاڵ نین، چ جار (٤١١٥)

تاڵی هیجران هەم لەپیاوا ن هەم ژنان  دوور بکە، ئەی بۆ گوناهکار موستەعان (٤١١٦)

بۆ ویساڵت مردنم لا، چاترە  تاڵی هیجرانت لەنار بالاترە (٤١١٧)

جا دەڵێ کافر لەنێو ئاگر ئەگەر  لێم بنۆڕی هیچ نامبێ، غەم لەبەر (٤١١٨)

ئەو نەزەر شیرین دەکا ڕەنجی گران  خوێن بەها بۆ دەست و بۆ پێی ساحیران (٤١١٩)

## تەفسیری گوفتاری ساحیران بەفیرعەون دەوەختی کەیفەر و موجازات کە (لا ضیرا نا الی ربنا منقلبون )

گەیەئاسمان نارەتەی (لاضیر) ە، خۆ  بوو بەگۆچان نارەتەو ئاسمان، بەگۆ (٤١٢٠)

زەربەتی فیرعەون بۆمان بێ زەرەر  قەهری عام مەغلووبی لوتفی خوای لەسەر (٤١٢١)

گــەر بزانــی ڕازمــان ئــەی بــێ خەبــەر — زوو دەدەی ئێمەنــەجات لــەو دەردەســەر (٢٢
بێرەئێرەجــــــا ببینەئەرغــــــەنوون — خــۆش دەڵــێ (یالیــت قــومی یعلمــون ) (٢٣
دای بەئێمــــەمولکی فیرعــــەونی خــــودا — چەشــنی مــولکی تــۆ نییــەبی بــێ، فــەنا (٢٤
چــاک ببینــەمولکی زینــدەو زۆرجــەلیل — ئــەی ئــەتۆ مــەغروور بەمیســرو ڕوودی نیــل (٢٥
گــەر نــەدەی تــۆ بــەو تەنــەی خــۆت ئیعتیبــار — نیــل دەکــەی نێــو نیلــی گیانــت، نادیــار (٢٦
دەس لەمیسرت بەردەئەی فیرعەونی پەست — سەت میسر نێو میسری گیانت دێتەدەست (٢٧
تــۆ(انــا ڕب )ون، دەکــەی بــۆ عــام بــەیان — لێت نــەبوو مــەفهوومی ئــەو دوو نێــو عــەیان (٢٨
ڕەب لــەبۆ مــەڕبووب چــۆن لــەرزان دەبــێ؟ — چۆن (انا) زان، بەندی جیسم و گیان دەبێ؟ (٢٩
ئێمەئێســــتاکەین(ئــــەنا ) لان نائــــەنا، — ئــەو( ئــەنا )ی پــڕدەردو ڕەنــج و پــڕ عــەنا (٣٠
ئەو ( ئەنا) یەی بۆ تۆ ئەی سەگ، شووم بوو — ئــەو لــەبۆ مــە، دەوڵــەتی مــەحتووم بــوو (٣١
تــۆ کەنــەتبا ئــەو ( ئــەنا) یــەی پــڕ لــەکین — چۆن دەبوو بۆ مان لەنێو ئەو خۆشیەژین؟ (٣٢
لــەو جیهانــەخوا شــوکور دەن بــێ نــەجات — پەنــدی ئێمــەت جــا لەســەر دار پێــدەگات (٣٣
داری کوشــــتنمان بــــوڕاقی ڕەحلەتــــە — داری مــــولکی تــــۆ غــــروورو غەفڵەتــــە (٣٤
ئــەو حــەیات پنهــان لــەنێو نەقشــی مــەمات — ئــەو مــەمات پنهــان لــەنێو قیشــری حــەیات (٣٥
نــور دەبینــرێتن بــەنارو، نــار بــەنوور — چــۆن دەنــا دونیــا دەبــوو،(دارالغــرور)؟ (٣٦
بێ عەجــەل ئــەووەڵ قــەبوڵ کــە،تۆ نــەبوون — پاش غرووبت دەر خــەخۆت لەو شــەرقی ڕوون (٣٧
لــەو (ئــەنا) یــەی بــوو ئــەزەل دڵ واقــو، وڕ — ئەو ( ئەنا) یــەش بوو بەڕیسواو ساردو سوڕ (٣٨
لــەو ( ئــەنا)یــە، بــێ ( ئــەنا ) زۆر جوانــەگیان — خۆی نەجات دا لەو ( ئەنا ) یەی نێو جیهان (٣٩
لەو(ئەنا )یەی گەر نەجات هات بوو، (ئەنا ) — ئافــەرین ســەت، لــەو ( ئــەنا ) یــەی بێ عــەنا (٤٠
ڕا دەکــا ئــەو جــا لــەدووی وی، دێ (ئــەنا ) — دێ لەدووی وی دا، کەدی ئەو، بێ ( ئەنا ) (٤١
تــالیبی وی تــۆ، نــەبوو ئــەو تالیبــت — گــەر گــو مــردی تالیبــت بــوو، مەتڵــەبت (٤٢
تــۆ کــەمردی مردەشــۆر دەت شــوا چلــۆن؟ — تــالیبی گــەر مەتڵــەبت، لــەدوا، چلــۆن؟ (٤٣
گــــەر عــــەقڵ لــــەو باســــەبایەڕێگەبین — فــەخری ڕازی بادەبــا، ڕازدانــی دیــن (٤٤
چونکەچێشتن تــامی شــت مــەعلووم دەکــات — عــەقڵی وی زیــاتر دەبــوو حــەیران و مــات (٤٥
کوا دەکا، مەکشووف تەفەککور ئەو ( ئەنا )؟ — ئەو ( ئەنا ) مەکشووف دەبێتن پاش فەنا (٤٦
ئــــەوعقوولی جــــوزئی وەختــــی ئیفتیقــــاد — دێتــــەنێو چــــاڵی حلــــوول و ئیتتیحــــاد (٤٧
ئــەی ئــەیازەی تــۆی فــەنا کــرد ئیقتیــراب — وەک لــەژێر ڕۆژ بــن، ستێرەی بێ حیســاب (٤٨

بەڵکەوەک تۆ نوتفەبووی و، بوویەتەن — لات حلوول وئیتتیحاد بوون، مومتەهەن (٤١٤٩)

تۆ ببەخشە، مەعدەنی عەفوان ئەتۆی — لوتفی تۆ پێشرەو، لەپێش هەموان ئەتۆی (٤١٥٠)

کێم؟ بڵەم بەخشش کەتۆ، ئەی شەهریار — تۆی خولاسەی ئەمری ( کن ) کرد کردگار (٤١٥١)

کێمەمن؟تاکومنت پێم دا، ژیان — ئەی بەدەسیان دامەنێ تۆ، گشت منان (٤١٥٢)

**موجریم زانینی ئەیازخۆی لەو شەفاعەتەدا ومەعزەرەت ویستن لەو جورمەدا وموجریم زانینی خۆی لەو مەعزەرەتەدا وئەو شکەستەگیەلەناسینی عەزەمەتی شا پەیدا دەبێ کە.. ( انا اعلمکم باللەواخشاکم للە) وقال اللەتعالی(انما یخشی اللەمن عبادەالعلماء )..**

من غەزەبناک، چۆن دەکەم دەعوەت بەحیلم؟ — چۆن بکەم دەعوەت بەحیلمیش ئەهلی عیلم؟ (٤١٥٣)

گەر بەزەربی زللەبمکەی زێدەخوار — لایقم بۆ زللەلێدان سەت هەزار (٤١٥٤)

چی بڵەم پێت و لەویت ئاگا بکەم — شەرتی ئیحسانت لەدەڵ، ئیحیا بکەم (٤١٥٥)

ئەو شتەی مەعلووم نەبوو بۆت ئەو چییە — کوا لەدونیا ئەو شتەی یادت نییە؟ (٤١٥٦)

خۆت و عیلمت پاک لەجەهلی پڕ زیان — بۆیەنابێتن لەعیلمت، هیچ نیهان (٤١٥٧)

ئادەمی بێ ئەرزیشت، وا کردەکەس — نووری ڕۆژی تابناک لای بوو، بەپەس (٤١٥٨)

چون کەست کردم ئەگەر زاری بکەم — گوێ دە، زاریم تۆ، لەبەر لوتف و کەرەم (٤١٥٩)

گەر لەنەقشی خۆم منت هێنایەدەر — لەو شەفاعەت، خۆت منت کرد، بەهرەوەر (٤١٦٠)

ئەو وەتەن گەربوو لەئەسبابم بەتاڵ — ماڵی من نین تەڕڕو ئیشکی نێوماڵ (٤١٦١)

چەشنی ئاو کردت ڕەوان نێو من دوعا — لێم قەبووڵ کە،شین کەبەو، گیا،ئەی خودا (٤١٦٢)

نێو وجودم تۆ دوعات هێنا بەدی — بۆ قەبووڵ بوون، غەیری تۆم ئوممێد نەدی (٤١٦٣)

تاکو لاف لێدەم کەشا هەنشای زەمان — دای لەبەر عەبدێک، بەبەد کاران ئەمان (٤١٦٤)

من سەراسەر دەرد بووم و خودپەسەند — شا منی کرد جا، دەوای گشت دەردمەند (٤١٦٥)

دوو زەخێک بووم پڕ لەفیتنەو پڕ بەدی — من لەدەستی فەزلی ویم، کەو سەر دەدی (٤١٦٦)

هەرکەسێک سووتا بەدووزەخ بۆ جەزا — جارەکی دی گیان دەدەم بەو، با سەفا (٤١٦٧)

کاری کەو سەر بوو،کەسووتا یەک نەفەر — شین ببێ لەنوێ بەوی، جوان بێتەدەر (٤١٦٨)

قەترەقەترەی وی، مونادین بۆ کەرەم — هەرچی سووتاندی سەقەر ئەو چا دەکەم (٤١٦٩)

جا، وەکوو، سەرمای خەزان دووزەخ بەقار — ئەی گوڵستان، کەو سەریش هەر وەک بەهار (٤١٧٠)

چەشنی مەرگ وخاکی گۆڕە، خۆ سەقەر — چەشنی نەفخی سوورەکەو سەر، ئەی پدەر (٤١٧١)

ئەی بەدوو زەخ سووت گشت ئەجسامتان — ئێوەلای کەو سەر دەبا، ئیکرامتان (٤١٧٢)

چونکەفەرمووی لوتفی تۆ ئەی لا یەنام | خەڵقی خەڵقم کرد هەتا سوود بەن لەلام (١٧٣

نەک هەتابم بێ، لەدەستی وان سوود | تۆ دەکەی گشت ناقیسان کامیل بەجوود (١٧٤

لەو عیبادی موجریمینت خۆش بەتۆ | بێ لەدەریای عەفو، غوفران، خۆشەخۆ (١٧٥

عەفوی خەڵکی چەشنی سێڵاو چەشنی جۆ | زۆر بەتوندی دێتەلای دەریایی خۆ (١٧٦

گشتی عەفوی دڵ شکاوان گشت شەوان | دێتەلای تۆ ئەی شەهی کەون و مەکان (١٧٧

گەر سەحەر هات ئەو چەلەشیان فڕ دەکەی | تاکو شەو دێتن بەوان، تەن پڕ دەکەی (١٧٨

جارەکی دی شەو کەهات دەفڕن ئەوان | زۆر بەسۆز لای کاخ و لای ئەیوان و بان (١٧٩

لادەبەن ئەو دەم لەلای تەن گشت ڕەخت | دێتەلای تۆ چون لەلای تۆن خۆشبەخت (١٨٠

لێدەدەن باڵ و دەڕۆن بۆ لای خودا | موتمەئیننیش بوون لەڕەجعی قەهقەرا (١٨١

دێتەگوێ ئەو دەم (تعالوا )لەو کەرەم | پاشی ئەو ڕیجعەت نەما هیچ حیرس و غەم (١٨٢

ئێوەزۆرتان دی لەدونیادا عەزاب | بۆیەدەگرن ئێوەقەدرم بێ حیساب (١٨٣

وەرنەژێر ئەو داری سێبەر خۆشی من | لاق درێژکەن ڕاحەتو ئاسوودەبن (١٨٤

لاقی ڕەنج دیتوو،کەدێن بۆ ڕێگەیان | باوەش و دەستانی حۆریان جێگەیان (١٨٥

جا دەڵێن حۆری بەغەمزەو میهرەبان | لەو سەفەر، وا، هاتنەوەئەو سۆفییان (١٨٦

سۆفییانی ساف وەک نووری نەزیف | ما وەیەک کەوتن لەسەر خاکی کەسیف (١٨٧

لەو کەسافەت هیچ نەیان هینا ئەسەر | ڕاستەخۆ لای نووری ئەسڵی چوونەسەر (١٨٨

ئەوگرووهی موجریمانیش ئەی فڵان | یەک بەیەک،سەریان لەدیوار دا، ئەوان (١٨٩

گەرچی ماتی کەعبەتەینی شا، دەبوون | باش لەجورمی خۆ، ئەوان ئاگا دەبوون (١٩٠

ڕوو لەتۆن ئێستا بەگریان و بەشین | ئەی تۆ لوتفت، ڕێی نیشاندا، موجریمین (١٩١

جا، ببە، ئالوودەکان بێ وەقفە، تۆ | نێو چەمی غوفران وکانی شوستو شۆ (١٩٢

تا بشۆن خۆیان لەو جورمی درێژ | نێو سەفی پاکان، بوێستن، بۆ نوێژ (١٩٣

لەو سەفانەی زۆر سەرو بن، لێک بەدوور | (نحن صافون) قەولی خنکاوان، دەنوور (١٩٤

وەسفی ئەو حاڵەم کەکرد، من، ئەی برا | هەم قەڵەم دەشکا و، هەم کاغەز،دڕا (١٩٥

کوا دەکا بەحرێک بەتاڵ، یەک دانەجام؟ | کوا دەکا هێرش بەشێر بەرخێکی خام؟ (١٩٦

گەرحیجابت بێ، وەلانێ تۆ حیجاب | تا ببینی سەڵتەنەت، تۆ ئەی جەناب (١٩٧

مەست و غافڵ گەرشکاندیان جامی تۆ | عوزری مەقبووڵ، مەستی مەی خۆش تامی تۆ (١٩٨

مەست بوونی وان بەئیقباڵەو بەماڵ | نەک لەبادەی تۆیەخۆ، ئەی بێ هەواڵ (١٩٩

مەست لەبەر تەخسیسی تۆن ئەی شەهریار — تۆ، لەمەستت، خۆش بە، ئەی بەخشیش مەدار (٤٢٠٠)

لەززەتی تەخسیسی تۆ، وەختی خیتاب — وادەکا، ناکرێ، بەسەت کوو پەی شەڕاب (٤٢٠١)

لێم مەدەحەد، خۆت منت مەست کردووە — لای شەریعەت حەد لەمەستا ن دوور بووە (٤٢٠٢)

هەردەمێک هاتم وەهۆش تۆ لێم دەحەد — نامهەوێ هیچ کات وەهۆش بێم، تا ئەبەد (٤٢٠٣)

هەر کەسێ خواردی لەجامت، ئەی سەمەد — ئەو لەحەددو، هۆش نەجات بوو، تا ئەبەد (٤٢٠٤)

نێو فەنا دا مەستی جاویدن ئەوان — مەستی عیشقت تازەهەڵناستێ، چ ئان (٤٢٠٥)

جا بەدڵمان فەزڵی تۆ بێژیت بڕۆ — ئەی گرفتار بوو، لەدۆی عیشقن، ئەتۆ (٤٢٠٦)

چەشنی مێش چون کەوتیەنێودۆی ئێمەتۆش — ئێستەئەی مێش، مەی ئەتۆ،نەک مەستی خۆش (٤٢٠٧)

خەرتەلانیش مەست دەکەی ئەی مێش یەقین — سواری ئەسپی، چون لەبەحری ئەنگەبین (٤٢٠٨)

چەشنی زەڕڕە،کێو هەموو سەر مەستی تۆن — نوقتەهەم پەرگارو خەت، نێو دەستی تۆن (٤٢٠٩)

فیتنەیی لەرزێنەریش، لەرزانەلات — گەو هەری زۆر قیمەتیش، ئەرزانەلات (٤٢١٠)

گەرخودا دابای بەمن، زار، یەک هەزار — شەرحی تۆم ئەو دەم دەکوت، ئەی شەهریار (٤٢١١)

من هەمەزارێک لەشەرمت،واقو، وڕ — ئەی ئەتۆ ئاگاو خەبەرداری لەسوڕ (٤٢١٢)

خۆ لەمن زۆر تێک شکاوتر، بوو عەدەم — هاتنەدەر لەو زاری، هەرچی بوون ئومەم (٤٢١٣)

مونتەزیر ئاساری غەیبی، بێ ژمار — نێو عەدەم دەربێن بەلوتفی کردگار (٤٢١٤)

ئیقتیزای تۆ بوو سەرم دەخوا، تەکان — ئەی فیدات بم من، بەجیسمم هەم گیان (٤٢١٥)

ئیقتیزای تۆ مەیلی ئێمەی وا دەوێ — جەزبەیی خوا بوو سەبەب، بۆ ڕەهڕەوێ (٤٢١٦)

تۆز، بەبێ، با، چۆن بەرەو بالا دەچێ؟ — چۆن لەڕێگا، کەشتی بێ دەریا دەچێ؟ (٤٢١٧)

کەس لەلای ئاوی ژیان نەی داوە،گیان — خڵتەبەلای ئاوی تۆ ئاوی ژیان (٤٢١٨)

قوبڵەبۆ گیان دۆستانە، ئاوی ژین — هەر بەئاو بێستان دەبێ، شاداب و شین (٤٢١٩)

زیندووەهەرکەس لەڕێی عیشقت دەمرد — گیان و ئاوی ژین لەدڵ خۆی، دەر دەکرد (٤٢٢٠)

ئێمەئاوی عیشقی تۆن گەر کەو تەدەست — ئاوی ژین ئەو دەم لەلامان، بوو بەپەست (٤٢٢١)

گیان دەکاشاداب و نوێ ئاوی ژیان — ئاوی ئاوی ژین ئەتۆی خۆ، بێ گومان (٤٢٢٢)

حەشر و مەرگت دا بەمن تۆ، دەمبەدەم — تا ببینم دەستی ئەو سافی کەرەم (٤٢٢٣)

چەشنی خەو، بووم من بەمردن، ئیعتیقاد — موعتەبەر بوون، چون لەلام، حەشر ومەعاد (٤٢٢٤)

گەر حەوت دەریا هەموو بینەسەراب — تۆ بەوان لەنوێ دەدەی ژین، بێ عەزاب (٤٢٢٥)

زۆرلەمەرگی ترسەعەقڵ و، عیشقەشێر — سندەکوا وەک بەر، لەژێر باران دلێر؟ (٤٢٢٦)

مەســنەوی ئــەو دەفتــەرەی وی پەنجومــە    نێـو برووجـی چـەرخی گیـان،وەک ئەنجومـە (٢٢٧

نـین سـتێران ڕەهنومـا، بـۆ گشـت حـەواس    غــەیری کەشــتیوان، کــەبێ ئەســتێرەناس (٢٢٨

بــەس تەماشــا، بــوو بەســەهمی ئیــدەدی    چـون قیـران و سـەعدیان هـیچ کـات نـەدی (٢٢٩

ئاشــنا بــە، شــەو کــەهات تــاکو ســەحەر    گـەڵ سـتێرەی دێـو سـووزی پـڕ شـەڕەڕ (٢٣٠

هەریــەکێک بــۆ دەفعــی دێـوی بــەدگومان    نــار دەبــارێنێ، لەقەلعـــەی ئاســمان (٢٣١

ئەختــەران گــەڵ دێـو بەچەشـنی عــەقرەبن    بـۆ حەقیقــەت خــواز، (وەلیبـو لئـەقرەبن ) (٢٣٢

قەوس، ئەگەر شەیتان دەکا، بۆ تیر هـەدەف    دەلوەپڕئـاو بـۆ زەڕاعــەت، جێـی شـەعەف (٢٣٣

حـووت گـەمی گومڕایـەتی گـەر لـەت دەکـا    بـۆ ڕەفیـق عـەردی دەکێڵـێ چەشـنی گـا (٢٣٤

گـەر کـو دەدڕێ ڕۆژ، لەشـەو ،وەک شـێر،لیباس    ئــــەو لــــەبۆ لەعلان،دەکا،ئەتڵــــەس،کراس (٢٣٥

هەرشـــتێک زاری عـــەدەم بیخاتــــەدەر    بـۆ یـەکێک زار، بـۆ یـەکی دیکـەش شـەکەر (٢٣٦

دۆسـت ببـەتۆ، خـوویی بـەد کـە تـار و مـار    تــابخۆی شــەکری لەکووپــەی ژاری مــار (٢٣٧

بۆیەنــەیکرد ژار لــەفاڕووق، هــیچ ئەســەر    چونکــەبۆی، تریــاکی فــاڕووقی شــەکەر (٢٣٨

---

**تەواو بوو جڵدی پێنجومی مەسنەوی شەریف بەسووڕەتی هونراوەی کوردی بەقەڵەمی عبدالسلام مدرسی(خانی) للەالحمد والمنە. لەتاریخی ڕۆژی شەنبە ١٣٨۴/٢/٣ کۆچی هەتاوی**

بسم الله الرحمن الرحيم

ئەی حیسامەددین کەداتەدڵ ژیان — مایلم زۆر، قیسمی شەش کەم، من بەیان (١)

جەزبی تۆی زاناوو زۆروشیار بوو — مەسنەوی وەک نوور لەدونیا، دیاربوو (٢)

من بەتۆی پێشکێش دەکەم ئەی مەعنەوی — قیسمەتی شەش لەو کیتابی مەسنەوی (٣)

شەش جیهەت جا،ڕوون کەتۆ،بۆ شەش سیحاف — تا تەوافی کا، ئەوەی نەی کرد تەواف (٤)

عیشق نیتی گەڵ شەش و پێنج هیچ کار — قەست ویستی وی فەقەت بووجەزبی یار (٥)

بەڵکەبیتن دوایەئەمری کردگار — گوفتەنی ڕازان بکەم من ئاشکار (٦)

ئەشکرا ئەو دەم دەکەم مەتڵەب بەیان — بێ کینایەو وردەکاری زۆر نیهان (٧)

ڕاز مەڵێ لای ئەو کەسەی ڕاز خواز نییە — ڕاز لەلای مونکیر بەڕازان، ڕاز نییە (٨)

ئەمری دا، ئەمما بەدەعوەت کردگار — تۆ، بەمەقبووڵ وبەڕەد، چیت داوەکار؟ (٩)

نووح نۆ سەت ساڵ دەعوەت کاربوو — کاری خەڵکیش دەمبەدەم ئینکار بوو (١٠)

قەت لەگوفتار وا نەبوو ئەو خەستەبێ — قەت نەبوو ئەزمان لەدەعوەت، بەستەبێ (١١)

ئەو بەخۆی کوت عەوعەوو، غەوغای سەگان — مەنعی ڕۆینی کاروان ناکەن، چ ئان (١٢)

یا شەوی مەهتاب لەسەگ غەو غاوو لوور — کە ی دەکەن مانگ، سست لەڕێگا هەم لەنوور؟ (١٣)

نوور دەداتن مانگ و، سەگ غەو غا دەکا — هەرکەسێک هەر چۆن کەویستی، وا دەکا (١٤)

دای بەگشت کەس خزمەتی مەخسووس قەزا — وەختی ئازموون خۆی دەکاتن ئاشکرا (١٥)

سەگ لەعەوعەو دەس کەبەر نادا، چ جار — من کەمانگم بۆ نەکەم گەشت و گوزار (١٦)

سرکەترشی خۆی بکا زیاتر ئەگەر — واجبەخۆی زێدەتر کاتن شەکەر (١٧)

قەهرەسرکە، لوتفەچەشنی ئەنگەبین — لەو دووانە چا دەبێ ئیسکەنجەبین (١٨)

گەرکو کەمتر بێ لەسرکەئەنگەبین — ئەو دەمی دێتێ خەڵەل ئیسکەنجەبین (١٩)

سرکەیان باراند ەسەر نووح قەو می وی — قەندی سەر نووح ڕشت بەحری مەعنەوی (٢٠)

دای بەقەندی وی مەدەد، دەریای کەرەم — زێدەبووجا، ئەو لەسرکەی عام، نەکەم (٢١)

تاق و تەنها وەک هەزار کەس بوو وەلی — بەڵکەیەک سەت قەڕ نەئەو عەبدولعەلی (٢٢)

خومرەیەک ڕێگای لەدەریا بێ ئەگەر — چەم لەحاستی وی دەکاتن خەم کەمەر (٢٣)

بیلخسسوس ئەو بەحرە، بەحری دیش بەعام      بیستیان گەر ئەو میسالەو ئەو کەلام (٢٤)

تاڵ دەبوو زاریان و، بوون زۆر شەر مەزار      چون قەرین بوو نێوی حەق بۆ عەبدی خوار (٢٥)

گەر لەگەڵ دونیا ببێ عوقبا، قیڕان      خۆی دەکا دونیا لەبەر شەرمان نیهان (٢٦)

تەنگەبۆ ئەو مەتڵەبەم خۆ گشت وتار      خۆ دەنا خەس گەڵ ئەخەس نیتی چ کار (٢٧)

گەر لەنێو باغان دەکا قاڕ قاڕ کەلاغ      کوا لەنەغمەی کەم دەبێ بولبول لەباغ؟ (٢٨)

جا لەنێو بازاڕی ( یفعل مایشا )      هەن خەریدار بۆ ئەو ان دوو، لێک جودا (٢٩)

خواردن و خۆراکی ئاگر، دڕک و داڵ      بۆنی گوڵ قووتی دەماغی خۆشحاڵ (٣٠)

گەر لەلامان پیسەهەم ڕیسوا، پەلید      بۆ سەگ و خووک، شەکرەهەم هەڵوا، پەلید (٣١)

گەر پەلید ئەنجام دەدا کاری کەسیف      ئەو دەکا خاوێن بەئاو، شەخسی نەزیف (٣٢)

گەرچی مار،پەخشان دەکا و، داوێت ژار      گەرچی بەد خوو، حاڵ دەکا، لێمان تار (٣٣)

خەڵفەمێش نێو شاخ وکەندوو هەم شەجەر      چادەکەن حەمیاری هەنگوین و شەکەر (٣٤)

گەر چی ئینسانان دەکا بەد حاڵ ژار      زوو ئەوی تریاک دەکاتن تارو مار (٣٥)

ئەو جیهانەگشت شەڕە، دەعوایە، کین      بەینی زەڕڕات یەک بەیەک،وەک کفر و دین (٣٦)

زەڕڕەیەک بۆ لایی چەپ پەر وازدەکا      زەڕڕەیێکی دیکەڕاس داخواز دەکا (٣٧)

زەڕڕەیێک بۆ سەر دەچێ، یەک بۆ خووار      چاو، دەکەن چۆن جەنگ بەبێ دەنگ و هەوار؟ (٣٨)

جەنگی فیعلی هات لەجەنگی باتینی      دای بەجەنگی فیعلی ئەو جەنگ ڕەو شەنی (٣٩)

زەڕڕەیێکی بوو فەناو مەحوی هەتاو      جەنگی وی ناکرێت تەو سیف قەت تەواو (٤٠)

گەر لەزەڕڕەهیچ نەما نەفس و نەفەس      جەنگی وی ئیستاکەجەنگی ڕۆژەبەس (٤١)

لای نەما ئەو جونبشی تەبع و سکوون      بۆ؟ لەبەر (انا الیه راجعون ) (٤٢)

ئێمەبۆ لای بەحری تۆ ڕاجیع دەبووین      لەو ڕیزاعی ئەسڵی موستەرزیع دەبووین (٤٣)

ئەی ئەتۆ خستووتەبێڕاهان غوول      کەم کە، تۆ باسی ئوسوول ئەی بێ ئوسوول (٤٤)

جەنگوسوڵحی ئێمەخۆ لای نووری عەین      نین لەئێمە، بەڵکە( بەینەلئیسبەعەین) (٤٥)

جەنگی ئەفعال هەم تەبایع هەم وتان      جەنگەکی سەختەلەنێو ئەجزای جیهان (٤٦)

بەو هەرا وجەنگە، جیهان بوو پایەدار      نێو عەناسیر بۆت دەبێ چاک ئاشکار (٤٧)

چوار عونسور چوارستوونن زۆر قەوی      بەس بەوان بوو سەقفی دونیا موستەوی (٤٨)

ورد دەکەن یەکتر ئەوان ئوستوونی چوار      وەک دەکا ئاو ئاگری گەش تارو مار (٤٩)

جا، بینای خیلقەت بەئەزداد بەرقەرار      لا جەرەم بۆ سوودو زەر، شەڕمانە،کار (٥٠)

مـن هـەموو حـاڵم خیلافـی یـەکترین — بۆ ئەسەر هیچیان وەکوو یەکتر کەنین (٥١)

من دەگەڵ خۆ م گەر دەکەم شەڕ دەمبەدەم — سوڵحو ئاشتی چۆن دەگەڵ خەڵکی دەکەم (٥٢)

چاو کەمەوجی لەشکری ئەحواڵی من — شەڕ دەکەن تا یەکتری دەر خەن لەبن (٥٣)

تۆ تەماشای ئەو شەڕەی نێو خۆت کە، جا — چیت لەجەنگو مەعرەکەی ئیدیکەدا؟ (٥٤)

بەڵکەلەو جەنگەت بداتن حەق نەجات — جێت لەدونیای سوڵحو یەک ڕەنگی بدات (٥٥)

ئەو جیهان ئابادەدائیم باقییە — چونکەدەو تەرکیبەجێی ئەزداد نییە (٥٦)

چون لەبەر ئەزداد، ئەفانی چادەبێ — بێ ئەزاد دائیم بەقا بەرپا دەبێ (٥٧)

نەفیی زیددی کرد لەجەننەت خوای قەدیر — تا نەبێ ڕۆژ، زیددی ویش هەم زەمهەریر (٥٨)

ئەسڵەبێ ڕەنگی لەبۆ ئەلوان و ڕەنگ — ئەسڵەئاشتی بۆ هەموو دەعواوو،جەنگ (٥٩)

بۆ جیهانی غەم جیهانی دیکەئەسڵ — بۆفیراق و هیجرو دووری ئەسڵەوەسڵ (٦٠)

بۆ موخالیف یەکترین ئەی موهتەدی؟ — بۆ لەوەحدەت هێندەکەسرەت هاتەدی؟ (٦١)

چونکەئێمەفەرع و، چوار ئەزداد ئەسڵ — خۆیی خۆی نێو فەرع کرد ئیجاد ئەسڵ (٦٢)

چونکەگیان گرتی وەڕای عونسور قەرار — خووی لەعونسور خۆ نەگرت بەل کردگار (٦٣)

هەن گەلێک جەنگ، ئەسڵی سوڵحانن ئەوان — هەر وەکو وجەنگی ڕەسوولی پاک ڕەوان (٦٤)

ئەو لەدونیاو ئاخیرەت سەرکەو تووە — کوا لەزار دا شەرحی وی جێگای بووە؟ (٦٥)

ئاوی جەیحوون گەر هەمووی ناکێشرێ — بۆ قومێک لەو، تینوو، دەس هەڵناگرێ (٦٦)

تۆ کەبووی تینوویی بەحری مەعنەوی — بیکەجێ سەیران جەزیرەی مەسنەوی (٦٧)

دەمبەدەم جا، گەر کو هاتی نێو وی — مەسنەویت لا بێت دەریای مەعنەوی (٦٨)

بەکەلاباتن، لەئاوی جۆگەکا — ئاو یقین یەکڕەنگی خۆی پەیدا دەکا (٦٩)

ئەو لکانەی تازەیی مەرجان، چاو — میوەیی شین بوو بەئاوی گیان، چاو (٧٠)

حەرف و سەوت و دەم، کەلانێ مەسنەوی — ئەو دەبێتەبەحرو و دەریای مەعنەوی (٧١)

وێژەروگوێ گر لەگەڵ حەر فان هەموو — هەرسێ دەبنەگیان، ئاخر،ئەی عەموو (٧٢)

نان ستێن و، نان دەروو هەم نانی پاک — لادەبەن سووورەت هەموویان دەبنەخاک (٧٣)

مەعنییان ئەمما لەسێ ڕوتبەو مەقام — لێک جییان تەشخیس دراون، هەن مودام (٧٤)

بوو بەخاک سووڕەت بەڵام مەعنا، نەبوو — هەرچی بێژێ بوو، بڵێ تۆ، نا، نەبوو (٧٥)

پێش لەخیلقەت هەرسێ بوویان ئینتیزار — جار لەهەیئەت فاڕ، دەویش دان جارو بار (٧٦)

دەچنەسووڕەت ئەمری حەق بێ، دوایەجا — دەچنەتەجرید گەر خودا فەرمان بدا (٧٧)

جـــا بزانەخــــەڵق و ئــــەمری کردگــــار ‌ ‌ ‌ خەڵقەسـووڕەت ئـەمرەگیان، لـەوبوو سـووار

ڕاکیـب و مـەرکووب لـەژێر فـەرمانی شا ن ‌ ‌ ‌ تـەن لەبـەر دەرگـاو، لـەنێو دەربـارە، گیـان

بیهـــەوێ نێـــو گـــۆزەیێ ئاو،کردگـــار ‌ ‌ ‌ ئـەو بەجەیشـی گیـان دەڵێـتن، بـن سـووار

گـەر خـودا ئـەرواح بـەرێ بـۆ لای سـەروو ‌ ‌ ‌ سـەرووەران ئـەو دەم دەکـەن گـاز ( انزلـوا)

جـا لـەوەی پـاش زۆردەبێ باریـک وتـار ‌ ‌ ‌ کـەم کـەئاگر، زیـاد مەکـەتۆ، وشـکەدار

خـوا نـەکا دیگـی بچـووک زوو بێتـەجۆش ‌ ‌ ‌ پەست وچووکن دیگی ئیدراکات و هۆش

خـوای مونـەززەه، بـاغی سێوان، چـا دەکـا ‌ ‌ ‌ هـەوری حـەرفان پۆششـی وان، جـا، دەکـا

جالەهـــەوری ســـەوت وحـــەرف وگفتوگـــۆ ‌ ‌ ‌ پەردەیـەک، تـا سێو، نـەدا هیچ غـەیری بـۆ

زێـدەتر تـۆ بـۆن کەئـەو بۆنـە، بـەهۆش ‌ ‌ ‌ تـا بیـا بـۆ لایـی ئەسـڵی خـۆت، ئـەتۆش

حیفزی بۆن کە، دوور لەخۆت کە، تۆ، زوکام ‌ ‌ ‌ تـــەن بپۆشـــەتۆ لـــەباو ســـەرمای عـــەوام

تـا ڕەفاقـەتیان مەشـامت تێـک نـەدا ت ‌ ‌ ‌ وەک هـەوای وان سارد نییەزستان، چ کات

وەک جـەمادی مونجەمیـد وان، تـەن زەلام ‌ ‌ ‌ دێتـەدەر لـەو بـەفری سـەنگینیان کـەلام

لێدەگـــەر ئـــەو بـــەفرەبۆ کفنـــی زەوی ‌ ‌ ‌ تیغـی تـاوی ئـەو حیسـامەددین لـەوی

بێتـەدەر لـەو شـەرقە، تیغـی خـوا ئـەتۆ ‌ ‌ ‌ بـەو هـەتاو، تـین دار کەئـەو دەرگـا ئـەتۆ

لێـدەدا خەنجـەر، لەبـەفران تـاو، بـەتین ‌ ‌ ‌ ئـا و دەڕێـــژێتن لـەکێوان سـەر زەمـین

چونکەئـەو، لا شـەڕ قـی، هـەم لاغەڕبییـە ‌ ‌ ‌ گـەڵ مونـەجیم ڕۆژو شـەو ئـەو حەڕبییـە

بـۆچی کـردت تـۆ سـتێرەی بـێ هـودا ‌ ‌ ‌ ڕووگەبۆخۆت؟بـەس لەبـەر پەستی و عـەما

تـا لـەلات بـەد بـوو وتـاری ئـەو ئـەمین ‌ ‌ ‌ هـــات لـــەقورئان ( لااحـــب الافلـــین )

وەسوەسەی دێو بەستی پێت پێش مانگ کەمەر ‌ ‌ ‌ بۆیـــەرەنجای تـــۆ لـــە( انشـــق القمـــر)

تـۆ دەکـەی ئینکـار کـە( شـمس کـوڕت ) ‌ ‌ ‌ چونکـەلای تـۆ ڕۆژ لەئـەعلا مەرتەبـەت

تـــۆ لەنـــەجمت دیـــت تەســـریفی هـــەوا ‌ ‌ ‌ تـــۆ دەدا ئـــازار (اذا الـــنجم هـــوی )

مانگ موئەسسیر خۆ نییەقـەت چەشنی نان ‌ ‌ ‌ زۆر کـەڕەت دەبڕێـت نـان ڕیشـەی گییـان

خـــۆ موئەسســـیرتر نییـــە زوهـــرە لـــەئاو ‌ ‌ ‌ زۆرکـــەڕەت کردوویـــەئاو، ئەبـــدان خـــەراو

حـوببی وی گرتـی لـەنێو گیانـت قـەرار ‌ ‌ ‌ پـــەنـدی دۆستیشـــت وەلا نـــا، بـــۆ کـــەنار

پەنـــدی ئێمـــەهیچ نییـــەبۆت دڵپەســـەند ‌ ‌ ‌ پەنـدی تـۆش بۆمـان نییـەخۆ سـوودمەند

یەک کلیل داتن مەگەر، خاس، خوای موعین ‌ ‌ ‌ چـــون کلیلـــی ئاســـمانان دەســـتی ویـــن

ئـــەو وتانـــەوەک ســـتێرەن وەک قەمـــەر ‌ ‌ ‌ خـۆ بـەڵام بـێ ئـەمری حـەق ناکـەن ئەسـەر

ئەو ستێرەی بێ جیهەت تەئسیری وی — دێتەگوێی خواهانی وەحیی مەعنەوی (١٠٥)

ئەو دەڵێ نەو وێ جیهەت، بەڵ بێ جیهات — تاکو هەڵنەدرێت ئێوە،گورگی مات (١٠٦)

هێتدەجوانەنووری بێ حەد باشی وی — تاوی دونیا هەر وەکوو خوففاشی وی (١٠٧)

حەو، سەمای ئەزرەق هەمووبەندی ئەوین — زەردەڕەنگی مانگ، بەوی بوو چون ئەوین (١٠٨)

وەک گەدا، زوهرەدەهاتەبەر دەری — گیانی خۆی هینایەپێش وی موشتەری (١٠٩)

ئارمزوویتی دەستی وی ماچ کا زوحەل — خۆی بەڵام نابینێ لایق بەو مەحەل (١١٠)

دلی بەخۆی مڕڕیخ لەبەر وی زۆر برین — هەم عوتارید وردی کرد پێنووس بەکین (١١١)

گەڵ مونەجیم زۆر دەکەن، نەجمان جەنگ — ئەی ئەتۆ لات ناوەگیان گرتووتەڕەنگ (١١٢)

گیان ئەوەو، ئێمەش هەموو ڕەنگ و، ڕقووم — پەرتەوی ئەفکاری وی، گیانی نجووم (١١٣)

کوا لەوێ ئەفکار؟ هەموو هەر نوورەخۆ — لەفزی ئەفکار بۆیەتێگەی چاک ئەتۆ (١١٤)

جێگەبۆ گشتی ستێران ئاسمان — بۆ ستێرەی ئێمەتەنگەخۆ مەکان (١١٥)

ڕووحی جێ سووز کوا لەجێی، جێگا دەبێ؟ — نووری نا مەحدوود، حەددی کوا دەبێ؟ (١١٦)

خۆ بەڵام تەسویر و تەمسیل چا دەکەن — چا حەقیقەت بۆ زەعیف ئیلقا دەکەن (١١٧)

ئەو وتارەی من نەمیسلە، بەڵ میسال — تاکو ناحاڵی، ببێ حاڵی لەقال (١١٨)

عەقڵی تیژەعاقڵ و، پێی سست، نەچوست — چون دڵی وێران بووەو، جیسمی دروست (١١٩)

عەقڵی وان بۆ کاری دونیا دێ بەکار — فیکری وان بۆ تەرکی شەهوەت، دێمەکار (١٢٠)

وەختی دەعوا، سەدری وان بوو چەشنی شەرق — وەختی تەقوا سەبری وان بوو چەشنی بەرق (١٢١)

چەشنی زانا، بۆ هونەر بوون خودنەما — چەشنی دونیا، بێ وەفان وەختی وەفا (١٢٢)

تەنگەبۆ وان وەختی خود خواهی جیهان — نێو گەروو و، مەعدە، دەبن ون، چەشنی نان (١٢٣)

ئەو هەموو ئەو سافی بەدیان چا دەبن — گەربین خێر خواو، دەرێنن بەد لەبن (١٢٤)

گەر مەنی گەندیدەیە، چەشنی مەنی — دێ کەوەسڵی گیان ببێ، بۆی ڕەو شەنی (١٢٥)

هەرجەمادێک گەرکوڕووکا، لای نەبات — پێی دەداتن داری بەختی وی حەیات (١٢٦)

گەر لەبۆلای گیان و ڕووح بێتن نەبات — چەشنی خزر، دەخوا لەکانیاوی حەیات (١٢٧)

ڕوو لەلای گیانان بکاتن گەر کو گیان — بێ گومان دەی بێت عومری جاویدان (١٢٨)

**سوئالی سائیلێک لەبارەی تەیرێک کەلەسەردیواری دەوری شارێک هەڵنیشتبێ، سەری وی فازیلترو شەریفترو موکەڕڕەمترەیا کلکی وی؟ وجواب دانەوەی واعیز بەو سائیلەبەئەندا زەی فەهمی وی ڕۆژێک شەخسێک لەخەتیبێکی پرسی کەئەگەر پەرەندەیەک**

**لەسەر بورج و دیواری دەوری شارهەڵنیشێ ئایا سەری وی باشترەیا کلکی وی؟ خەڵ جوابی داوە، ئەگەرسەری ئەو پەڕەندەبەتەرەفی شار بێ وکلکی بەتەرەفی دێ بێ، سەر وی لەکلکی وی باشترە،وئەگەرکلکی بەتەرەفی شاربێ وسەری بەتەرەفی دێ بێ، بۆ کلکەخاشیع و خازیع بەولەسەری وی سەرفی ئەزمرکە..**

سائیلێک کردی لەیەک واعیز سوئال
ئەی ئەتۆ چاتر لەگشت ئەهلی مەقال

یەک سوئالم من هەیە، ئەی با لوباب
هەر ئەلێرەزووکەوێم دەتۆ جەواب

هەڵدەنیشت تەیرێک چەلێک سەر بورجی شار
باشەکلکی یا سەری، ئەی هووشیار؟

پێیدەکوت کلکی بەرەو دێ، ڕوو بەشار
ڕووی لەکلکی چاترەزۆر ئاشکار

گەر کوکلکی بێ بەرەو شار، ڕووش بەدێ
خاک بەبۆ ئەو کلکە، لەو ڕوویەش هەڵێ

مەل بەپەڕ، پەرواز دەکا، تا ئاشیان
پەڕی ئینسانانە هیممەت ئەی فلان

خێرو شەڕی گەر هەبێتن ئادەمی
خێرو شەڕ نا، چاو کەهیممەت ئەو دەمی

گەرچی باز بێتن سپی و جوان، بێ نەزیر
گەرکو مشکان ڕاو بکا ئەو بوو حەقیر

گەر کو کوندێک مەیلی شاهەنشای هەبوو
ئەو ڕەئیسی بازە، مەنوارەلەڕوو

گەرچی ئینسان زۆر بەقەد، چوک و، کەمە
ئاسمان ژێر پێ دەنێتن دەمدەمە

ئاخۆ (کرمنا)ی چ جار بیست ئاسمان؟
هاتەگوێی ئینسانی پرغەم بێ گومان

بۆ زەوی و، ئەفلاک عەرزەی کرد کەس
عەقڵ و جوانی، هەم عیبارات و هەوەس؟

قەت ئەتۆ داوتەبەئاسمانان نیشان
جوان بوونی ڕوو، سەحیح بوونی گومان؟

لای نقووش و سوورەتی حەممام ئەتۆ
قەت نیشانت داوەجیسمی جوانی خۆ؟

لادەدەی خۆت لەو نقووشی بێ نەزیر
دەچیەلای یەک ژن، کەکەم بینایە، پیر

ئەو عەجووزەچی هەیە، نیانەئەوان؟
لادەبا تۆ لای نقووشی زۆر جووان

تۆ کەنای لێی من دەکەم ئەو بۆت بەیان
عەقڵ و حیسسەو، دەرک و تەدبیرو گیان

ڕووحی عیشرەت دەوعەجووزەداهەیە
ڕووح دەنێو نەقشی حەمام دا کوا هەیە؟

نەقشی حەممام خۆی تەکان داتن ئەگەر
لەو عەجووزەلادەدەی زوو ڕوو،و سەر

گیان چیە؟ ئاگای لەخێرەهەم لەشەڕ
شاد بەئیحسان و، دەکا گریان بەزەڕ

چونکەڕازی گیان، خەبەر دار بوونەبەس
وەک خەبەر دار گیان، عەزیم نابێ، چ کەس

قودرەتو تەئسیری ڕووح، ئاگاهییە
هەرچی ئاگا بێ گەلێک، ئەڵلا هییە

چون وەڕای مەحسووس خەبەر هەن زۆر زییاد
گیانی ئاکامیل دەوێدا وەک جەماد

گیانی ئەووەڵ مەزهەری دەرگایەئەو — گیانی گیان خۆ، مەزهەری ئەڵلایەئەو (١٥٢)

ئەو مەلائیک بوون هەوەڵ عەقڵ و گیان — گیانی نوێ هات بوونەجیسمی وان ئەوان (١٥٣)

جا لەشانسی باش کەهاتنەلای گییان — چەشنی تەن بۆ ڕووح بوون خادیم ئەوان (١٥٤)

بۆیەلای دا، ڕوو، لەڕووح ئیبلیسی گەن — چونکەبۆ عوزوێکی مردوو ئەو لەتەن (١٥٥)

بێ سەعادەت بوو نەبوو قوربانی گیان — دەس بوو بێ ڕووح، ڕەددی کرد فەرمانی گیان (١٥٦)

نەقسی نایێ گیان کەعوزوێکی شکا — چون لەدەستی دێت چاک، ئەو چا بکا (١٥٧)

ڕازی دی مەو جوودەکوا گوێی دی ئەدی؟ — کێیەتووتیەک، لایقی بەو قەندەد ی؟ (١٥٨)

تووتیانی خاس دەخۆن زۆر قەندی خۆش — تووتیانی عام کەمەحرووم لەبۆش (١٥٩)

کوانی دەروێش لەو غەزای پاک تام دەکات؟ — مەعنییەئەو، نەک فەعوولون فاعیلات (١٦٠)

مەنعی ناکا ئەو کەری عیساش لەقەند — لای کەران ئەمما لەخیڵقەت، کا، پەسەند (١٦١)

گەر کو شادی کردبایەقەند، کەر — بۆ کەرانی هەڵدەرشت عارف شەکەر (١٦٢)

مەعنی بۆ( نختم علی افواههم ) — ئەو هەبوو بەس، زۆر لەبۆ سالیک موهیم (١٦٣)

تا لەڕێگای خاتەمی پێغەمبەران — لابرێ و، لاچی لەلێو مۆر ی گران (١٦٤)

قفڵی سەختی ئەنبیا دایان دەنا — ئەو بەدینی ئەحمەدی لایان دەنا (١٦٥)

زۆر هەبوون قفڵانی نەکراوەی گران — بوون بەدەس (انا فتحنا ) واز، ئەوان (١٦٦)

ئەو شەفیعەلەو جیهانەو لەو جیهان — لێرەبۆ لای دین، لەوێ بۆ لای جینان (١٦٧)

لێرەدەی وێ ڕێ نیشان دا خوا بەوان — لەو جیهان دەی وێ بەوان دا خۆی نیشان (١٦٨)

ئاشکرا دەی کرد وەها مەتڵەب بەیان — ( اهد قومی ) چونکەنادانن ئەوان (١٦٩)

بەو دەمی وی هەردوو دەر بوون ئاوەڵا — موستەجاب بوو نێو دووعالەم لەو دوعا (١٧٠)

بۆیەیەزدان ئەو بەخاتەم گازدەکات — چون لەجوود وەک وی نەبوو، نایێ چ کات (١٧١)

سەنعەتی ئوستاد لەپێش بێتن ئەگەر — خەتمی سەنعەت تۆ بەوی ناڵێی مەگەر؟ (١٧٢)

بۆ وەکرنی خانەمان تۆ خاتەمی — نێو جیهانی ڕووحبەخشان حاتەمی (١٧٣)

نێو ئیشاراتی موحەممەد ئەی جەناب — هەن گوشایش نێو گوشایش بێ حیساب (١٧٤)

سەت هەزاران ئافەرین بۆ گیانی وی — بۆ زهووری عەسری منداڵانی وی (١٧٥)

گشتی ئەخلاقی سەعادەتمەندی وی — لەو دڵ و لەو گیانی وی ڕا، هاتنەدی (١٧٦)

جا، لەڕەی بن یا هیرا و بەغدا ئەوان — نەسلی وین بێ ئاو و گڵ، تێکڕا ئەوان (١٧٧)

هەرگوڵەشین بێ لەهەر جێگایەگوڵ — هەر شەرابەخوم لەهەرجێ بێتەکوڵ (١٧٨)

گـــەر لەمـــەغریب ڕۆژ دەربێنێـــت ســـەر — عـــەینی ڕۆژە، وای کەســـەر هێنـــاوەدەر (٧٩

تـۆ بەســـەتتاریت ئـــەی خـــوای عـــامی مـــە — کـوێر کەبـەدخواهانی بـەد فـەڕ لـەو دەمـە (٨٠

حـەق کـوتی چـاوی خوفاشـی بـەد خیسـال — چـاو کەبەسـتم مـن لـەڕۆژی بـێ میسـال (٨١

وەک لەخوففاشـم دەکـرد پنهـان هـــەتاو — واش لـــەویم ئەســـتێرەپنهان کـــرد تـــەواو (٨٢

**سەرزەنیش و مەلامەتی ئەو شوهرەتانەی کۆن و پزیو کەمانعی زەو قی ئیمان و دەلیلی زەعفی سەداقەتن وڕێ گری سەت هەزار نەفام، هەر وەکوو مەڕان ببوونەڕێ گر لەیـەک مەخەننـەس ونەیـدەتوانی بـڕوا، وپرسـیاری ئـەو موخەننەسەلەشـوان کـەئایا ئـەو مەڕانەئەمن ئازاردەدەن یا ئازارم نادەن؟ شوان کوتی ئەگەر ئـەتۆ پیاوەتیـت هـەبێ ئـەو مەڕانەهـەموو فیـدای تـۆ دەبـن وئەگـەر موخەننەسـیش بـی دانەدانەئـەو مەڕانەلـەتۆ دەبنەئەژدیها .. موخەننەسێکی دیکەهەیەکەئەگەر مەڕان دەبینێ دەگەڕێتەوە، وجورئـەت ناکا پرسیاریش بکا،چون دەڵێ ئەگەر بپرسم مەڕەکان حەملەم پێدەکەن وئازارم دەدەن ..**

موخەننەس = دونیا پەرەستی تەقلیدی .. مەڕان = جامیعە.. شوان = موسلیحان ..

ئـــەی حیســـامەددین ئـــەی نـــووری خـــودا — ئـەی لـەبۆ ڕووح سـەیقەل و، شـا، بـۆ هـودا (٨٣

تـۆ لەوەرگـەی زۆر وەسـیع دە، مەسـنەوی — گیـان ببەخشـەتۆ بەگشـت ئەمسـالی وی (٨٤

حـەرفی وی تـابن هـەموو عـەقڵ و گیـان — هـــەڵفڕن بـــۆلای بەهەشـــتی جاویـــدان (٨٥

کۆششـی تـۆ بـوو کـەڕووح هـاتن هـەزار — گرتیـان نێـو بەنـدی حـەرفان دا قـەرار (٨٦

عـومری ئیلیـاس و خـزر خـوا پێـت بـدا — دائیمـەن بـت بێـت ڕووح بەخشـی و هـودا (٨٧

تـا بمێنـی چەشـنی وان تـۆ نێـو جیهـان — تـا بـەلوتفی تـۆ زەمـین بـێ ئاسـمان (٨٨

هەیبـەتی چـاوی بـەدم گـەر مـن نـەبا — کـەم لـەلوتفی تـۆم ئـەمن کوتبـا دەبـا (٨٩

زۆر لـەزاری چـاوی پـیس وبـەد، بـەڵام — زەخمـی ڕووح ئـازار دەهەنـدە، هاتنـەلام (٩٠

غـەیری نێـو ئـەحواڵی خـەڵکی دی، چ ئـان — شـەرحی حاڵت، مـن چ کـات ناکـەم بـەیان (٩١

مـەکری دڵ بـوو ئـەو بەهانـەم کـرد ئـەدا — کەوتـەنێو قـوڕ، بـەو، هـەچی دڵ هـەیبوو،پا (٩٢

سـەت دڵ و گیـان بـۆ خودایـان بـوو ئـەوین — چـاوی بـەد یـا گـوێی بـەد، مـانیع لـەوین (٩٣

چەشـنی ئـەو بـوو تالیبـەی مـامی ڕەسـوول — تانـەیی ئـەعرابی دی، بـێ حـەد مـەهوول (٩٤

پـێم دەڵـێن ئـەعراب لەبـەر منـداڵی خـۆی — ئـەو وەلای نـا، دینـی بـاب و کـاڵی خـۆی (٩٥

مامـە، شـادەی بێنـە، بـەس یـەک دانـەجار — تـا شـەفاعەت کـەم لـەبۆت لای کردگـار (٩٦

ێیدەکوت مەتڵەب دەکا ئاشکار سەماع ( کــل ســر جــاوزالا ثنــین شــاع ) (١٩٧)

جا لەبۆ ئەعراب دەبم ویردی زەبان جا لەلای وان خوار دەبم، تابێ زەمان (١٩٨)

گەر هەبا بۆ وی بەڵام لوتفی ئەزەل چۆن دەبوو بەد دڵ، بەجەزبی خوای ئەجەل (١٩٩)

ئەی ئەتۆ بۆ گشتی دا د خوازان نەوید داد لەدەســتی ئیختیــاراتی پەلیــد (٢٠٠)

عەکری دڵ واکردمی حەیران و مات شیوەنیشــم تــازەبێ نــاکرێ چ کــات (٢٠١)

من کەهیچ نیم بەڵکەچەرخی نامدار دادو فــەریاد یــە، لــەداوی ئیختیــار (٢٠٢)

گازدەکا ئەی خوای کەریم و کردگار تــۆ نــەجاتم دە، لــەدووڕێی ئیختیــار (٢٠٣)

مەیلی یەک ڕێگای سیراتەلموستەقیم لەو دوو ڕێی تەڕدید چاتر ئەی کەریم (٢٠٤)

لەو دوو ڕێ، مەقسوود ئەگەرچی تۆ ی و، بەس تۆ لەڕەنجی دوویی، مەرگت دێتەدەس (٢٠٥)

لەو دوو ڕێگا، هەر ئەتۆ مەقسوودو عەزم نینەوەک یەک خۆ بەڵام قەت بەزم و ڕەزم (٢٠٦)

تۆ لەقورئان گوێ دەگوفتاری خودا ئایــــەتی (اشــــفقن ان یحملنهــــا) (٢٠٧)

چادەکا تەڕدید لەدڵ دەعواوو، جەنگ کامەلەو دوو ڕێگە، بۆم باشەو قەشەنگ؟ (٢٠٨)

وەختی تەڕدید شەڕ دەکەن بێ حەد شەدید یەک لەوان بێ مونتەخەب، خەوف و ئومید (٢٠٩)

**موناجاتو پەنا بردن بەخوا لەفیتنەی ئیختیار ولەفیتنەی سەبەبی ئیختیار کەئاسمان و زەوی لەئیختیارو سەبەبی ئیختیار ترسان، خیلقەت وخسڵەتی ئینسان موشتاقەبۆ تەڵەبی ئیختیارو ئەسبابی ئیختیاری خۆی. ئەگەر نەخۆش بێ ئیختیاری کەم دەبێ، دەیەوێ ساغ و سەلامەت بێ، چونکەساغی و سەلامەتی سەبەبی ئیختیارن، تا ئیختیاری زۆر بێ، مەنسەب و مەقامی دەوێ تا ئیختیاری زیاد بێ، وجێگای نزوولی قەهری خوداوەند دەنێو میللەتانی ڕابوردو دا زیاد بوونی ئیختیارو ئەسبابی ئیختیار بووەوە، وهیچکەس فیرعەونی بێ نەواو بێ ئەسباب نەدیتووە..**

تۆ لەئەووەڵ جەزرو مەددت دا بەمە خۆ دەنا ساکین بوو ئەووەڵ ئەو یەمە (٢١٠)

چونکەتەڕدید دات بەمن تۆ ئەی قەدیم لێم کەتەڕدید تۆ بەلوتفی خۆت عەدیم (٢١١)

سەختەزۆر بۆم تۆ کەدەمکەی ئیمتیحان ئیمتیحانــت پیــاو دەکــاتن وەک ژنــان (٢١٢)

ئەی خودا تاکەی دەکەی من ئیمتیحان؟ ڕێگــەیێکم پێــدە، نــەک زۆر ڕێ، نیشــان (٢١٣)

وشــتریکم پشــت برینــدار و نــەزار وام بــەدەس کورتــانی قورســی ئیختیــار (٢١٤)

ئەو کەژاوەقورسە، بۆ یەک لا چەلێ واش لەبۆ لای دی دەبێ سەنگین گەلێ (٢١٥)

لــێم کەوەئــەو بــاری ناهــەموار ئــەتۆ تــا ببیــنم بــاغی پاکــان ســەربەخۆ (٢١٦)

چەشنی ئەو ئەسحابی غار نێو باغی جوود　　خۆش دەژیم، وشیار نەبوون ( بل هم رقود ) (٢١٧)

نوستبم گەر لای یەمین یا لای یەسار　　خۆم دەدەم وەک گۆ،تەکان بێ ئیختیار (٢١٨)

بەس بەدەستی تۆیەئەی خوای بێ مەکان　　گەر وەلای ڕاس یا نەچەپ خۆم دەم تەکان (٢١٩)

سەت هەزاران ساڵ بووم من نێو مەتار　　چەشنی زەڕڕاتی هەوا بێ ئیختیار (٢٢٠)

گەرچی نەم ما من لەبیر ئەو وەزعو حاڵ　　یادگارە، بۆم لەخەو کۆچ ئەی هەواڵ (٢٢١)

لەو جیهانەی پڕعەزاب پەرواز دەکەم　　نێو گوڵستانی گییان، جێ، ساز دەکەم (٢٢٢)

شیری ئەو دەورانی ڕابوردوویی خۆم　　ئەی خوداوەند من لەدایەی خەو دەخۆم (٢٢٣)

گشت لەبەر مەو جوود بوون و ئیختیار　　دەچنەلای مەستی و بێهۆشی بەغار (٢٢٤)

تا دەمێک بن بێ عەزابی هۆش ئەوان　　نەنگی خەمرو نەی لەلایان خۆش ئەوان (٢٢٥)

گشت دەزانن داوەدونیای نابەکار　　ناری دوو زەخ فیکرو زیکری ئیختیار (٢٢٦)

دەچنەبێهۆشی لەهوشیاری بەغار　　ئەی هودا خواز،یا بەمەستی یا بەکار (٢٢٧)

دەر دەکێشی تۆ لەبێهۆشی گییان　　چون بەبێ فەرمانی تۆ چۆ لای نەمان (٢٢٨)

جیننو ئینسان نین تەوانا، قەت چ جار　　تێپەڕن لەو حەپس و بەندی ڕۆژگار (٢٢٩)

ناتوانێ کەس گوزەر کا، بێ هودا　　قەت چ کاتێک لەو سەماواتی عولا (٢٣٠)

گەر لەحوڕڕاسی شەهاب مەحفووز نەکا　　قودرەتێک یەک ڕووحی پاک، نابێ هودا (٢٣١)

ئەوکەسەی هەستی لەدەس داو، فانییە　　جێگەبۆ وی بارەگای یەزدانییە (٢٣٢)

نیستیەمانای عورووج بۆ ئاسمان　　دین و مەزهەب نیستیەبۆ عاشقان (٢٣٣)

چون لەڕێی عیشق و ئەوین هەیبوو نیاز　　کاڵەهەم خەرقەی دەکرد میحراب ئەیاز (٢٣٤)

ئەو لەلای شا گەرچی بوو، بێ حەد عەزیز　　زاهیر و باتین گەلێک پاک و تەمیز (٢٣٥)

بێ‌ریاوکین، بێ غروور، بێ وێنەبوو　　ڕووی لەبۆ ڕووی جوانی شا، ئاوێنەبوو (٢٣٦)

چونکەهەستی خۆی وەلانا بۆ کەنار　　بۆیەئەو بوو عاقیبەت مەحموود کار (٢٣٧)

لەو ئەیازەکیبرو خودخواهی بەدوور　　تا ئەبەد، نایەت لەبۆ لای وی غروور (٢٣٨)

گشتی ناپاکی لەقەلبی خۆی سڕی　　گەردەنی نەفس و غرووری خۆی بڕی (٢٣٩)

وای دەکرد تا فێر بکاتن خەڵکی دی　　یانەلەوکار حیکمەتێکی دی دەدی (٢٤٠)

دیتنی کاڵەی لەلابوو، دڵپەسەند　　چون شنەی نیستی بەهەستی کەوتەبەند (٢٤١)

وازبکا تابەندی دونیای بێ ئەساس　　بێتەدەستی،لەو نەسیم جا، ژینی خاس (٢٤٢)

موڵک و ماڵ و سەروەتو نەقشی جیهان　　بەندی ڕووحی چوستو چالاکن ئەوان (٢٤٣)

| | | |
|---|---|---|
| ئەو قریوی خوارد بەزەنجیرێک قەشەنگ | دوور لەسەحرا ماوە، چۆ چاڵێک تەنگ | (٢٤٤) |
| ئەهیرمن جەننەت بەباتین دوو زەخە | ئەفعییەئەمما بەزاهیر گوڵڕوخە | (٢٤٥) |
| گەرچی دوو زەخ نیتی بۆ موئمین زەرەر | چاکەوا، بۆ وی، لەوێ، ئەو کا گوزەر | (٢٤٦) |
| گەرچی دووزەخ دوور دەکاتن ڕەنج لەو | بۆی بەهەشت چاتر بوو ئەمما ڕۆژو شەو | (٢٤٧) |
| دێدن ئەی ناقیسان لەو گوڵڕوخە | وەختی سوحبەت ئەو کەچەشنی دووزەخە | (٢٤٨) |

**حیکایەتی غولامی هیندو کەدەدڵدا عاشقی کچی ئەربابی خۆی ببوو، کاتێک کەکچەکەی لەنەجیب زادەیەک مارەکرد غولامەکەخەبەرداربوو، وبەشیددەت نەخۆش بوو وەسووتا، وهیچ تەبیبێک عیللەتی ئەو نەخۆشیەی نەزانی وئەویش جورئەتی کوتنی نەبوو ..**

**خولاسەی داستان ..**

لەقەدیم دا بەدەو لەمەندانیان دەکوت خواجە، یەکێک لەو خواجانەغولامێکی ڕەشی هەبوو کەفێری عیلم و فەزلیشی کردبوو، ئەو خواجەیەکچێکی زۆر جوانی هەبوو، کاتێک ئەو کچەبەسیننی بلووغ گەیشت، زۆر خانەوادەی ئەشراف و ئەعیان لەو کچەیان خوازبێنی کرد بەڵام خواجەهیچیانی قەبووڵ نەکرد وموعتەقید بوو کەسەروەت دەوامی نییەوسەعادەت و خۆشبەختی نایەنێ، تاکو جەوانێکی نەجیب و ئەسیل و بەتەقوا، بەڵام فەقیرو دەست کورت، چوو بۆخوازبێنی کچی خواجە، وخواجەئەوی قەبووڵ کرد، کچەکەی تیبقی مەڕاسیمی مەخسووس لەوی مارەکرد.. چونکەغولام عاشقی کچی خواجەببوو هەر لەگەڵکو ئەو خەبەرەی بیست دونیای لەپێش چاوی تاریک بوو ولەپاشان بەشیددەت نەخۆش بوو بەجوورێک کەڕۆژو شەو، وەکوو شەم دەسووتا، وتەبیبانی ماهیریش نەیان توانی کەئەوی دەرمان وعیلاج بکەن تاکو خواجە بە هاوسەری خۆی کوت ئێمەنەمان زانی کەلەبەرچی هێندەپەرێشان و ناڕەحەتە، واچاکە کە ئەتۆ بچیە لای وی و بەنەرمی و مەحەببەتی دایکانە حاڵی وی بپرسی بەڵکەم بەو وەسیلەلەڕازی دەروونی وی ئاگادار بین .. ژن چۆ لای غولام وتیبقی دەستووری خواجە بە مەحەببەتی دایکانە حاڵی وی پرسی وبەنەرمی وگەرمی قسەی دەگەڵ کرد وبەحەددێک جوان نەقشی خۆی ئیجراکرد کەغولام وەقسەهات، بەڵام قسەیەکی کرد کەئاگری دەگیانی ژن بەردا ودووکەڵی لەکەللەی وی وەدەرخست.. غولام کوتی تەوەققوعەم نەبوو کە ئەمن هەبم و ئێوە کچتان بە بێگانەیەک بدەن، ژن کە ئەو قسەی بیست ویستی کەئەو غولامەتیککەتیککەکا، بەڵام خۆی ڕاگرت وهیچی نەکوت، بەڵام فەو ڕەن چۆ لای خواجەوئەوی

لــەو مەوزووعەخەبــەردارکرد .. خواجــەش زۆر توورەبــوو وکــوتی بەڵایــەکی بەســەردێتم کەبیێتەئەفسانەخواجەنەقشەیەکی خەراپ و شەیتانی کێشا، وبەژنەکەی کوت هەر وەکوو جاری پێش دەچیەلای غولام ودەڵەی زۆر چاکە، ئەتۆ کەکچی ئێمەت دەویست بۆچی زووتر نەت دەکوت؟ ئەگەر ئێمەزانیبامان خواستگاریکی وەک تۆمان هەیەئیدی ئەومان بەبێگانەنەدەدا، غـولام بەبیسـتنی ئەوقسـانەزۆر خۆشـحاڵ بووولەشـیددەتی هەیـەجان وخۆشـحاڵی هـەرخۆی هەڵداویشت ونەخۆشیەکەشی ڕۆژ بەڕۆژ چاکتردەبوو تاکو پاش ماوەیەکی کەم بەتەواوی ساغ و سـەرحاڵ بـوو..خواجەبـۆئیجرای نەقشـەی خـەراپ و شـەیتانی خـۆی جەشـنێکی سـازکرد وبەعزێکیشی لەدۆستان و قـەو م و کەسی خـۆی دەعـوەت کـرد، جەشـن ئامـادەکرا وموتریبـان دەستیان کرد بەگۆرانی کوتن مووسیقی لێدان وحازران دەستیان کرد بەچەپڵەلێدان وداوەتـوو هەلهەلەو شادی.. خواجەی فێڵباز لـەکاتی جەشـن دا پیـاوێکی هەیکـەل زەلام کەقیافـەی ژنانـەی هەبوو وەک کچەکەی خۆی ڕازاندەوەولیباسی بووکانی دەبەرکرد .. وئەوی بەشکڵی بووکان دەر هینـا، ودەولـەحزەدا کـەزاوا دەی ویسـت کەبچتەحیجلەئەو پیاوەخەراپـەی لـەباتی بـووکی واقیعی ناردەحیجلـە..غـولامی تـازەزاوا بەشـادی و سـەر مـەستی تـەواو چـوو نێـو حیجلەوخواجەفـەو ڕەن شەمع و چرای حیجلەی کوژانده، تابووک وزاوا دەخـەڵوەت دابن، هـەر لەگەڵکو غـولام ویسـتی بەزەریفی ونەرمی ڕووبەندی بووک وەلابا، ئەو نێرەکەرەی لەخودا بێ خەبەرەجومگەی غـولامی محکەم گرت وفەورەن لەباوەشی کرد ولەسـەر تـەخت ئاوەژووی کـرد غـولام لەترسـان هـاواری دەکـرد بـەڵام کـەس گـوێی لـێ نـەبوو چـون لـەدەرەوەی حیجلـەموتریبان مەشـغووڵی داوەتـو هەنگامەبوون . خولاسەی کەلام ئەو کابرا بێ حەیایەهەتا بەیانی زاوای بـەد بـەختی مەوریـدی تـەجا وەز قـەرار دا، وحـاڵ وحەواسـی لـێ بڕی،بـەیانی زوو تیبقـی ڕەسـمی قـەدیم بەتەشـریفاتی مەخسـووس زاوایـان بـۆ حـەمام بـەڕێ کـرد، لـەو بەینـەدا خواجـەی فێڵبـاز کچەکـەی خـۆی بەئاراێشێکی تـەواو لـەجێی ئەونێرەکەرەی دانا،وەختێـک غـولام لەحـەمام بۆحیجلەگەڕاوەلـەجوانی ولەتافـەتی ئەوکچەماتوسەرسـام ما،وبـەخۆی کـوت مەگەرمومکینەمـەوجوودێکی والـەتیف،کاری واناحەز ئەنجام بدا؟ بەڕاستی چی نەما بووکەلەبەر حیرەتو سەرسامی شێتو دێوانـەبێ، عاقیبـەت زۆر بـەنفرەت بـەبووکی کـوت خۆڵـت وەسـەر خـوا هـیچ کەسـێکت هـاو سـەر نـەکا، ئـەوەوەزعی شەوانەت وئەوەش وەزعی ڕۆژانەت..

خواجەیـەک بـووی بەندەیـەک هینـدی نەسـەب   دانــیش و ڕزقــی لــەبۆ وی کــرد تەڵــەب (٢٤٩)

دانیش و ئادابی وی زۆر بردەسەر / نێو دڵی وی ئایساند، شەمعی هونەر (٢٥٠)

هەرکەمنداڵ بوو، لەلای بووخۆشەویست / بۆی دەدا ئەنجام هەچی ئەو دەیهەویست (٢٥١)

هەیبوو ئەو خواجەکچێک جوان بووزیاد / تەن وەکوو زێو پا ک وخاوین پاک نیهاد (٢٥٢)

کچ کەباڵغ بوو دەهاتن خواستگار / مارەیی زۆریان دەکرد بۆوی قەرار (٢٥٣)

جادەهاتن یەک بەدووی یەک موحتەشەم / خوازبێنی کەر، لەبۆ کچ دەمبەدەم (٢٥٤)

خواجەدەیکوت ماڵ کەنایێ پایەدار / چون بەرۆژ دێت و بەشەو دەڕوا بەغار (٢٥٥)

حوسن و جوانی زاهیری بێ ئیعتیبار / زەر دەکا چون سوورەتا ن یەک زەخمی خار (٢٥٦)

بوون بەسەروەر زادە، نیتی ئیعتیبار / چون بەماڵ و سەروەتی بوو ئیفتیخار (٢٥٧)

زۆر دەبێ ئەشراف زادەی نابەکار / نەنگی بابە، ئەو بەکاری نالەبار (٢٥٨)

کەمکە، مەدحی شەخسی ئەرزیشمەند ئەتۆ / چاک لەئیبلیس بگرەبۆخۆت پەند ئەتۆ (٢٥٩)

هەیبوو دانیش نەیبوو ئەمما عیشقی دین / ئەو لەئادەم نەیدی ئیللا نەقشی تین (٢٦٠)

گەرچی زانیت باش دانیش ئەی ئەمین / بەو نەبوو، بۆت واز، چاوی غەیب بین (٢٦١)

غەیری زاهیر هیچ شتێک لەو دیارنییە / بێ موعەرریف ئەو لەهیچ وشیار نییە (٣٦٢)

نینەموحتاجی موعەرریف عارفان / چونکەنوورن، شت دەبینن چاک ئەوان (٢٦٣)

ئەسڵی کار تەقوایە هەم دین و سەلاح / چون لەدوو دونیا بەوان دێتن فەلاح (٢٦٤)

کردی یەک زاوایی ساڵح ئیختیار / بۆ تەواوی قەو م وحێل جێی ئیفتیخار (٢٦٥)

ژن دەیانکوت سەر وەتو ماڵی نییە / دوور لەئیستیقلال و ماڵ و جوانییە (٢٦٦)

خواجەدەیکوت ئەو کەسانەن ئەهلی دین / گەنجەئەو زاوایەبێ زێڕ، سەر زەمین (٢٦٧)

گەر نیکاحی کچ لەوی بوو ئاشکرا / مارەیی، نیشانە،پارچەش دیارکرا (٢٦٨)

یەک غولامی چووک کەجێی ئەوماڵەبوو / هەم نەخۆش هەم تووشی زەعف و، ناڵەبوو (٢٦٩)

وەک نەخۆشێکی دقی، دەتواوەئەو / لای تەبیبان جوابی وێ نەدراوەئەو (٢٧٠)

عەقڵ دەیکوت جێگەڕەنجی وی دڵە / خۆ دەوای تەن بۆ غەمی دڵ باتڵە (٢٧١)

ئەو غولام نەیکوت لەلای کەس حاڵی خۆی / دەردی دڵ دێتن لەکام ڕێگا لەبۆی (٢٧٢)

شوو، شەوێکی وای بەخاتوون کوت، بڕۆ / تۆ لەخەڵوەت حاڵی وی کە، جستوجۆ (٢٧٣)

تۆ لەجێگای دایکی بۆ وی بەڵکەئەو / حاڵی خۆی بۆ تۆ بەیان کا، بێ درەو (٢٧٤)

چونکەخاتوون وای لەشووی خۆی، بیست کەلام / ڕۆژی دوایەچوولەبۆ لای ئەو غولام (٢٧٥)

جا سەری وی شانەکرد خاتوونی ناز / زۆر بەحوببومیهرەبانی و دڵنەواز (٢٧٦)

هەر وەکوو دایکانی بێ حەد میهرەبان    نەرمی کرد تاهاتەگوفتارو بەیان (٢٧٧)

من ئومێدم وانەبوو هیچ کات ئەتۆ    بێی بەبێگانەی عەنوود دەی کیژی خۆ (٢٧٨)

ئەو کچی خواجەم، منیش خوێتین جگەر    بچتەجێگای دیکە، ئینسافەمەگەر؟ (٢٧٩)

تووڕەبوو خاتوون کەوای بیست لەو وتار    دەیهەویست لێیدا، لەبان بیخاتەخوار (٢٨٠)

چۆن دەبێ هیندوویی دایک بەد عەمەل    کیژی خواجەی خۆی ئومێد بێت و ئەمەل؟ (٢٨١)

سەبری کرد ژن، چی نەکوت جا، ئەو دەمی    ماجەرای کوت دوایەبۆ شووی، بێ کەمی (٢٨٢)

ئەو غولامەپەستەخائین، زیاد لەحەد    ئێمەلامان وابوو باشەو موعتەمەد (٢٨٣)

**دەستووردانی خواجەبەسەبر کردنی دایکی کچ کەئەتۆ ئەو غولامەمەلامەت وسەزەنیش مەکەئەمن بێ لۆمەو سەرزەنیش دەستی پێ لەتەماع هەلدەگرم، کەنەسیخ بسووتێ و، نەکەباب نەبرژێ ..**

خواجەپێیکوت بەو بڵێ باحەو سەلە    دێنمەوەکچ، دەیدەمەتۆ، ئەو چەلە (٢٨٤)

بەڵکەئەو هەی من لەدڵ وی بێنمەدەر    وادەکەم نەی بێ لەوەی پاش، وا نەزەر (٢٨٥)

تۆ دڵی خۆش کەو، بڵێ بەو خۆ یەقین    کیژی ئێمەبۆ ت دەبێتەهاو سەرین (٢٨٦)

نەن دەزانی دەتهەوێ تۆ کیژمان    خۆ دەنا دەن دا بەتۆ ئەو بێ گومان (٢٨٧)

ئاگری ئێمەلەنێو کانوونی مە    لەیلی ماڵی ئێمە، تۆش مەجنوونی مە (٢٨٨)

تاخەیاڵ و فکری خۆش بێن لایی ئەو    چون دەکاتن فکری خۆش ئینسان قەڵەو (٢٨٩)

گیایەباعیس تاقەڵەو بێ جانەوەر    عیززە، باعیس تا قەڵەو بێتن بەشەر (٢٩٠)

بەس لەڕێگای گوێ دەبێ ئینسان قەڵەو    بەس لەڕێی حوڵقووم دەبێ حەیوان قەڵەو (٢٩١)

ژن کوتی لەو نەنگی شەخسی پەست و خوار    چۆن دەبێ مومکین، تەکان دەم لێوو، زار؟ (٢٩٢)

گفتی وا پووچ چۆن بڵەم بەو بەد سیفەت؟    بمرێ با ئەو خائینی بێ مەعریفەت (٢٩٣)

خواجەپێیکوت ئەو فریوە، نەت بێ، بیم    تا بەلوتفی خۆش چا بێ ئەو سەقیم (٢٩٤)

دەفعی وی جا، تۆ بەمن کە، واگوزار    لێی گەڕێ لاچێ نەخۆشی، لەو نەزار (٢٩٥)

بەو نەخۆشەی، وا کەخاتوون کوت وتار    هێندەشاد بوو، سەر زەوی نەی بوو قەرار (٢٩٦)

چەشنی گوڵ پشکووت وسووربووهەم قەڵەو    جا، سپاس و، شوکری کرد سەت جار لەو (٢٩٧)

جارو بار دەیکوت کەئەی خاتوونی من    خوا نەکاتن ئەو وتانەت فێڵ ببن (٢٩٨)

خەڵکی دەعوەت کرد خواجە، زۆر، نە،کەم    دەمهەوێتن من فەرەج زاوا بکەم (٢٩٩)

بۆفریودان خەڵکی وایان کوت مەقال    ئەی فەرەج لێت بێ موبارەک ئێتتیسال (٣٠٠)

چـون فـەرەج پێـی وابـوو ڕاسـتەئەو وتـار | دەرد و ڕەنجی چـوون نـەمـان بـوون تارومـار (۳۰۱)
جـا شـەوی حیجلەبەڕەسـمی ئـەو زەمـان | دای لەیـەک ئـەمرد حـەنا، ئـەو وەک ژنـان (۳۰۲)
دەست و قۆڵی پڕنیگارکرد وەک عـەرووس | جـا مریشـکی دا نیشـان، پێـی دا خـڕووس (۳۰۳)
گشـت لیبـاس و ڕووسـەری بووکـان تـەمام | کردەبـەر ئـەو، ئـەمرەدی بـێ حـەد زەلام (۳۰۴)
وەختی خەڵوەت شـەمعی خامووش کرد زوو | مـان زەلامێـک، واو، هینـدوو، دوو بـەدوو (۳۰۵)
بەچکەهینـدوو کـردی هـاوارو فیغـان | کەس لەدەر نەی بیس لەبەر دەف دەنگی وان (۳۰۶)
دەنگـی دەففـو هەلهەلـەی پیـاو و، ژنـان | کردیـان هـاواری ئـەو هینـدوو نیهـان (۳۰۷)
بەچکەهینـدووی خسـتەژێرخۆی تـا بـەیان | چی بەسـەر دێتن لـەپێش سـەگ کیسـەنان (۳۰۸)
ڕۆژکـەهات ئامادەیـان کـرد بـۆ حـەمام | تیبقـی عادەتیـان فـەرەج بـرد بـۆ حـەمام (۳۰۹)
چوودەنێـو حـەمام ئـەو ڕەنجـوور گیـان | قـوون دڕاو بـوو وەک لیباسـی توونییـان (۳۱۰)
هاتـەوەنێو حیجلەئـەو هینـدووی بچـووک | جا لەلای وی دا دەنیشت کچ، چەشنی بووک (۳۱۱)
دایکـی کـچ دانیشـت لـەوێ وەک پاسـەوان | تـا نـەکاتن ئـەو لـەڕۆژدا ئیمتیحـان (۳۱۲)
زۆر شـەدید کـردی نیگـا لـەو نـەڕمو نـۆڵ | جـا بـەئیما دای بـەدوو دەس لـەو چـەمۆڵ (۳۱۳)
پێیـدەکوت یـاخوا نـەکا کـەس ئیتتیسـال | گەڵ عەرووسێک چەشنی تۆ ناحەز فیعال (۳۱۴)
ڕۆژ بـەڕوو بـۆ گشـت جوانـان میـری تـۆ | شـەو لـەکیری کەرکەسـیفتر کیـری تـۆ (۳۱۵)
لـەو جیهانـەوان هـەموویان نیعمـەتان | جوانـو خـاوێنن هـەموو پـێش ئیمتیحـان (۳۱۶)
دیار دەکا خۆشی لەدووڕ ڕا، چەشنی ئاب | بچیـەپێش گـەر، تـۆ دەبینـی ئـەو سـەراب (۳۱۷)
ئـەو عـەجووزەبۆ گـەنیوەی چـاپلووس | خۆی دەدا نیشان بەچەشنی نەو عەرووس (۳۱۸)
قـەت نـەبی مـەغروور بـەجوانی وی ئـەتـۆ | شـەربەتێکی سـەمی تێـدابێ مـەخۆ (۳۱۹)
تـۆ سـەبوور بـە، سـەبرەچون دێنـێ فـەرەج | تـا نەکـەو یـە، نێـو بـەڵایان وەک فـەرەج (۳۲۰)
ئاشـکرایەدانە، پنهـان دامـی وی | خۆشـەلات ئـەووەڵ ئـەتۆ، ئینعـامی وی (۳۲۱)

**لەبارەی ئەو مەتڵەبەکەئەو غروورو فریومەتەنهابۆ ئەو هیندوویە نەبوو بەڵکەم هەموو ئینسانێک دەهەموو مەرحەلەیەک دا، بەغرووری وا موبتەلایە( الا من عصمه الله)..**

بێتەدەسـتت هـەردەمێک دونیـا ئـەتۆ | بـۆ نەدامـەت شین دەکـەی بـەر پـا، ئـەتۆ (۳۲۲)
نێـوی میـری هـەم وەزیـری و شـەهریار | بـوو دەنێویـان مـەرگ وگیـان دان ئیسـتیتارَ (۳۲۳)
بەندەبـە، سـەرخاک وەکـوو ئەسـپان بـڕۆ | وەک جـەنازەنا، بەئەسـتۆ بـەن، ئـەتۆ (۳۲۴)
عالـەمی حـەمباڵ دەوێـتن، ناسـوپاس | وەک بەشان مردوو دەبەن بۆ گۆڕ، ئوناس (۳۲۵)

هەرکەسێکت دی لەسەر تابووت، دەخەو    هەم مەقام هەم سەر وەری بۆ دێت ئەو (۲۶

چونکەئەو تابووت لەعالەم بوو بەبار    بوون بەبار خۆیان لەعالەم ئەو کیبار (۲۷

چاکەباری خۆت بەپشتی خۆت بەری    چاکەدەروێشیت بوێ، نەک سەروەری (۲۸

تۆ نەدەی هیچ مل بەدوو پێی خۆت فشار    تا بەنقریس، پێت نەبێ بیمار، چ جار (۲۹

لەو ملانەعاقیبەت تۆ دێیەخوار    دێی خەرابەی، گەرچی زاهیر تۆیی شار (۳۰

خاک وەسەر ئەو شۆهرەتو ئەو شارەکە    تا لەدێی وێران نەژی، ئەو جارەکە (۳۱

خاک کەسەرجاه، تۆ کەباغت هەن هەزار    تا نەبێ وێران نشین و، پەست و خوار (۳۲

وای نەبێ کوت گەر بەهەشتی خوات دەوێ    قەت لەکەس داوانەکەی چیت دەسکەوێ (۳۳

زامینم من نەت هەوێتن تۆ ئەگەر    هەم بەهەشت و هەم لیقایی دادگەر (۳۴

هێندەساف بوو ئەو سەحابی لەو وتار    تاکو ڕۆژێک ئەو کەبوو مەرکەب سووار (۳۵

تازیانەی کەو تەعەرزی ئەو لەدەس    هاتەخواری خۆی و، نەی ویست ئەو لەکەس (۳۶

ڕەنج نادا بەخشش وەهەدیەی خودا    خۆی دەزانێ ئەو بەبێ خواهیش دەدا (۳۷

گەر بەئەمری حەق بێ خواهیش، بوو ڕەوا    خواهیشی وا باشەلایان ئەنبیا (۳۸

لا دەچێ بەد، گەرکو فەرمان دات یار    بەد، دەبێتەباش کەبێ، بۆ کردگار (۳۹

چی بەدی بێ گەر بەئەمری دادگەر    ئەو لەگشتی باشی دونیا دەچێتەسەر (۴۰

گەر سەدەف چڕژا مەنۆڕەلەو بەخوار    چون دەویدا، دوڕ نیهان هەن، سەت هەزار (۴۱

ئەو وتارەدوایی نایەجا ئەتۆ    چەشنی باران بێرەوە، لای شاهی خۆ (۴۲

هەروەکوو زێڕ، ڕووکەوە لای کانی خۆ    تا لەنفرەت بێ نەجات دەستانی تۆ (۴۳

گەر بەدڵ عاشق بەیەک زاهیر دەبن    زۆر پەشیمان و، پەرێش ئاخیر دەبن (۴۴

وەک پەپوولان تۆبەیان بوو، کار، ئەوان    کاری پێش ئەنجام دەدەن سەت جار ئەوان (۴۵

وەک پەپوولان وادەزانن نوورەنار    جا لەدوور ڕا دێن لەبۆ لای نار بەغار (۴۶

لەو دەسووتێ، بێ لەبۆ لای نار، باڵ    ئەو چەلەش کەوتو ڕژا خوێی، وەک مناڵ (۴۷

جارەکی دیش ئەو بەفیکری سوود بوو    خۆی لەناری شەم دەدا ئەو بۆیەزوو (۴۸

جارەکی دیکەش دەسووتێ و، ڕادەکا    ئەوچەلەش فیکری تەماع بەو، وا، دەکا (۴۹

ئەو دەمەی ڕاحەت لەدەستی نار دەبێ    چەشنی هیندوو ئەو لەشەم بێزار دەبێ (۵۰

ئەی بەڕوو وەک مانگی ئاسمان تۆ گەشی    ئەی بەسوحبەت کازیب و، عاشق کوشی (۵۱

ئەو چەلەش دەی چێ لەبیر تۆبەو حەنین    چون دەکا خواسست تۆبەی کازیبین (۵۲

### تەئویلی ئەو ئایەتەبەسوورەتی عام (كلما اوقدوا نارا للحرب )..

هەركەهـەڵیان كـرد نـاری جـەنگ ئـەوان ... ناری وانی كرد خەمووش، خوای پڕ تەوان (٣٥٣)
دەیهـــەوێتن ئـەو لەبـــەد، دەس هـــەڵگرێ ... ئـەهلی تەسـمیم چـون نییـەبێی نـاكرێ (٣٥٤)
چـون دەدڵ دا، زەڕڕەیـەک نـەی بـوو سـەفا ... دایـــدەنا ســـەرقەلبی وی نیســـیان خـــودا (٣٥٥)
گـەرچی چـەخماخی دڵـی ڕەو شـەن دەكـا ... زووئـەوی خـامووش دەكـا دەسـتی خـودا (٣٥٦)

### داستانێک لەتەوزیحی ئەو مەتڵەبە..

خشـبەێێکی بیسـت سـاحەب مـاڵ شـەوێ ... دەیهەویسـت چەخماخ ڕەو شـەن كـا، لـەوێ (٣٥٧)
دز، بەئەسـپایی لـەلای وی گـرت قـەرار ... زوو لەسەرپووشـووی دەكـرد خـامووش نـار (٣٥٨)
جـا لەسـەر ئـەو پووشـوو، قـامكی دادەنـا ... تـــا بكـــاتن ئـــاگری وی، زوو فـــەنا (٣٥٩)
خواجـەپێی وابـوو كـەئاگر خـۆی دەمـرد ... نەیـدەدی گـەر دز ئـەوی خـامووش دەكـرد (٣٦٠)
خواجـــەدەیكوت چونكەپووشـــوو، بانەمـــە ... ئـــاگری وی زوو دەبـــێ خـــامووش لەمـــە (٣٦١)
چونكـەتاریک بـوو لـەوێ بـێ حـەد هـەوا ... نەیـدەدی كـەس نـار خـامووش كـا، ئـەوا (٣٦٢)
قـەلبی كـافر نـار كـوژێكی وای هەیـە ... بۆیەنەیـدی، چـاوی كـەم بینـای هەیـە (٣٦٣)
چـاک لەقـەلبی شەخسـی زانـا بـوو عـەیان ... بـێ تەكانـدەر نـاخوا هـیچ شـت تـەكان (٣٦٤)
ڕۆژو شـەو گـەر دێـن مەگـەر نـاڵێی ئـەتۆ ... بێ خوداوەنـد چۆن ئەوان دێن سەر بەخۆ؟ (٣٦٥)
گـەر دەڕۆی بـەدوایی مـەعقوولات ئـەتۆ ... بـێ شعووری خـۆت دەكـەی ئیسبات ئـەتۆ (٣٦٦)
كامـــەیان مەعقوولـــە، لات تـــۆ دا بڵـــێ ... مـــاڵ بەبـــەننا یـــا بـــەبێ بـــەننا، بڵـــێ؟ (٣٦٧)
نووسـەری بـێ، یانەنـەی بـێ، خـەت ئەگـەر ... كێهـەیان مەعقوولـە، لات هـەم موعتەبـەر؟ (٣٦٨)
جیمـی گـۆش و عـەینی چـاوو میمـی زار ... چۆن بـەبێ نووسـەر دەبـن؟ ئـەی نابـەكار (٣٦٩)
شـەمعی ڕەو شـەن سـەر بـەخۆ ڕووناكـەیا ... یـەک نەفـەر زانـا ئـەوی ڕەو شـەن دەكـا؟ (٣٧٠)
سەنعەتی باش كوێرو شـەل ئـەنجام دەدەن ... یا كەسێک چاو ساغ بێ و، سـالم بـەدەن؟ (٣٧١)
جـــا كـــەزانیت خـــوا ئـــەتۆ ئـــازار دەدا ... دەردو ڕەنجت نەک چەلێک، زۆر جار دەدا (٣٧٢)
چەشنی نەمروود دوور لەخۆت كە،ئەو بەجەنگ ... بـاوێ بـۆلای وی ئـەتۆ تیـری خـەدەنگ (٣٧٣)
وەک مـــەغوول تـــۆ تیـــر بـــاوێ ئاســـمان ... تـا لەكێشـان بـۆت مـەحفووز بـێ گییـان (٣٧٤)
تـۆ لـەلای وی گـەر لەدەسـتت دێ بـڕۆ ... چـۆن دەڕۆی تـۆ؟ خـۆ ئەسـیری وی ئـەتۆ (٣٧٥)
نێو عـەدەم نـەت بـوو لەدەستی وی نـەجات ... كـێ لەدەسـتی ویـت ئێسـتا دەر دەخـات؟ (٣٧٦)

مـــەرگی تەقوایەکـــەچووی بـــەدوای هـــەوا — هــەم هــەڵاتن بــوو لــەدەس عــەدڵی خــودا (٣٧٧)
ئــــەو جیهانــــەداوە، دانــــەش ئــــارەزوو — بــەردە داو،تــۆ، روو دەلای یــەزدان کــەزوو (٣٧٨)
بچیــەلای وی، ســاف دەبــی تــۆ، زێدەشــاد — ســاف نــەبی گــەر، تــۆ دەبینــی زۆر فەســاد (٣٧٩)
وای نەبی کوت گوێ دەفەتوای قەلبی خۆت — گــەرچی مــوفتی دی، بــدەن فــەتوا لــەبۆت (٣٨٠)
وێــڵ کەئــەمیال تــاکو بــێ ڕەحمــی خــودا — خــۆت دەزانــی دەیهــەویتن خــوا وەهــا (٣٨١)
تــۆ تــەلاش کــە، ببیەخزمــەتکاری وی — تــا ببێتــە جێگــە بــۆت ،گــوڵزاری وی (٣٨٢)
گــەر موراقیــب بــی لــەخۆت تــۆ، دائیمــی — دادو داوەر تــــۆ دەبینــــی ئــــەو دەمــــی (٣٨٣)
گــەر حیجــاب نەیهێشــت ببینــی تــۆ بــەچاو — کــوا لــەکاری خــۆی دەکــاتن، کــەم هــەتاو؟ (٣٨٤)

**نیشان دانی شا بەئەمیران وکەج فیکران لەبارەی ئەیاز، سەبەبی فەزیلەت و گەورەیی و ڕتبەو مەقام وزیادبوونی موستەمەڕڕی وموقەڕڕەڕی وی، بەجوورێک کەئەوان هیچ ڕێگای ئیعتیرازیان نەمێنێ .**

**خولاسەی داستان ..**

ئەمیران لای سوڵتان مەحموود گلەی یان کرد کەبۆچی موستەمەڕڕی ومقەڕڕەڕی سی نەفەر دەدەی بەوی؟،شا، هیچ جوابی نەدانەوە،تارۆژێکی شا دەگەڵ سی نەفەرلەئەمیران چۆدەشت وکێوان ولەدوور کاروانێکی دی وبەیەکێک لەئەمیرانی کوت .. بڕۆ بزانەئەو کاروانەلەکوێ ڕادێ؟ ئەو بەعەجەلەچوو وگەڕاوە، وکوتی .. لەشاری ڕەی، ڕا، دێ،شا کوتی دەچتەکویی؟ ئەمیر جوابی نەبوو چون ئەو سوئالەی لەکاروان نەکردبوو، شا،بەئەمیرێکی دیکەی دەستووردا کەبڕوا ولەوکاروانەسوئال بکا،کەدەچنەکوێی؟ ئەویش چوو گەڕاوەوکوتی دەچتەیەمەن، شالێی پرسی چیان پێیە؟چونکەئەو سوئالەی نەکردبوو نەی توانی جواب بداتەوە، شا، ئەمیرێکی دیکەی نارد کەئەو مەسئەلە، لەکاروان پرسیاربکا ئەویش جوابی داوە،کاسەو زرووفی ساختی ڕەی مەتاعی وانەشا، لەوی پرسی کەنگی لەڕەێ، دەرکەوتوون؟ئەو ئەمیرەش نەی توانی جواب داتەوە، جا بەئەمیرێکی دیکەی دەستووردا کەبڕوا وئەو مەتڵەبەلەکاروان تەحقیق بکا، ئەو ئەمیر چوو وجوابی هینا کەکاروان لەحەوتەمی ڕەجەب لەڕەی وەدەرکەوتووە، شا، لێی پرسی کەقیمەتی مەتاعی وان لەچ قەرارێکە؟ئەو نەی توانی جواب داتەوە، بەوجوورەسوڵتان مەحموود سی ئەمیری بەڕێ کرد تا سستی ڕای و نەزەری وان لەموقابیل تەحقیقی مەسائیل، بەوان نیشان بدا .. جا لەپاشان شا،کوتی ڕۆژێک کاروانێک هاتبوو ئەو مەنتیقە،بەئەیازم دەستوور داکەبڕوا

لەوکاروانەسوئال بکا کەلەکوێ ڕا دێ؟ ئەو چوو وبەهۆش و زیرەکیەکی کەهەیبوو نەتەنها جوابی ئەو سوئالەی هینا، بەڵکەم هەربەفیکری خۆی زۆر مەسائیلی دیکەشی لەکاروان بەدەست هینا، دەواقیع دا ئەو بەیەک جار چوون، بەئەندازەی سێ نەفەری ئێوەی لەو کاروانەکەسبی ئیتیلاع کرد، ئەلئان ئێوەحاڵی بوون کەبۆچی موستەمەڕی وی بەتەنهایی بەقەد، سێ، ئەمیرە؟

ئەو شتەی میران بەسێ جار کردیان ئەو بەجارێکی هەمووی لێ بوو عەیان ..

| | | |
|---|---|---|
| هێن حەسادەتیان ئەمیران هاتەجۆش | گرتییان ئیراد لەشاهەنشاهی خۆش | (٣٨٥) |
| ئەو ئەیازەت نیتی عەقڵی سێ کەسان | موزدی سێ میر بۆ ئەدی دەخوا وەسان؟ | (٣٨٦) |
| سێ ئەمیری برد دەگەڵ خۆی شەهریار | چوو لەبۆ لای دەشت و کێو ئەو بۆ شکار | (٣٨٧) |
| دی لەدووردێ، کاروانێک ئەو مەلیک | وای بەمیرێک کوت بڕۆ ئەی موئتەفیک | (٣٨٨) |
| تۆ بڕۆ لەوکاروان کە، پرسیار | دێ لەکام عەرزو لەکام شارو دیار؟ | (٣٨٩) |
| چوو کەهات دەیکوت لەڕەی دێ کاروان | ئەو لەجوابی دەچتەکوێ، بوو ناتەوان | (٣٩٠) |
| وای بەئێکی دی دەکوت ئەی باشەڕەف | تۆ سوئال کە، کوێ یە، بۆ کاروان هەدەف؟ | (٣٩١) |
| ڕۆی کەهات دەیکوت کەدەڕوا بۆ یەمەن | پێیدەکوت چی پێیەئەو، ئەی موئتەمەن؟ | (٣٩٢) |
| ئەو کە، ما، دەیکوت بەمیری دی بڕۆ | بۆم بپرسەکاروان چی پێیە؟ تۆ | (٣٩٣) |
| هات و پێیکوت زۆرەجینسی تابڵەی | ئەکسەریشی زەرفو کاسەی شاری ڕەی | (٣٩٤) |
| پێیدەکوت شا، کەی لەڕەی ڕا هاتەدەر؟ | ما، لەجواب دان، ئەو ئەمیری سست نەزەر | (٣٩٥) |
| سێ ئەمیری زێدەنارد ئەو شەهریار | سست ڕای ناقیس لەئەنجام دانی کار | (٣٩٦) |
| شا بەمیرانی دەکوت ڕۆژێک جودا | ئیمتیحانم کرد ئەیازی خۆش ئەدا | (٣٩٧) |
| مەبدەئی کاروان سوئال کە،کام دیار | ئەو هەموو سوالەی دەچوون،کردپرسیار | (٣٩٨) |
| بێ سفاریش بێ ئیشارەت یەک بەیەک | حاڵی وان حاڵی بوو بێ تەردیدو شەک | (٣٩٩) |
| ئەو شتەی میران بەسێ جار کردیان | ئەو بەجارێکی هەموی لێ بوو عەیان | (٤٠٠) |

**قەبووڵ نەکردنی ئەمیران ئەو حوججەتەبەشوبهەی جەبریان وجواب دانەوەی شا بەوان ..**

| | | |
|---|---|---|
| جا دەیان کوت میر کەئەو بوو هێندەباش | کاری خوایەوایەنەک، جەهد و تەلاش | (٤٠١) |
| قیسمەتی خوابوو کەمانگ بوو ڕوو، قەشەنگ | بەختەوەر بووگوڵ بەبۆن خۆشی وبەڕەنگ | (٤٠٢) |
| شا کوتی چی بێ بەشەر، بەد، یانەباش | یا لەبەر تەقسیرە یا جەهد و تەلاش | (٤٠٣) |

وانــەبا، ئــادەم چلــۆن دەیکــوت دەنــا — (ربنـــــا انــــــا ظلمنـــــــا نفســـــنا ) (۰۴)

نەیـدەکوت بـەختم بـەمن وای کـرد گونـاه — هەردەبوو، چون وای دەویست حوکمی ئیلاه (۰۵)

وەک کـــوتی(اغـــویتنی) شـــەیتانی هـــار — خۆت دەکەی بەد،من دەکەی تەقسیر کار (۰۶)

هـەردوو حـەققن هـەم تـەلاش و هـەم قـەزا — وەک بلیس یەک چاو مەبە، ئەی مورتـەزا (۰۷)

گەر تەرەددود کا کەسێک بەینی دوو کار — ئــەو تــەرەددود کــوادەبێ بــێ ئیختیـار؟ (۰۸)

ئــەو کەســەی بەسراوەدەســت و پــایی وی — ئینتیخـــــابی کارنـــــــابێ، لایـــــــی وی (۰۹)

کوادەکـاتن فکـری وا، قـەت یـەک نەفـەر؟ — دەچمــەژێر یــەم یــا لەئاســمان دەچمــەدەر (۱۰)

ئـەو دەکـا، تەردیـد هـەتا مووسـیل بـڕۆم — یالـــەبۆ جـــادوو هـــەتا بابیـــل بـــڕۆم (۱۱)

جـــا لـــەبۆ تەڕدیـــد قـــودرەت لازمـــە — وانــەبێ گــەر، جێــی کەنینــەو جێــی گەمــە (۱۲)

ســەر قــەزا مــاوێ بەهانــە، ئــەی جــەوان — دامــەنێ ســەرخەڵکی جـورمی خـۆت چ ئـان (۱۳)

زەیـدە، قاتـڵ، بـۆ قیسـاس بکرێـت عـەمر؟ — عەمرە، مەیخۆر، بۆ لە ئەحمەد،حەددی خـەمر؟ (۱۴)

جـورمی خـۆت بنـوارەڵای دەورو بـەرت — هەرلەخۆتەجونبشـــت نـــەک ســـێبەرت (۱۵)

ئیشـــتیبا ناکــا لـــەپاداش چـــون ئـــەمیر — بـاش دەناسـێ دوژمـن ئـەو میـری بەسـیر (۱۶)

نۆبــەتێ، دێ بــۆ کەســێک بخــوا عەســەڵ — موزدی خۆی گرت ئەو کەسەی کردی عەمـەڵ (۱۷)

چیت دەویست نەیدا بەدەستی تۆ تـەلاش؟ — چیت دەچاند نەیدا بەتۆ، مەحسوولی باش؟ (۱۸)

کــاری تــۆ جێگــای کــەبوو،گیان وتــەنت — وەک منالــت دێــت و دەگــرێ دامــەنت (۱۹)

خــوا بــەکاران عاقیبــەت ســوورەت دەدا — چوونەســـەردار ســـوورەتی ســـیرقەت دەدا (۲۰)

کوا وەکوو سیرقەت دەچی هیچ کات دار؟ — وای موســـەووەر کـــرد ئـــەمما کردگـــار (۲۱)

وای بەدارۆغـــــەدەکرد ئیلهـــــام خـــــودا — بـــۆ عەداڵـــەت ســـوورەتی وا، بـــا، بـــدا (۲۲)

تــاتۆ عــالم بــی و، عــادڵ، چــون قــەزا — نامناســـب پێـــت دەدا حـــوکم و ســـەزا (۲۳)

حـوکمی قـازی گـەر بـێ بـاش و قـەمین — چۆنـەحوکمی ئەحکـەمی گشـت حـاکمین؟ (۲۴)

جـۆ، بچێنــی شــین دەبێــتن جــۆو، بــەس — وام کـەبگری بـۆت ڕەهـن نـادا چ کـەس (۲۵)

کەس موقەسسیر مەگرە، تۆ، بۆ کاری خۆت — خۆت دەبینی موزدی گشت کرداری خۆت (۲۶)

خـۆت موقەسسیرکە، کـەخۆت کردووتـەکار — ئــاش بەوەگــەڵ عــەدڵ ودادی کردگــار (۲۷)

کاری بەد باعیس بوو، بۆت بێ، ڕەنجی سەخت — بـەد لـەکاری خـۆت بزانـە، نـەک لەبـەخت (۲۸)

چاو دەبێ خێل گەر لەبەختت کەی نـەزەر — سـەگ کـەوابێ، قـەت لـەکادێن ناچتـەدەر (۲۹)

موتتەهـەم کەنەفسـی خـۆت تـۆ ئـەی فـەتا — موتتەهــەم مــەگرە، جــەزای عــەدڵی خــودا (۳۰)

| | | |
|---|---|---|
| تۆبەکـــە، تـــۆبێرەڕێی ڕاســـت و هـــودا | هـــەرچی کـــردت پێـت دەدا نیشــان خـودا | (٤٣١) |
| تۆنـەخۆی هـیچ دەم فریـوی نەفسـی خـۆت | ڕۆژی حـەق ناپۆشـێ یـەک زەڕڕەش لـەبۆت | (٤٣٢) |
| یـەک بەیـەک زەڕڕاتی جیسمی، مـوو بـەموو | لای هـــەتاوی زاهیـــری ئاشـــکار هـــەموو | (٤٣٣) |
| زەڕڕە، زەڕڕە، خـــــاترات و ئیفتیکـــــار | بـــوون لـــەلای ڕۆژی حـــەقایق ئاشـــکار | (٤٣٤) |

**حیکایەتی ئەو سەییادەی کەخۆی دەگیا دا وەر پێچابوو ودەستەیەک گوڵ و لالەی وەک کلاو بەسەر خۆی دا دابوو، تا پەڕەندان ئەو ی بەگیا دانێن، ئەو تەیری زیرەک کەمێکی ئیحساس کرد کەئەوەئادەمیە، چون گیای وام نەدیوە بەڵام بەتەواوی ئیحساس نەکرد، فریوی فێڵی وی خوارد چونکەدەئیدڕاکی ئەووەڵ قانیعییەتی نەبوو، ودەئیدڕاکی مەکری دوو وەم قانیعییەتی بوو، ..(وهوالحرص و الطمع سیما عند فرط الحاجه والفقر ) قال النبی صلی الله علیه وسلم کاد الفقر ا ن یکون کفرا ..**

**خولاسەی داستان ..**

پەڕەندەیەک بۆ لای لالـەزارێک پـەروازی کـرد دەحاڵێک دا کەلـەوێ داوێک دانرابۆوەو چەند دانەیەکیش لەدەوری وی .. لەقەراغ ئـەو دا وەسـەییادێک خـۆی مـات کردبوو و بـۆ فریـو دانی پەڕەندان خۆی دەلک وگەڵای گوڵان دا، ون کردبوو،پەڕەندەدەهەوای دەو رو بەر، دەورێکی لێدا ولەداو نیزێک بۆ وە، و سـەییادی، دی، بەسـەییادی کـوت ئـەی سـەبز پۆش ئـەتۆ کێی؟کەلـەو سـەحراو بیابانەبەتـەنها دانیشتووی،سـەیاد کـوتی پیـاوێکی ڕاهیـبم ولەخـەڵکی دوور کەوتوومـە، وبەگـەڵای گیـای سـەحرا قەناعـەتم کـردووە، پەڕەندەکوتی ڕەهبانییـەت دەئیسلام دا جائیزنییـە، لەخـەڵوەت وەرەدەر و دەگـەڵ خـەڵکی ژیـان بەرەسـەر، سـەیاد کـوتی ئـەوەی ئـەتۆ دەڵـەی حـوکمێکی موتڵـەق نییـەچون گۆشـەگیری ئەگـەر خـەراپیش بێ لەتێکـەڵاوی دەگـەڵ ئینسانی خەراپ خەراپتر نییە، ئایا ئەتۆ هـەتاکو ئێستاکەدیتووتەبەرد و سندەگڵی سـەحرا هیچ کەسێک گـومڕا بکـەن؟ بـەڵام لەخـەڵکی ئـازار دەری دونیـا زۆر جـاران، زۆر کەسـان بـەگومڕاهی دەکێشـرێن،پەڕەندەکوتی ئـەتۆ ئیشـتیبا فکـر دەکـەی، ئەگـە ر دەجامیعـەدا زینـدەگیت کردبێ هونـەرت کـردووە، دەنـا لەترسـی گوناەپـەنابردن بـۆ کـەلێن و قوژبنـان شـەرتی هیدایـەت نییـە، سەییاد کوتی بـەڵێ وایەبەو شەرتەکەبەسـەر عـامیلی شـەڕ ساز کـەری جامیعـە پیرۆزبێ بـەڵام ئەگەرقودرەتێکی وات نـەبوو هـەروا چاکەپـەنا بـۆ گۆشـەی و ئینزیـوا بـەری،تازەبۆ ئـەوەی کـەڕێ لەچاڵ تەشخیس بدەی نیازت بەڕەفیقی سادق هەیە، ئێستا بڵێ بزانم دەو زەمانـەدا کوا ڕەفیقی

سادق؟ پەڕەندەکوتی ئە ساسی سلووک سیدقی قەلبە، نەڕەفیقی تەریق .. ئەتۆ سادق بە، ڕوفەقای سادق پەیدا دەکەی .. بەحسی ئەو دووانەزۆرشەدید بوو، پەڕەندەچونکەبرسی بوو چاوی لەدانەکان دەکرد وناچارلە سەییادی پرسی ئەو دەنکەگەنمانەئی تۆنە؟ سەییاد کوتی نا، ئەوانەئی منداڵێکی هەتیون، چونکەسەرپەرەستی نییەمووەققەتەن بەمنی زاهیدیان ئەسپاردووە، وبۆ خۆشت دەزانی کەخواردنی ماڵی هەتیو حەرامە، پەڕەندەچونکەزۆر برسی بوو کوتی دەحاڵی حازردا ئەمن دەئیزتیرارو عوسرەت دامە وشەرعەن جائزەبۆ پێش گری لەبرسیا یەتی کەمێک لەو دەنکانەبخۆم سەییاد کوتی ئەگەر شەخس موزتەڕ وناچاریش بێ وا چاکترەکەخۆی بپارێزێ، وئەلئان کەدەتهەوێ لەو دەنکانەبخۆی دەبێ قەول بدەی کەقیمەتی وان بدەی ..بەو جوورەسەییاد ئەو پەڕەندەی فریودا، پەڕەندەکە سەبرو قەراری نەبووقەبووڵی کرد،وهەر دەگەڵکو هات دەنکان هەلگرێ کەو تەداو وئاهو ناڵەی بڵیند بوو.

| | | |
|---|---|---|
| یەک پەڕەندەچوو لەبۆ نێو مێرغوزار | دانرابوو داو لەوێ دا، بۆشکار | ٣٥) |
| قیسمەتێکی دان ڕژاند بۆ سەر زەمین | ئەو شکارچی خۆشی چوو، بۆ نێو کەمین | ٣٦) |
| ئەو لەخۆی پێچا گییا هەم بەرگی دار | تا دەداو خاتن بەفێڵ تەیری هەزار | ٣٧) |
| هاتەلای وی ئەو پەڕەندەی بێ خەبەر | پاش تەوافێک هات لەبۆ لای ئەو نەفەر | ٣٨) |
| پێیدەکوت کێی؟ تۆ کەسەو زت کردەبەر | وای لەنێو ئەو دەشت و چۆلی پڕ خەتەر | ٣٩) |
| پێیدەکوت من زاهیدم دەرچووم لەشار | قانعم ئێستا بەگیا هەم بەرگی دار | ٤٠) |
| زوهدو تەقوام ئینتیخاب کردمن بەدین | چون ئەجەل گرتوو یەئێستا، لێم کەمین | ٤١) |
| مەرگی جیران من لەویم گرت ئیعتیبار | لێک وپێکی دا لەمن ئەو، کەسب و کار | ٤٢) |
| چون لەئاخیر من دەبم تەنها وبەس | هەر لەئێستا چاکەخوو نەگرم بەکەس | ٤٣) |
| چون لەئاخیر جێگەبۆمن هەر لەحەد | چاکەبگرم خوو لەگەڵ زاتی ئەحەد | ٤٤) |
| چون چەنەم ئاخیردەبەستن ئەی سەنەم | چاکەئێستا من کەکەم لێدەم چەنەم | ٤٥) |
| ئەی ئەتۆ موعتاد بەزەڕ کووب و کەمەر | ئاخیرت پارچەی نەدورواو دێتەبەر | ٤٦) |
| ڕوودەکەینەخاک کەلەو بووین ئاشکار | بێ وەفایان بۆ دەبێ بگرین بەیار؟ | ٤٧) |
| جەددو خزمی کۆنی ئێمەچوار تیباع | خزمی تازەو بێ بەقان گرت بۆ تەماع | ٤٨) |
| زۆر لەمێژەهاو نشینی و هاو دەمی | گەڵ عەناسیر هەیبوو جیسمی ئادەمی | ٤٩) |
| گەرچی ڕووحی وی لەئەرواحەو عوقوول | چوو لەبیر ئەو ڕووحە، هەرچی بووی ئوسوول | ٥٠) |
| دێ لەئەرواح و عقوولی با سەفا | نامەلای گیانی ئەسیر ئەی بێ وەفا | ٥١) |

خۆت بەیاری پێنج ڕۆژەکرد شاد ‌ ‌ هیچ کەناکەی تۆ لەدۆستی کۆنەیاد (٤٥٢)

گەرچی خۆشحاڵن لەبازی دا منداڵ ‌ ‌ شەو بەئیجباریان دەبەن بۆ لایی ماڵ (٤٥٣)

خۆ دەکا ڕووت وەختی بازی تیفلی چووک ‌ ‌ دز، دەبا کەوش وعەبای وی چوست وسووک (٤٥٤)

وا بەبازی خۆی دەبێ منداڵ شاد ‌ ‌ هەرچی هەیبوو ئەو لیباس، دەی چێ لەیاد (٤٥٥)

شەو کەهات و، بوو تەواو بازی منداڵ ‌ ‌ ڕووی نییەبەو حاڵەئەو بڕواتەماڵ (٤٥٦)

بازیەدونیا، مەگەر نەت بیست لەپێش؟ ‌ ‌ وا، مەتاعت دا بەباو، واش بووی پەرێش (٤٥٧)

پێش ئەوەی شەو بێ کراس کە، جستوجۆ ‌ ‌ ڕۆژ مەکەزایع، بەبەحس و گفتوگۆ (٤٥٨)

من لەسەحرا بۆیەخۆم دوور کرد لەناس ‌ ‌ چونکەخەڵکی دیکەلێم دەدزن لیباس (٤٥٩)

نیسفی عومرم چوو لەڕێگای یاری خۆم ‌ ‌ نیسفی دیشی برد غەمی بەدکاری خۆم (٤٦٠)

یار جبەو، بەدکار کڵاو می برد سووک ‌ ‌ غەرقی بازین ئێمەوەک منداڵی چووک (٤٦١)

جا، شەوی مردن لەتۆ نیزیکە، تۆش ‌ ‌ بەسکەلەو کایەو قومارەی لاتە، خۆش (٤٦٢)

سوار لەئەسپی تۆبەبە، جا بگرەدز ‌ ‌ چی دزی بێ، بگرەتۆ لەو چاو نز (٤٦٣)

زۆر عەجیبەئەسپی تۆبە، ئەی فلان ‌ ‌ ئەو بەیک ئان دەچێتەحەوتەم ئاسمان (٤٦٤)

حیفزی ئەسپت کەبەڵام، تۆ ئەی فلان ‌ ‌ لەو دزەی بردی لیباسی تۆ نیهان (٤٦٥)

تا نەبا دز، ئەسپەکەش ئەی خۆش قەدەم ‌ ‌ هۆشی ئەسپی خۆت هەبێ تۆ دەمبەدەم (٤٦٦)

**حیکایەتی ئەو شەخسەی کەدزان بەرانی ویان دزی وبەوەش قەناعەتیان نەکرد وبەفێڵ لیباسەکانیشیان دزی ..**

**خولاسەی داستان ..**

شەخسێک بەرانێکی هەبوو و بەتەنافێک کەدەئەستۆی وی کردبوو بەدوای خۆی دا، دەکێشا دزێک لەسەر ڕێی وی خۆی مات کردبوو، دەفرسەتێکی موناسب دا، تەنافەکەی بڕی، وبەرانەکەی ڕفاند و ڕۆی، ساحەب بەران بەپەرێشانی بەدوای ئەو بەرانەدا هەموو جێگایەک گەڕا، تاکو گەیشتەسەر چاڵاوێک ودیتی کەکابرایەک لەوێ دانیشتووە وهەر هاوار دەکاو دەڵێ ئەی داد دیتت کەچیم بەسەرهات؟بەد بەخت و بێچارەبووم .ولازم بەکوتنەکەئەوکابرایەدزی بەرانەکەبوو ساحەب بەران بەبێی ئەوەکەئەو بناسێ، پێیکوت مامەگیان چ قەوماوە؟ کوتی لەناکاو کیسەی زێڕم لێ دەنێو چاڵاو کەوت، ئەگەر ئەتۆ هیممەت بکەی و ئەوی دەرێنی یەک پێنجومی وی دەدەم بەتۆ یانی لەسەت دانەسکەی زێڕ بیست دانەی بەسوورەتی پاداش دەدەم

بەتۆ، ساحەب بەران بەو قسەوەتەماع کەوت، وەبەخۆی کوت بەبیست دانەسکەیەک بەران کەهیچ، بەڵکەم دەتوانم دەبەران بکرم، جا، بەعەجەلەلیباسەکانی دەرێنا، و بەتوندو تۆڵی چۆ دەنێو چاڵاو وئەو ەکارێک بوو کەدز دەی ویست، ئەو دزەدەیەک چاو هەڵێنان دا تەواوی لیباسی ئەو تەمەعکارەساویلکەی ڕفاند و برد..

یەک نەفەر دەی برد بەدووی خۆی دابەران  دز بڕی حەبل و بەرانی برد نیهان (٤٦٧)

ئەو هەموو لایەک گەڕا گەر بووی خەبەر  تا بزانێ ئەو بەران چی هات بەسەر (٤٦٨)

دی لەسەر چاڵاو دز، هەر وای دەکرد  شیوەنو گریانو وا وەیلای دەکرد (٤٦٩)

پێیدەکوت تۆ بۆ دەکەی وا ناڵەناڵ  پێیدەکوت هەمبانی زێڕیم کەوتەچاڵ (٤٧٠)

گەر تۆ بتوانی دەرێنی ئەو لەچاڵ  پێت دەدەم یەک پێنجومی وی من، حەڵاڵ (٤٧١)

خومسی سەت دینار دەدەم من جا، بەتۆ  دەە بەران دەکرێ بەوی دەیکوت بەخۆ (٤٧٢)

گەر دەرێکم بەسترا، وەکرا دە، دەر  گەر بەران چوو وشتری دا، دادگەر (٤٧٣)

ئەو لیباسی داکەنی و چۆ خوار لەچاڵ  دز لیباسی لێ ڕفاند، ڕۆی خۆشحاڵ (٤٧٤)

شەخسی موحتات، ڕێ هەتا کو دێ، دەبا  وانەبێ گەر عومری خۆی ئەو دا، بەبا (٤٧٥)

ئەو دزێکە، فیتنەسازی خوویی وی  وەک خەیاڵ دائیم دەگۆڕی ڕوویی وی (٤٧٦)

مەکری وی زانی فەقەت خوای لەو سەرە  تۆ لەمەکری وی پەنا بۆ خوا بەرە (٤٧٧)

**مونا زەرەی پەرەندە دەگەڵ سەییاد لەبارەی ڕەهبانییەت، ولەبارەی ڕەهبانییەتێکی کە موستەفا علیەالسلام، لەئوممەتی خۆی نەهی کرد، کە( لارهبانیەفی الاسلام )..**

وای پەرەندەکوت بەپیاو، خەڵوەت، بەدە  ڕاهیبی مەمنووعی دینی ئەحمەدە (٤٧٨)

مەنعی ڕەهبانییەتی کرد ئەو ڕەسوول  بیدعەتی وا، بۆ دەکەی تۆ ئەی فزوول؟ (٤٧٩)

شەرتەبۆ موئمین جەماعەت جومعەهەم  ئەمری مەعرووف مەنعی مونکەر دەمبەدەم (٤٨٠)

حەو سەلەی کێشان لەبەدخوو، ڕەنج و جەور  سوودو نەفعیش دان بەعالەم چەشنی هەور (٤٨١)

چاکەئەو کەس سوود بداتەخەڵکی دی  بەر، کەنی بۆ هاو دەمی سندی ئەدی؟ (٤٨٢)

ڕووکەفەو مێک ڕەحمی خوایان یار بێ  سوننەتی پێغەمبەرت تۆ کار بێ (٤٨٣)

ئەو کوتی هەر کەس کە نەیبێ عەقڵی باش  ئەو لەلای ئەشخاسی عاقڵ، سندو داش (٤٨٤)

وەک کەرە، هەرکەس کەفیکری نانەبەس  هاو دەمی وی هاو دەمی بەردانە، بەس (٤٨٥)

غەیری حەق نای بێ لەنابوودی ئەمان  هەرچی لازم بێ کەبێ، دی، بێ گومان (٤٨٦)

وەک موورادی خۆیەتی، بێ گیانەئەو ‌ ‌ چون بەدائیم هەر بەدووی مردوانەئەو (٤٨٧)

دۆستی دونیا دۆست، ڕاهیب بوو دەقیق ‌ ‌ چونکەبەردو سندەگەڵ،گەڵ وین ڕەفیق (٤٨٨)

کەس بەسند و بەر، نەبوو گومڕا، چ جار ‌ ‌ دێ لەشەخسی چەشنی سند، ئافەت هەزار (٤٨٩)

پێیدەکوت مەل، بۆ ت جیهاد، وا چادەبێ ‌ ‌ گەر دزی وا، جێی لەنێوان، جا دەبێ (٤٩٠)

جا لەبەر حیفزو لەبەر یاری، بەتاو ‌ ‌ دێتەسەر ڕێگای خەتەر دار، شێرەپیاو (٤٩١)

پیاوەتی ئەو دەم هوویدا چا دەبێ ‌ ‌ گەر موسافیر ڕوو بەڕووی ئەعدا دە بێ (٤٩٢)

چون نەبێ بۆ شیر بوو، ئەو ئەحمەدە ‌ ‌ ئوممەتی وی زۆر شوجاعن یەک بە، دە (٤٩٣)

مەسڵەحەت، بۆ دینی ئێمە،کارزار ‌ ‌ مەسڵەحەت بۆ دینی عیسا، کێوو، غار (٤٩٤)

ئەو کوتی وایەکەهەت بێ ئیقتیدار ‌ ‌ تا بەقودڕەت شوورو شەڕ کەی تار و مار (٤٩٥)

چاکەپەرهیز، گەرنەبێتن ئیقتیدار ‌ ‌ ئینتیخاب بۆ (لایطاق ) کە، تۆ فیرار (٤٩٦)

مەل کوتی بەس سیدقی دڵ دێتن بەکار ‌ ‌ خۆ دەنا، کەم نایەبۆ ئینسان یار (٤٩٧)

یاربەتۆ، تا یار ببینی بێ عەدەد ‌ ‌ چون بەبێی یاران دەبی تۆ، بێ مەدەد (٤٩٨)

دێو وەکوو گورگەو ئەتۆش وەک یووسوفی ‌ ‌ دامەنی یەعقووب بگرەئەی سەفی (٤٩٩)

غالیبەن وا دەگرێ گورگی بەندەنێ ‌ ‌ گەر لەمێگەل دی دەچێ یەک شەک، تەنێ (٥٠٠)

هەرچی سوننەت هەم جەماعەت بەر دەدا ‌ ‌ خوێنی خۆی ڕشت لێرەدا ئەو بەد ئەدا (٥٠١)

ڕێ یەسوننەت، بۆ جەماعەت وەک ڕەفیق ‌ ‌ تۆ بەبێ ڕێ و یار، دەکەو یە، نێو مەزیق (٥٠٢)

نەم دەوویست ئەوکەس کەزیکرم کرد هەواڵ ‌ ‌ تاکو بدزێ لێت لیباس، بتخاتەچاڵ (٥٠٣)

دێ لەگەڵ تۆ مونتەزیر بۆ بستووە ‌ ‌ تاکو بگرێ هەرشتێکی دەس تووە (٥٠٤)

یان ببێ یەک ترسەنۆک گەر دی خەتەر ‌ ‌ جوان بەهانەی بێ، نەکا لەو ڕێ گوزەر (٥٠٥)

ترسەنۆک تەرسوو دەکا، هەیبێ کەیار ‌ ‌ گەرکو هاو ڕێ بێ وەها، نایەت بەکار (٥٠٦)

ڕێگەیێکەجەنگەڵی هەن پڕ خەتەر ‌ ‌ ترسەنۆک لەو ڕێ هەموویان دەچنەدەر (٥٠٧)

چون لەفیتنەو شەڕ پڕەڕێگایی دین ‌ ‌ ڕێگەبۆ بەد گەو هەران، دەو دا، چ نین (٥٠٨)

جیا دەکا ئەو ترسە، نەفسان یەک لەیەک ‌ ‌ وەک لەئاردی جیادەکا، هێڵەک کەیەک (٥٠٩)

ڕێی حەقیقەت پڕ لەجێ پێی سالیکان ‌ ‌ ڕێی ڕاستی بۆ گییانە، پللەکان (٥١٠)

گەر لەگورگیشت نەجات دا ئیحتیات ‌ ‌ گەر لەنێو یاران نەبی، نات بێ نیشات (٥١١)

ئەو کەسەی تەنها لەڕێ دەڕوات شاد ‌ ‌ گەڵ ڕەفیقان شاد دەبێ سەت جار زیاد (٥١٢)

گەر لەگەڵ یارانی خۆی بڕوات کەر ‌ ‌ زیندەشادی و قووەتی ئەو دێتەبەر (٥١٣)

گەر لەکاروان بوو جودا یەک کەر لەڕێ ... سەت بەرابەر زێدەڕەنجی دیتەپێ (٥١٤)

چەن نەقیزەو دار زیاد دەخوات ئەو ... تا تەنێ لەو دەشت و چۆل بڕوات ئەو (٥١٥)

جا دەڵێتن ئەو کەرەئەو دەم بەتۆ ... تۆ کەکەر نی، قەت وەها تەنها مەڕۆ (٥١٦)

ئەوکەسەی دەڕوا، تەنێ زۆر شادمان ... گەڵ ڕەفیق دەڕوات شادتر، بێ گومان (٥١٧)

یەک بەیەک وا بوون هەموویان ئەنبیا ... کردیان ئیعجازو دۆستیان کرد پەیا (٥١٨)

گەر نەبێتن یار مەتی دیوار، چلۆن ... چا دەبن وا،ماڵ هەم حەمبار لەبۆن (٥١٩)

گەر کو دیواران هەموو لێک بن جودا ... سەقفی ماڵ چۆن ڕادەوەستێ لەو حەوا؟ (٥٢٠)

گەر نەبێتن یارمەتی زانا و قەڵەم ... بێژە تۆ چۆن دێتەسەر کاغەز، ڕەقەم؟ (٥٢١)

ئەو حەسیرەی گەر کەسێک دێ، دادەنێ ... با، دەبا ئەو گەرکو هیچ کەس نەی چنێ (٥٢٢)

چادەکاتن حەق لە هەر جینسێک دوو زەوج ... جا نەتایج دێن لە جەمعییەت بە فەوج (٥٢٣)

هەردوو هێنایان لەبۆ یەکتر دەلیل ... بەحسی وان لەو بارەدابوو زۆر تەویل (٥٢٤)

مەسنەوی شیرین بکە هەم موختەسەر ... ماجەڕا کۆتا بکە، بێ دەردەسەر (٥٢٥)

مەل کوتی ئەو گەنمە ماڵی کێیە لات؟ ... پێیدەکوت ماڵی هەتیوێک، بێ بەرات (٥٢٦)

ماڵی ئەیتامە، ئەمانەت لای من ... چون ئەمین دەگرن من و، بڕوایی من (٥٢٧)

مەل کوتی موزتەڕڕم و بێچارە حاڵ ... ئێستە منداریش لەبۆ من بوو حەڵاڵ (٥٢٨)

گەر ئیجازەم دەی دەخۆم لەو گەنمە، جا ... ئەی ئەمین و موحتەرەم ئەی پارسا (٥٢٩)

پێیدەکوت موفتی زەروورەت خۆ، ئەتۆی ... موجریمی گەر بێزەروورەت ئەو بخۆی (٥٣٠)

چاکەبۆت گەر تۆ زەروریش بی نەخۆی ... گەر بخۆی لەو، زامنی ئەو گەنمە، تۆی (٥٣١)

چۆ دەنێو فیکرو خەیاڵ مەل، ئەو زەمان ... ئەسپی تۆڕی، دای وەبن پێی خۆی عینان (٥٣٢)

کەو تەداو ئەو دەم کەدای لەو گەنمەزار ... خوێتدنی ئەنعام و یاسین زۆر جار (٥٣٣)

سوود کەنادا پاش ئەساڕەت، شین لەبۆت ... پێش ئەساڕەت نەفعەبۆت گریانی خۆت (٥٣٤)

هەر دەمێک جووڵانەوەحیرس و هەوەس ... ئەو دەمی تۆ بێژەئەی فەریاد ڕەس (٥٣٥)

ئەو دەمی بەسرەخەرابی بۆ نەهات ... ڕەنگەبەسرە بێ لەوێران بوون نەجات (٥٣٦)

شیوەنو گریان کە، بۆ من ئەی جەناب ... پێش ئەوەی کە، موسڵ و بەسرە، بن خەراب (٥٣٧)

بۆم کە، پێش مەرگم ئەتۆ، شین و گرین ... من کەمردم، بۆم مەگێڕە، گەرمەشین (٥٣٨)

پێش نەمانم بۆ فیراقم کە، گرین ... پاشی تووفانی فیراق تۆ، بەسکەشین (٥٣٩)

ئەو دەمەی شەیتان دەکا گومڕا ئەتۆ ... جێ بەجێ بخوێنەیاسین جا ئەتۆ (٥٤٠)

یتیش ئەوەی تاڵان کریتن کاروان　　دەنگی تەپڵت بێ ئەتۆ، ئەی پاسەوان (٥٤١)

**حیکایەتی ئەو پاسەوانەی کەهیچ دەنگی نەکرد تا دزان تەواوی وەسائیل و مەتاعی تاجیرانیان برد .. جا لەپاشان هەراو هوریای دەس پێ کرد ..**

پاسەوانێک نوستت و، دز ئەسبابی برد　　هەرچی بردی دز، هەمووی ژێر خاک دەکرد (٥٤٢)

ڕۆژ کەهات هەستا لەخەو، ئەو کاروان　　زێڕ و زیوەر ماڵ و وُشتر، هیچ نەمان (٥٤٣)

جا دەیان کوت بێژەتۆ ئەی پاسەوان　　زێڕ و زیوەر ماڵ و وُشترمان، کووان؟ (٥٤٤)

ئەو کوتی هاتن دزان بردیان زوو　　هەرچی ئەسباب بوو، نیقابیشیان هەبوو (٥٤٥)

جا دەیان کوت ئەی لەویجدان بێ خەبەر　　چیت دەکرد تۆ ئەی حەقیری بێ هونەر؟ (٥٤٦)

ئەو کوتی یەک بووم ئەمن، زۆر بوون ئەوان　　زۆر شوجاع و با سیلاح و، پڕ تەوان (٥٤٧)

جا دەیان کوت گەر لەجەنگ بووی نا تەوان　　بانگی ئێمەت کردبا، بۆ جەنگی وان (٥٤٨)

ئەو کوتی کوتیان کەدەنگت بێتەدەر　　ئێمەدەبڕین لێت، بەئەو تیغانەسەر (٥٤٩)

من زمانم بەست لەترسان ئەو زەمان　　ئێستەئەمما من دەکەم دادو فیغان (٥٥٠)

ئەو دەمی هاتن لەمن بڕیان نەفەس　　هێن دەڵەم هەی، ئێستەتابێژن کە، بەس (٥٥١)

چونکەعومری بردی دێوی فازیحە　　مەنفەعەت نادەن ئەعووزو فاتیحە (٥٥٢)

گەرچی ئێستا سوود، چ ناداتن حەنین　　خۆ لەوی بێ سوود ترە، غەفلەت، یەقین (٥٥٣)

تۆ بناڵەگەرچی ناش هێتن بەکار　　بێنەپەستان، بەر نەزەر، ئەی کردگار (٥٥٤)

قادری تۆ دائیمەن لەیل و نەهار　　چۆن دەبێ یەک شت ببێ، لێت نادیار؟ (٥٥٥)

شاکوتی قەت بۆ چووان حەسرەت مەخۆن　　سەبتی حوکمی وین، مەتالیب، نوێ وکۆن (٥٥٦)

**حەواڵەکردنی پەڕەندەگرفتاری خۆی دەو داوەدا، بەکارو مەکرو فێڵی زاهید وجواب دانەوەی زاهید بەو پەڕەندە..**

مەل کوتی وایەسەزای هەرکەس کەئەو　　گوێی بەفێڵی زاهیدان دا، ڕۆژو شەو (٥٥٧)

پێیدەکوت زاهید جەزای وایە،نەفام　　ماڵی مندالی هەتیو، دەخوا حەرام (٥٥٨)

جا لەپاشان دەستی کردەشین بەتاو　　هەردوو لەرزین زۆر غەمین، سەیاد و داو (٥٥٩)

من شکا پشتم بەئەزدادی دەروون　　پێم دە، لوتفت ئەی خودای بوون و نەبوون (٥٦٠)

من سەرم ژێر دەستی تۆ زۆر ڕاحەتە　　دەستی تۆ نیعمەت دەرێکە، ئایەتە (٥٦١)

لامەنێ، سایەت لەسەر من بۆ کەنار　　بێ قەرارم بێ قەرام بێ قەرار (٥٦٢)

خەو لەچاوی من هەموو بێزار بوون    حاسیدت سەر وو، گوڵی گوڵزار بوون (۵۶۳)

چی دەبێ گەرکەی، دەمێ ئەی بێ میسباڵ    حاڵی یەک نالایقی خەمبار سوئاڵ؟ (۵۶۴)

خۆ عەدەم نەی بوو لیاقەت بۆ ئەدی    ئەو هەموو رەحمەی لەلوتفی تۆ دەدی؟ (۵۶۵)

لوتفی تۆ دیتی حەقیری پەستی قوڕ    زوو لەنووری حیس، دەجیبی کرد، دەدوڕ (۵۶۶)

پێنج حیسسی زاهیری پێنجیش نیهان    بوو بەشەر نوتفەی کەنەی بووگیان، بەوان (۵۶۷)

تۆبە، بێ ئەو فیقی تۆ ئەی کردگار    هیچ نییە، بێ سوودە ئەو، نایەت بەکار (۵۶۸)

مووی سمێڵی تۆبە، یەک یەک دەی کەنی    تۆبەسایەو،تۆش مانگی رەو شەنی (۵۶۹)

ئەی بەتۆ وێران دوکان و مەنزڵم    چۆن نەناڵم گەر فشارت دا دڵم؟ (۵۷۰)

چۆن هەڵێم بێ تۆ، کەنابێ گیاندار    بەندەنین هیچ خۆ، بەبێت ئەی کردگار (۵۷۱)

بگرەگیانم ئەی ئەتۆ بۆ گیان ئوسوول    چونکەبێ تۆ من لەگیانی خۆم مەلوول (۵۷۲)

عاشقی دێوانەگیم بەخوا ئەمن    نامهەوی چیدی ببم زانا ئەمن (۵۷۳)

گەر درا، شەرمم دەڵێم راز ئاشکار    بەسسەناڵین و پەرێشی و، ئیستیبار (۵۷۴)

من لەژێر پەردەی حەیادا بووم نیهان    دێتمەدەر لەو پەردەمن، سەر نا گەهان (۵۷۵)

ئەی رەفیقان گشت رێگای بەست یار    ئێمەئاهووی لەنگ و ئەو شێری شکار (۵۷۶)

غەیری تەسلیم بوون لەبۆ ئەو شێری راو    خۆ، چ نیتی چارەئاسکی لاق شکاو (۵۷۷)

ناخوات و نانوێ ئەو وەک هەتاو    مەنعی خوردو خەو لەرووح کرد، ئەو تەواو (۵۷۸)

ئەو دەڵێ تۆ من بە، یا هەمخوویی من    تا ببینی نێو تەجەللی، روویی من (۵۷۹)

تۆ کەنەت دیم چۆن وەها شەیدا دەبووی؟    خا ک کەبووی تۆ، تالیبی ئیحیا دەبووی (۵۸۰)

گەر نەبوو جێگای تەعامت لا مەکان    بۆ چی هەر دەو لا ت برِی تۆ، چاوی گیان (۵۸۱)

بۆیەگوربەخۆی لەدەم کون مات دەکرد    چونکەزۆر جاران لەوێی خۆراک دەبرد (۵۸۲)

دەچێتەسەربان گوربەیێکی دی بەلام    چون لەراوی مەل وەدەستی هات تەعام (۵۸۳)

یەک نەفەر جۆلایەتی شادی دەکات    پاسەوانان شاد دەکا مووچەو بەرات (۵۸۴)

یەک نەفەر بێکار رووی لای لا مەکان    چون لەوێ را دات بەوی تۆ، قووتی گیان (۵۸۵)

کار، ئەو کەس هەیتی بی وێ، بەس خودا    خۆی لەبەر ئەو کار، لەعالەم کرد جودا (۵۸۶)

خەڵکی دیکەش لەو جیهانەئەی هەواڵ    هەردەکەن بازی هەتا شەو، وەک مناڵ (۵۸۷)

هەڵدەسێ شەخسی خەواڵو، خۆ لەخەو    دایەنی وەسواس دەکێشێ نازی ئەو (۵۸۸)

تۆ برۆ بۆخۆت بنوو، ئێمەش لەلات    نایەڵین کەس تۆ لەخەو وشیار بکات (۵۸۹)

دەر دەهێنــی تــۆ لەڕیشــە، خــەو، تــەواو | هــەر وەکــوو تینــوو کەبیســتی دەنگــی ئــاو (۵۹۰)
دەنگــی ئــاوم مــن، لــەنێو گــوێی تینــووان | دێــم وەکـــوو بــاران لــەڕێگای ئاســمان (۵۹۱)
هەستە عاشـق، تـۆ تـەلاش کـە، زۆر بـەتاو | چـۆن دەنـووی تینـوو کـەبێتن دەنگـی ئـاو؟ (۵۹۲)

**حیکایەتی ئەو عاشقەی کەشەوێک تیبقی قەراری قەبلی هات ومونتەزیرما، وخەوی لێکەوت مەعشووق هات و دیتی کەعاشق نوستووە.کیلفانی پڕ لەگوێزکرد و دەحاڵی خەو دا بەجێی هێشت و بۆخۆی گەڕاوە..**

**خولاسەی داستان ..**

دەزەمانی پێش دا عاشقێک هەبووکەزۆر ئیزهاری عیشقی دەکرد، ونیسبەت بەمەعشووق زۆر ئیزهاری عەلاقەی دەکرد ڕۆژێک مەعشووق خەبەری پێدا کەئەو شەو وەرەفڵان جێگا ومونتەزیری من بەوئەمنیش سەری فڵان ساعەتەدێمەلات، عاشق تیبقی قەرارلەجێگای دیاری کراو حازر بوو ومونتەزیر ما، بەڵام چونکەماوەی ئینتیزار تەواو بوو،جەنابی عاشق لەبەر ماندوو بوون لەعەرزی درێژ بوو و چۆ دەخەوێکی گران، مەعشووق چەند دەقیقەدوایەهات وعاشقی دەحاڵی پرخەپرخی خەو داد ی، جا لەبۆ ئەدەب کردنی وی میقدارێک گوێزی دەگیلفانی وی کرد ورۆیشت، یانی ئەتۆ چ کارت بەعیشق داوە، ئەتۆ هێستا منداڵی ودەبێ بچی بەگوێزان کایەو بازی بکەی ..

عاشــقێک دەژیــا قــەدیم ژارو نــەزار | زۆر لــەلای بــوو موحتــەرەم عەهــد و قــەرار (۵۹۳)
زۆر لــەمێژ بــوو ئــارەزووی بــوو وەسڵی یــار | مــاتو مــەبهووت و، ئەســیری شــەهریار (۵۹۴)
جوســتوجۆکەر عاقیبــەت پەیــدا دەکــا | ســەبرە خۆشــی و ئیســتیراحەت چــا دەکــا (۵۹۵)
پێیــدەکوت یــار، تــۆ وەرەئــەو شــۆکە، جــا | مــن کــەلێم ناوەلــەبۆتۆ، لــوو بییــا (۵۹۶)
دابنیشــەنێو فــڵان حــوجرە، ئــەتۆ | نیوەشــەو مــن دێمــەلای تــۆ ســەر بــەخۆ (۵۹۷)
نــانی داو، قوربــانی کــرد جــا، ئەونەفــەر | چونکــەدی مــانگی لــەژێر تــۆز هاتــەدەر (۵۹۸)
چــوو دەنێــو ئــەو حوجرەدانیشــت دەردەدار | بــەو ئومێدەبێتــەلای وی یــاری غــار (۵۹۹)
هاتــەلای وی نیوەشــەو جــا یــاری وی | وەک دروســت پــەیمان، ئــەو دڵــداری وی (۶۰۰)
عاشــقی خــۆی دی کەنوستوەســەرزەوی | جــا کــەمێکی دادری ئاســتینی وی (۶۰۱)
دایــدەنا نێــو جیبــی وی چــەن گــوێز یــار | تــۆ منــاڵی بگرەگــوێزان بــۆ قومــار (۶۰۲)
گــەر لەخــەو بێــدار بــوو عاشــق ســەحەر | ئاســتین و گــوێزی هــاتن بــەرنــەزەر (۶۰۳)

ئەو کوتی شای من هەمووی سیدقەو سەفا — بەس لەخۆمە، چی بەسەر من هات بەڵا (۶۰۴)

نینەخەو ئەو قەلبی بێ خەو وەک عەسەس — لێدەری تەپڵین لەسەربان وەک حەرەس (۶۰۵)

تێک شکان دەو ئاشەدا گوێزانی مە — هەرچی بێژم من غەمی خۆم، خۆ کەمە (۶۰۶)

بەسکەلائیم، باسی ئەو باسانەتۆ — قەت لەوەی پاش، پەن مەدەدێوانەتۆ (۶۰۷)

باسی هیجران من فریو نادا چ ئان — ئیمتیحانم کرد، تاکەی ئیمتیحان؟ (۶۰۸)

غەیری شەیدابوون لەعیشقی کردگار — دوور لەمەتڵەب بوونەنایەت هیچ بەکار (۶۰۹)

دابنێ سەر دەست و پێم زەنجیرو بەند — چون لەتم کرد سیلسیلەی تەد بیر و پەند (۶۱۰)

غەیری ئەو جەعدی نیگاری خۆش قەدەم — گەر هەزار زەنجیر بێنی لەت دەکەم (۶۱۱)

عیشق و مەغروور بوون لەگەڵ یەک نینەجوور — دوور بە عاشق تۆ لەدەم دەرگای غروور (۶۱۲)

وەختی وەم هات ڕووت وەبم من ئەی فلان — لابنێم نەقش و، سەرا سەر ببمەگیان (۶۱۳)

ئەی عەدووی عەقڵ و حەیا، دەی تۆ وەرە — من دڕیم پەردەی حەیای خۆم یەک سەرە (۶۱۴)

ئەی بەجادووت خەو لەگیانمت کردەدەر — سەختەناسینت لەبۆ گشت گیان لەبەر (۶۱۵)

ئەی خودا تۆ بگرەڵێم سەبرو قەرار — تا کو زووتر بۆم وسووڵ بێ، وەسڵی یار (۶۱۶)

تا نەسووتێم کەی دەبێ فێنک دڵی؟ — ئەی لەبۆی، دڵمانەماڵ و مەنزڵی (۶۱۷)

بتهەوی ماڵت بەئاگر دا دەکەی — کێ حەقی بوو، پێت بڵێ، بۆ وادەکەی؟ (۶۱۸)

گڕدەباش ئەو ماڵەتۆ ئەی شێری مەست — ماڵی عاشق چاکەسووتاو بێتەدەست (۶۱۹)

من دەکەم قوبڵەم لەوەی پاش سووتنم — چونکە شەمعم من بەسووتن ڕۆشنم (۶۲۰)

بابەگیان ئەو شەو لەخەو، خۆت لادەتۆ — بۆ مەحەللەی بێ خەوان یەک شەو بڕۆ (۶۲۱)

جا لەوەی دێوانەبوو، بڕوانە تۆ — بۆ ویسال دای وەک پەپوولان گیانی خۆ (۶۲۲)

چاو،کەچۆن بوون کەشتی خەڵکی غەرقی عیشق — سەختەبێ حەد، فەرقی حەزیاوفەرقی عیشق (۶۲۳)

ئەژدیهایە و نادیار و دڵڕوبا — عەقڵی وەک کێو چەشنی پووشکێک کا، دەبا (۶۲۴)

عەقڵی عەتتار گەرلەوەی ئاگابێ — ئەو دەخا جۆ، چی دەسەندووق دا بێ (۶۲۵)

تۆ بڕۆ لەو جۆگەدەرنایەی ئەبەد — بێ گومان وەک وی کەنابێ هیچ ئەحەد (۶۲۶)

چاو هەڵێنەچاک ئەتۆ ئەی حیلەگەر — چەن دەڵەی تۆ،نیمەلەو یا لەو خەبەر؟ (۶۲۷)

تۆ لەدەردی مەکر و حیرمان بێرەدەر — بێرەدونیای پایەدار و گیان لەبەر (۶۲۸)

تاکوجەهل وغەفڵەتت ئەی بێ ئەوین — گشت عیوەزبن، ببنەعیرفان و یەقین (۶۲۹)

حاڵەتی دونیایی زاهیر لابنێ — دەس لەسەر ئەحواڵی باتین دابنێ (۶۳۰)

چـەن دەنـازی تـۆ بەمەسـتی نێـو جیهـان؟ مەستی وەک تۆ هەن لەزۆر جێ، بێ گومان (٦٣١)

خەڵکی دوو عالەم کەبن گشت مەستی یار گشت یەکن هیچیان لەوان نین پەست و خوار (٦٣٢)

چونکـەزۆرن، نینـەهیچیان پەسـت و خـوار خوارەئـەو کـەس تـەن پەرەسـتەو، جێگـەنار (٦٣٣)

گــەر لــەنووری ڕۆژ ببــێ پــڕ، ڕۆژگــار کـوا دەبـێ ئـەو تـین و جـوانی ڕۆژ خـوار؟ (٦٣٤)

تـۆ لـەوەش زیـاتر بـڕۆ ئـەی خـۆش مـەڕام چونکەعــەرزی خــوا وەســیعە، زۆرو، ڕام (٦٣٥)

مەســت بــوونی والــە، زۆروالایــە، خــۆ لـەو لـەزوور تـر، نێـو زەمینـی خوایـە، خـۆ (٦٣٦)

خــۆت کەئیســراڤیلی ســاحەب ئیمتیــاز هەم لەڕووح دان هەم لەمەستی و مەست ساز (٦٣٧)

بـۆ دڵـی مەسـت چـون مـەزاح ئەندیشـەبوو شــان لــەزانین خــاڵی کــردن پیشــەبوو (٦٣٨)

بـۆ نـەزانم تـۆ دەڵـەی لای خـاس و عـام؟ تــا بڵــەی کێیەئــەو ەی مەعلوومــەلام (٦٣٩)

بــۆ ســبووتەگەر کــو مــەنفی بــێ وُتــار بگرەئیســبات لانــێ مــەنفی بــۆ کــەنار (٦٤٠)

لابنــێ مــەنفی ئــەتۆ بــۆ لای کــەنار تـا لـەلای تـۆ بگـرێ بـەس موسبەت قـەرار (٦٤١)

مـەنفی دووزەخ،خـۆت کـەتۆ موسبەت پەرەست حـەق گـەڕایی فێربـەتۆ، لـەو تـورکی مەسـت (٦٤٢)

**داواکردنی ئەمیرێکی تورکی مەست لەموتریب،کەبەسازو ئاواز لـەکاتی بەیانـەدا ئـەوی مەشــغووڵ بکا،وتەفســیری ئــەو حەدیســە( ان للــه شــرابا اعــده لاولیائــه اذاشربواسکرواواذاسکرواطابوا)الی اخرلحدیث ..یانی حەقیقەتەن خوداوەنـدی موتـەعال شەرابێکی هەیەکەلەبۆ دۆستانی خۆی ئامادەکردوە. ئەگەر لـەوی بخۆنەوەمەست دەبـن وئەگەر مەست بوون حاڵیان خۆش دەبێ ..**

می در خم اسرار بدان میجوشد تا هرکه مجردست ازان می نوشد

قال تعالی( ان الابرار یشربون )..

این می که میخوری حرامست ما می نخوریم جز حلالی

جهد کن تا ز نیست هست شوی وز شراب خدای مست شوی ..

**خولاسەی داستان ..**

ئەمیرێکی تورک بەیانەیەک لەبەر مەست بوونی وی دەشەوی پێش دا،دوچاری بێ خەوی ببوو و بەو عیللەتە لە موتریبی داوا کرد کەبەسازو ئاوازی وی دووبارە بچتەوە حاڵەتی مەستی، بەڵام موتریب غەزەلێکی خوێندەوەکەڕەدیفەکەی (نمیدانم ) یانی نازانم بوو.. لەئاخیری هەموو شیعران تیکرار دەبۆ وە، ئەمیری تورک چونکەلەو شیعرانەچی وەدەست نەکەوُت تووڕەبوو، و هەستاو گورزێکی هەلگرت تا لەسەری موتریبی بدا،یەکێک لەسەرهەنگان لەنێو حازران دەستی

بەشەفاعەت بۆ موتریب کرد وگورزەکەی لەدەستی ئەمیری تورک وەرگرت، وئەمیری نەفام موتریبی بەشیددەت سەرزەنیش کرد کەبۆچی ئەتۆ( نمیدانم ) یانی نازانم دەڵەی؟ کەمێکیش(میدانم )یانی دەزانم بڵێ ..

یەک نەفەر تورکی خوماری هیچ نەزان — موتریبی ویست گەرلەخەو هەستا بەیان (٦٤٣)
موتریبی گیان بوو ئەنیسی گشت مەست — نوغڵ وقووت و هێزی مەست، لەو هاتەدەست (٦٤٤)
کردنی موتریب ئەوان سەرمەست و شاد — مەستی کردن جا، دەمی موتریب زیاد (٦٤٥)
لای ئەوان، موتریب شەرابی خوا، دەبا — لای بەدان مەشرووبی تەن وەک با، دەبا (٦٤٦)
گەرچی هەردوو بوون بەیەک نێو ئەو دووان — زۆرەفەرقی وان، زەمین تا ئاسمان (٦٤٧)
ئیشتیبای لەفزی دەبێ وەختێ بەیان — لێک بەدوورن ئاسمان و ڕیسمان (٦٤٨)
دێ لەلەفزی موشتەرەک تەردید و شەک — بوون لەتەن دا،گەبرو موئمین موشتەرەک (٦٤٩)
تەن هەموویان چەشنی گۆزەی بەستەسەر — تۆ ئەوەی نێو گۆزەبێنە، بەر نەزەر (٦٥٠)
گۆزەیەک تێیدایەبەس ئاوی حەیات — گۆزەیەک تێیدایەبەس ژەهری مەمات (٦٥١)
گەر لەمەزرووفان نەزەر کەی شای ئەتۆ — گەر لەزەرفان کەی نەزەر، گومڕای ئەتۆ (٦٥٢)
بگرەئەلفاز، وەک تەنان تۆ ئەی فلان — نێو ئەوان مەعنای ئەوان هەر وەک گیان (٦٥٣)
هەربەتەنها تەن دەبینێ چاوی تەن — پێی دەبینرێ چاوی گیان، گیانی بەفەن (٦٥٤)
جا بەزاهیر نەقشی لەفزی مەسنەوی — ون کەری ڕێگان و هادی مەعنەوی (٦٥٥)
خوا لەقورئان باسی قورئان وا دەکا — یەک دەکا ئیرشاد و یەک گومڕا دەکا (٦٥٦)
گەرکوعارف کردی باس و زیکری مەی — کوا لەلای عارف دەبێ مەعدووم شەی؟ (٦٥٧)
گەر لەمەی تۆ دەرکی مەی شەیتان دەکەی — کەی ئەدی تۆ فکری مەی ڕەحمان دەکەی؟ (٦٥٨)
موتریب و مەی پێکەوەن لەیل و نەهار — یەک لەبۆ لای نوور دەبا، یەک لایی نار (٦٥٩)
لەو دەمی موتریب غەزای دێ، پڕ خومار — موتریبیش دەیباتەجێگای مەی، بەغار (٦٦٠)
ئەو سەری مەیدان ئەوەش پایانی وی — بێ دڵان وەک گۆ، دەنێو گۆچانی وی (٦٦١)
مەنزەری گوێ، هەرچی نێو سەر دا دەبێ — عاقیبەت سەفرایی سەر، سەو دا دەبێ (٦٦٢)
جا لەوێ ئەو دوو دەچێ هۆشیان لەسەر — هەردوو دەبنەیەک لەوێ، با ب و پسەر (٦٦٣)
چونکە شادی و دەرد لەگەڵ یەک بوون بەیار — کردی تورکی ئێمە موتریب هووشیار (٦٦٤)
جا خەواڵو وایدەکوت موتریب بەدەنگ — وێمدە جامێک ئەی‌کەنەم دی لێت چڕەنگ (٦٦٥)
تۆ منی جا، بۆیەنای بینم چەلێ — چونکەنیزیک بوو لەمن ئەو زات، گەلێ (٦٦٦)

عەقڵی من تۆی، من کەنات بینم بەڕاس چونکەزۆر هەن ئیشتیا هەو، ئیلتیباس (٦٦٧)

وەک تۆ لێم نیزیک نییەحەبلو لوەرید چەن بڵەم (یا) (یا) نیدایە، بۆ بەعید (٦٦٨)

من لەچۆل و دەشت بانگی خوا دەکەم تا لەبەد کار ئەو نیهان کەم، وا دەکەم (٦٦٩)

**هاتنی کوێرێک بۆ ماڵی موستەفا (علیەالسلام ) وهەڵاتنی عایشە(رضی اللەعنها) لەلای کوێر وکوتنی ڕەسوول (علیەالسلام )کەبۆ هەڵدێی؟ ئەو کەئەتۆ نابینێ وجواب دانەوەی عایشەبەڕەسوول (صلی اللە علیە وسلم ) ..**

**خولاسەی داستان ..**

پیاوێکی کوێر هاتەماڵی حەزرەتی موحەممەد، وعایشەبۆ خۆ پنهان کردن لەو، بۆ وەتاغێکی دیکەهەڵات، پێغەمبەر فەقەت بۆ ئیمتیحان کردنی عایشە فەرمووی، خۆ ئەو کابرایەکوێرەو ئەتۆ نابینێ بۆ خۆت لەوی پنهان دەکەی؟ عایشەبێ ئەوەی کەقسەیەک بکا، بەئیشارەی دەست کوتی ئەو ئەمن نابینێ، خۆ ئەمن ئەوی دەبینم ..

هاتەلای ئەحمەد چەلێکی یەک زەریر ئەی ئومێدی بێ نەوایان و فەقیر (٦٧٠)

ئەی ئەتۆ میراو، منیش تینوو، شەدید ئەی ئەتۆ ساقیم و بۆ خۆشیم نەوید (٦٧١)

گەر لەدەرکەهاتەژوور ئەوکوێرەچاو بۆ حیجاب عائیشەئەو دەم ڕۆی، بەتاو (٦٧٢)

چونکەئەو خاتوونی زۆرپاک و، تەهوور ئاشکرا دیتی ڕەسوول، بێ حەد غەیوور (٦٧٣)

جوانی بێ حەد غیرەتی زۆر، چادەکا چونکە ناز، غیرەت گەلێک، بەر پا دەکا (٦٧٤)

پیرەژن دێتێ کەنیز، بۆ شوویی خۆی چونکەدی پیری وپیسی، ڕوویی خۆی (٦٧٥)

کوا جەماڵی ئەحمەدی وەک نوور مونیر قەت لەدونیاو ئاخیرەت، دەی بێ نەزیر؟ (٦٧٦)

فەڕ وعیززی ڕۆژی ئەحمەد وا، قەوی ڕۆژ هەموویان بوو ن لەلای وی، سەر نەوی (٦٧٧)

نووری خۆم من، ناردەحەوتەم ئاسمان دا بپۆشن ڕووی خۆ، تا ئەختەران (٦٧٨)

لای شوعاعی بێ نەزیرم، بن فەنا وانەکەن گەر، گشت دەبن ڕیسوا دەتا (٦٧٩)

من کەشەو داهات لەپێش چاوان دەڕۆم کوا دەڕۆم من؟، وا دەدەم نیشان دەڕۆم (٦٨٠)

تا بەبێ من ئێوەیەک شەو، وەک خوفاش لێک بدەن باڵان لەدەوری عەرد باش (٦٨١)

چەشنی تاووس، پەڕ بدەن زۆر جوان نیشان مەست و سەرکەش خودپەسەندو شادمان (٦٨٢)

چاو کە، پێی ناحەزکەرت ئەی موحتەشەم وەک ئەیاز کردی لەبۆ خۆی، کاڵە، شەم (٦٨٣)

بۆتەنەبوە، ڕووم دەکەم، زاهیر سەحەر تا نەتانباتن غروور بۆ تێو سەقەر (٦٨٤)

تـوول مـەدە چیـدی ئـەتۆ ئـەو باسـە چـون مەنعی کرد تـەتویل لـە ئێمـە، ئەمری (کُـن) (۶۸۵)

**ئیمتیحـان کردنـی موسـتەفا علیەاسـلام عایشـە(رضـی اللـە عنهـا) کـەبۆ خـۆت پنهـان دەکـەی؟خۆت پنهـان مەکـە، چونکـەکوێر ئـەتۆ نـابینێ، تـاکو مـەعلووم بـێ کـەئایا عایشەلەقەلبی موستەفا ئاگادارە، یا لەقسەی زاهیر تەقلید دەکا ..**

وایـدەکوت ئەحمـەد فەقـەت بـۆ ئیمتیحـان ئـەو کـەنابینێت، خـۆت کـەم کـەنیهان (۶۸۶)

عائیشـــەدەیکرد بـــەئیمای دەس بـــەیان ئـــەو کەنابینایـــەمن بینـــام عـــەیان (۶۸۷)

غیرەتی بـوو چـون عـەقڵ نیسبەت بەرووح پـڕ لەتەشـبیەو میسـالم کـرد نسـووح (۶۸۸)

بـــەو هـــەموو پنهانییـــەی رووح لایـــەتی بـۆ عـەقڵ نیسـبەت بـەوی بـوو، غیرەتـی؟ (۶۸۹)

تـۆ لـەکێ پنهـان دەکـەی ئـەی غیرەتـی ئـەو کەسـەی رووی ون، بـەنووری خۆیـەتی (۶۹۰)

ڕێ دەچێـــتن ئـــەو هـــەتاوەبێ حیجـــاب نـووری زۆری وی لـەبۆ رووی وی نیقـاب (۶۹۱)

ئەی غەیوور تۆ، بۆ دەکەی ئەو، وا، نیهان؟ ڕۆژی روونـیش ئـەو نـەبینێتن، چ ئـان (۶۹۲)

ئێستەمن بـووم هێنـدەزۆر، غیـرەت مـەدار دەمهـەوێ ئـەو، بـێ لەخۆشـم نادیـار (۶۹۳)

ئـــاگری غیـــرەت کەتونـــدە، وا دەکـــەم مـن دەگـەڵ دوو چـاوو،گوێم دەعـوا دەکـەم (۶۹۴)

چونکەهێنـــدەغیرەتی ئـــەی یـــار، ئـــەتۆ هـیچ مـەڵێ جـا، تونـد ببەسـتەزار، ئـەتۆ (۶۹۵)

مـــن دەترسـم پەردەبـدڕێ ئـــەو هـــەتاو گـەر خـەمووش بم،بێتـەدەر لای دی،بـەتاو (۶۹۶)

نێـو خەمووشـی زێـدەدەمبێ مـــن وتـــار گـەر مـەنع بـم، زێـدەدەمبێ مـەیلی کـار (۶۹۷)

ئـەو خرۆشـی بـەحر ئـاخیر هەرکەفـە خۆشەویسـتی جۆششـیش (ان اعـرف ) ە (۶۹۸)

حـەرفی گوفتـار بـۆ حەقیقـەت، بۆ حەسار بـــۆ حەقیقـــەت پۆشیشـــەعەینی وتـــار (۶۹۹)

سەر گوڵان وەک بولبولان بە، نەغمەخوان مونسـەریف کـەی تـا لـەبۆنی گـوڵ، ئـەوان (۷۰۰)

تاکومەشـــغووڵ بـــێ بـــەگوفتار گۆشـــیان ڕوو دەلای رووی گـوڵ نـەکاتن هۆشـیان (۷۰۱)

لای هـــەتاوی روون لەعالـــەم ڕا دیـــار هـیچ دەلیلێـک، بێ گومـان نایـەت بـەکار (۷۰۲)

**حیکایەتی ئەو موتریبەی کەدەبەزمی ئەمیری تورک دا دەستی بەخوێندنەوەی ئەو غەزەلە کرد**

گلی یا سووسنی یاسروی یاماهی؟ نمیدانم ازین آشفته بیدل چه میخواهی؟ نمیدانم ..

و داد و فـەریاد کردنی ئـەو تورکـە، کەشتێک بڵێ کـە دەیزانی، و جـواب دانـەوەی موتریـب بە ئەمیر..

جـاکوتی موتریـب لـەلای ئـەوتورکی مەست نێـو حیجـابی نەغمـە، ئەسـراری ئەلەسـت (۷۰۳)

من کەنازانم بوتی تۆ یاقەمەر؟ — من کەنازانم لەمن، چیت بوو نەزەر؟ (٧٠٤)

من کەنازانم چ بۆت ئەنجام بدەم؟ — من سکووت کەم یانەباست کەم، بەدەم (٧٠٥)

زۆر عەجەب تۆ، نی جودا یەک لەحزەلێم — بێ خەبەر ماوم لەجێگات و، لەجێم (٧٠٦)

چۆن دەکێشی من کەنیمەهیچ خەبەر؟ — جار لەبۆ نێو خوێن دەبەی جار سینگ و بەر (٧٠٧)

ئەو بەنازانم شرووعی کردوتار — یەک بەدووی یەک کردی نازانم قەتار (٧٠٨)

چونکەنازانم دەبوو تیکرارزیاد — تورکی میری ئێمەبوو، خەمبارزیاد (٧٠٩)

ڕاپەڕی ئەو تورکەگورزی گرتەدەست — تاکو ببڕێ،بەو لەموتریب، ژین و هەست (٧١٠)

یەک نەفەر سەرهەنگ گورزی گرت بەدەست — پێیدەکوت موتریب کوشی کارێکەپەست (٧١١)

پێیدەکوت تیکراری بێ حەددو ژمار — کوشتی تەبعم، بۆیەدەیکەم تارو مار (٧١٢)

هیچ کەنازانی مەخۆ گوو، قەلتەبان — گەر دەزانی، مەتڵەبت کە، زوو بەیان (٧١٣)

تۆ شتێک بێژەکەدەیزانی ئەوی — چیدی نازانم مەڵێ تۆ، ئەی غەوی (٧١٤)

ئەی ڕیاکار لێت دەپرسم کوێندەری — تۆ دەڵەی من نیمەبەلخی هەم هەری (٧١٥)

نیمەخەڵکی موسڵ و بەغدادو تراز — تۆ لەنا، نا، گرتەپێش ڕێ یەک دراز (٧١٦)

زوو بڵێ من خەڵکی کوێم ڕاحەت کەخۆت — زیکری مەتڵەب لێرەکەمکە، ڕەنجەبۆت (٧١٧)

گەر بڵەم چیت خوارد بەیان تۆ ئەی جەناب — تۆ دەڵەی نەمخوارد کەباب نەمخوارد شەراب (٧١٨)

هیچ کەنەمخوارد گۆشت و شۆرباو و عەدەس — چیت ئەتۆ خوارد، بێژەئەو، تەنهاوو بەس (٧١٩)

ئەو کەلامی وادرێژ سوودی چییە؟ — پێیدەکوت موتریب مەرامم مەخفییە (٧٢٠)

بێ نەفی، ئیسبات دەبێتن لێت بەری — من نەفیم کرد تا لەئیسبات بۆن بەری (٧٢١)

من بەمەنفی دێتمەدەنگ ئەو جارەساز — تا کەمردی پێت بڵێتن مەرگ ڕاز (٧٢٢)

### تەفسیری ئەو حەدیسە(موتوا قبل ان تموتوا )

بمیر ای دوست اگر می زندگی خواهی — که ادریس ازچنین‌مردن‌بهشتی‌گشت‌پیش‌ازما ..

زۆرعەزابت دیت و هەر ژێر پەردەمای — مەرگی ئەسڵت چون نییەتۆ بۆیەوای (٧٢٣)

تا تۆ نەمری ڕەنج تەواو نابێ چ ئان — بێ تەواوی نەردەبان، ناگەی بەبان (٧٢٤)

گەر تۆ دیتت دووی لەسەت پلان کەمە — بان لەبۆ کووشەندەکەی نا مەحرەمە (٧٢٥)

گەر لەسەت گەز یەک گەزی کەم بێ تەناف — کوا لەچاڵ ئاو دێتەدەر ئەی با عەفاف؟ (٧٢٦)

لەو گەمی قووم نابێ تۆ ئەی شەهریار — دانەنێی گەر تۆ لەسەر وی زێدەبار (٧٢٧)

ئەسڵی کار بوو زێدەبار، ئەو تاریقە — بۆ گەمی وەسواس و غەی، ئەو غاریقە (٧٢٨)

گەر گەمی هۆش غەرقی یەم بێ، بێ گومان ئـــەو دەبێتـــەرۆژی ڕوونـــی ئاســـمان (۷۲۹)

تـۆ کەنـــەمری ســـەختەبۆ تـــۆ گیـــان دان مات بەئەی شەم، گەر کو زاهیر بێ بەیان (۷۳۰)

بـــوون ســـتێرەی ئێمەئـــەو دەم ئـــا شـــكار گـــەر هـــەتاوی ئاســـمان بـــێ نادیـــار (۷۳۱)

تۆ لەخۆت دەگورزو، وردو خاش کە، مەن چونکەپەنبـــەی گـــوێی تۆیـــەچاوی تـــەن (۷۳۲)

خۆت وەبەرگورزان دەدەی ئەی بێ شعوور عەکسـی خۆتەگـەر لـەمن دیتـت غـروور (۷۳۳)

ڕوئیـەتی عەکسـت لـەنێو ڕووم دا دەکـەی جا لەگەڵ خـۆت تۆ شـەڕو دەعوا دەکـەی (۷۳۴)

چەشنی ئەو شێرەی کەعەکسی خۆی دەچاڵ دی بەخەسمی خـۆی و، خـۆی هاویشـتەباڵ (۷۳۵)

زیـددی مـەنفی بوونەئیسـبات بـێ گومـان تـا کـەمێکت بـۆ لەزیـد، زیـد بـێ عـەیان (۷۳۶)

لێرەغـەیری نـەفیی زیـد هـیچ بـاو نییـە لـەو جیهانـەهیچ دەمێـک بـێ داو نییـە (۷۳۷)

بێ حیجابت ئەو کەویست ئەی بالوبـاب ئینتیخـاب کەمـەرگ و، بـدرەتۆ حیجـاب (۷۳۸)

مـن لەمـەرگم قەست نـەبوو بۆ گۆڕ چوون بەڵکـــەگۆڕانت بـــەنووری زێـــدەڕوون (۷۳۹)

پیـاو کـەباڵغ بێـت نـای بـێ، خـووی منـاڵ قـول کـەبۆ ڕۆمـی دەبـێ ساحەب جـەماڵ (۷۴۰)

خـاک کـەبۆ زێـڕ هەیئـەتی خـاکی نـەما بـۆ فـەرەح غـەم، خـاری غـەمناکی نـەما (۷۴۱)

بۆیـەدەیکوت ئەحمـەد ئـەی ئەسـراڕ جـۆ دەتهـــەوێ مـــردوو ببینـــی زینـــدەتۆ؟ (۷۴۲)

ئـەو لەسـەر عـەرزی دەچێ وەک زینـدووان مردووەڕووحـــی چووەســـەر ئاســـمان (۷۴۳)

ئێســـتەڕووحی وی لـــەباڵا، بـــووی مـــەکان بش مرێ گـەر، ڕووحی وی نادرێ تـەکان (۷۴۴)

چونکـەپێش مـردن لـەبۆ وێـی کـرد نـەقڵ دەرکی وی دەکرێ بەمردن نـەک بەعەقڵ (۷۴۵)

نـــەقڵی وی نابێـــت چەشـــنی نـــەقڵی عـــام نـــەقڵی وی گـــۆڕینی جێگایـــەو مـــەقام (۷۴۶)

هەرکەســـێک بیـــوێ ببینـــێ ســـەرزەوی یـەک نەفـەر مـردوو لـەڕێ دەڕوا قـەوی (۷۴۷)

بێژەبنوارەئـــــەبوو بـــــەکری بـــــەدین سـیدقی وی کـردی ئـەمیری موحشـەرین (۷۴۸)

بێنەبـەر چـاو زینـدەگی سـیددیق ئـەتۆ تـا لەمەحشـەر زیـاد بکـەی تەسـدیق ئـەتۆ (۷۴۹)

جـا قیيامـەت بـوون، لەئەحمـەد دا هـەزار چونکـــەفانی بـــوو دەعیشـــقی کردگـــار (۷۵۰)

لـەو جیهانـەدوو کـەڕەت ئـەو بـوو وەلـەد ئاشـکرا ئـەو بـوو قیيامـەت سـەت عـەدەد (۷۵۱)

وا قیـام دەکـرا سـوئال لـەو خـۆش پـەیام ئـەی قیيامـەت، چەنـدەڕێگا، تـا قیيـام؟ (۷۵۲)

بـــەو زبـــانی حـــاڵ دەیکـــوت زۆر جـــار چۆن لەمەحشەر، حەشر دەکرێ پرسییار؟ (۷۵۳)

بۆیـەدەیکوت ئـەو ڕەسـوولی خـۆش پـەیام ڕەمزی مـردن پێش لـە مـردن ئـەی کیـرام (۷۵۴)

هەروەکوو من ئێستەمردووم پێش لەمەوت مـن لـەلای دیکـەم دەهێنـا سیت و سـەوت (۷۵۵)

جـا قیيامـەت بـە، ببینـی تـا قیيـام　　وایەشـەرتی دیتنـی ئەشـیا، بـەعام (٧٥٦)

خـۆت کەئـەو تـاکو بناسـی ئـەو تـەمام　　جـا، چ ئـەنوار بێـت ئـەو شـت یـازە لام (٧٥٧)

تۆ کەبووی عـەقڵ، شارەزای عـەقڵی یـەقین　　تـۆ دەناسـی شـوعلە، گـەر ببیەئـەوین (٧٥٨)

مـن لـەبۆ ئـەو ئیـددیعام دەمکـوت دەلیـل　　لێـرەدا گـەرکو نـەبا ئیـدڕاک زەلیـل (٧٥٩)

زۆرەهـەنجیرمان لـەلا خـۆش، وەک شـەکەر　　تـەیری هـەنجیر خـۆر، میـوان بـێ ئەگـەر (٧٦٠)

لـەو جیهانـەیێ گییـان و گیانـدار　　لەحزەلـەحزەوان لەمـەرگ و ئیحتیـزار (٧٦١)

تـۆ وەسـییەت بگرەگشـت گوفتـاری وان　　وەک وتـاری بـاب لـەبۆ کـوڕ، ئـەو زەمـان (٧٦٢)

عیبرەت و ڕەحمـەت هـەتا بـەو جووره بێت　　تـاکو ڕیشـەی بـوغز و کـین، ببرێـت لێـت (٧٦٣)

تۆ تەماشای قەو م و کەس کە، بەو خەیاڵ　　تـا بسـوو تێـتن دڵـت بـەو وەزع و حـاڵ (٧٦٤)

هەرچی وەختی هات کەبێ، دێ، بێ گومان　　بێنەبـەرچاو دۆسـت لـەحاڵی گیـان دان (٧٦٥)

گەر غـەرەز نەیهێشـت تـۆ وا کـەی نـەزەر　　ئـەو غـەرەز تـۆ بێنەبیخـەژێر حەجـەر (٧٦٦)

گەر کـو عـاجز بـووی مەبـەعاجز چ کـات　　چونکـەموعجیز عـەجزو زەعفـان لا دەبـات (٧٦٧)

عـەجزی تـۆ زەنجیرەداینـا کردگـار　　وازکـەچاو بنوارەجـا، زەنجیـر گـوزار (٧٦٨)

جـا، بـەناڵین بێژەتـۆ ئـەی کـار سـاز　　دەستەبەستەم ئێستەبۆ؟ مـن بـووم کـەباز (٧٦٩)

دادەنـێم زیـاتر لـەڕێگای بـەد، قـەدەم　　چـون ( لفی خسرم ) بەقـەهرت دەمبـەدەم (٧٧٠)

مـن لەپەنـدت گـوێم کـەڕو، بێ واز بـووم　　بوت شکەن خۆم دانیشان، بوت ساز بووم (٧٧١)

یـادی سـونعت چاترەیـا یـادی مـەرگ؟　　وەک خەزانـەمردن و، تـۆش ئەسڵی بـەرگ (٧٧٢)

تـەپڵی خـۆی زۆر وەختـەمردن لێـدەدا　　زۆر درەنـگ گـوێی تـۆ دەبیسـێ ئـەو سـەدا (٧٧٣)

وەختـی مـردن جـا دەڵـەی هـاوار، مـەرگ　　ئـەو دەمـەتۆی کـرد جـا، وشـیار مـەرگ؟ (٧٧٤)

دەنگـی مـردن بـەو هـەراو هوریـا بـڕا　　تـەپڵی وی بـەو زەربـی زۆر محکـەم دڕا (٧٧٥)

خۆت خـەریک کـرد تـۆ بـەکاری دونیـەوی　　ڕەمـزی مـردن ئێسـتەحاڵی بـووی لـەوی (٧٧٦)

**تەشبیهی یەک نەفەر ساویلکەکەعومری خۆی زایع د ەکا ولەکاتی مردن دا لەو کاتەناخۆشەدا تۆبەو ئیستیغفار دەکا، بەتازیەگرتنی شیعەی ئەهلی حەڵەب هەمووساڵێ دەرۆژی عاشوورا دا لەدەروازەی شاری ئەنتا کیەوگەیشتنی شاعرێک غەریب لەسەفەر وپرسینی وی کەئەو شیوەنەو تازیەچییە؟**

**خولاسەی داستان ..**

خەڵکی حەڵەب دەرۆژی عاشوورا دا لەقەراغ دەروازەی ئەنتاکییەتا شەو کۆ دەبوونەوە و عەزاداریان بۆ ئەهلی بەیت(ع) ئەنجام دەدا، وبەتەعزیم و تەکریم، موسیبەتی کەر بەلایان یاد دەکرد وباسی زوڵمی یەزید و شومَریا ن دەکرد، تاکو ڕۆژێک شاعیرێک لە دوورەوە هات و عیددەیەکی زۆری دی کەشیوەن و غەوغا دەکەن وەختێک کەلەماجەڕا حاڵی بوو، کوتی گریان لەبۆ چی؟ وشیوەن و ماتەم بۆ چییە؟ ئەو شەهید، یانی حەزرەتی سەیید ەششوهەدا حوسەینی بنی عەلی (ع) کەشای دین و مەعریفەت بوو لەزیندانی تەبیعەتی ماددی نەجاتی بوو وبەعالەمی ئیلاهی واسیل بوو ئەو نەجات بوونەشادی هێنەرەنەغەم و ماتەم هێنەر .. بڕۆن بۆ حاڵی خۆتان بگرین کەئێوەبەو دونیای تیرەوتار وابەستەنە..

ڕۆژی عاشوورا تەواو ئەهلی حەڵەب　　دەرکی ئەنتاکییەدەگرن تاکو شەب (٧٧

کۆ دەبن پیاوو ژنان لەو دەرکی شار　　بۆ عەزای ئەو خانەدانی نامدار (٧٨

ناڵەناڵ و شین و واوەیلا دەکەن　　شیعە، یادی ڕۆژی عاشوورا دەکەن (٧٩

جا دەیان کرد باسی زوڵمی کردیان　　هەم یەزید هەم شومری وی، لەو خانەدان (٨٠

شین و واوەیلایی وان دەیکرد پڕ　　کێو و چول و دەشت و سەحراو دۆڵ و خڕ (٨١

شاعیرێکی دوور وڵات ڕێی کەو تەوێ　　ئەو سەداو گریان و شینەی کەوتەگوێ (٨٢

ڕووی دەلای گریان وشین کرد ئەو، نەشار　　تا بکا لەو شین و گریان پرسیار (٨٣

دەستی کردەپرسیارو جستو جۆ　　ئەو غەم و ئەو ماتەمە، بۆ کێیە؟ بۆ؟ (٨٤

وا دیارەگەورەپیاوەمردووە　　بۆیەعالەم ئیجتیماعیان کردووە (٨٥

بۆم بەیان کەن ئێوە نێوی ئەو نەجیب　　چونکەئێوەن خەڵکی ئێرەو من غەریب (٨٦

نێوو پیشەی وی چییەو ئەو سافی وی؟　　تاکو بێژم نێو ڕەسا، ئەلتافی وی (٨٧

جا دەکەم یەک مەرسیە، چون شاعیرم　　تا خەڵاتم، لێرە بۆ خۆم وەر گرم (٨٨

یەک نەفەرپێیکوت مەگەر دێوانەبووی؟　　شیعەنی تۆ، دوژمنی ئەو خانەبووی؟ (٨٩

تۆ مەگەر نەت بیست عاشوورا چییە؟　　ماتەمی گیا نێکەبێ حەد عالییە (٩٠

کوا لەلای موئمین دەبێ ئەو دەردەخوار؟     خۆشەویستەخۆ بەقەد، گوێ، گووشوار (٧٩١)

لای موسەڵمان ماتەمی ئەو پاک ڕووح     زێد ەتر مەشهوور لەسەت توفانی نووح (٧٩٢)

**نوکتەکوتنی ئەو شاعیرەبۆ سەر زەنیش ولۆمەی شیعەی حەڵەب ..**

پێیکوتن دەوری یەزید بوو ئەو غەمە     بۆ درەنگتان هاتەلا، ئەو ماتەمە؟ (٧٩٣)

چاوی کوێران دیتییان خۆ ئەو زییان     ئەو هەرایە، گوێی کەڕانیش بیستییان (٧٩٤)

تاکو ئێستا هەر دەخەو دابوون مەگەر؟     ئێستەدەدڕن ئێقەتان تاسێنگ و بەر (٧٩٥)

شین لەبۆ خۆتان بکەن ئەی نوستووان     مەرگی بەد بوو، ئەو خەوی وا زۆرگران (٧٩٦)

ڕووحی سوڵتانی لەزینەدان هاتەدەر     بۆ کراس بدڕین و بۆ خاک کەین وەسەر؟ (٧٩٧)

چون ئەوان شا، بوون لەبۆئیمانو دین     مەرگی وان جێی شادییە، نەک داد و شین (٧٩٨)

بۆ سەراپەردەی سەعادەت چوون بەغار     کۆت و زەنجیریان دەکردن تارو مار (٧٩٩)

گەرکو هەت بێتن خەبەر تۆ، هیچ لەوان     ئێستەشادو شادمانن وەک شەهان (٨٠٠)

گەرلەوان بی باخەبەر، بۆ خۆت گری     چونکەبۆ حەشرو مەعاد تۆ مونکیری (٨٠١)

بۆدڵ و دینی خەڕاپت شین کە، چاک     چونکەنابینێت غەیری کۆنەخاک (٨٠٢)

گەر دەبینی، بۆ ئەدی نابی دلێر؟     با تەوەککول گیان فیدا، هەم چاو تێر (٨٠٣)

کوا لەمەی دین، کەو تەڕووی تۆ،فەڕڕوخی؟     گەر یەمت دی کوا ئەدی دەستی سەخی؟ (٨٠٤)

ئاو دەبەخشێ هەرچی دیتی جۆگەئاو     هەرچی دیتی هەورو یەم، ئەو بێ حیساو (٨٠٥)

**تەشبیهی پیاوی حەریس کەڕەززاقی وخەزائینی ڕەحمەتی حەق نابینێ بەمێروولەیەک کەلەخەرمانێکی گەورەدا، مەشغووڵی دەنکەگەنمێکەوبەپەلەو لەرزەلەرز، دەیکێشێ وگەورەیی ئەو خەرمانەگەورەنابینێ ..**

چونکەکوێرەمووروڵەحاست خەرمانی بەرز     دەنکەگەنمێک ڕادەکێشێ لەرزەلەرز (٨٠٦)

ئەو دەبادەنکێک بەحیرس و ئازو بیم     چونکەنەیدی ئەو خەیانەی خوای کەریم (٨٠٧)

ساحەبی خەرمان دەڵێ بەو موورەتۆ     چونکەکوێری، شەی لەلات مەعدوومەخۆ (٨٠٨)

هەرئەوت دی لەو هەموو خەرمانەتۆ     بۆیەمحکەم ئەو دەبەی نێو لانەتۆ (٨٠٩)

ئەی بەسووڕەت چووک ببینەتۆ زوحەل     تۆ سولەیمان بین ببە، ئەی مووری شەل (٨١٠)

نی ئەتۆ تەن بەڵکەتۆی ئاوی حەیات     گەرببینی گیان لەتەن دەت بێ نەجات (٨١١)

ئادەمی هەرچاوە، باقی گۆشت و پۆست     هەرچی دیتی چاو، دەگەڵ وی بوو بەدۆست (٨١٢)

گۆزەیـەک گـەر مەنفـەزی بێـتن بەیـەم ئـەو دەکـاتن غـەرقی خـۆی شاخ و عەلـەم (١٣)

گۆزەیـەک گـەر مەنفـەزێکی لای یەمـە چۆمی جەیحوون ئـەو دەمـەلا ی وی کەمـە (١۴)

بۆیــەگفتی بــەحرە،گفتی ئەحمـــەدی گـەرچی ئـەو گوفتـار، لەئەحمـەد هاتـەدی (١۵)

دوڕڕی دەریـابوون هــەموو گوفتـاری وی وەسـڵی یـەم بـوو چـون دڵـی پڕبـاری وی (١۶)

چونکەیــەم گرتـی لــەگۆزەی ئێمــەجوود سـەهلەنێو حووتێـک هـەیبێ یـەم وجـوود (١٧)

زاهیــری ئەشـیا لــەچاوی سـەر عــەیان چـاوی کامیـل لێـی عەیانـە، چـاک نیهـان (١٨)

خێڵ کەنـەی دیبایەهیچ کـات یـەک بەدوو ئـەووەڵ ئـاخیر، ئـاخریش ئـەووەڵ دەبـوو (١٩)

مەتڵـەبی وات بـۆ دەبێ مـەعلووم لەبـەعس بتهەوێ بەعس و،لەبەعسیش کەمکەبەحس (٨٢٠)

شــەرتی ڕۆژی بــەعس، ئــەووەڵ مردنــە چونکـەدەو ڕۆژ، مــردوو زینــدوو کردنــە (٨٢١)

بۆیەعالــــەم گرتییـــان ڕێـــی ئیشـــتیباه چـون دەترسـێن لـەو فەنایـەی بـوو پـەناه (٨٢٢)

مەنشـەئە، بـۆ عـیلم و دانیش تـەرکی عـیلم مەنشەئە، بۆ سوڵح و سیلمیش تەرکی سیلم (٨٢٣)

هەست و بوون لانێ، هەتا بت بێت هەست دەسـت وەلانـێ تـاکو سـێوت بێتەدەسـت (٨٢۴)

تـۆ لەدەسـتت دێـت ئـەی نیعمـەلموعین چاوی مەعدووم بین بکەیتـە، هەست بین (٨٢۵)

گـەرکوچاوێک مەنشـەئی وی بـێ عــەدەم بـێ گومـان نـابینێ هەسـتی ئـەو، چ دەم (٨٢۶)

ئەو جیهانـەی مونتـەزەم مەحشـەر بوو گەر ڕوون بـبن، موبـدەل بـبن، دووچـاوی سـەر (٨٢٧)

دیــار دەکـــەن بۆیەحـــەقایق ناتـــەمام چونکەفــەهمی وان لـــەخامان بووحـــەرام (٨٢٨)

لێـی حەرامەجەننــەتی خـۆش، دووزەخــی گـەرچی یـەزدان بێ نیهایـەت، بـوو سـەخی (٨٢٩)

بــۆ مـــەزاقی وان تاڵەشــــەهدی خولـــد چون نەیان بوو هیچ وەفا، بۆ عەهدی خولد (٨٣٠)

وەختـی سـەودا چـاک ئـەتۆ بڕوانـەخۆت کـوا دەجـوولێ دەس؟ نـەبێ کڕیـار بـۆت (٨٣١)

کـوا تەماشـا کـەر دەبێ بـۆت موشـتەری؟ کاری وی بوو بەس تەماشای سەر سەری (٨٣٢)

هــەر دەپرســن قیمــەتی ئەشـیاوو، بـەس تـا بـدەن کاتیـان بـەبێهوو دەڵــەدەس (٨٣٣)

چــون مەلوولەبۆیــەدێ بــۆ لایــی تــۆ خـۆ دەنـا نـای وێـت ئـەو کـالایی تـۆ (٨٣۴)

سـەت کـەڕەت دیتوویـە ئـەو کالایەئـەو نـاکڕێ هـیچ، موشـتەری بـۆ بایـە، ئـەو (٨٣۵)

هــاتن و، جیلــوەو جــەلالی موشـــتەری نین شـەبیهی هـەزل و شۆخی سەر سەری (٨٣۶)

چونکـەگیلفانی لەحــەد زیـاد بـوو هــەژار غـەیری شـۆخی هـیچ لەدەسـتی نایـەکار (٨٣٧)

بـۆ تیجـاڕەت چونکـەبێ سـەرمایە، ئـەو لای دوکانـدار ناحــەزە، وەک سـایە، ئـەو (٨٣٧)

مایەلــــەو دونیایـــــەدا تـــــەنها زەڕە مایەلــەو لاعیشــق و، دوو چــاوی تــەڕە (٨٣٩)

هـــەرچی چـــۆ بـــازاڕ بـــێ ســـەر مایەئـــەو عـــومری دانـــا، هاتـــەوە،جا، دوایـــە، ئـــەو (٨٤٠)

تۆ لـەکوێ بـووی ئـەی عـەزیزم؟هیچ جـێ چیت ئەتۆ خوارد؟ نەمبوو،هیچ خۆراک پێ (٨٤١)

موشـتەری بـە، تـا بجـووڵێ دەسـتی مـن دەر بخـا دوڕ، مەعـدەنی دەر بەسـتی مـن (٨٤٢)

موشتەری گـەرچی گـەلێک مـەیلی کەمـە ئـەو بـەدین دەعـوەت کـە، دەعـوەت لازمـە (٨٤٣)

بـەردە، بـاز و، بگرەجـا تـۆ کـۆتری ڕووح بگرەبـۆ دەعـوەت ئـەتۆ ڕێگـایی نـووح (٨٤٤)

خزمـەتێک ئـەنجام دەتـۆ، بـۆ خـوای ئەحـەد چیـت لـەوەی دا، باشـەلای عـام یانەبـەد (٨٤٥)

**داستانی ئەو شەخسەی کەلەبەر دەرکی ماڵێک تـەپڵی پارشێوی لێدەدا، جیرانـی ئـەو ماڵەبەوی کوت ئاخر ئێستا نیوەشەوەپارشێونییەڕەنگەکەسیش دەو ماڵەدا نەبێ تەپڵی بۆ کێ لێدەدەی؟ وجواب دانەوەی ئەو تەپڵ کوتەی ئاوازخوان بەوی ..**

**خولاسەی داستان ..**

شەخسێک دە نیوەشەوێک لەشەوانی ڕەمـەزان دا، لەبـەر دەرکی مـاڵێکی موجەللەل و ئەشرافی بە ئاواز خوێندن و تەپڵ لێدان مەشغووڵ بوو، شەخسێک دەرکی ماڵی خۆی کردەوەو پێیکوت مامەگیان ئێستا وەختی ئەو کارانە نییە و لەوەش بگوزەرێین بەچی مەعلوومە کە کەسێک دەو ماڵەدا هەیە؟ تـەپڵزەنی پارشێو بـەوی کـوت ئەگـەر ئێستا بەنـەزەری تۆ نیوەشەوە و تاریکە، لەلای من بەیانی ڕووناکە، و لـەوەش بگوزەرێین ئـەمن ئـەو تـەپڵی پارشێوە بـۆ خـودا لێدەدەم و هیچ ئینتیزارێکم لە خەڵکی نییە..

یەک نەفەر کردی لەپێش دەرکێک سەڵا گـــەو ڕەماڵێـــک بـــوو عـــەزیم و باســـەفا (٨٤٦)

نیوەشـەو دەیکـرد سـەڵا، ئـەو زۆر بەجیـد یەک نەفەر دەیکوت بەوی ئەی موستەمید (٨٤٧)

ئەووەڵـەن وەختـی سـەحەر تـۆ، لێدەتـەپڵ نیوەشـەو تـۆ، لێدەدەی بـۆ تـەپڵ و چـەپڵ؟ (٨٤٨)

دووهـەمیش حاڵی بـە، تۆ، ئـەی بولهـەوەس داخڵـــی ئـــەو ماڵەتێیدایـــە چ کـــەس؟ (٨٤٩)

دێـرەدا نـین غـەیری جیننـو دێـو، چ کـەس ڕۆژگاری خـۆت دەدەی بـێ سـوود لـەدەس (٨٥٠)

لێدەدەی دەف تۆ لـەبۆ گۆش، گۆش کووا؟ هـۆش دەبـێ، بـێ، تـا بزانـی هـۆش کـووا (٨٥١)

پێیـــدەکوت ئێســـتا ببیســـەلێم جـــەواب تـــاکو نـــەت مێنێـــت مـــاتی و ئیزتیـــراب (٨٥٢)

گـــەرچی ئێســـتا نیوەشـــەوتاریکەلات ســوبحی ڕوون نیزیکـەلێم، هـا کـا، کـەهات (٨٥٣)

مـــن شکەســـتم لا، هـــەموو ســـەرکەوتنە شـــەو بـــەچاوم ڕۆژی بـــێ حـــەد ڕۆشـــنە (٨٥٤)

خوێنـەلای تـۆ ئـاوی جـوانی چـۆمی نیـل خـوێن نییەئـەمما لـەلام ئـاو، ئـەی نـەبیل (٨٥٥)

یەک شتت لا، بەردەیا ئاسن بەڵام — لای نەبی داوود، ئەو بوو نەرم و ڕام (٨٥٦)

کێو لەلای تۆ، بوو جەماد هەم زۆر گران — لای نەبی داوود، بەڵام بوو نەغمەخوان (٨٥٧)

تۆ لەلات ئەو ورکەبەردە، ساکیتە — ئەو لەلای ئەحمەد فەسیحەو قانیتە (٨٥٨)

کۆڵەکەی مەسجید لەلات بێ گیانە، دار — لای موحەممەد عاشقێکەبێ قەرار (٨٥٩)

گشتی ئەعزای ئەوجیهانەلای عەوام — بێ گیانن لای خودا زاناوو، ڕام (٨٦٠)

تۆ کوتت دەو ماڵەدا، خۆ کەس نییە — ئەو هەراو ئەو زەربی تەپڵت بۆ چییە؟ (٨٦١)

بۆ خودا عالەم دەدەن زۆر زێڕ و ماڵ — چا دەکەن مەسجید دەکەن خێر خۆشحاڵ (٨٦٢)

چا دەدەن لەو ڕێی حەججی دوورە دەست — ماڵ و تەن وەک عاشقی سەر خۆش و مەست (٨٦٣)

کەس دەڵێ دەو ماڵەدا خۆ کەس نییە؟ — بەڵکەساحەب ماڵ وەک ڕووح مەخفییە (٨٦٤)

ئەو کەسەی هەیبێت نووری کردگار — پڕ، دەبینێ دائیمەن ئەو ماڵەیار (٨٦٥)

زاهیرەن بوون پڕ لەئینسان، کاخ و ماڵ — لای دوو چاوی عاقیبەت بینا ن، بەتاڵ (٨٦٦)

هەر کەست ویست تۆ لەنێو کەعبەت بوێ — تاکو حازربێت بۆ تۆ، ئەو لەوێ (٨٦٧)

سوو ڕەتێکی فاخیرەهەم عالییە — کوا لەماڵی ئەو خودایە خاڵییە؟ (٨٦٨)

ئەو لەوێ حازر، لەبۆوی دەرکەواز — عالەمی دیکەش دەچن بەس بۆ نییاز (٨٦٩)

کوا، دەڵێن کوتمان( لەبیەیک ) بێ حیساب — بۆ ئەد ی بۆمان نەهات لای خوا جەواب (٨٧٠)

بەڵکەئەو( لەبیەیکی )کردی پێن بەیان — لەحزەلەحزەجوابەلای خوای دوو جیهان (٨٧١)

من بەبۆن زانیم کەئەو کاخ و سەرا — جێگەبەزمی گیانە، خاکی کیمییا (٨٧٢)

من مسی خۆم چا لەڕێگای زێڕو بەم — تا ئەبەد لەو کیمیایەی، وی دەدەم (٨٧٣)

تا لەزەربی تەپڵی پارشێو بێنەجۆش — یەم هەموویان، دوڕ ببەخشن،پڕبەکۆش (٨٧٤)

خەڵکی بۆ دەعواوو جەنگ و کارزار — گیان دەبەخشن جا لەڕێگای کردگار (٨٧٥)

بۆ بەڵاو دەرد یەک وەکوو ئەییوب دەبێ — بۆ سەبووریش یەک وەکوو یەعقووب دەبێ (٨٧٦)

تینووان و ئارەزوومەند، سەت هەزار — کار دەکەن بۆ لوتفی زاتی کردگار (٨٧٧)

جا، منیش بۆ لوتفی زاتی دادگەر — تەپڵی پارشێو لێدەدەم وا، دەر بەدەر (٨٧٨)

بتهەوێ گەر موشتەری زێڕ پێت بدا — دێتەدەس کێ،موشتەری باش وەک خودا؟ (٨٧٩)

ماڵی ئالوودەلەتۆ دەکڕێ خودا — پێت دەدا لەجیاتی وی نووری هودا (٨٨٠)

ئەو تەنەی فانی سەهۆڵ، دەگرێ خودا — مولکی مەعنای جاویدانمان پێدەدا (٨٨١)

چەند قەترە، ئەشک دەگرێ لێن، خودا — کەو سەری مەحسوودی قەند، ئەو پێن دەدا (٨٨٢)

| | | |
|---|---|---|
| ئـەو لەئیمـەدەگرێ ئـاهی پـڕ لەشـوور | بۆ هەموو ئاهێک دەدا سوود، جوور بەجوور | (۸۸۳) |
| هـەوری ئەشـکی چـاوی جوولاند بـایی ئـاه | بۆیـەئیبراهیمی ئـەوواە،کوت ئـیلاە | (۸۸۴) |
| تـۆ لـەنێو بـازاڕی وا زۆر گـەرم و خـۆش | بگرەنەغـدو، کۆنـەدانێ، بـۆ فـرۆش | (۸۸۵) |
| تۆ کەلـەو ڕێگایـەبت بێ، ڕەیـب و شـەک | ئـەنبیا لات موسـتەنەد بـن، یـەک بەیـەک | (۸۸۶) |
| هێنـدەزۆری دا خوداوەنـد بـەختی وان | کێـو کـەناتوانێ بکێشـێ ڕەختـی وان | (۸۸۷) |

**داستانی ئەحەدکوتنی بیلال دەگەرمای حیجاز دا بـەخاتری خۆشەویستنی موستەفا علیەالسلام، لەکاتی چێشتان دا کەئەربابی وی بەتەعەسسوبێکی شـەدید لـەژێر تـاوی حیجاز بەدوڕوان لێیـدەدا، ولـەبرینی بـەدەنی وی خـوێن دەتکاوە،ئـەو بـەبێ قەست و ئیرادەئەحـەد ئەحـەدی دەکـوت .. هـەر وەکـوو سـاحەب دەردانـی بـێ قەسـت و ئیرادەکەدەنالێنن، چونکەدەردی عیشقی وی زۆر بوو ئیهتیمامی بەدەفعی دەردی دوڕوان نەدەکرد وەک ساحیرانی فیرعەو ن و جرجیس و(غیرهم لایعد و لا یحصی )..**

**خولاسەی داستان ..**

بیلالی حەبەشی بەردەی یەکێک لەسەروەتمەندانی مەککەبوو، کاتێک ئایینی ئیسلامی قـەبووڵ کرد ئەربابی وی تووڕەبوو،وبۆ ئەوەی کەپەشیمان بێتەوەزۆر ڕۆژان دەگەرمای نیوەڕۆ دا،لەسـەر عـەرزی درێـژی دەکـرد و بـەدەنی وی وەبـەر شـەللاقان دەدا، بیلال لـەژێر بارانی شـەللاقان دا دەیکوت ئەحەد ئەحەد، ڕۆژێک ئەبوو بەکر بەوێ دا ڕادەبـرد و ئەشکەنجەو ئـەو موقاوەمەتـەی دیت، دڵی پێ سووتا و کا تێک کەبیلالی بەتـەنهاد یت پێیکوت کەئەتۆ نیازێکت بـەئیزهاری ئیمـان نییـەچون خوداوەنـد بەهـەموو ڕازو سـوڕێک ئاگـادارە، و لـەوەی پـاش دەگـەڵ بێگانـان لەبارەی دین هیچ مـەڵێ تا ئازارو شکەنجەت نەکەن،بیلال قـەبووڵی کرد و لـەئیزهاری ئیمان تۆبـەی کـرد،ڕۆژی دوایەئـەبوو بـەکر ڕێـی دەوێ کـەوت، وهـەر بـەو حـاڵی پێشـووی دی، ئـەو چەلەش دەمەو قیعییەتێکی مونا سب سفارشی پێشووی بەتەئکیـد بۆ تیکرار کردەوە، و بیلال جارەکی دیش تۆ بـەی کـرد..خولاسـەی کـەلام بیلام هـەر دەفعەیـەک کەلـەئیزهاری ئەسراڕی خودا تۆ بەی دەکرد، هێندەی پێ نەدەچووکەتۆ بەکەی دەشکاند،تا عاقیبەت لەتۆبەکردن تۆبەی کرد چونکەعاشقی موحەممەد (ص) بـوو وعیشـق زاتـەن سـەرکەش وسۆزناکە.ئەبووبەکر کاتێک دیتـی کـەبیلال نـاتوانێ دەموقابیـل عیشـقی موحەممـەد و خـودای واحیـدو ئەحـەد خـۆ ڕاگـرێ هاتـەلای پێغەمبـەر و جـەرەیانی بـۆ بـەیان کـرد و تەسـمیمی گـرت کـەبیلالی لەئـەرباب بکـڕێ،

پێغەمبەر بۆ ئەو کارەتەشویقی کرد و پێیکوت ئەمنیشس بکە شەریکی ئەو کارەباشە، و نیەوەی قیمەتی وەئەستۆی خۆی گرت . ئەبووبەکر فەو رەن چۆ ماڵی ئەو کافرەوپێشنیهادێکی بەزاهیر عەجیب و زیان ئاوەری پێکرد .کوتی بیلالی ڕەش بەمن بفرۆشەو لەجیاتی وی غولامێکی زۆر جوان دەدەمەتۆ، ئەربابی بیلال کەئیشتیاقی زۆری ئەبوو بەکری دی بەعادەتی کاسبکارانی حیرفەئی کوتی زەرەر دەکەم،دەبێ دوو سەت درهەمی زێڕیشم بدەیەی، تا موعامەلەکەسەر بگرێ ئەبوو بەکر قەبووڵی کرد. موبادەلەئەنجام درا، کافر بەشیددەت پێکەنی و بەتەو هین و مەسخەرەکوتی ئەتۆ لەو موعامەلەدا زۆرت زەرەر کرد و ئەمنیش سوودێکی زۆرم دەس کەوت . ئەگەر لەکڕینی ئەو غولامەڕەشەدا ئیسراڕت نەکردبا بەقیمەتێکی زۆر کەمتربەتۆم دەفرۆشت، ئەبوو بەکر پێیکوت ئەتۆ وەک منداڵ عەقڵی نا تەواوت هەیە،دەحەقیقەت دا گەو هەرێکت بەگوێزێک لەدەست دا چونکەئەتۆ زاهیر دەبینی بەڵام ئەمن باتینی وی دەبینم لەپاشان ئەبوو بەکر بیلالی بردەمەحزەری پێغەمبەر(ص ) ئەو حەزرەتە، بیلالی دەباوەش گرت و بیلال لەو دیدارە، لەخۆ چوو، ئەو دەمی پێغەمبەر گلەیی لەئەبوو بەکر کرد کەمەگەر نەمکوت ئەمنیش لەو کارەخێرەدا بکەشەریک؟ ئەبوو بەکرکوتی ئەمن و بیلال هەردووکمان غولامی تۆین ئەمن بەخاتری تۆ ئەوی دەڕێی خودا دا ئازاد دەکەم ..

| | | |
|---|---|---|
| ئەو بیلال دەیکرد لەبۆ خار تەن فیدا | خواجەکەی وی بۆ تەنەبیوەلێیدەدا | (٨٨٨) |
| بۆچی ئێستا پەیڕەوی بۆ ئەحمەدی؟ | ڕەد دەکەی دینم، غولامێکی بەدی | (٨٨٩) |
| لێیدەدا ئەرباب لەبەر تاو توند بەخار | ئەو فەقەت دەیکوت ئەحەد، بۆ ئیفتیخار | (٨٩٠) |
| تاکو سیددیق جارەکی ڕێی کەوتەوێ | ئەو ئەحەد کوتنەی لەناکاو کەو تەگوێ | (٨٩١) |
| چاوی وی پڕ بوو لەئاو دڵ پڕ عەنا | لەو ئەحەد، چون کردی بۆنی ئاشنا | (٨٩٢) |
| جا لەپاشان وای دەدا پەند بەو نیهان | ئیعتیقادی خۆت مەڵێ تۆ لای جووان | (٨٩٣) |
| ڕاز کەپنهان، ڕاز دەزانێ کردگار | کردی تۆبە، بەس بلێ لەو ڕاز وتار | (٨٩٤) |
| جارەکی دیش چونکەسیددیق بوویی کار | لەو مەحەللەو دەورو بەر کردی گوزار | (٨٩٥) |
| ئەو چەلەش بیستی ئەحەد هەم زەربی خار | هاتەقەلبی ئێشی زۆرو سۆزی نار | (٨٩٦) |
| ئەو چەلەش دای پەند و تۆبەی کردەوە | هات ئەوین تۆبەی لەبیر وی بردەوە | (٨٩٧) |
| کردنی تۆبە وەها، زۆر جار بوو | ئەو لەتۆبە، عاقیبەت بێزار بوو | (٨٩٨) |
| دای بەئێش تەن، مەتڵەبی کرد ئاشکار | ئەی موحەممەد ئەی لەبۆ تۆبان نەیار | (٨٩٩) |

ئـەی تـەن و گیـانم لەعیشـقت بـوون پـڕ — تـۆ بـە، نیتـی جێگـە، جـا، مـا، مـاتوکڕ (٩٠٠)

دەر دەخەم تۆبەی لەدڵ، ئەو هەی دەکەم — چـۆن لـەژینی جاویـدان تۆبـەی دەکـەم؟ (٩٠١)

عیشق قـەهھارە، منیش مـەقهووری عیشق — بوومەشەکری خۆش بەشەوقو شووری عیشق (٩٠٢)

تۆ وەکوو بای توندو پووشکەی کا، منم — کـوا دەزانـم کوێیـەجێگای کـەوتنم؟ (٩٠٣)

مـن هـیلال بـم یـابیلال بـم،وام، لـەدووت — پـەیڕەوم بۆ ڕۆژی بێ حـەد ڕوونی خـووت (٩٠٤)

مانـگ زەعیـف بـێ یانـەمانگی دەو چـووار — هـەر بـەدووی ڕۆژدا دەچـێ لـەیل و نـەهار (٩٠٥)

هەرچی پێی پووچ بێ قەزای خوای لەو سەرە — گێـل و گێـژە، خـۆی دەکـاتن مەسـخەرە (٩٠٦)

پوشـکەکا، لای بـا، چلـۆن دەگـرێ قـەرار؟ — ڕۆژی مەحشـەر کـوا دەبێـتن وەختـی کـار؟ (٩٠٧)

وەک پشی نێو کیسەمی کرد، دەستی عیشق — جار لەبۆ لای ژوور و جار جار پەستی عیشق (٩٠٨)

دەوری سـەر ئـەو خـول دەدا، ئـەمنی هـەزار — مـن لـەژێر و ژوور نیمـەهیچ قـەرار (٩٠٩)

عاشـقان کەوتوونـەنێو سـێڵاوی عیشـق — جا دەبوون تەسلیمی ویست و داوی عیشق (٩١٠)

چەشـنی بەرداشـن ئـەوان نـاگرن قـەرار — ڕۆژو شـەو سـووڕان و ناڵینیانـەکار (٩١١)

جۆ، تەڵـەب، بۆی،گەردشـی بـەرد شـاهیدە — تـا نـەڵێ هـیچ کـەس کەئـەو جـۆ ڕاکیـدە (٩١٢)

گەر کو نەت دی جۆی نیهان تۆ ئەی ڕەفیق — گردشـی ئـەفلاک ببینـەزۆر دەقیـق (٩١٣)

چون ئەوین گرتی لەئەفلاک سەبرو هۆش — مـەگرەئاڕام وەک سـتێران، دڵ ئـەتۆش (٩١٤)

نایـەڵێ بـت بێ ئـەوین، هـیچ کـات سـەبات — پەندی وەسڵت بێ بەهەرچی لەت دەکات (٩١٥)

گەرئـەتۆ نـەت دیـوە، تـەدویری قەمـەر — چـاک بنۆڕەتـۆ لەئەشـیای دەو رو بـەر (٩١٦)

چون تەکانی ئەو خەس و خاشاک و کەف — بـوو بـەدەس غـەلیانی بـەحری باشـەڕەف (٩١٧)

چاو لـەبای شـێواو کـەتۆ، وەختـی خـڕۆش — ئـەمری وی ئـەمواجی وی دێنێتـەجۆش (٩١٨)

مانگ و ڕۆژ هەردوو وەکوو دوو گاوی ئاش — خول دەدەن بۆ حیفزی مەوجوودا ت باش (٩١٩)

مـاڵ بـەماڵ ئـەنجوم دەڕۆن زۆرتونـد بـەغار — مەرکـەبن بـۆ سـەعدو نەحسـی ڕۆژگـار (٩٢٠)

گـەرکو دوورن ئەختـەرانی ئاسـمان — تـۆش حەواسـت زۆر زەعیفـەو ناتـەوان (٩٢١)

ئەختـەرانی چـاوو گـوێ هـەم هۆشـمان — شـەو چکـارەن، ڕۆژ لـەکام جێگـا دەمـان؟ (٩٢٢)

جار لەسەعدو وەسڵ و دڵ خۆشین ئەوان — جـار لـەهیجرو نـەحس و بێهۆشـین ئـەوان (٩٢٣)

چـون گەڕانـەکاری مـانگی ئاسـمان — یـەک زەمـان تاریک، ڕووناک یـەک زەمـان (٩٢٤)

جار بـەهارو سـەیفی چەشـنی شـەهدو شیر — جـار دەبێتەجێگەبـەفرو زەمهـەریر (٩٢٥)

چون هەموویان چەشنی گۆی گۆچانی وین — چون هـەموویان گشت لـەژێر فـەرمانی وین (٩٢٦)

تۆ کەئەی دڵ جوزئەکی لەو سەت هەزار   چۆن لەحاستی حوکمی وی دەت بێ قەرار؟ (٩٢٧)

چەشنی یەک مەرکەب بە، ژێر ئەمری ئەمیر   جار لەئاخوڕ حەبس و جار جار نێو مەسیر (٩٢٨)

تۆ ڕەزات بێ گەر بەمیخ تۆی بەستەوە   گەر کو وەی کرد، چوست و چالاک هەستەوە (٩٢٩)

گەر لەئاسمان کەج رەوی کا ڕۆژی گەش   دێ کسووف جا، ڕووی دەکا تاریک و ڕەش (٩٣٠)

لەو زەنەب تۆ دوورکەخۆت ئەی ڕۆژی گەش   تا نەبێ ڕووت،چەشنی مەنجەڵ تارو ڕەش (٩٣١)

دێتەسەرهەوران قامچی ئاگرین   ڕێ و مەسیری وان دەکەن ئەو دەم تەعین (٩٣٢)

پێیدەڵێن جا پاش گەلێ ڕەنج و عەنا   سەر فلان جێ ڕۆکەباران، ئێرە، نا (٩٣٣)

تۆ کەنابی وەک هەتاو گەو رەو عەزیم   مەیکەهەرچی مەنعی کردی خوای کەریم (٩٣٤)

دا مەنێ ئەی عەقڵە؛ لاقی خۆت خووار   تا نەبی ڕوو ڕەش لەدەرگای کردگار (٩٣٥)

ڕۆژ کەجورمی کەم بێ نیوەی ڕەش دەبێ   نیوەکەی دی هەر وەکووپێش گەش دەبێ (٩٣٦)

من دەدەم کەیفەر بەئەندازەی گوناە   بۆ موجازات وایەجا،عەدلی ئیلاە (٩٣٧)

باش یا بەد ئاشکرا بن یانیهان   لێم عەیانن من هەموویان بێ گومان (٩٣٨)

بتهەوێ گەر خوا تەجەللی کات بۆت   زوو لەخودخواهی و تەکەبیو ر دوور کە خۆت (٩٣٩)

هاتەجۆمان ئەو چەلەش ئاوی حەیات   هاتەکۆمان ئەو چەلەش پاشای وڵات (٩٤٠)

جا خەرامان و بەناز، دێ بەختی باش   دەیهەوێ تۆ بەی بکاتن وردو خاش (٩٤١)

ئەو چەلەش سێڵاو دەهات تۆبەی دەبرد   خەو لە فرسەت پاسەوانی مات دەکرد (٩٤٢)

گشت خوماران مەستی مەی بوون بێ درەو   دا دەنێین ئەو شەو لیباسمان بۆ گرەو (٩٤٣)

بەو شەرابی سوورو جوان و مەعنەوی   دڵ دەبوو ساحەب کەماڵات و قەوی (٩٤٤)

خۆشبەمەجلیس ئەو چەلەش زیاتر لەحەد   گڕ دەئەسپەندەر لەترسی چاوی بەد (٩٤٥)

نارەتەی مەستانەخۆشەلایی من   تا ئەبەد وابن ئەوان، ئەی خوایی من (٩٤٦)

وەک هیلال ئێستا بیلال زەردەو نەزار   وەک گوڵ و گوڵنارەبۆ وی زەخمی خار (٩٤٧)

گەر تەنم وەک هێڵەگی لێهات بەخار   جیسم و گیانمی کردەگوڵزار کردگار (٩٤٨)

تەن لەژێر زەخمی دڕووی ئەو جووی لەعین   گیانی من مەست و خەرابی خوای موعین (٩٤٩)

بۆ گیانم دێت بۆنی یەک گیان   دێتەلای من بۆنی یاری میهرەبان (٩٥٠)

گەر لەمیعراج هاتەوەئەو موستەفا   (یا بلال حبذا لی ) کرد ئەدا (٩٥١)

چونکەسیدیق لەو بیلالەی ڕاس دەبیست   تازەتۆبەی هیچ چەلی دی لەو نەویست (٩٥٢)

**گێڕانەوەی سیددیق (رضی الله عنه ) جەرەیانی بیلال (رضی الله عنه) وزوڵمی جوو لەکان لەوی و ئەحەد ئەحەد کوتنی وی و زیاد بوونی ڕق و کینەی جوولەکان وکوتنی ئەو مەوزووعەلەلای موستەفا ( ع)وەمشوەرەت کردن بۆ کڕینی وی لەجوولەکان ..**

دوایە سیددیق هات بۆ لای موستەفا    پێیدەکوت حاڵی بیلالی با وەفا (٩٥٣)

ئەو فەلەک پەیمایی باڵ چوست و قەوی    ئێستەکەو تەداوی عیشقت قەلبی وی (٩٥٤)

بازی شایە، دی لەوان کوندانەڕەنج    نێو پەین پنهان بووەئەو گەورەگەنج (٩٥٥)

زوڵمی زۆر، کوندان لەباز ئیجرا دەکەن    بێ گوناەلەوباڵ و پەڕ، بەڕ با دەکەن (٩٥٦)

غەیری باز بوون،گشت گوناەبوون لەو نەفی    غەیری جوانی کوا گوناهی یووسوفی؟ (٩٥٧)

مەسکەنی کوندان فەقەت وێرانەبەس    بۆیەڕقیان زۆر لەباز کوندان هەس (٩٥٨)

بۆ دەکەی تۆ یادو بیری ئەو دیار    یادی کاخ و یادی قۆڵی شەهریار؟ (٩٥٩)

تۆ لەدێی کوندان فزوولی چا دەکەی    جەنگ و فیتنەو شۆڕش و غەوغا دەکەی (٩٦٠)

ئاسمانیش بووی بەمەسکەنمان حەسەد    تۆ بەڵام لا ت ئەو حەقیرەو پەست و بەد (٩٦١)

تۆ لەکوندان مەکرو فێڵت کرد هەزار    تا بکەن بۆ خۆ ئەوان تۆ شەهریار (٩٦٢)

وەهم و وەسواس دادەنێی نێو وانەتۆ    ئەو بەهەشتەش نێو دەنێی وێرانەتۆ (٩٦٣)

هێن لەسەرتۆنووک دەدەین، ئەی بەد سیفات    تا نەڵەی چیدیکەمەکرو تووڕەهات (٩٦٤)

ئەو دەکەن چوار میخ لەژێر تاو، ڕووت بەدەن    جا بەشەللاقی دڕوو، دار لەو دەدەن (٩٦٥)

جیسمی وی، دەی بێ برین زیاتر لەسەد    ئەو موتیعی حەق دەڵێ تەنها، ئەحەد (٩٦٦)

زۆرکەرەت پێم کوت کەتۆ پنهان کە، دین    ون کەراز تۆ، لەو جهودانەی لەعین (٩٦٧)

عاشقەئێستاکەلای وی مەحشەرە    دەرکی تۆبە، بەستراوەلەو سەرە (٩٦٨)

گەڵ سەبووری وتۆبەجوور نابێ ئەوین    ئەی عەزیزم بێ گومان وایە، یەقین (٩٦٩)

تۆبەکرمە، عیشق هەر وەک ئەژدیها    تۆبەوەسفی خەڵقە، ئەو وەسفی خودا (٩٧٠)

عیشق، وەسفی کردگاری بێ نیاز    عاشقی بۆ غەیری وی بوو، خۆ مەجاز (٩٧١)

غەیری حەق جوانی هەچی بێ ڕووکەشە    زاهیری نوور باتنی دوودی ڕەشە (٩٧٢)

گەر کو نوور بڕوات و پەیدابێ دوخان    سار دەبێ عیشقی مەجازی ئەو زەمان (٩٧٣)

دەچێتەوەلای ئەسڵی خۆی ئەو جوانییە    تەن دەمێنێ گەن، کەسوودی لا نییە (٩٧٤)

دەچێتەوەلای مانگ، نووری مانگی گەش    نوور کەڕۆی دیوار دەمێنێ تارو ڕەش (٩٧٥)

جا دەمێنێ ئاوو قوڕ، بێ ئەو نیگار    پیس دەبێ وەک دێو، بەبێ مانگ ئەو جیدار (٩٧٦)

زێڕی ڕووی مەغشووش وەرگیرێ ئەگەر ... ئــەو تــەریقی کــانی خــۆی دەگرێتەبــەر (٧)

ئەو دەمی مس، ڕوو ڕەش و ڕیسوا دەبێ ... عاشــقی ویــش زێــدەتر لــەو، وا دەبــێ (٨)

کــانی زێــڕ مەعشــووقی بینایــان، بەجــەم ... زیـاد دەبـێ ئـەو عیشـقەبۆ وان، دەمبـەدەم (٩)

چــون نــەزیر بــۆ کــانی زێــڕ پەیدانییــە ... ئافــەرین کــان، هــیچ شــکت تێــدا نییــە (١٠)

هەرچی زێڕی غەششی لا بێ چەشنی کان ... دەچێتــــەوەزێڕ، تــــاکو کــــانی لا مــــەکان (١١)

عاشــق و مەعشــووق دەمــرن دڵ پەشــێو ... وەک لـەگێژاو ئـا و خـەڵاس، ماسیش لـەنێو (١٢)

عیشــقی حــەق ڕۆژی کــەماڵی بــێ میســال ... ڕووح لەبۆ وی نوورو، خەڵکیش وەک زیلال (٨٣)

موســتەفا لــەو باســەچون بــوو شــادمان ... ویسـتی کامیـل کـات مەتڵـەب، ئـەو، بـەیان (٨٤)

چونکەسـیددیق گـوێ گـری بـوو موسـتەفا ... مەتڵەبی خۆی زیاد لەحەد جوان کرد، ئەدا (٨٥)

پێیـدەکوت ئەحمـەد چییـەجا، چـاری وی؟ ... بــوو بــەکر پێیکــوت مــنم کڕیــاری وی (٨٦)

دەیکــڕم هــەر چــەن بــەهای دانایەســەر ... لام زیــــانی زاهیــــری نــــا موعتەبــــەر (٨٧)

لـەو زەمینـە چـون ئەسـیری خوایـە ئـەو ... خەشمی خەسمی خـوای لـەبۆ ئیجرایـە ئـەو (٨٨)

**سفارش ووەسیەتی موستەفا علیەالسلام بەسیددیق (رضـی اللـه عنـه) کەئەگەر تۆ ببیەموشتەری بیلالی قیمەتی وی زیاد دەکەن، تۆ ئەمیش لەو خێرەدا بکەشەریکی خۆت ئەتۆ وەکیلی من بەنیوەی قیمەت لەمن وەر بگرە..**

پێیکوت ئەحمەد ئەی بەدووی لوتفی خودا ... مــن شــەریکی تــۆ دەبــم لــەو کــاڕەدا (٨٩)

تــۆ وەکیلــی مــن بە،گــەر بــووی موشــتەری ... نیوەبــۆ مــن، قیمــەتیش لــێم وەر گــری (٩٠)

پیـدەکوت مـن بـۆت مـوتیعم ئـەو زەمـان ... چوو لەبۆ لای ماڵی ئەو جووی بێ ئەمان (٩١)

ئەو بەخۆی کوت لای مناڵ بێ، زێڕ ئەگەر ... سـەهل و سـادەزوو لـەدەس وی دێتـەدەر (٩٢)

عــەقڵ و ئیمــان لــەو منالانــەی نــەفام ... دێو بەدونیای پەست و دوون دەکڕێ تەمام (٩٣)

جــوان دەدا نیشــان بــەوان مــندار ئــەو ... جـا لـەوان دەکڕێ دوو سـەت گوڵزار ئـەو (٩٤)

وا دەداتــن مانگەشــەو نیشــان بەســیحر ... زوو دەبــاتن پــووڵی نامــەردان بەســیحر (٩٥)

فێــری وانیــان، ئــەنبیا کــرد تــاجری ... بـۆ ئـەوان گرتیانـەدەس خـۆ، ڕەهبـەری؟ (٩٦)

جــا نیشــانی وان دەدا جــادوویی دێــو ... ئــــەنبیایان ناحــــەزو پــــیس و دزێــــو (٩٧)

زۆر دەکاناحــــەز بــــەجادوویی، عــــەدوو ... تـا جـودا بـن لێـک ژن و شـوو زوو بـەزوو (٩٨)

چـاوی وانیـان جـا بـەجادوویی دەبەسـت ... گەوهەری وایان بەکەم، دەرخست لەدەست (٩٩)

چـاکتری دوو عالەمـە، ئـەو گـەو هـەرە ... بکڕەلــەو منــداڵی نــادان، چــون کــەرە (٠٠٠)

فەرقی زێرو مورووەکەر، لای کەر نییە　　فەرقی دەریاو دوڕ لەلای کەر هەر نییە (۱۰۰۱)

ئەو بەدەریاو دووڕِی دەریا مونکیرە　　دوڕرو جوانی ناهەوێ، هەرچی کەرە (۱۰۰۲)

دای نەنا نێو مەغزی حەیوان خوایە قین　　ئارەزووی جوانی و، دوڕو، لەعلی سەمین (۱۰۰۳)

قەت دەگوێی کەردا ئەتۆ دیتت گووار؟　　هۆش و گوێی کەر بوو فەقەت نێو سەوزەزار (۱۰۰۴)

تۆ لە(والتین احسن التقویم ) بزان　　چەن عەزیزەئەی عەزیزی من، گییان (۱۰۰۵)

(احسن التقویم ) لەعەرشیش بوو لەژوور　　(احسن التقویم) لەفیکرو بیر، بەدوور (۱۰۰۶)

گەر بەیان کەم قیمەتی ئەو مورتەفیع　　من دەسووتێم هەم دەسووتێ موستەمیع (۱۰۰۷)

لێو ببەستە، بەسکەلێرە، تۆ وتار　　چوو لەبۆ لای ئەوکەران ئەو یاری غار (۱۰۰۸)

دای لەدەر جا، هاتەدەر ئەو جووی نەیار　　ڕووی دەژوور کرد، بوو بەکر، بێ ئیختیار (۱۰۰۹)

دادەنیشت سەر مەست و تووڕەو پڕ لەنار　　زۆر کەلامی تاڵی جا، دەر چوون لەزار (۱۰۱۰)

بۆ دەدەی ئازار یاری خوای غەفوور؟　　بۆ حەقوودی هێندەتۆ، ئەی زیدەی نوور؟ (۱۰۱۱)

تۆ کەسیدقت بێ، دەدینی خۆت ئەدی　　بۆ لەسەر سادق ئەتۆ وای، موعتەدی؟ (۱۰۱۲)

ئەی دەدینی کفری خۆت تۆ خوێڕیەپیاو　　شاهزادەت چەشنی خۆ دی تۆ بەچاو (۱۰۱۳)

وا مەزانەئەی لەعینی بەدنیهاد　　عالەمی دونیا وەکوو تۆن، بێ موراد (۱۰۱۴)

گەر ئەوەی سیددیق کوتی بیکەم بەیان　　دەست و پێی خۆت گوم دەکەی تۆ بێ گومان (۱۰۱۵)

جا لەدونیای لامەکان و بێ جیهات　　بوون ڕەوان حیکمەت لەزاری، وەک فوڕات (۱۰۱۶)

چەشنی بەردێکی کەئاو لەو بێتەدەر　　نینەمەخزەن، نێوەڕاست و دەو ڕو بەر (۱۰۱۷)

خوای لەبۆ خۆ ی کرد ئەو بەردە، سپەر　　ئاوی ئاو ڕەنگ جا لەوی دێنێتەدەر (۱۰۱۸)

وەک لەچاوی چاوی تۆ ئەی خوای غەفوور　　کردی جاری نووری بێ بوخل و فتوور (۱۰۱۹)

پیوو، پێست مەنشەء، لەبۆ ئەو نوورەنین　　بەڵ ئەوانی کردەپۆشش خوای موبین (۱۰۲۰)

نێو خەلای گوێ، نەو عەبایەک جازیبە　　مودریکی گوفتاری سیدق و کازیبە (۱۰۲۱)

ئەو، چ بایە، وا، لەنێو ئێسقانی چووک　　بەو دەبیسرێ حەرف و دەنگ و سەوتی سووک (۱۰۲۲)

هەر دوو پەردەو پۆششن، ئێسقان و با　　نێو دووعالەم کەس نییەغەیری خودا (۱۰۲۳)

ئەو سەمیع وقائیلە، بێ ئیحتیجاب　　چونکەدوو گوێ جوزئی سەربوون ئەی موساب (۱۰۲۴)

پێیدەکوت ڕەحمت بەوی دا دێ ئەگەر　　زێڕ بدەو ئەو بکڕەلێم، ئەیٚ خۆش نەزەر (۱۰۲۵)

بکڕەلێم ئەوگەر دڵت بۆی بوو بەئێش　　بێ هەزینەناڕوات موشکیل لەپێش (۱۰۲۶)

پێیدەکوت باش، من دەکەم سەت جار سجوود　　بەندەیێکم من هەیە، جوانەو جهوود (۱۰۲۷)

بگـرەلێم تـۆ، تـەن سـپی و، دڵ تـارو ڕەش ‌ ‌ ‌ ویم دەجا تۆ، تەن ڕەش و، دڵ ڕوون و گەش (۲۸

جـا بـەڕێی کـرد بـۆی دەهێنـا ئـەو هومـام ‌ ‌ ‌ زۆر لەحـەد زیـاتر جـووان بـوو ئـەو غـولام (۲۹

هێنـدەجوان بوو،جـوو دەبـوو حـەیران ومـات ‌ ‌ ‌ ئـەو دڵـەی بـەردی لـەجێ،جا دەر دەهـات (۳۰

وایـــەحاڵی ڕوو پەرەســـتی دوور لەشـــەرم ‌ ‌ ‌ زوو دەکـاتن بـەردی وی، وەک مێـو، نـەرم (۳۱

ئـەو چەلـەش ڕازی نـەبوو جـوو، جـا، کـوتی ‌ ‌ ‌ تـــۆ لـــەبۆمن زێدەتر،کـــە، قیمـــەتی (۳۲

یـەک نیسـابی زێـڕی زیـاد کـرد یـاری غـار ‌ ‌ ‌ حیرسی جـوو، ڕازی دەبـوو، ئـەو دەم بـەغار (۳۳

## پێکەنینی جوو بەو خەیاڵە کە دەو موعامەلەدا سیددیق زەرەری کردووە...

جوولەکـــەی دڵ ڕەق بـــەقاقا پێکـــەنی ‌ ‌ ‌ بەس بەخاتر غەلل و غەشش و دوشمەنی (۳۴

پێیـدەکوت سـیددیق کـەبۆ تـۆ پێکـەنی؟ ‌ ‌ ‌ پێکـەنی زیـاتر لـەجواب دا، ئـەو دەنـی (۳۵

پێیدەکوت نـەت بـا ئەگـەر جیـدد و غـەرام ‌ ‌ ‌ بـۆ کڕینـی ئـەو ڕەشـی، ناحـەز غـولام (۳۶

نـەم دەکـرد هێنـدە، هـەراو هوریـا ئـەمن ‌ ‌ ‌ خـۆ بەعوشـری قیمـەتیش دەمـدا ئـەمن (۳۷

قیمـەتی وی چـون لـەلام بێ حـەد نـەچیز ‌ ‌ ‌ قیمـەتت تـۆ بردەسـەر کـردت عـەزیز (۳۸

وای بـەوی سیددیق جـەواب دا ئـەی غـەبی ‌ ‌ ‌ گـەو هـەرێکت دا بـەگوێزێک وەک سـەبی (۳۹

ئەو لەلام بوو هـەردوو عالـەم هاوو سەنگ ‌ ‌ ‌ مـن لـەڕووحی وی دەنـوڕم تـۆ لـەڕەنگ (۴۰

زێـڕی سـوورەڕەش کـرا، تـا ئـەو حـەدە ‌ ‌ ‌ تا نـەبێ مەحسـوودی، ئـەو ئەحمـەق کـەدە (۴۱

چـاوی زاهیربینـی مەحسـوور نێـو تـەنان ‌ ‌ ‌ نـاتوانێ قـەت ببینـێ، ڕووح و گییـان (۴۲

بـۆ فـرۆش گـەر ویسـتبات زیـاتر لـەمن ‌ ‌ ‌ ماڵ و مـوڵکم مـن دەدا پێـت، چـی هـەمن (۴۳

زێـدەتر گـەر ویسـتبات لـێم ئـەی نـەفام ‌ ‌ ‌ من لەخەڵکیم وەر دەگرت، زۆر زێڕ، بەوام (۴۴

چون کڕیت کەم،دات بەکەم ئەوخۆش نیاز ‌ ‌ ‌ نەت دەدی دوڕ، چونکەنەت کرد جەعبەواز (۴۵

تـۆ بەجـەهلت، دات جەعبـە، بەستەسـەر ‌ ‌ ‌ زوو دەبینی،تـۆ کـە چەنـدەت کـرد زەرەر (۴۶

جەعبـەیێکی پـڕ لەلـەعلت، دا بـە بـا ‌ ‌ ‌ وەک قـولی تـۆ، ڕوو ڕەشیت شادیت دەدا (۴۷

عاقیبـەت (واحسـرتا)ت، گوفتارەبـەس ‌ ‌ ‌ قەت فرۆشتی بەختی خۆی،یەک کەس بەکەس؟ (۴۸

نێـو لیباسی بەنـدە، بـەختت کـەو تـەدەس ‌ ‌ ‌ چـاوی تـۆ دی، زاهیـری تـەنهاوو، بـەس (۴۹

بەنـدەگی خـۆی دانیشـانی تـۆ بـیلال ‌ ‌ ‌ بۆیـەکردت تـۆ بەمـەکرو فێـڵ مـەلال (۵۰

بگرەتـۆ ئـەو دڵ ڕەشـی پـیس، نوقرەتـەن ‌ ‌ ‌ بیکەبوت، بۆخۆت و، تۆش بۆی، وەک شەمەن (۵۱

ویم دەتۆ ئەو، وێت دەدەم ئـەمنیش ئـەوە ‌ ‌ ‌ سـوود دەبـەین لـەوکارە، هـەر دوو، پێکـەوە (۵۲

بـوت پەرەسـتان وا، جـەزایان بـوو دیـیـار    زیـن هـەریـن، ئەسپی وانیش چـووب و دار (١٠٥٣)

چەشـنی قـەبری کـافران پـڕ دەردو نـار    زاهیریشـی پـڕ لەنـەقش و پـڕ نیگـار (١٠٥٤)

چەشـنی مـالی زالمـان زاهیـر جـەمال    بـاتنی وی خـویتی مەزلوومـەو، وەبـال (١٠٥٥)

وەک مونـافیق زاهیـری سـەو م و، سـەلات    ئـەو دەبـاتین دا، بـەلام بـوو شـورەکات (١٠٥٦)

چەشنی هەوری خالی هەی بێ، هات و هووت    هیچ کەنیتی ئەو لەخاک دا، سوود و قووت (١٠٥٧)

چەشـنی گوفتـاری درۆو، وەعـدەی بـەفێل    ئـەو دەلـێ جـوان، ئاخیریشـی تـارو لێـل (١٠٥٨)

جـا لەپاشـان گرتـی ئـەو، دەسـتی بـیلال    ئەو بیلالـەی بـوو بەمیحنـەت وەک خـیلال (١٠٥٩)

بـۆ خیلالێـک هاتـەنێو یـەک دانـەزار    توند دەچوو بۆلای کەسێک، شیرین وتار (١٠٦٠)

موستەفای گـەر،دی، بیلالـی زۆر نـەخۆش    کەو تەعەرزی ئەو بەرەو پشت، چوو لەهۆش (١٠٦١)

ما وەیەک ئەو هەر وەها، ما، دوور لەهۆش    گەر وەخۆ هات، ئەشکی شادی هاتەجۆش (١٠٦٢)

موسـتەفاگرتی لـەباوەش خـۆی بـیلال    کێ دەزانێ چی دەهات، جا، بۆی، بیلال؟ (١٠٦٣)

چۆن دەبێ یەک مس کەئیکسیر لەو درێ    یانەیـەک مـوفلیس کەگـەنجێک بـەو درێ (١٠٦٤)

کەوتـەنێو یـەم ماسـی پێکـی نیوەگیـان    هاتـەرێی راس رێگـەون بـووی کـاروان (١٠٦٥)

ئـەو وتانـەی گـەر نـەبی دەیکـوت بـەوی    بۆ شەوی کوتبا، دەرۆی لەو شەو، شەوی (١٠٦٦)

روون دەبوو جا، ئەو شەوەهەر وەک سەباح    نـاتوانم مـن بلـەم ئـەو ئیسـتیلاح (١٠٦٧)

چـاک دەزانـی تـۆ، هـەتاو فەسلی بـەهار    چـی هەیـە، بـۆ گیـاوو میـوەی کـال، وتـار (١٠٦٨)

چـاک دەزانـی تـۆ کەئـەو ئـاوی زولال    چـی دەلێـتن بـۆ گـولان و، بـۆ نیهـال (١٠٦٩)

کاری حەق بۆ یەک بەیەک ئەجزای جیهان    وەک فسـوون و،وەک دەمـی جادووگـەران (١٠٧٠)

جازیبـەی یـەزدان دەلـێ گوفتـار هـەزار    بـەس بەئاسار و سـەبەب، جـا، نـەک بـەزار (١٠٧١)

نینەتەئسـیرات لەتەقـدیرات، بـەدەر    دەرکـی ئـەو تەئسـیرەناکا، قـەت بەشـەر (١٠٧٢)

گـەر عـەقل تەئسـیر دەئەسـلان دادەکـا    بـۆ فـرووعیش بـێ گومـان هـەر وادەکـا (١٠٧٣)

گەرعـەقل زیـاتر لـەخۆی کـا پرسـییار    پێـی بلـێ تـۆ زوو ببەسـتەلێوو، زار (١٠٧٤)

**گلایەکردنی موستەفا علیەالسلام، لەسیددیق (رضی الله عنه) کەئەمن بەتۆم سفاریش کرد بەشەراکەتی من بی کرەتۆ لەبۆ چی هەر لەبۆ خۆت کری؟ و مەعزەرەتی وی ..**

دەیکوت ئەی سیددیق مەگەر نەمکوت بەتۆ؟    بمکـەبۆ خێـر تـۆ شـەریکی کـاری خـۆ (١٠٧٥)

پێیـدەکوت هـەردوو، غـولامی تـۆین، ئەمـە    خـۆ لەبـەر تـۆم مـن دەکـرد ئـازاد، ئەمـە (١٠٧٦)

تـۆ قـەبوول کـە، مـن بەبەنـدەو یـاری غـار    نامهـەوێ ئـازاد بـبم مـن، قـەت چ جـار (١٠٧٧)

بەنـــدەگی بۆتـــۆ، لـــەبۆم ئازادییـــە زینـــدەگیم بـــێ تـــۆ، نـــەمانی شـــادییە ٧٨)
دات بـەدونیا بـەو گوزینـەت، تـۆ ژیـان کرتەخاس عام، بیلخسووس من، ئەی گیان ٧٩)
مـن دەخـەو، دەمـدیت کـاتێ بـووم جـەوان بـۆ سـەلامم هـات هـەتاوی ئاسـمان ٨٠)
بردمـی لـەو خاکـەبۆ سـەر ئاسـمان ئـەو دەمـی مـن بـووم لـەبۆ وی هـاو شـان ٨١)
مـن کـوتم بیمارییـە، وام و محـاڵ کوا دەبێتن موستەحیل قەت وەسفی حاڵ؟ ٨٢)
خۆم دەدی ئەو دەم کەتۆم دی ئەی عەزیز تـا فـەرین نـەینووکی بـێ گـەردو تـەمیز ٨٣)
مـن کـەتۆم دی، بـوو محـاڵی مـن، بـەحاڵ گیـانی مـن بـوو غـەرقی ئیجلال و کـەماڵ ٨٤)
مـن کـەتۆم دی، ئـەی لـەبۆ دونیـا گیـان عیشقی ئەو ڕۆژەم لەبەر چاو بوو، نیهان ٨٥)
بـوون لـەتۆ دوو چـاوی مـن، والا هیمـەم زۆر لـەلایان چیمـەن و گـوڵزار کـەم ٨٦)
دەمهەویست نوور،دیم لەناکاو نووری نوور دەمهەویست حوور،دیم ئەمن مەحسوودی حوور ٨٧)
دەمهەویست یـەک یووسوفی جوان، نوقرەتـەن دیـم دەتـۆ دا، بـێ ژمـار یووسـوف کەهـەن ٨٨)
بـۆ بەهەشـتم زۆر دەکـرد مـن جسـتوجۆ دیم بەهەشت نێو، یـەک بەیەک ئەعزایی تۆ ٨٩)
ئـەو، وتـە، نیسـبەت بـەمن، مەدحـەو سـەنا ئـەو، وتـە، نیسـبەت بـەتۆ عەیبـەو هیجـا ٩٠)
چەشنی مـەدحی شوانی زۆر سادەو سەلیم بـۆ خـودا لای حـەزرەتی مووسـای کـەلیم ٩١)
شیر دەدەم پێت جوستو جۆی ئەسپێت دەکەم کاڵەکەت دەدرووم،موهـەییا ی پێت دەکـەم ٩٢)
مـەدحی خۆی گرت، ناحەزی ئەو شوانە،ڕەب تـۆش کـەڕەحمت بێت،نـابێ هیچ عەجـەب ٩٣)
میهرەبـان بـە، بـۆ قسووری دەرک و فـەهم ئـەی وەڕایـی گشت عقوول و گشت وەهـم ٩٤)
هـات ئیقباڵێـک جەدیـد، ئـەی عاشـقان لـەو جیهـانی کۆنی نـوێ کـەر، گشت ئـان ٩٥)
لـــەو جیهـــانی چارەســـازی دەردەدار نـادیرەی دونیـا دەوی دان، سـەت هـەزار ٩٦)
موژدەئەی قەوم، چونکەوەختی هات فەرەج شـاد بـبن ئـەی قـەوم، چـون لاچوو،حـەرەج ٩٧)
یـەک هـەتاو ڕووی کردەنێو کولبـەی هیلال تـا بلـێ ڕاحـەت کەئێمـە، ئـەی بـیلال ٩٨)
تـۆ لەترسـان ژێـری لێـو، دەت کـوت وتـار ئێستەبێژەســــــــەرمنارە، ئاشــــــــکار ٩٩)
وا دەگـوێی غـەمگین دەکـا هـاوار، بەشـیر بگرەبـەختت ئـەی لـەحاس، بـەختت فـەقیر ٠٠)
تــۆ لــەنێو ئــەو بەنـدو گەنـدو پیسـەدا تـا نـەزانی کـەس، نـەجات بـووی، بێ سـەدا ٠١)
چۆن دەبی ئێستا خـەمووش ئـەی یاری مـن یـەک بەیەک مووت یـەک نەفەر تەپیاڵ،لەبن ٠٢)
دوژمنـی حاسـید وەهـا کـەڕ بـوو لـەگوێ گـاز دەکا ئـەو دەنگی تـەپڵان دێ لـەکوێ؟ ٠٣)
زۆر گـوڵی جـوانی لـەڕوو دەخشـێن ئـەو کـوێرە، بێژێـت مووزییـانم کـێن؟ ئـەو ٠٤)

حوور کەئەو بگرێ بەدوو قامکی لەتیف — کوێر دەڵێ بۆ من دەدا ئازار کەسیف؟ (١١٠٥)

چن ئەوان ئازاری دەست و لاق و سەر؟ — لیم گەرێ با من بنووم، بێ دەردەسەر (١١٠٦)

تۆ ئەوەی دەت ویست دەخەو دا، خۆ ئەوە — چاو کەتۆ لەو مانگە، ڕاستە، نەک خەوە (١١٠٧)

دمردو ڕەنجیان بۆیەزۆر هەن دۆست و یار — تاکو بازی زێدەتر کا، کردگار (١١٠٨)

ئەو دەکا دائیم دەگەڵ پاکان قومار — ئەو دەکا کوێریش، بەئێشی چاو دوچار (١١٠٩)

خۆی بەکوێرانیش دەدا، جار جار نیشان — تا بڵێند بێتن لەکۆی کوێران، فیغان (١١١٠)

**داستانی هیلال کەبەندەیەکی موخلیسی خودا بوو، بینا دڵ، بێ تەقلید، بەندەیی بۆ مەخلووقات دەکرد بەخا تری مەسڵەحەتی، نەک لەبەر عەجزو ناتەوانی، وەک لوقمان و یووسوف لەڕووی زاهیر.. بەندەیەک بوولەماڵی ئەمیرێک مەیتەربوو،وئەو ئەمیرەموسەڵمان بوو،بەڵام کوێر بوو.. کوێر لەبوونی دایکی خۆی هەیتی خەبەر — چۆنیەتی وی کرد لەزیهنی خۆی بەدەر .. ئەگەر بەو بیرو ڕایە، تەعزیمی دایکی بکا، مومکینەکەلەکوێری نەجاتی بێ، کە(اذااراداللە بعبد خیرا فتح عینی قلبە لیبصرە بهما الغیب) یانی هەرکات خوداوەند بۆ عەبدێکی خۆی خێرو چاکەی بوێ دووچاوی دڵی وی واز دەکا، تا بەو چاوانەغەیب نیشانی وی بدا ..**

**خولاسەی داستان ..**

هیلال یەکێک لەیارانی پێغەمبەر (ص) لەماڵی ئەربابێک مەشغووڵی مەیتەری و خزمەت بەماڵات بوو بەڵام ئەو ئەربابەلەحەقیقەتی مەزووع بێ خەبەر بوو، تاکو ڕۆژێک هیلال نەخۆش بوو، ونۆ ڕۆژ دەتەویلەدا نەخۆش کەوت، وهیچ کەس لەو حاڵەخەبەردار نەبوو، وحەتتا ئەربابیش نەیدەزانی کەئەو نەخۆش بووە، تا ئەو کاتەکەپێغەمبەر لەڕێگای وەحی ئاگادار بوو، وبۆ عەیادەتی وی چۆ ماڵی ئەو ئەربابە، وهەر دەگەڵکو ئەرباب زانی کەپێغەمبەر دێتەماڵی وی، بێ نیهایەت خۆشحاڵ بوو و بەپێشوازی پێغەمبەر(ص) چوو، بەڵام پێغەمبەر بەلەحنی عیتاب و مەلامەت پێیکوت ئەمن نەهاتوومە بۆ دیدەنی تۆ، دەمهەوێ هیلالی ببینم، وحاڵی بپرسم، ئەرباب کوتی ئەمن لەوی بێ خەبەرم، چونکەمەسکەنی وی تەویلەیە، پێغەمبەر زۆر بەئیشتیاق چۆ تەویلە، وبەبۆنی خۆشی پێغەمبەر(ص) هیلال گیانی تازەی هاتەبەر، خۆی هاویشتەسەر پێی ڕەسوولی خودا، پێغەمبەر(ص) ئەوی ماچ باران کرد..

تـۆ کەبیسـتت قیسـمەتێک وەسـفی بـیلال
گـوێ دەئێسـتا باسـی ڕەنجـووریٚ هـیلا
بـۆ سلووک ئـەو پـێش بیلالی گـرت قـەرار
خووی بەدیشی زیاد لـەوی کـرد تارو ما
نـەک وەکـوو تـۆ دەمبـەدەم بـۆ دوا، دەڕۆی
زێـر بـەجێ دێڵـی بـەدووی بـەر،جا،دەڕۆی
چەشـنی ئـەو خواجـەی کـەزەیفی هاتـەماڵ
لێی سـوئاڵ کـرد خواجـەڕۆژو عـومرو ساڵ
پێیـدەکوت چـەن سـاڵەعومرت ئـەی فـڵان
ڕاس بڵـێ، بـێ کـەم، بکـەتۆ، بـۆم بـەیاز
پێیـــدەکوت ئـــەو، هەژدەحەفـــدە، شـــازدە
ئـــەی بـــرادەر یانەکـــەمتر، یـــازدە
خواجـــەپێیکوت دێیەدوایـــە، ئـــەی فـــڵان
تا دەبێ جێت وەک هـەوەڵ، فەرجی مـەمان

## حیکایەت لەبارەی تەوزیحی ئەو مەتڵەبە..

یـەک نەفـەر ئەسـپی لـەمیر داوا دەکـرد
میـر ئەسـپی ئەشـهەبی ئیعتـا دەکـرد
پێیـدەکوت مـن نامهـەوێ دەیکـوت لـەبۆ؟
پێیـــدەوت تـــۆڕەو دەچـــی بـــۆ پاشـــەخۆ
بۆ عەقەب دەڕوا سەریع وەک بای شەماڵ
پێیـــدەکوت تـــۆ کلکـــی بێخـــەلایی مـــاڵ
مەیل و شەهوەت کلکی ئەسپی نەفسی تۆ
بۆیـــەدێ بـــۆ دوایـــە، ئـــەو ڕازی لـــەخۆ
شـەهوەتی نەفسـی کەسـەرجەم کلکـی وی
ئـەی موبـەددیل بیکـەمـەیلی ئـوخرەوی
تـۆ کـەببڕی شـەهوەتی نەفسـت لـەنان
شـەهوەتی نەفسـت دەبێ عـەقڵێک جـووان
چەشـنی دارێـک تـۆ کـەببڕی لـک لـەوی
ئـەو لکـی ئەسـڵی دەبـێ زیـاتر قـەوی
تـۆ کـەکردت کلکی وی لای ئـەو تـەڕەف
ئـەو بەپشـتاو پشـت دەچێـتن تـا هـەدەف
خـۆش بـەحاڵ، ئەسـپانی ڕامـی پـێش ڕەو
نین عەقەب ڕەو، بۆ چەمووشیش نین گرەو
توند دەڕۆن جا وەک تـەنی مووسای کەلیم
ڕێـی گـەلێک دووریـان لـەلا، عـەرزی گلیم
تـوولی حـەوسـەت ساڵە بـوو ئـەو ڕێیـە گـەر
حـــەزرەتی مووســـا، بـــەحوببی گرتـــە بـــەر
هێنـــدە دوور بـــڕوا ئەگـــەر جوســـمانی وی
تـــاکو عیللیـــین دەچێـــتن گیـــانی وی
زۆر سەریع بۆلای هـەدەف چوو، شۆڕە سوار
زگ پەرەست نێو پایەگا ما، پەست و، خوار

## مەسەل ..

چوولـەبۆ یـەک دێ چـەلێک یـەک کـاروان
تاوەڵایـــان دیـــت یـــەک دەرگـــا ئـــەوان
یـەک کـوتی زۆر سـاردە، جـا لـەو حاڵـەدا
بـــاموقیم بـــین ماوەیـــەک لـــەو ماڵـــەدا
هـات سـەدا، دانـێ لـەپێش دا، بـار ئـەتۆ
وات کـــەکرد بـــۆزوور وەرەئـــەو جارئـــەتۆ
تـــۆ کـــەهاتی بـــۆ مـــەکانی وا ســـەنی
لات نـەبێ تـۆ، زۆر و کـەم بـاری دەنـی

بوو هیلال ساحەب دڵ و ڕەو شەن زەمیر مەیتەرو بەندەی موسەڵمانێک ئەمیر (١١٣٥)
مەیتەری ماڵی ئەمیربوو ئەو غولام گەرچی شابوو بۆ هەموو شایان تەمام (١١٣٦)
جا لەحاڵی بەندە، میر، بوو بێ خەبەر چونکەهەیبوو ئەو وەکوو شەیتان نەزەر (١١٣٧)
ئەو قوڕو ئاوی دەوی دا، دی، نەگەنج ئەو لەوی دی،پەنج و شەش نەک ئەسڵی پەنج (١١٣٨)
ڕەنگی قوڕ ئاشکارو نووری دین نیهان ئەنبیا وا بوون هەموویان نێو جیهان (١١٣٩)
دی منارەنەیدەدی مەل، یەک نەفەر ڕەنگەبازی شارەزای بێتن لەسەر (١١٤٠)
دووەمی دەیدی پەڕەندەی سەر منار نەیدەدی مووی نێو دەنووکی وی، چ جار (١١٤١)
ئەو کەسەی نازر، بەنووری خوایەئەو هەم لەتەیرو هەم لەموو، ئاگایەئەو (١١٤٢)
پێیدەکوت ئاخر بنۆڕەچاک لەموو تا نەبینی موو،گرێت بۆ واز نەبوو (١١٤٣)
یەک دەبینێ ئادەمی نەقشینەقووڕ یەک دەبینێ ئەو لەعیلم و کارەپوڕ (١١٤٤)
عیلم و تاعەت بوون دووتەیرو، تەن مەنار جا، دوو تەیران تۆ دەبینی، یا هەزار (١١٤٥)
شەخسی عادی بەس پەڕەندەی دی نەغەیر پاش و پێشی هیچ نەدی ئەو غەیری تەیر (١١٤٦)
موو هەمان نووری نیهانەو نادیار ڕووحی تەیریش بەو دەبێ،جا پایەدار (١١٤٧)
تەیرەکی موو، بێ لەنێو مینقاری وی بێ تەسەننوع ڕاستەخۆ گشت کاری وی (١١٤٨)
دانیشی وی، دێ لەگیانی وی مودام لای نەبوو ئەو عاریە،نەیگرت بەوام (١١٤٩)

**نەخۆش بوونی هیلال و بێ خەبەربوونی ئەربابی وی لەنەخۆش بوونی وی لەبەر بەکەم زانین و ئەهەممییەت نەدان بەوی و ئاگادار بوونی موستەفا علیه‌السلام لەنەخۆش بوون و حاڵی وی و چوونی ڕەسوول علیه‌السلام بۆ عەیادەتی هیلال ..**

ئەزقەزا بۆی هات هیلال دەرد و مەلال موستەفای ئاگا دەکرد لەو، زولجەلال (١١٥٠)
بێ خەبەر بوو خواجەلەو دەردو بەڵا چون لەلای وی نەیبوو، هیچ قەدرو بەها (١١٥١)
نێو تەویلە نوستبوو نۆ ڕۆژ تەمام کەس نەبوو ئاگا لەحاڵی ئەو غولام (١١٥٢)
ئەو کەسەی کەکەس بوو، هەم پاشای کەسان عەقڵی وەک دەریای ئێحاطەی کردجێهان (١١٥٣)
وەحیی بۆ هات، ڕەحمی خوای ئەو یار بوو کە، فڵان خواهانی تۆ بیمار بوو (١١٥٤)
موستەفا جا، بۆ هیلالی باشەڕەف بۆ عەیادەت ڕووی دەکردەئەو تەڕەف (١١٥٥)
ڕۆی بەدووی ئەو ڕۆژی وەحیەمانگ بەغار وەکستێران بوونلەدووی وی دۆست و یار (١١٥٦)
مانگ دەڵێ یارانی من گشتیان نجووم موقتەدای شەو ڕەو، لەبۆ تاغیش ڕجووم (١١٥٧)
جا بەمیریان کوت کەتۆ، شات گەیەماڵ میر لەجێی خۆی ڕاپەڕی زۆر خۆشحاڵ (١١٥٨)

میر کەپێی وابوو لەبەر وی هات شا     زۆر بەشادی هەردوو دەستی لێک دەدا (

گەر لەباڵاخانەهاتەخوار ئەمیر     دەیهەویست گیان دا بەمزگێنی بەشیر (

جا سەلامی کرد و ماچی کرد عەرد     ڕووی‌لەشادی چەشنی‌گوڵ نەی ما، چ دەرد (

پێیدەکوت فەرموو کەپێت،زۆرخێرەبۆم     تۆ بەهەشتی جاویدان کە، ئێرەبۆم (

تا لەلای کاخم نەوی بێ ئاسمان     چونکەدیتم قوتبی دەورانی زەمان (١

پێیدەکوت بۆ لۆمە،ئەو عالیمەقام     دیتنی تۆ،خۆ نەبوو، بۆ من مەرام (

پێیدەکوت ڕووحم فیدات بێ ئەی ڕەسوڵ     ئەو عەزابەت تۆ لەبۆ کێ کرد قەبووڵ؟ (١

تا ببم من خاکی بەر پێی ئەو کەسە     باغی لوتف و ڕەحمەتی تۆی،مەغرەسە (٦

جا ڕەسوول پێیکوت هیلال بۆ دیار نییە؟     بۆ تەوازوع وەک ئەوی، دەبیار نییە (٧

شایە، بەرگی بەندەگی بۆ خۆی بڕی     هاتەدونیا ئەو بەخاتر سیخوڕی (٨

لەو بەعەبدی و مەیتەری، مەنوارە پەست     بەس لەنێو وێرانەدا، گەنج دێتەدەست (٩

ئەو هیلالەی مانگ لەحاس وی، سەر نەوی     چۆنەئێستا، حاڵ و وەزع و سوقمی وی؟ (٠

پێیدەکوت من هیچ لەویم ئاگا، نییە     ما وەیێکە، ئەو لەبەر دەرگا، نییە (١

گەڵ کەرو ماڵاتەبەس سەودایی وی     ئەو تەویلەش مەسکەن و مەئوایی وی (٢

**هاتنی موستەفا علیەالسلام بۆ عەیادەتی هیلال، بۆ نێو تەویلەی ماڵاتی ئەو ئەمیرەو تەسەللی و دڵجوویی موستەفا علیەالسلام، بەهیلال (رضی الله عنه) ..**

چۆ تەویلەئەو ڕەسوولی کردگار     تا پەیا کا ئەو هیلالی دەردەدار (٣

بوو، تەویلەناحەزو، زۆر پیس و تار     حوب دەکا ئەو هانە، تێکڕا، تارو مار (٤

بۆ هیلال هات بۆنی پاکی ئەحمەدی     وەک لەبۆ باب، بۆنی یووسوف، هاتەدی (٥

موجیبی ئیمان نین خۆ موعجیزات     بۆنی جینسییەت دەکا جەزبی سیفات (٦

موعجیزات بۆ تێک شکانی دوژمنە     بۆنی جینسییەت لەبۆ دڵ بردنە (٧

دۆست کە، نا، دوژمن دەبێتن تارو مار     بەستەئەستۆ، چۆن دەبێتەدۆست و یار؟ (٨

ئەو بەبۆنی ئەحمەدی هەستا لەخەو     لای عەجیب بوو، بۆنی وا، لەو پەینەئەو (٩

دی لەنێوان لاقی ماڵاتی فەقیر     دامەنی پاکی ڕەسوولی بێ نەزیر (٠

جا لەگۆشێک ڕا، خزی ئەو قارەمان     ڕووی دەخستەسەر دووپێی شای دوو جیهان (١

جا، پەیامبەر ڕووی لەسەر ڕووی، دا دەنا     ڕوو و، سەرو، چاوی، لەماچ کردیان، شنا (٢

پێیدەکوت تۆ گەو هەری جوانی نیهان     چۆنەحاڵت ئەی غەریبی عەرشییان؟ (٣

وای جەواب دا چۆنەئەو کەس بچتەخەو     تا گەهان ڕۆژ بێ لەبۆ نێو زاری، ئەو (١١٨٤)
چۆنەئەو تینوەی کەقوڕ دەخوا لەتاو؟     بێتەدەستی وی لەناکاو زێدەئاو (١١٨٥)

**لەبارەی ئەو مەتڵەبەکەموستەفا علیەالسلام بیستی کەعیسا علیەالسلام، بەسەر ئاو دا دەڕۆیشت فەرمووی ( لو ازداد یقینەلمشی علی الهواء) ئەگەر یەقینی وی زیاتر با، بەحەوا دا دەڕۆیشت ..**

چەشنی عیسا ڕۆی لەسەر ئاوی فوڕات     تۆ کەقوم نابی لەنێو ئاوی حەیات (١١٨٦)
دەیکوت ئەحمەد، زێدەبای، ئیقان ئەگەر     بۆی دەبوو مەرکەب،حەوابێ هیچ خەتەر (١١٨٧)
هەروەکوو من لەو حەوایە، بووم سووار     ئەو شەوەی کردم عورووج لای کردگار (١١٨٨)
ئەو کوتی سەی پیس و کوێر چۆنە؟کەئەو     خۆی بەشێر دی ئەو دەمەی هەستا لەخەو (١١٨٩)
نەک وەهاشێرێک کەکەس لەو دا بەتیر     بەل لەترسی وی بکا، لەت، تیرو شیر (١١٩٠)
چۆنەکوێر بڕوا لەسەر زەگ چەشنی مار     چاو هەڵێنێ ئەو لەنێو باغ و بەهار؟ (١١٩١)
چۆنەئەو چۆنەی لەچۆنی دەر کەوت     ژینی بێ چۆنی لەپاشان، بەر کەوت (١١٩٢)
ئەو دەبەخشێ چۆنیەتی نێو لا مەکان     چۆنیەتی، سەر سفرەکەی وین، وەک سەگان (١١٩٣)
ئەو لەبێ چۆنی، دەدا ئێستقان بەوان     با، جنوب، نەخوێنێ سوورەی وا، چ ئان (١١٩٤)
تا لەبێ چۆنی نەکەی غوسڵێک تەمام     دەس مەدە، لەو موسحەفە، تۆ ئەی غولام (١١٩٥)
گەر پەلید بم یا نەزیف بم، ئەی شەهان     لەو جیهانەبەس ئەوەم ویردی زەبان (١١٩٦)
وەک بڵێ وا، چاکەبۆ تۆ، یەک نەفەر     تۆ مەڕۆ نێو حەوزی ئاو، پاک نی، ئەگەر (١١٩٧)
خاریجی حەو زان غەیری خاک نییە     هەرچی نەچتەنێو حەوز، خۆ پاک نییە (١١٩٨)
گەر نەیان بێ گشت ئاوی پاک، کەرەم     لانەبەن خوبس و پەلیدی دەمبەدەم (١١٩٩)
وای بەحاڵ موشتاق و هەم ئوممیدی وی     سەت ئەسەف بۆ حەسرەتی جاویدی وی (١٢٠٠)
ئاو گەلێک هەیتی کەرەم هەم ئیحتیشام     چون پەلیدان پاک دەکاتن، وەسسەلام (١٢٠١)
ئەی زیائەلحەق حیسامەددین کەنوور     تۆ دەکا مەحفووز لەدەس( شەڕڕوتتیوور) (١٢٠٢)
ئیرتیقاو نووری خودا بۆت پاسەوان     ئەی ئەتۆ لای چەکچەکی ڕۆژی نیهان (١٢٠٣)
پەردەبۆ ڕۆژ ئێستەبێژەتۆ چییە؟     غەیری شۆقی زۆرو تیشکی ڕۆژ نییە (١٢٠٤)
پەردەبۆ ڕۆژیش، خۆ نووری ڕەبە     بێ نەسیب لەو، هەم خوفاشە، هەم شەبە (١٢٠٥)
چون دەپەردەهەم لەدوورمان ئەو دووان     یانەڕوو ڕەش یا نەخێر، ئەفسوردە، مان (١٢٠٦)
تۆ کەنووسیت قیسمەتێک باسی هیلال     باسی مانگی چاردەبینەنێو مەقال (١٢٠٧)

ئــەو هــیلاڵ و بــەدرە، بوویــان ئیتتیحــاد دوور لەدوویین، هەم لەنەقس و هەم فەساد

نەقسی بـاتین لـەو هـیلال بـوو زۆر بـەدوور نەقســی زاهیــر کەمکەمــە، دەبیاتــەژوور

شـەو بەشـەو تـەدریس دەکـا تـەدریج ئـەو پێــت دەڵــێ ســەبرت دەدا، تــەفریج ئــەو

جــا دەڵــێ ئــارام ئــەی عــەجوولی خــام پللەپللـــەدێ لـــەدەس تـــۆ بچیـــەبام

دیـگ بەســەبرو حـەو ســەلەتۆ بێنــەجۆش قەڵیەگــەر زۆر تونـد کـوڵی، نایێـت خـۆش

حـەق مەگـەرقادر نـەبوو چـا کـا، فەلـەک؟ بەس بەیەک لەحزە،بە( کن ) بێ هیچ شەک

بـۆ ئـەدی کێشـای شـەش ڕۆژی ڕەبـەق ( کـل یـوم الـف عـام ) لای خـوای فەلـەق

خیلقـەتی منــداڵ لــە نێــو نــۆمانگــە دا چونکـە تـەدریج زۆر پەسـەندە لای خـودا

خیلقـەتی ئـادەم لـەبۆ، بـوو چـل سـەحەر؟ لەو قوڕەی زیاد کرد کەم کەم خوای لەسەر

نەک وەکوو تۆی خام دەڕۆی ئێستا، بەغار خـۆت بـەپیر دی، تۆکـەتیفلی بـێ عـەیار

وەک کەدووت غار داوو،خۆت لای سەر،دەدی قـودرەتی جـەنگ و جیهـادت، کـوا ئـەدی؟

موتتـەکات بوون، ئەی کەچەڵ، دیوارو دار وەک کـەدوو گرتت لـەلای سـەر، تۆ قـەرار

مەرکــەبت ئــەووەڵ کەســەروە، پاجــەماڵ عاقیبــەت وشـکی لەمــەغزی تــۆ، بــەتاڵ

ڕەنگی سەو زت زەرد بوو زوو ئەی کەدوو عــارزی بــوو، چونکەئــەو ئەســڵی نــەبوو

**داستانی ئەو پیرەژنەی کەسووڕەتی پڕ چین و چرووک و گنجاوی خۆی ئـاڕایش دەدا، بەڵام بۆی دروست نەدەبوو..**

**خولاسەی داستان ..**

پیرەژنێکی نـەوەت ساڵەبەسـووڕەتی زەرد و پـڕ چـین و چـرووک و گنجاوی و قامـەتی کـووڕو خەمیدەوزاری بێ ددان ئارەزووی مێرکردنی کەوتەسەر.ڕۆژێک لەماڵی یەکێک لەجیرانەکانی وی جەشـنێک بـەرپـا بـوو ئەزقـەزا ئەویشـیان بـۆ ئـەو مەجلیسـەدەعوەت کـرد، پیـرەژن بـۆ ئەوەکەسووڕەتی خۆی ساف و جوان بکا، وەسائیلی ئاڕایشی دانا،وئاوێنەیەکیشی لەڕوو بەڕووی خۆی دانا، و بەموو کێش مووی ژێر برۆی خۆی هـەڵگرت، و بەبـەنی مەخسووسی هەنیەکردن مووی زائیدی سووڕەتی خۆی لا برد،لەپاشان سووراوو، سپیاوو مەوادی دیکەی ئاڕایشی دەدەم و، چاوی خۆی هەڵسوو،بەڵام چون سووڕەتی وی زۆر پڕ چین و چرووک و گنجاوی و تێک شکاو بووئەو کارانەهیچ فایدەیان نەبوو، جا بـەناچار چوو، بۆ لای قوڕئانی شـەریف، وبەمقەست زەڕکوویی ئەو قوڕئانـەی بڕی، ولەسـوو ڕەتی خۆی دا و بەمـەوادی ئاڕایشی دای پۆشی وزۆر

خۆشحاڵ خۆی دەئاوێتەدا دی، وکاتێک کە ویستی چارشێو بەسەر دا دا، زەڕ کووبەکان لەسوورەتی وی جودا بوونەوە، و کەوتنەعەرزی، پیرەژن خواربۆ وەو هەلیگرتنەوە، وبەتف لەسوورەتی خۆی دان، بەڵام ئەو چەلەش لێ بوونەوە، وکەوتنەخوار، چون ئەو کارەچەند جار تیکرار بۆ وە، پیرەژن زۆر تووڕەوعەسەبانی بوو ولەژێر لێو دەیکوت لەعنەت لەشەیتان،لەعنەت لەشەیتان،لەو کاتەدا شەیتان لەموقابیل وی زاهیر بوو، و بە لۆمە و سەرزەنیش پێیکوت، ئەی پیرەژنی فێڵەباز بێ دەلیل ئەمن لەعن و نفرین دەکەی، چونکەخۆت بەتەنهایی لەسەت شەیتانی وەکوو من شەیتان تری، دەستی سەت شەیتانی وەکوو من لەپشت ڕا دەبەستی، و بەڕاستی ئەو فێڵانەتا ئێستا بەفکری من نەگەیشتوونە، وهیچ کەسیشم غەیری تۆ نەدیوەکەفێڵی وا بزانی، تۆ بەفێڵ و تەڵەکەت ڕیشەی کتێبی ئاسمانیت بڕی ..

یەک ژنی پیری نەوەت ساڵ، ناتەوان — پڕ لەگنج بوو ڕووی و، ڕەنگیش زەعفەران (١٢٢٢)

گنجی زۆر و تۆی تۆیی بوو، ئەو لەڕوو — ئەو بەڵام هێستا کە، مابووی عیشقی شوو (١٢٢٣)

بێ ددان بوو مووی بەچەشنی شیر بوو — قەد کەمان، چی حیس هەبووی، تەغییر بوو (١٢٢٤)

عیشقی شووی بوو شەهوەتو حیرسیش تەواو — لێی پسا بوو داو و،هەیبوو، عیشقی ڕاو (١٢٢٥)

تەیری بێ کات یانەڕێی بێ ڕێبووار — مەنجەڵی خاڵی لەژێر وی بێت نار (١٢٢٦)

عاشقی مەیدانەئەسپ و، پای نییە — عاشقی زەمرەلەب و، زوڕنای نییە (١٢٢٧)

پیر کەجووش بێ خوا نەکا هەی بێ تەماع — وای بەحاڵ ئەو کەس تەماعی بێ، مەتاع (١٢٢٨)

ئەو دەمەی سەگ بێ ددان ماو، پیر بوو — دوور لەئینسان ماوە سەرگین گیر بوو (١٢٢٩)

بێنەبەر چاو ئەو سەگانەی شەست ساڵ — تیژ دەکەن دانیم ددان بۆ حیرسی ماڵ (١٢٣٠)

سەگ کەپیر بوو هەرچی تووکی بووی وەری — ئەو سەگی پیر، چاو لیباسی جوان، بەری (١٢٣١)

عیشق وحیرسی فەرج و زێڕی ئەو کەسە — لەحزەلەحزەزیاد دەبێ وەک نەسڵی سە (١٢٣٢)

عومری بەو جووڕەکەجێگای دوو زەخە — بۆ قەسابانی غەزەب، ئەو مەسلەخە (١٢٣٣)

گەر بڵێن یاخوا ببێ عومرت زیاد — پێکەنین دەس پێدەکا، دڵخۆش و شاد (١٢٣٤)

لای دوعایەئەو حەریس نفرینی وا — هەر لەخەو دا،چاو کەناکا، ئاوەڵا (١٢٣٥)

گەر مەعادی زەڕەیەک دیبایەئەو — پێیدەکوت ئەو عومرەبۆ تۆ، بایە، ئەو (١٢٣٦)

**داستانی ئەو دەروێشەی کەلەبۆ ئەوگیلانیەی دوعا دەکرد کەخودا ئەوی بە سەلامەت بگەێنێتەوەماڵ و حاڵی خۆی ..**

هاتــەلای گیلانییــەک شەخســێک گــەدا — لێی دەویست تاکو کەمێک بەو، نان بدا (۳۷)

گەر وەری گرت نان، کوتی ئەی خوای غەنی — بیبــەوە ســالم ئــەوی بــۆ مەوتــەنی (۳۸)

پێیدەکوت ئەو هەی کەدیم گەر بێ وەتەن — خۆزگــەتۆ بــۆ وێ ببا خــوای( زو لمینــەن) (۳۹)

گفتــی خــۆی وێــژەر گــەلێک دێنێتــەخوار — گەر نەکا گوێ گر، دروست فەهمی وتار (۲۴۰)

چــون دەبــێ گوفتــار بەقــەد ئیدراکی نــاس — چــونبەقەدئینسـان، خـەیاتدەبڕێ، لیبـاس (۲۴۱)

**سیفەتی ئەو پیرەژنە..**

چون دەمەجلیس دانە،کەم فام زۆرنەکەم — نـاعیلاجم گفتــی پەســت ئیجــرا دەکــەم (۲۴۲)

زووبلەباســی غــەیری مەتڵــەب بێنــەواز — زووکەباســی ئــەو عــەجووزەی، شــوو خــوواز (۲۴۳)

پیاو کەپیربێ و، نەگری ڕێی خوای بێ هەواڵ — لــەو بنــێ نێــو تــۆ عــەجووزی کۆنەسـاڵ (۲۴۴)

هــیچ کــەنیتی ســەروەت و ســەرمایەئەو — دوور لەمایــــەی بــــاتنی و مەعنایەئــــەو (۱۲۴۵)

کــەس لــەناکاو شــاد و، شــادی لا نییــە — مەعنەوییــەت زەڕڕەیــەک دەو دا نییــە (۱۲۴۶)

بــێ زەبــان و گوێیەهــەم بــێ عــەقڵ و چــاو — بــێ فکــر، بــێ هــۆش، نــەبێ هۆشــی تــەواو (۱۲۴۷)

بــێ جەماڵــە، بــەو کــەناز کــا بــێ نییــاز — تــوێ تــوێی وی بــۆ گــەنیوە، وەک پییــاز (۱۲۴۸)

ڕێ کــەناڕوا، پــای لــەبۆ ڕێگــا نییــە — ئــەو فەســاد کــار، تــین و ســۆزی لا، نییــە (۱۲۴۹)

**داستانی دەروێشێک کەهاتەماڵێک، هەرچی داوای کرد، ساحەب ماڵ کوتی نییە ..**

هاتــەماڵێــک جــارەکی شەخســێک گــەدا — تــاکو ســاحەب مــاڵ نانێــک بــەو بــدا (۱۲۵۰)

ســاحەبی مــاڵ پێیــدەکوت کــوا لێرەنــان؟ — ئێرەکــوا دووکــانی نانــە، ئــەی نــەزان (۱۲۵۱)

پێیــدەکوت پیــوم دەیە،گــەر نــان نییــە — دەیکــوت ئێرەبــۆ قەســاب دووکــان نییــە (۱۲۵۲)

پێیدەکوت، کەم پێم دە ئارد، ئەی پیاوی باش — وای جــەواب دا، ئێرەماڵــە، خــۆ نــەئاش (۱۲۵۳)

تــۆ لەمەشــکەهیچ نــەبێ، ئــاوم دەیــە — پێیــدەکوت، کــوا جۆگــە، یــا ڕێی ئاو هەیــە؟ (۱۲۵۴)

هــەرچی داوای کــرد لــەنان تــاکو کەپــەک — دای جــەوابی مەسخەرەبەو، یــەک بەیــەک (۱۲۵۵)

دامــەنی خــۆی هەڵدەکێشــا ئــەو گــەدا — وای نیشــان دا،گــوو دەکــا دەو ماڵــەدا (۱۲۵۶)

پێیــدەکوت ئــای ئــای،کوتی ئــەو، لاڵ بــەلاڵ — تــا کــو لــەو وێرانــە، مــن خــۆم کــەم بــەتاڵ (۱۲۵۷)

چونکــەلێرەجێ نییــە، هــیچ بــۆ ژییــان — مــاڵی وا، خــۆ، چاکــە، بــەس بــۆ تێ ڕییــان (۱۲۵۸)

چونکەبازێک نی کەبگری تۆ شکار — فێری ڕاوت کات دەستی شەهریار (١٢٥٩)
تۆ کەتاووس نی، بەسەت نەقش و نیگار — ڕوون بکەن نەقشانی تۆ چاوانی تار (١٢٦٠)
تۆ کەتووتی نی،بنێن قەن، زاری تۆ — جا، بدەن گوێیان بەخۆش گوفتاری تۆ (١٢٦١)
بولبولیش نی عاشقی شەیداوو زار — خۆش بنالی نێو چەمەن، یا لالەزار (١٢٦٢)
هودهودیش نی قاسیدی ئێجرا بکەی — لەک لەکیش نی، جێ لەباڵا چا بکەی (١٢٦٣)
تۆ بەچی مەشغووڵی بۆ تالیب بەتۆن؟ — تۆ، چ تەیری، تۆ دەگەڵ کام شت دەخۆن؟ (١٢٦٤)
لەو دوکانی چانەلێدان، وا، وەرە — تا دوکانی فەزل، کڕیار دادگەرە (١٢٦٥)
ئەو مەتاعی کۆنی نای وێ، هیچ بەشەر — دەیکڕێتن لێت، خوداوەندی لەسەر (١٢٦٦)
لای خوداوەند، هیچ غەشێک مەڕدوود، نییە — چون مەڕامی لەو کڕینە، سوود، نییە (١٢٦٧)

## گەڕانەوەبۆ داستانی ئەو پیرەژنە..

گەر کو ویستی بچتەشایی ئەو خەریف — مووی بڕۆی خۆی هەڵدەگرت، ئەو موستەخیف (١٢٦٨)
دایدەنا، نەینووک لەپێش خۆی ئەو عەجووز — تاکو جوان کا، ڕوومەت و، ڕوخسارو، پووز (١٢٦٩)
دای لەڕوو، سووراو بەشادی، زۆر جار — گنجی ڕووی وی هەر وەکوو پێش، بوون دیار (١٢٧٠)
دەی بڕی تەزهیبی قورئانی مەجید — تاکو چەسپی کا بەڕووی خۆی ئەو پەلید (١٢٧١)
تاکو گنجی زۆری ڕووی پنهان بێ — تا نەقیمی حەڵقەیی جوانان بێ (١٢٧٢)
دایدەنا، تەزهیب لەسەر ڕوو، ئەو دزێو — لێی دەکەوتن گەر کو دەی بەست چارشێو (١٢٧٣)
ئەو چەلەش دەستی لەبۆ تەزهیب دەبرد — جا بەتف، گشتی لەڕوو قائیم دەکرد (١٢٧٤)
ئەو چەلەش گەر دایدەنا، چارشێو لەسەر — لێیدەکەوتن گشت ئەوان تەزهیبی زەر (١٢٧٥)
زۆر تەلاشی کرد بەڵام هەر هاتنەخوار — جا کوتی لەعنەت لەشەیتان، سەت هەزار (١٢٧٦)
جێ بەجێ شەیتان لەوێ خۆی دا نیشان — پێیدەکوت ئەی فاحیشە، ئەی هیچ نەزان (١٢٧٧)
فکری وام هیچ کات لەزیهنی خۆم نەدی — غیری تۆ نەم دی لەهیچ قەحبەی دەدی (١٢٧٨)
تۆوی ڕیسوایی عەجیبت خستە خاک — لەو جیهانەت هیچ نەهێشت قورئانی پاک (١٢٧٩)
سەت بلیس و لەشکری، تەنها ئەتۆ — لێم گەڕێ ئەی فێڵەباز توخوا، ئەتۆ (١٢٨٠)
چەن لەقورئان جوانی دەدزی ئەی دزێو؟ — تاکو ڕووی خۆت کەی مولەووەن، چەشنی سێو (١٢٨١)
چەندەدەدزی گفتی مەردانی خودا — وەرگری تا کو بەوان، تۆ مەرحەبا (١٢٨٢)
ڕووی نەکردی ڕەنگی مەسنووعی، جووان — قەت لکی مەسنووعی ناگرێ جێی لکان (١٢٨٣)

| | | |
|---|---|---|
| عاقیبـەت ئـەو دەم کـەتۆ پۆشـیت کەفـەن | زینـەتی ڕووت دێتـەخوارێ هـەرچی هـەن | (١٢٨٤) |
| ئـەو دەمـەی مـردن کـەدێ و، تـۆ گازدەکـا | قـال و قیـل بـێ قیمـەتن، کـەمتر لـەکا | (١٢٨٥) |
| عاقیبـەت دونیـای سـکووت هـەر دێتـەدی | وای لـەوەی قەلبـەن نـەبێ، مەئنووسـی وی | (١٢٨٦) |
| سینەسـاف کە،یـەک دووڕۆژ بـێ وێنـەتۆ | بیکـــەبۆ خـــۆت، دەفتـــەرو ئاوێنـــەتۆ | (١٢٨٧) |
| جـا لەسـایەی یووسـوفی سـاحەب قیـڕان | بـوو زولـەیخای پیـر، وەک ئـەووەڵ جـوان | (١٢٨٨) |
| جـا دەبێتـەڕۆژی بـێ حـەد گـەرم وگـوڕ | ئەو میزاجەی زیاد لەحەد بوو سەردو سوڕ | (١٢٨٩) |
| سۆزی مەریـەم یـەک لکی زۆر وشکی دار | کردیەنـەخلی شین وەکـوو خـوڕڕەم بـەهار | (١٢٩٠) |
| ئەی عەجووز تا کەی دەکەی شەڕگەڵ قەزا | ئێسـتەبت وێ، نەغـدو،وێڵ کـە( مامـەزا ) | (١٢٩١) |
| چونکـەجوانی هـیچ دەڕووی تـۆ دا نییـە | جـەو هـەرو سـووراو ئەسـەریان لا، نییـە | (١٢٩٢) |

## حیکایەتی ئەو نەخۆشەی کەتەبیب پێی وابوو چانابێ..

### خولاسەی داستان ..

نەخۆشـێک چـۆ لای تـەبیبێک، تـەبیب نـەبزی وی گـرت، وا حـاڵی بـوو کەئـەو نەخۆشەتووشـی نەخۆشی ڕەوانی بووە، جاپێیکوت بۆ عیلاج و چارەسـەرکردنی خۆت هیچ کات بێ دڵی خۆت مەکە، بەڵکەم هەرچی دڵت ویستی، جێ بەجێ ئەنجامی بدە، نەخۆش کەلەمەتەب دەرکەوت ویستی بچێتەقەراغ جۆگەئاوێک ولەوێ پیاسەبکا،مەشغووڵی پیاسەکردن بـوو کـەدیتی شەخسێک لەقـەراغ ئەوجۆگەدانیشتووەودەست و ڕووی خـۆی دەشـوا چونکـەملێکی پان وسافی هەبوو،ئـەو نەخۆشەئارەزووی کرد کەشاپەلاغێک بەئیشتیای خۆی لەپشت ئەستۆی بدا، لەهەوەڵەوە، ویستی کـەخۆی ڕاگرێ و، وانـەکا بـەڵام سفارشی تـەبیبی وەبیـر هاتەوە،کـەکوتبووی هـەرچی ویستت بیکـەتاچابی، جـا دەستی خـۆی بڵیندکردومحکـەم لەپشت ئەستۆی دا، بـەجوورێک کەعـەجیب دەنگی هات، کابرای مەزرووب بەشیددەت لەجێی خـۆی ڕاپـەڕی و دەستی کـرد بـەجنێو دان و قسـەی ناحـەز، ویسـتی چەنـد مسـتێکی لێبـدا، بـەڵام دیتـی کـەزاریب شەخسـێکی لاوازو بـێ تاقەتە،بەخۆی کوت ڕەنگەئەگـەر مستێکی لێبدەم بمرێ،وخوێنی بکەوێتەئەستۆم جا تەسمیمی گرت کەئەوی بۆ لای قازی ببا، ئـەوی بۆ لای قازی برد و تـەقازای کـرد کەئـەوی موجـازات بکا،کاتێـک قـازی شکایەتی ئـەو کابرایـەی گوێ دایە،چاوێکی لـەزاریب کـرد و کـوتی دەسـگای قەزاوەت دەبەینی زیندووان دا قەزاوەت دەکا، بەڵام ئەو کابرایەئەوەندەلاوازو بێ تاقەتەکـەدەبێ بەمردوو حیساب بکرێ،جا لەپاشان قازی ڕووی دەشاکی کردوکوتی چەندەت پووڵ پێیە؟کوتی

فەقەت شەش درهەم،قازی کوتی سێ درهەمان بۆ خۆت ڕاگرەوسێ درهەمان بدەبەو زاریبە،کەشەخسێکی موحتاجە،شاکی لەوحوکمەزاڵمانەتووڕەبوو،ودەگەڵ قازی مەشغووڵی جەڕڕو بەحس بوو،لەوحاڵەدا زاریب سفاریشی تەبیبی هاتەوەبیر،وچاوی بەئەستۆی قازی کەوت ودیتی کەپشت ئەستۆی ئەو جەنابەبۆ زللەلێدان زۆر لەوی پێش موناسبترەجا دەستی خۆی بڵیند کردو زللەیەکی زۆر شەدیدی لەپشت ملی قازی دا،کەزۆر ئێشا، شاکی بەمەسخەرەبەقازی کوت هەرکەس چاڵ بۆ خەڵکی هەڵقەنێ بۆ خۆی تێدەکەوێ،قازی جوابی داوە، ئێمەدەبێ تەسلیمی قەزا ببین، وئەگەر قەزا بەزاهیر تاڵە، دەباتین دا شادی هێنەرە..

یەک نەخۆش هات جارەکی بۆ لای تەبیب — پێیدەکوت تۆ بگرەدەستم ئەی لەبیب (١٢٩٣)

چون لەنەبزم حاڵی دڵ پەیدا دەکەی — چون بەدڵ وەسڵن ڕەگی دەس، یەک یەکەی (١٢٩٤)

ئەو شتەی وەسڵی دڵەپنهانە، تۆ — تاعەیان بێ دڵ، ئەوُت بێ جستوجۆ (١٢٩٥)

تۆ ببینەبای نیهان و نادیار — نێو غوبارو نێو تەکانی بەرگی دار (١٢٩٦)

جا بەزریان بێت ئەو با، یا شەماڵ — جونبشی بەرگان دەڵێ پێت، وەسفی حاڵ (١٢٩٧)

وەسفی مەستی دڵ دەکاتن ئاشکار — وەسفی چاوی سست و بێ حاڵ و خومار (١٢٩٨)

چون لەزاتی حەق بەدووری وەسفی زات — بۆت دەکەن مەعلووم، ڕەسوول و موعجیزات (١٢٩٩)

موعجیزات جا هەم کەراماتی خەفی — دێتەسەرقەلبان لەپیرانی سەفی (١٣٠٠)

ئەندەروونیان هەن قیامەت، سەت هەزار — کەمترینی وان، تەماشا، مەستی جار (١٣٠١)

هاو نشینی خوایەجا ئەو خۆشبەخت — چون لەبۆ لای خۆشبەختی برد ڕەخت (١٣٠٢)

موعجیزەی کە، سەر جەماد کردی ئەسەر — یا عەسا، یا یەم بوو، یا شەققەلقەمەر (١٣٠٣)

گەر ئەسەر کاتن لەڕووح بێ واسیتە — ئەو دەبێ واسیڵ، بەپنهان ڕابیتە (١٣٠٤)

سەر جەمادات، موعجیزات نین پایەدار — ڕووحی پاکیان موعجیزات بوو ئینتیزار (١٣٠٥)

تاکو لەو جامید ئەسەر بگرێ، زەمیر — خۆش بەحاڵ نانێک کەنەی بێتن خەمیر (١٣٠٦)

خۆش بەحاڵ سفرەی مەسیحا، بێ کەمی — خۆش بەحاڵ، بێ باغ، میوەی مەریەمی (١٣٠٧)

دێن لەگیانی شەخسی کامیل موعجیزات — سەر زەمیری ڕووحی تالیب وەک حەیات (١٣٠٨)

موعجیزات دەریانەناقیس تەیری خاک — تەیری ئاو نایێ لەنێو دەریا هیلاک (١٣٠٩)

گیانی نامەحرەم دەکا موعجیز زەعیف — گیانی مەحرەم تین دەدا و دەیکا شەریف (١٣١٠)

چون دەدڵدا نیتەخۆشبەختی وەها — تۆ لەزاهیر بگرەئیستیدلال جا (١٣١١)

لای مەشاعیر زاهیرن ئاسار هەموو — سەر موئەسسیر، موخبیرن ئاسار هەموو (١٣١٢)

کاری دەرمان بوونیان نەک زاهیری — چەشنی سیحر و سەنعەتی جادوو گەری (١٣١٣)

گەر بنۆڕی تۆ لەئاسار و لەکار — چی نیهان بێتن، دەبێ، بۆت ئاشکار (١٣١٤)

قووەتێکی بوو لەباتین دا نیهان — گەرکو ئەنجام بێ، دەبێتن ئەو عەیان (١٣١٥)

چون بەئاسار، بوون حەقایق ئاشکار — چۆن ئەسەر ناکات پەیدا کردگار؟ (١٣١٦)

مەغزو پێستن گشتی ئەسباب و ئەسەر — گشت دەلیلن بۆ وجوودی خوای لە سەر (١٣١٧)

باعیسی حوببێت بەئەشیا، بوو ئەسەر — بۆ لەوەی بەخشی ئەسەر، بووی بێ خەبەر؟ (١٣١٨)

عالەمت دۆست گرت لەڕێی فیکرو خەیاڵ — بۆ ئەدی ناکەی بەدۆست، خوای بێ هەواڵ؟ (١٣١٩)

دوایی نایەئەو وُتارەی زۆر دراز — خوا نەکا لەو بارەنەم مێنێ، چ ئاز (١٣٢٠)

## گەڕانەوە بۆ لای داستانی نەخۆش ..

بۆم وەگێڕەئێستەداستانی نەخۆش — گەڵ تەبیبی شارەزاو ئیراد پۆش (١٣٢١)

نەبزی وی گرت و دەبوو ئاگا لەحاڵ — سیحجەتی وی بوو لەلا، ئەمری محاڵ (١٣٢٢)

پێیدەکوت هەرچیت کەویست تۆ، وا بکە — ڕەنجی کۆنی جیسمی خۆت بەر با، بکە (١٣٢٣)

خاترت چی ویست، تۆ لەو مەگرەپێش — تا نەبن پەر هێزو سەبری تۆ بەئێش (١٣٢٤)

سەبرو پەرهێز بۆ نەخۆشی وا، زیان — چی دڵت ویستی ئەتۆ، زووی کە، عەیان (١٣٢٥)

بۆ نەخۆشی وای،دەکوت حەق،ئەی عەموو — جێ بەجێ کەن مەیل و، ویستی دڵ هەموو (١٣٢٦)

پێیدەکوت خوات خێر بدا، مەمنوونی تۆم — ئێستەبۆ تەفریح بۆ سەر جۆ دەڕۆم (١٣٢٧)

چوو بەمەیلی دڵ گەڕا سەر جۆی سەفا — تا لەبۆ وی، بێ لەدەردو ئێش، شەفا (١٣٢٨)

دی لەسەر جۆ، سۆفییەک ڕۆنیشتووە — ئەو خەریکی شوشتنی دەست و ڕووە (١٣٢٩)

پشت ملی سۆفی کەدی جا ئەونەخۆش — ئارەزووی کرد زللەیەک لەو دا، بەجۆش (١٣٣٠)

بۆ قەفای ئەو سۆفییەی زۆر زگ پەرەست — حازری بۆ زللەلێدان کرد دەست (١٣٣١)

گەر بەمەیلی خۆم نەدەم ئەنجام کار — پێیکوتم دوکتۆر دەبێ بیمارو زار (١٣٣٢)

زللەیەک من لەو دەدەم زۆر توندو چاک — چون بەدەستی خۆ، مەکەن خۆتان هیلاک (١٣٣٣)

سەبرو پەرهیزی وەها بوون مەهلەکە — لێیدە، زۆر توند، وەک چ کەس پەرهیز مەکە (١٣٣٤)

گەرکو لێیدا زللە، دەنگی هات تەراق — پێیدەکوت سۆفی کەئەی گەووادی عاق (١٣٣٥)

سۆفی ویستی یەک دوو مستی لێبدا — ڕیش و سمبێڵ یەک بەیەک لەو کا جودا (١٣٣٦)

بۆیەعالەم بیلعموم ئازاردەرن — چون لەبۆ ئیلیسی بەد، فەر مانبەرن (١٣٣٧)

بۆ عەزابی بێ گوناهان زۆرحەریس ‌ ‌ پشت سەری یەکتر بەدووی عەیب و نەقیس (١٣٣٨)

ئەی لەبێ جورمان، دەدەی ئازار قەفا ‌ ‌ بۆ قەفای خۆت تۆ مەگەر نەت دی جەزا؟ (١٣٣٩)

ئەی ئەوەی کردت هەوا بۆ خۆت تەبیب ‌ ‌ ناتەوانت دا، وەبەر زللەی عەجیب (١٣٤٠)

بۆ تەمەسخور پێی کوتی ئەو هەت دەوا ‌ ‌ گەندومیشی دا نیشان ئادەم، ئەوا (١٣٤١)

ها بخۆن ئەو دانە، ئەی دوو نازەنین ‌ ‌ ئێش دەکا دەرمان، دەبن بەو خالیدین (١٣٤٢)

ئەو لەڕێی دەرکرد قەفای بەر زللەدا ‌ ‌ عاقیبەت زللەی قەفا، بۆی بوو جەزا (١٣٤٣)

زۆر شەدیدی ئەو لەڕێگا لا دەدا ‌ ‌ دەستگیری وی دەبوو ئەمما خودا (١٣٤٤)

کێوبوو ئادەم،گەرچی ئەو پڕ مار بوو ‌ ‌ کانی زیددی زارە، بێ ئیزرارِ بوو (١٣٤٥)

زیددی سەممت گەر نییە، یەک زەڕڕەتۆ ‌ ‌ بۆ خەڵاسی خۆت، لەبۆ وای غەڕڕەتۆ؟ (١٣٤٦)

وەک خەلیلت کوا تەوەککول،کوا ئەتۆ؟ ‌ ‌ وەک کەلیمت کوا کەرامەت، جا، ئەتۆ؟ (١٣٤٧)

تا کو تیغت نەبڕێ ئیسماعیل ئەتۆش ‌ ‌ تا نەکەی نێو نیل بەڕێگا ی وشک و خۆش (١٣٤٨)

گەرکو خۆشبەختێک لەلای باڵا کەوت ‌ ‌ بووی نەجات گەر نێو لیباس وی،با، کەوت (١٣٤٩)

گەر یەقینت تۆ نییەبۆ بەختی وا ‌ ‌ بۆ دەدەی خۆت، تۆ وەبەر بای سەختی وا؟ (١٣٥٠)

لەو بلێندایی، هەزاران چەشنی باد ‌ ‌ کەو تن و، سەریان بەبا دا، چوون لەیاد (١٣٥١)

چاو، ئەوانەی بوون لەباڵاو کەوتنەخوار ‌ ‌ سەت هەزاران زێدەهەن، بەل بێ ژمار (١٣٥٢)

تۆ کەنازانی تەناف بازی یەقین ‌ ‌ شوکری لاقت کەو، برۆ چاک، سەر زەمین (١٣٥٣)

پەڕ لەکاغەز چامەکە، بۆ هەڵفڕین ‌ ‌ زۆر لەدەستیان دا، سەران لەو ڕێگەژین (١٣٥٤)

گەرچی ئەو سۆفی گەلێک بووی خەشم و کین ‌ ‌ عاقیبەت بین بوو بەڵام، ئەو موستەعین (١٣٥٥)

ئەووەڵی سەف ئەو کەسە، دیتی مەڕام ‌ ‌ دانەنەگرێ، بەل ببینێ بەندی دام (١٣٥٦)

خۆش بەحاڵ دووچاوی پایان بینی باش ‌ ‌ تا یەڵن تەن بێ، فەساد و وردو خاش (١٣٥٧)

چاوی ئەحمەد چونکەپایان بین بوو ‌ ‌ لێرەدا دیتی جەهەننەم، موو بەموو (١٣٥٨)

عەرش و کورسی دیت هەم جەننات ئەو ‌ ‌ گەر کو لای برد، پەردەیی غەفلات ئەو (١٣٥٩)

تۆ کەبت وێ هیچ زەمان نەت بێ زیان ‌ ‌ عاقیبەت بین بە، نەئەووەڵ، ئەی فلان (١٣٦٠)

تا ببینی تۆ ئەوانەی نینە، هەن ‌ ‌ هەم ببینی هەستی مەحسووس، پەست و گەن (١٣٦١)

جا، بزانەهەرچی عەقڵی لایە، ئەو ‌ ‌ ڕۆژو شەو، بەس جستو جۆی بۆ (لا)یە، ئەو (١٣٦٢)

سواڵکەران زۆر تالیبی جوودن، نییە ‌ ‌ نێو دوکانان تالیبی سوودن، نییە (١٣٦٣)

نێو مەزاریع تالیبی دەخلن، نییە ‌ ‌ نێو نەهالان، تالیبی نەخلن، نییە (١٣٦٤)

نێــو مـــەداریس تـــالیبی عـــیلمن، نییـــە — نێـــو مەعابیـــد تـــالیبی حـــیلمن، نییـــە (١٣٦٥
هەسـتی مەحسووسـیان هـەموویان لا دەنـا — بـــۆ ئەوانـــەی نینەســـەر یـــان دادەنـــا (١٣٦٦
چونکـەکان و مــەخزەنی لــوتفی غــەفوور — بـەس لـەنێو نیسـتی وفـەنا دەی بێ زهـوور (١٣٦٧
پێش ئەوەش من ڕەمزەکەم خۆ،کرد بـەیان — ئەو هەگەڵ وی هەریەکن،نەک لێک جییان (١٣٦٨
من کوتم هەرکات کەدێن سـەنعەت گـەران — تـالیبی مـەحوو فـەنا و نیسـتین ئـەوان (١٣٦٩
دەیهـەوێ بـەننا مـەکان وجێـی بـەتاڵ — یـەک کـەلاوەی تێـک دراوی کۆنـەماڵ (١٣٧٠
دەیهـەوێتن ئـاو فـرۆش گـۆزەی بـەتاڵ — دەیهـەوێ نـەجار، کەنـەیبێ، دەرکـە، مـاڵ (١٣٧١
وەختی ڕاو حەملـەی دەکـەن گشت،سـەرعەدەم — لای عـەدەم جا،دوایـە نایـەن یـەک قـەدەم (١٣٧٢
بـۆ لەبـەر ئـەو (لا)ی ئومێـدت ڕادەکـەی — بۆ دەگـەڵ ویسـتت ئـەتۆ دەعـوا دەکـەی؟ (١٣٧٣
چـون ئومێـد و ئـارەزووی تـۆ نیسـتییە — لـەو فـەناو نیسـتی فیـرارت بـۆ چییـە؟ (١٣٧٤
گـەر لـەبۆ ( لا ) نی ئـەتۆ مـەئنووس و یـار — نێـو کـەمینی ( لا ) لـەبۆ، بـووت ئینتیـزار؟ (١٣٧٥
هـەرچی هـەت بێ تـۆ دەد ڵدا، لای دەنێـی — ئـەو قـولایی دڵ، دەدەریـای (لا) ی دەنێـی (١٣٧٦
بۆ دەکەی جا، لەو یـەمی مەقسوود، فیرار؟ — ئـەو کـەتا ئێسـتا بـەتۆی دا، ڕاو هـەزار (١٣٧٧
نێـوی بـەرگت تـۆ لـەبۆ چـی ناوەمـەرگ؟ — چا و لەجادوو، مەرگی نیشان دای بەبەرگ (١٣٧٨
هـەردووچاوی بەسـتی سـیحری سـەنعەتی — تا کو ڕووحیش قەعری چاڵ بێ، ڕەغبەتی (١٣٧٩
وا دەزانـــی تـــۆ، بەمـــەکری کردگـــار — دەشتی سـەر چـاڵ گشتی ژارە، گشتی مـار (١٣٨٠
ڵا جـەرەم چـاڵی لـەبۆ خـۆ کردەمـاڵ — تـاکو مـردن هـات ئەویشـی خسـتەچاڵ (١٣٨١
ئیشـتیباهی تـۆن ئـەوەی کـردم ئـەدا — گوێ دەعـەتتار، چـی کـەکوت، لـەو باسـەدا (١٣٨٢

**داستانی سوڵتان مەحموود و غولامی هیندوو..**

**خولاسەی داستان ..**

سوڵتان مەحموودی غەنەوی لەکاتی جەنگ دەگەڵ هیندیان،مێر منداڵێکی بەغەنیمەت گرت ولەسەر تەختی شایانەی دانا . بەڵام ئەو مێر منداڵەبەشیددەت دەگریا . سوڵتان پێیکوت بۆ دەگری؟مەگـەرموڵک و ماشـت لەدەسـت داوە؟ منداڵەکـەپێیکوت بۆیـەدەگریم چونکەئـەمن لەهیندوستان دایکێکم هەبوو کەهەمیشەئەمنی بەتۆ دەترساند، وەهەرکات کەدەی ویست نفرینم بکا دەیکوت ئیشاللا ڕۆژێک دەکەویەدەست سوڵتان مـەحموود، بابم کەئـەو نفرینـەی دەبیست دڵی بەحاڵی من دەسووتا وبەسەر دایکم دادی دەکێشا ودەیکوت مەگەر نفرین قاتەکەنفرینی وا

خەتەرناک دەکەی؟ئەمن لەئیختیلافی دایک و بابم تەسووریکی خەتەرناکم دەزیهنی خۆم دا، لەتۆ دروست کردبوو، بەڵام ئیستا دایکم لەکویێە؟ کەبیت و ئەمن لەسەرتەختی شایانە، ببینی.

| | | |
|---|---|---|
| شێخ فەریدەددین کەلێی خۆش بێ خودا | باسی شا مەحموودی ئەو، وا کرد ئەدا | (۱۳۸۳) |
| گەر کو دەیکرد جەنگی هیندی ئەو هومام | بۆ غەنیمەت کەوتەدەس وی، یەک غولام | (۱۳۸۴) |
| جێ نشینی و تەختی پێدا، ئەو شەهیر | کردی بۆ خۆی کوڕ، لەبۆ لەشکر ئەمیر | (۱۳۸۵) |
| موو بەموو ئەو داستان کە، جستو جۆ | نێو وتەی ئەو گەورەپیاوەی دین، ئەتۆ | (۱۳۸۶) |
| جا لەسەر ئەو تەختەجوانە، ئەو منال | دا دەنیشت لای شەهریاری باکەماڵ | (۱۳۸۷) |
| ئەشکی دەڕژاند و دەگریا، زار زار | شا کوتی ئەی بەختیاری ڕۆژگار | (۱۳۸۸) |
| بۆ دەگر یەی، شانس و بەختت بوو خووار؟ | خۆ لەزوور شایانی، یاری شەهریار | (۱۳۸۹) |
| چاو لەپێش تەختت سپا گشت، هەم وەزیر | بوون بەسەف وەک ئەنجوم و، مانگی مونیر | (۱۳۹۰) |
| پێیدەکوت منداڵ، دەگریەم، بۆیەزار | چونکەدایکم ئەو دەمەی بووم لەو دیار | (۱۳۹۱) |
| وای ئەمن تەخویف دەکرد پێت گشت ئان | بچیەژێر دوو دەستی مەحموود ئەرسەلان | (۱۳۹۲) |
| باب دەگەڵ دایکم بەلام دەیکرد هەرا | بۆ دەکەی تەهدید و نفرینی وەها؟ | (۱۳۹۳) |
| تۆ مەگەر نفرینی دیکەت هیچ نەدی؟ | سادەتر بێ و، نەی بێ تا ئەو حەد، بەدی | (۱۳۹۴) |
| تۆ گەلێک بێ ڕەحم و زۆر سەنگین دلی | چون بەسەت شەمشیر لەبۆ وی، قاتلی | (۱۳۹۵) |
| من لەگفتی وان دەبووم حەیران و مات | زۆر غەم و ترسم لەبۆ نێو دڵ دەهات | (۱۳۹۶) |
| تا چ حەد مەحموود، خولق و خووی بەدە؟ | بۆ مەسەل بۆ دەرد و میحنەت، ئەو حەدە | (۱۳۹۷) |
| جا دەلەرزیم من لەترس و بیمی تۆ | بێ خەبەر لەو لوتف و لەو تەعزیمی تۆ | (۱۳۹۸) |
| کوا ئەدی دایکم ببینی زۆر جووان | من لەسەر ئەو تەختە، ئەی پاشای جیهان | (۱۳۹۹) |
| فەقرەئەو مەحموود ی تۆ،ئەی نا تەوان | تەبعەلەو تەهدید دەکا تۆ، گشت ئان | (۱۴۰۰) |
| گەر بزانی ڕەحمی ئەو مەحموودی مەند | تۆ دەلەی یاخوا ببێ، ئەو دلپەسەند | (۱۴۰۱) |
| فەقرەئەو مەحموودی تۆ ئەی بێ ورە | گوێ بەتەبعی خۆت مەدە، ڕێ ون کەرە | (۱۴۰۲) |
| گەر فەقیری ڕاو بکاتن تۆ، یەقین | وەک منال ئەشکان دەڕێژی، ڕۆژی دین | (۱۴۰۳) |
| گەر چی تەن بۆ پەروەریش وەک دایکەبۆت | خۆ عەدوو تر بوو لەسەت دوژمن، بەخۆت | (۱۴۰۴) |
| تەن کەبیمار بێت، دەرمان جووت دەکا | گەر قەویش بێتن ئەتۆ تاغووت دەکا | (۱۴۰۵) |
| ئەوتەنەی زالم،زرێی نێو کارزار | نایەزستانان و هاوینان بەکار | (۱۴۰۶) |
| یاری بەد، بۆ سەبری تۆ زۆر دێ بەکار | واز دەبێ چون سینگی شەخسی بوردبار | (۱۴۰۷) |

سەبری مانگ گەڵ شەو، دەکا ئەو پڕ لەنوور — سەبری گوڵ گەڵ خار، دەکا لەو بۆن زهوور (۰۸

سەبری شیر نێوخوێن و تەرس وپەین و پاڵ — بۆ سـەبەب دەیـلاغ دەژی زۆر خۆشـحاڵ (۰۹

چون دەگـەڵ گوفتـار سـەبوور بـوون ئـەنبیا — بـوون بەخۆشـبەخت و بەخاسـانی خـودا (۱۰

هەرکەسـێ کـردی لیباسـی جـوان دەبـەر — بێ گومان ڕێی کەسب و سەبری گرتەبەر (۱۱

هەرکەسـێکت دی کەڕووتـەو بـێ هونـەر — بێ گومان سەبری نەبوو، وای هات بەسەر (۱۲

هەرکەسـێک وەحشـەت زەدەو، غەمبارەئـەو — بـێ گومـان یـەک حیلەگـەر، بـۆی یارەئـەو (۱۳

گـەرکو هـەیبـا سـەبرو یـاری بـا وەفـا — لـەو کـەدوور بـا، نەیـدەخوارد، زللـەی قـەفا (۱۴

ئونس وخووی گەڵ حەق دەگرت،وەک ئەنگەبین — بـێ دەگـەڵ شـیر( لاحـب الافلـین) (۱۵

لاجـەرەم تـەنها نـەبوو جـا ئـەو زەمـان — وەک دەمێنـێ نـار لـەڕێگای کـاروان (۱۶

چـون لـەبێ سـەبری، لـەبۆ بێگانـەیار — لەو کـەدوور بێ، دێ لـەبۆ وی غـەم، بـەبار (۱۷

زێڕی خـالیس گـەر لـەبۆت بێ هـاو نشین — چـۆن خیانەتکاردەکـەی سـەر وی ئـەمین؟ (۱۸

بگرەبۆخۆت دۆست و یار ئەو کەس ئەگەر — ئـەو لـەلای نایـەت ئەمانـەت چـی بەسـەر (۱۹

بگرەخووگـەڵ وەی،کـەخووی ئیجـاد دەکـرد — یـەک بەیـەک خـووی ئـەنبییای ئیرشاد دەکرد (۲۰

گـەر بـدەی بـەرخێک، بـەتۆ مێگـەل دەدا — چادەکـاتن گشـت سـیفاتان، خـۆ، خـودا (۲۱

دات ئەمانـەت مـەڕ، بـەگورگی پـڕ خەتـەر — گورگ و، یووسوف قەت نەکەی تۆهاو سەفەر (۲۲

گـەرکو گورگت بێ بـەزاهیر دۆست و یـار — بێ گومـان لـەو چاکـە نایـەت، قـەت چ جـار (۲۳

گـەرکو جاهیـل بـێ بەدۆسـت و یـاری تـۆ — دێ لـەوی ڕا،عاقیبـەت، ئـازاری تـۆ (۲۴

ئالـەتی دوو دانەهـەن خونسـایە، ئـەو — کـاری هـەردوو ئالـەتانی لایـە، ئـەو (۲۵

ئـەو زەکـەر لای جینسـی ژن پنهـان دەکـا — جـا، وەهـا خـۆی، خوشکی وان ئیعلان دەکا (۲۶

ئەو بەدەستیش فـەرجی خـۆی پنهـان دەکا — جـا وەهـا ئـەو، خـۆی وەکـوو مـەردان دەکـا (۲۷

خوا کوتی لەو فـەرجی زۆر مـەکتوومی وی — چادەکـەم فـەرجێک لەسـەر خرتـوومی وی (۲۸

تـا بـەمـەکر وفێـڵ نـەبا ئـەو حیلەگـەر — هـیچ لـەبینایانی مـە، بـۆ نێـو خەتـەر (۲۹

پیـاوەتی نایـەت لەگشـت پیـاوان خـۆ — خـۆت لـەجاهیل لادە،گـەر وشـیاری تـۆ (۳۰

دۆسـتایی جـاهیلی شـیرین وتـار — سـەممی کۆنـە، هـیچ کـەنیتی ئیعتیبـار (۳۱

گـەرچی حوببـت ئـەو دەگـەڵ ئیزهـار دەکـا — حەسـرەت و دەردو غـەمت، لـێ باردەکـا (۳۲

جـا دەڵـێ دایـک بـەباب، زۆر ئاشـکار — ئەومناڵـەم بـوو لەمەکتـەب زۆر نـەزار (۳۳

گـەرژنێکی دیکـەبۆ تـۆی ئـەو بیـا — هێنـدەدەت کـرد تـۆ لـەوی جـەو رو جـەفا؟ (۳۴

گەر لەغەیری تۆ م بیایەئەو منال ... ئەو ژنیش وەک تۆی دەکوت گوفتاری تاڵ (١٤٣٥)

لادەخۆت، لەو دایکەهەروا،مەکری وی ... مستی باب خۆشتر لەهەڵواو شەکری وی (١٤٣٦)

لێرەدایک نەفس و، باب عەقڵی مەعاد ... زۆر لەئەووەڵ سەختە، ئاخر سەهل و شاد (١٤٣٧)

ئەی عەقڵ دەر، بەس ئەتۆی فەریاد ڕەس ... تا تۆ نەت وێ، نای هەوێتن خۆ، چ کەس (١٤٣٨)

گشت بەدەس تۆن باش بوون و ویست و خواز ... غەیری تۆ خۆ،کەس نییەئەی کار ساز (١٤٣٩)

وێژەرو گوێگر ئەتۆی، هەرتۆی، کە هەی ... گەرچی زۆرین ئێمەئەمما، نین چ شەی (١٤٤٠)

بەو حەواڵە،زۆرکە، مەیلم بۆ سجوود ... پێم مەدە، تۆ تەنیەڵی جەبری و، خموود (١٤٤١)

باڵ و پەڕ بوو جەبر، بۆگشت کا میلان ... حەپس و بەندەجەبر، بۆ گشت کاهیلان (١٤٤٢)

بگرەهەر وەک ئاوی نیل، ئەو جەبرەتۆ ... ئاوەبۆ پاکان و، خوێن، بۆ گەبرەخۆ (١٤٤٣)

باڵ لەبۆ لای شا دەبا،بازانی گەش ... باڵ لەبۆ قەبران دەبا، زاغانی ڕەش (١٤٤٤)

ئەو چەلەش تۆ باس کەدەی، شەرحی عەدەدم ... گەرچی زیددی سەممە،تۆ لا توایە،سەم (١٤٤٥)

ئەی ڕەفیق وەک بەچکە هیندووی خۆش قەدەم ... هیچ مەترسێ تۆ لەمەحموودی عەدەم (١٤٤٦)

لەو وجوودەی خۆت بترسێ،ئێستەتۆ ... هەم خەیاڵت،هەم ئەتۆ هیچ نینەخۆ (١٤٤٧)

یەک عەدەم بۆ یەک عەدەم عاشق بووە ... نیستییەک،یەک نیستی گومڕا کردووە (١٤٤٨)

ئەو خەیاڵاتانەگەرکو چوون، نەمان ... ئەو شتەی مەعقوول نەبوو، بۆت بوو عەیان (١٤٤٩)

**(لیس للماضین هم الموت انما لهم حسره الفوت ) ..**

ڕاستی فەرموو حەزرەتی خەیرەلبەشەر ... هەر کەسێکی لەو جیهانەی کا، گوزەر (١٤٥٠)

هیچ کەنیتی دەردوحەیف وغەبنی مەوت ... بەڵکەهەیتی حەیف وحەسرەت،ئەو لەفەوت (١٤٥١)

من لەبۆ خۆم بۆ نەکردە، ڕووگەمەرگ؟ ... مەخزەنی گشت سەروەتو،گەنجان و، بەرگ (١٤٥٢)

ڕووگەبۆ من تا هەبووم، چون بووم حەوەل ... ئەو خەیاڵانەی کەچوون،گەر هات ئەجەل (١٤٥٣)

حەسرەتی مردوو لەبەر مردن نییە ... حەسرەتی وی غەیری ناکردن نییە (١٤٥٤)

غەیری نەقش و کەف ئەمن چیدیم نەدی ... کەف لەدەریایتی تەکان،لەو دیتەدی (١٤٥٥)

ئەو کەفانەی یەم، کەلای نان بۆ کەنار ... تۆ لەقەبرانیان ببینە، زارو خوار (١٤٥٦)

جا بڵێ کوا جونبش و جەو لانتان؟ ... بەحرە ئێوەی خستەنێو بوحڕانتان (١٤٥٧)

تا بێژن پێت بەحاڵ، نەک لێوو، قال ... تۆ لەیەم کە، نەک لەئێمەئەو سوئال (١٤٥٨)

کوا تەکان بۆ نەقشی وەک کەف،دوور لەمەوج؟ ... کوا بەبێ با،خاک دەچێ،بۆ لایی ئەوج (١٤٥٩)

گەر غوبارت دی ببینەبا، ئەتۆ / گەر کەفت د ی، یەم ببینە، جا، ئەتۆ

جا، لەتۆ دیتن فەقەت دیتن بەکار / ما بەقی بەس شەحم و لەحم وپوودو تار

زێدەناکانووری شەم، قەت شەحمی تۆ / بۆ کەبابی ناوێ مەخموور،لەحمی تۆ

تۆ فیداکە، گشت وجوودت بۆ بەسەر / تۆ لەلات بێ موعتەبەر دائیم نەزەر

دوو گەزی ڕێ، یەک نەزەر دی ئاشکرا / یەک نەزەر دی دوو جیهان و، ڕوویی شا

بەینی ئەو دوو، هەن تەفاوەت بێ ژمار / کل،تەڵەب کە، خوا دەزانێ، چاک سیڕاڕ

شەرحی بەحری نیستیت تۆ چونکەبیس / تۆ تەلاش کە، بی لەگەڵ ئەو یەم، ئەنیس

چونکەئەسڵی کا رگا، ئەو نیستییە / هیچ نیشان و هیچ تەعەیبون، بۆی، نییە

گشتی ئوستادان لەبەر ئیزهاری کار / تالبی نیستین و جێگای ئینکیسار

خوا کەوەستای گشتی وەستایان بەجەم / کارگا کەی، نیستییەو، لا، لاجەرەم

زیاد لە هەر جێ بگرێ ئەو نیستی قەرار / کار و کارگای حەق لەوێ بوو ئاشکار

چونکە نیستی بوو گەلێک والا مەقام / مەرتەبەی دەروێش بڵیندتر بوو لە عام

بیلخسووس دەروێش کەنەیبێ جیسم و ماڵ / فەقری تەن بێ حەد موهیممە، نەک سوواڵ

سواڵکەرئەوکەس بووکەنەی مێتنی،چ ماڵ / قانع ئەو کەس بوو،لەخۆی تەن کا،بەتاڵ

تۆ نەکەی ئێستاکە، شەکوا، هیچ لەئێش / ئەسپەچون، لای نیست ئەو دەتباتەپێش

من ئەوەندەم کوت بەقییەش فیکر کە / گەرکو جامید بێت فیکرت، زیکر، کە

زیکری حەق فیکرت دەکا زۆر توندو تۆڵ / زیکری حەق ڕۆژ، فیکری وا جامید، سەهۆڵ

ئەی ڕەفیق جەزبەی ئیلاهی ئەسڵی کار / تۆ تەلاش کە، نەت بێ، جەزبەی ئینتیزار

چونکەتەرکی کار هەر وەک نازییە / ناز کوا شایستەبۆ جانبازییە؟

تۆ قەبووڵ و ڕەد، مەخە، بیر، ئەی غولام / بەس ببینەئەمرو نەهیان، تۆ مودام

تەیری جەزبە، ناگەهان دەفڕێ لەلان / شەم خەمووش کە،گەرکو دیتت تۆ، بەیان

چاوی نافیز، نووری وی، نووری خودا / مەغزی نێو پێستان ئەو تەشخیس دەدا

ئەو دەزەڕڕەی دا دەدی جاوید هەتاو / ئەو دەقەترەی دا دەدین، دەریا، تەواو

## جارەکی دیش گەڕانەوەبۆ لای سۆفی و قازی ..

سۆفی دەیکوت بۆ قیساسی یەک قەفا / با نەدەم من، چەشنی نادان، سەر، بەبا

من کەکردم خەرقەیی تەسلیم، دەبەر / خۆ، قەبووڵم کرد، زللەی بێتەسەر

خەسمی خۆی سۆفی کەدی لاواز و سست ـــ ئەو بەخۆی کوت گەر بدەم من، لەو بەمست (١٤٨٥)

خۆ بەیەک مستم دەبێ ئەو سەرنیگوون ـــ شاش لەمن دەگرێ قیساس دەمکا، زەبوون (١٤٨٦)

خەیمەبوو وێران و ئەستوندان شکان ـــ ئەو بەهانەی کەوتنی بوو، نەک ئەمان (١٤٨٧)

کوا لەبەر ئەو مردووە، یەک زەڕڕە، خاس ـــ دابنێم سەر، من لەژێر تیغی قیساس؟ (١٤٨٨)

چونکەنەیتوانی کەلەو داتن بەدەست ـــ بردنی وی کرد،لەبۆ لای قازی قەست (١٤٨٩)

ئەو تەرازووی حەقق و عەدڵەئاشکار ـــ ڕێی نەجات بوونەلەمەکری نا بەکار (١٤٩٠)

وەک مقەست دەبڕێت ئەو جەنگ و جیدال ـــ لادەبا ئەو جەنگ و دەعواو،قیل و قال (١٤٩١)

دێو دەنێو شووشەی دەکا ئەفسوونی وی ـــ جەنگ و فیتنان لادەبا، قانوونی وی (١٤٩٢)

گەر تەرازووی دیت خەسمی پڕ تەمەع ـــ سەرکەشی ناکاو دەبێ ئەو دەم تەبەع (١٤٩٣)

بێ تەرازوو زیاتریش دەی، بەو ئەگەر ـــ ناڕەزایە،گەرچی هەیتی ئەو خەبەر (١٤٩٤)

ڕەحمەقازی،جەنگ و دەعوا لابەرە ـــ قەترەیێکی عەدڵی ڕۆژی مەحشەرە (١٤٩٥)

گەرچی قەترەزاهیرەن چووک و، کەمە ـــ مەزهەری لوتف و،سەفای ئاوی یەمە (١٤٩٦)

گەرکو لابەی تۆ لەپەردەی چاو غوبار ـــ بۆ ت لەیەک قەترەدەبێ، ڕوو بار دییار (١٤٩٧)

حاڵی کول ئاشکار بەجوزئان بوو تەواو ـــ وەک شەفەق ئاگا دەکا، دێتن هەتاو (١٤٩٨)

سوێن بەجیسمی ئەحمەدی یاد کرد حەق ـــ گەر کو فەرمووی ئەو دەقورئان (والشفق ) (١٤٩٩)

موور لەبەر دەنکێک دەلەرزێ وا، مەگەر ـــ خەرمەنی بۆ با عەیان، لەو دەنکەگەر؟ (١٥٠٠)

با س کە، مەتڵەب، سۆفی نەیما، حەو سەلە ـــ بۆ موکافاتی جەفا، هەیتی پەلە (١٥٠١)

تۆ کەزوڵمت کرد زۆر، چۆن خۆش دڵی ـــ لەو تەقازای تۆڵەخواز تۆ غافڵی؟ (١٥٠٢)

یا لەبیر خۆت برد گشت کاری خەراب ـــ چون قەرارت گرت لەنێو پەردەو حیجاب (١٥٠٣)

پشت سەرت گەر چات نەکرد با،تۆ عەدوو ـــ ئاسمان حاسید بەئەو سافت دەبوو (١٥٠٤)

حەپسەجێگای تۆ بەخاتر ئەو حقووق ـــ کەمکەمەبخوازەعوزرت لەو عقووق (١٥٠٥)

نەت گرێ تاکو بەیەکجار موحتەسیب ـــ ڕوون کە، ئاوی خۆت ئێستا گەڵ موحیب (١٥٠٦)

توند دەچوو سۆفی وەلای سیلی زەنی ـــ جا بەدەس وەک موددەعی گرت، دامەنی (١٥٠٧)

ڕای دەکێشا بردی لای قازی، بەشەڕ ـــ سواری کەرکە، ئەو کەرەی بەد بەخت وفەڕ (١٥٠٨)

یان بدەیەو زەربی شەللاق تۆ جەزا ـــ هەرچلۆنت مەسڵەحەت دی تۆ سەزا (١٥٠٩)

چون بەزەجرت هەرچی گیانی بچتەدەر ـــ نیتەتۆ تاوان لەسەر، ئەو چوو هەدەر (١٥١٠)

گەر بەحەددی قازی، یەک بوو بێ گیان ـــ قازی بێ تاوانە، نینتی هیچ زەمان (١٥١١)

نـــائیبی خـــواو ســـێبەری عـــەدڵی ویـــە غـەیری وی نـەینووکی دوولا ی شـەڕ، نییـە (٥١٢

گـەر دەکـا مـەحکووم لەبەرمـەزڵووم دەکـا نەک لەبەرخۆی ئەوکەسێک مەحکووم دەکا (٥١٣

گـەر لەبـەر ڕۆژی جـەزایی و، بـۆ خـودا گەرخەتای کرد خوێن بەها، بۆی، خوا دەدا (٥١٤

ئـەو کەسـەی کوشـتی لەبـەرخۆی زامینـە ئـەو کەسـەی کوشـتی لەبـەر حـەق، ئامینـە (٥١٥

گەر لەبەر خۆی باب لەکوڕ داو گیان بدا خـوێن بـەهای وی، بـاب دەبێ بی کـا ئـەدا (٥١٦

چون لەبەر خۆی لەو کوڕەی خۆی زارییە خزمـەتی بـاب گـەرچی سـەر کـوڕ، واجیبـە (٥١٧

گـەر موعـەللیم دای لەمنـداڵ بـوو تەلـەف سـەر موعـەللیم هـیچ نییـە، جـا (لا تخفْ ) (٥١٨

چـون موعـەللیم بـۆ خوداوەنـد جـێ نشـین وایـــەحوکمی هەرکەســێکی بـــێ، ئـــەمین (٥١٩

خزمـــەتی وەســـتای لەســـەر واجـــب نییـــە ئــەو بەلێــدان هــیچ لــەوی تالیــب نییــە (٥٢٠

بـاب لەبـەرخۆی دای لـەکوڕ محکـەم وەهـا بۆیـەواجب بـوو لەسـەر وی، خـوێن بـەها (٥٢١

لـەو خـودی خـۆت جا ئـەتۆ زوو، ببڕە سـەر چەشنی دەروێش ئەو خودی خۆت، دەرکەدەر (٥٢٢

ئیمـەنی، هـەرچی بکـەی، گـەر بـێ خـودی (مارمیـــت اذرمیـــت)ەت، تـــۆ کـــەدی (٥٢٣

حـەق زەمانـەت دارەبـۆ وی، نـەک ئـەمین شـەرحی وی کـوت ئاشـکرا فیقهـی مـوبین (٥٢٤

هەردوکانەی هـەیتی سـەو دای خـاس بـەوی فـەقری بـەس تێـدا، دوکـانی مەسـنەوی (٥٢٥

چـەرمی چـاکی نێـو دووکان،کـەففاش، هـەس دار لـــەوێ بـــۆ قـــالیبی کەوشـــانەبەس (٥٢٦

لای بـــەزاز ئەبریشـــەم و ئەدکـــەن، هەیـــە بـۆ گـەزو، بـۆ میتـرە، گـەر ئاهـەن، هەیـە (٥٢٧

مەسـنەوی مـە، بـەس دوکـانی وەحدەتـە غـەیری وەحـدەت هـەرچی بی بینی، بوتـە (٥٢٨

مـەدحی بـوت، بۆ داوی عامـەت بێ، لـەلا وەک تـۆ بیسـتت( الغـرا نیـق العـلا ) (٥٢٩

زوو دەسوورەی نـەجمی دا، خوێند ئەو وتە ئیمتیحـان بـوو، هـیچ نـەبوو لـەو سـوورەتە (٥٣٠

چوونەسـەجدەکافران گشـت ئـەو دەمـی ڕازی ئـەو گوفتـارەوا بـوو، ئـەی عـەمی (٥٣١

پاش ئەوەش هەس، پر خەم و پێچ، یەک وُتار دێـو، مەکـەئاڵۆز، سـولەیمان، بگرەیـار (٥٣٢

مـا جـەڕای سـۆفی کـە، گـەڵ قـازی بـەیان هـەم سـتەمکاری زەعیـف و ناتـەوان (٥٣٣

قـازی دەیکـوت بێژەسـۆفی ئیـدديعات حـوکمی لازم تـا کـو سـادر کـەم، لـەلات (٥٣٤

لێـدەرت کوا؟کـوا مەحـەللی ئینتیقـام؟ وەک خەیاڵەئـەو هـە، هێن هـەیتی سـەقام (٥٣٥

حـوکمی شـەرعی بـۆ تـەواناو زینـدووە حوکمی شـەرعی کوا لـەبۆ گیان دەرچووە؟ (٥٣٦

ئـەو فەقیرانـەی لەفـەقران بـێ سـەرن خـۆ لـەمردوو سـەت کـەڕەت فـانی تـرن (٥٣٧

چـون فـەنای مـردوو لەیـەک ڕێگایەبـەس ئـەو فـەنای سـۆفی لەسـەت لا، دیتـەدەس (٥٣٨

مەرگی تەن یەک قەتڵە، ئەوهەش سەت هەزار    خوێن بەها بۆ یەک یەکەی وان،بێ ژمار (١٥٣٩)

ئەو گرووهەی گەرچی کوشت زۆر جار خودا    خوێن بەهای وانی بەبێ ئەژمار دەدا (١٥٤٠)

هەر وەکوو جەرجیس کەگیانی دا، نیهان    زیاد لەسەت جار هاتەوەبەر وی گیان (١٥٤١)

جا، لەزەوقی تیغی زاتی دادگەر    کوشتە، دەی وێ، زەخمی دیکەی بێتەسەر (١٥٤٢)

سوێن دەخۆم، عاشق بەخوای عەدڵ و ویداد    قەتڵی دووەم خۆشترەلای وی زیاد (١٥٤٣)

پێیدەکوت قازی قەزام بۆ زیندووە    نیمەقازی بۆ ئەوەی گیان دەرچووە (١٥٤٤)

گەرچی ئەو شەخسەبەزاهیر زیندووە    ئەو بەڵام خۆ مردووە، گیان دەرچووە (١٥٤٥)

زۆر کەڕەت مردووت لەگۆڕ دا دیوە،خۆ    ئێستەنێو مردوو ببینەگۆڕ ئەتۆ (١٥٤٦)

گەر لەگۆڕ خشتێک بەسەرتۆ هاتەخوار    کوا لەگۆڕ شاکی دەبێ عاقڵ چ جار؟ (١٥٤٧)

تۆ لەمردوو مەگرەتۆڵەو ئینتیقام    شەڕ، مەکەتۆ، قەت دەگەڵ نەقشی حەمام (١٥٤٨)

شوکری خوا کە، لێی نەدای گەر گیاندار    چون دەکاتن زیندوو کاری کردگار (١٥٤٩)

خەشمی زیندوو خەشمی زاتی خوایەخۆ    چون بەحەق ئەو جوانە، وا سەر پایە، خۆ (١٥٥٠)

حەق ئەوی کوشت فووی دەنێو پایان دەکرد    چەشنی قەسساب، پێستی سەروی، لا دەبرد (١٥٥١)

فوو دەنێو، وی دا دەمێنێ، تا مەئاب    فووی خوداوەند، خۆ نییەوەک فووی قەساب (١٥٥٢)

فەرقەبەینی ئەو دوو فوویەئاشکار    فووی‌خوداجوان،فووی‌قەساب گشت عەیب‌وعار (١٥٥٣)

فووی قەساب دەبڕێ حەیات و، بوو موزیڕ    فووی خوداوەند ژین دەداتن موستەمیڕ (١٥٥٤)

فووی خودا ناکرێ بەهیچ ئەزمان بەیان    تۆ لەژێر چاڵ دەرکەوە، سەر ساختومان (١٥٥٥)

شەر ع و عاقڵ،کوا قەبووڵیان بوو، چ جار؟    یەک نەفەر بێ، سواری کەر،کا،نەقشی دار (١٥٥٦)

ئەو نەبوو لائیق، لەکەر بێتن سووار    ئەو دەبێ بگرێ لەنێو تابووت قەرار (١٥٥٧)

زوڵم و زۆر یانی لەجێی خۆ، دا نەنان    تۆ نەکەی زایع بەزوڵم و زۆر، چ ئان (١٥٥٨)

پێیدەکوت سۆفی مەگەر لات وایەخاس؟    لێم بدا ئەو هەر بەهیچێ و، بێ قیساس (١٥٥٩)

کوا ڕەوایە، ورچی وا گەو رەو نەباش    بێ وەبەر زللان بدا سۆفیان بەلاش؟ (١٥٦٠)

قازی پێیکوت چیت هەیەتۆ، زۆرو کەم؟    دا ی جواب بەو، من هەمەبەس، شەش درەم (١٥٦١)

قازی پێیکوت سێ درەم بۆتۆ بەسە    سێ یەکەی دیش بەو بدەتۆ، بێ قسە (١٥٦٢)

زارو ڕەنجووروو فەقیرەو ناتەوان    سێ درەم لازمیەبۆ پیوازو نان (١٥٦٣)

پشت ملی قازی لەناکاو دی بەچاو    پشت ملی سۆفی لەلای وی ناتەواو (١٥٦٤)

دەستی بۆ سەر برد، بۆ زللەی قەفا    خۆ قیساسیم کەم بەهایەکەم جەفا (١٥٦٥)

هاتـەلای گـوێی قـازی وەک بێـژێ وتـار
زللـەیێکی جـا، بـەقازی کـرد نیسـار

هـەر شەشـان بگـرن کوتی، ئـەی دوو نـەیار
تـا نـەجاتم بـێ لەبـەحس و عـەیب و عـار

**تووڕەبوونی قازی بەسەبەب زللەلێدانی دەروێش لەوی وسەرزەنیش کردنی سۆفی قازییە..**

تووڕەبــووو قــازی،کوتی ســۆفی نەکــەی
حـوکمی تـۆ عەدڵـە، دروسـتە،خۆ، نەغـەی

تۆ ئەوەی خـۆت ناتهـەوێ ئـەی شێخی دیـن
بۆ برای خـۆت دەت هـەوێ،چۆن ئـەی ئـەمین؟

تۆ مەگەر نەت بیست لەکەس ئەی با کەماڵ
چاڵەهەڵقــەن بــۆ بــرا، خــۆی کەوتــەچاڵ

(من حفر بئرا) مەگـەر نـەت خوێند چ جار
هــەرچی خوێنــدت، تــۆ بکەبــەو، ئیعتیبــار

حـوکمی تـۆ ئـەو هـەت وەهـا بـوو نێـو قـەزا
زللــەیێکی محکــەمت، هــات ســەر قــەفا

خـــوا دەزانـــێ حوکمـــەکانی دیکەشـــت
چۆن دەکەن تاریک چرای ڕوون و گەشت

تـۆ، بەیـەک زاڵـم دەکـەی ڕەحـم وکـەرەم
پێم دەڵـەی تـۆ بەستە، بۆ ژین، سێ درەم

دەســـتی زاڵـــم ببڕەکـــوا بـــوو، وا، ڕەوا
تـۆ بەسـوودی وی بـدەی حوکمـت وەهـا؟

تـۆ وەکـوو ئـەو بزنـەوای ئـەی دوور لـەداد
شـــیر بداتەبەچکەیـــەک، گـــورگی نیـــزاد

قـــازی دەیکـــوت واجبەهـــەن بـــێ، ڕەزا
بـۆ قـــەفاو بـــۆ هەرجـــەفای بیـــدا، قـــەزا

مــن لەتەقــدیر بــووم دەبــاتین خۆشــحاڵ
گـەرچی گرژم، چـون بەحـەق کوتراوە، تاڵ

ئـەو دڵـەی مـن باغـە، چـاوم هـەوری ڕەش
شـین دەکـا هـەو رو،دەبـێ بـاغ شـادوگەش

پێکــەنینی دوور لەســـوودی ڕۆژ، دەقــات
بـاغی شـادو گـەش دەبـا بـۆ لای مـەمات

ئەمری حەق (وا بکوا کثیرا) خوێندووتـە، تۆ
وەک ســەری بــرژاوو، خەنــدانی، لــەبۆ؟

چەشنی شەم تۆ، ڕوون دەکەی ماڵت، تەواو
گـەر برێـژی ئەشـک و فرمێسـکان لـەچاو

تووڕەبــــوونی دایــــک و بابــــانی منــــاڵ
دوور دەکــاتن لــەوزییان و ژینــی تــاڵ

زەخمــی خەنـدەت دیوەئـەی بێهوودەخەنـد
چـاو لـەزەوقی گریەکـە، ئـەو کـانی قەنـد

گـەر بـەیادی دوو زەخـت بـێ تـۆ، گـرین
زۆر لەجەننــەت چــاترە، دوو زەخ، یــەقین

پێکــەنین، نێــو شــین و گریانــان نیهــان
گـەنج لـەوێرانـان تەڵبکـە، ئـەی فـلان

خۆشـیەنێو غــەم، ڕێگــەیان، ون کــردووە
ئــاوی ژینیــان، نێــو زوڵمــات بــردووە

ئـەهلی ئیـزلال هـەن لـەڕێگا، بـێ ژمـار
ئیحتیـات کـە، ون نـەبێ لێـت، ڕێ، چ جـار

چاوەکانــت چوارکــە، تــۆ، بــۆ ئیعتیبــار
یـار کە،گەڵ دوو چاوی خۆت، دوو چاوی یار

(امــرهم شــوری ) بخوێنــەنێو ســوحوف
یـار بـە، بۆ وی،قـەت مـەڵێ بەو، ئاهو، ئۆف

یـار لـەڕێگا دا پەنایـەو پشـتەخۆ    یـارە، ڕێ، گـەر کـو دەقیـق بنـواڕی تـۆ (۱۵۹۱)

تۆ لـەنێو یـاران خـەمووش بـە، ئـەی فـەهیم    خۆت نەکەی بۆ حەڵقەکەی وان، وەک نـەقیم (۱۵۹۲)

چلو لـەنوێژی جومعەکـە، تـۆ، زۆر بـەهۆش    پێکـەوەن عالـەم، بەیـەک فیکـرو خـەمۆش (۱۵۹۳)

لای خەمۆشی و، بێ سـەداییت، بێ سـەفەر    گەر ڕەفیقت ویست، مەدە،خۆت بەر نـەزەر (۱۵۹۴)

ولی نـەبی کـوت، تـۆ لـەنێو دەریـای هەمـووم    بـۆ هیدایـەت، بگرەیارانـت، نجـووم (۱۵۹۵)

چـاو لەئەسـتێران کـە، ڕێ، پەیداکـەتۆ    تێـک دەدا ئـەفکار، چـون گوفتـار خـۆ (۱۵۹۶)

یەک دووحەرفت گەرئەتۆ،کوت ڕاست و باش    دێ بەدووی وان حەرفی زۆر پووچ وبەلاش (۱۵۹۷)

تۆ مەگەر نەت خوێندووە، ئەی خۆشمەرام    گشـت وتـان سـاحەب لکـن دێـنن کـەلام (۱۵۹۸)

جـا بەحـەرفی بـاش نەکـەی تـۆ ئیبتیـدا    چـون وتـار دێنـێ، وتـاری دی، جـودا (۱۵۹۹)

تـی، ئـەتۆ موختـار ئەگـەر، وەت کـرد، زار    چون لـەدووی باش بێ گومان دێ، نالەبار (۱۶۰۰)

ئەوکەسـەی مەعسـوومی وەحیـی کردگـار    چونکەباشە،گشـتی، وەیکـا، چاکـەزار (۱۶۰۱)

جون ڕەسوول نـاڵی لـەڕێی، ویسـت و هـەوا    کـوا هـەوا دێـتن لەمەعسـوومی خـودا؟ (۱۶۰۲)

بـۆ وتـار حـاڵی شـهوودت بـێ دەلیـل    تـا نـەبی وەک مـن ئەسـیری قـاڵ و قیـل (۱۶۰۳)

**پرسیار ئەو سۆفیەلەقازی ..**

سۆفی پێیکوت بۆ لەیـەک مەعـدەن تـەلا    یـەک بـەهادار، قیسـمەتێکیش کـەم بـەها؟ (۱۶۰۴)

خـالقی ئینسـان بـەعام هـەر خوایـەخۆ    یـەک گـەلێک وشیارە، یـەک نادان، لەبۆ؟ (۱۶۰۵)

خـۆ لەیـەک دەریـا ڕەوان بـوون جۆیبـار    بۆ یـەکێک شیرین،یەکێک وەک ژەهـری مـار؟ (۱۶۰۶)

گەرهـەموو ئـەنوار لـەڕۆژڕا، دێنـەدی    سوبحی سادق، سوبحی کازب، بـۆ ئـەدی؟ (۱۶۰۷)

گـەر لـەبۆ بینـا بەعام،یـەک کـل هـەبوو    بۆ یەکێک، یەک، یەک دەبینێ، یەک بەدووو؟ (۱۶۰۸)

گەر ئەمیر بۆ زەربی سککان بـەس خـودا    بـۆ خـەراپ و بـاش دەو سـککانەدا (۱۶۰۹)

گـەر خوداوەنـد ڕێـی حـەقیقی دا نیشـان    بۆیـەکێک بـۆ دز، یـەکێک بـۆ پاسـەوان (۱۶۱۰)

گـەر یـەقین بـوو،( الولـد سـر ابیـە)    چۆ ن لەیەک زگ دێنەدەر، حوڕڕو، سەفیە (۱۶۱۱)

کێیە، ئەوکەس دی، لەوەحدەت سەت هەزار؟    سـەت هـەزاران زیاد،تەکان،چاکا،قـەرار (۱۶۱۲)

**جواب دانەوەی قازی بەسۆفی ..**

ولی بەسۆفی، قازی ئەو چەل جوا ب دەدا    بـۆ میسـالێک بگرەگـوێ، لـەو بـارەدا (۱۶۱۳)

وەک تـەکان و بـێ قـەراری عاشـقان    دێنـەدەس، لـەو بـێ تـەکانی دڵسـتان (۱۶۱۴)

ئەو وەکوو کێو بوو لەنێو ناز ئیستیوار — عاشقان، لەرزان، بەچەشنی بەرگی دار (۵

پێکەنینی وی دروستی کرد شین — ئاوی ڕووی برد، ئاوی ڕووی ئەو نازەنین (۶

گشتی مەخلووقات و مەو جوودی جیهان — بێ قەرارن، وەک کەفی دەریایەوان (۷

بێ شەریکەو زید لەزات دا، هەم عەمەل — بۆیەپۆشی ئەو بەمەوجوودات، حولەل (۸

چۆن دەبەخشێ، زید بەزید هەستی چ جار؟ — بەل دەکا بێ شک، لەبەر زید، زید، فیرار (۹

نید، بەمانای میسلە، میسلی باش و بەد — میسل، میسلی خۆی دروست ناکا، ئەبەد (۰

دوو مەسیل گەر مەبدەئی هەستی ببان — چۆن دەخیلقەت، یەک دەبوو چاتر لەوان (۱

چەشنی بەرگی دارو بێستان زیدد و نید — وەک کەفن، سەر ئەو یەمەی بێ نیددو زید (۲

وەسفی ئەوسافی خودا ناکرێ چ جار — چۆنیەتی ناگرێ، دەبێ چوون، قەت قەرار (۳

کەمترین مەسنووعی وی بوو،گیانی تۆ — چۆنیەتی نایێ، لەهەرچی، گیانەخۆ (۴

ئەو یەمەی کە، نین لەوی حاڵی، چ ئان — زەڕڕەیەک، هەم جیسموتەن هەم عەقڵوگیان (۵

بۆی لەتەنگنای چەند و چوون، جێگا، نییە — عەقڵی کوللیش خۆ لەوێ، زانا نییە (۶

جا بەتەن بێژێت عەقڵ، تۆ، ئەی جەماد — تۆ، چ بۆنت برد لەو بەحری مەعاد؟ (۷

تەن دەڵێ من سێبەری تۆم، بێ گومان — کێ لەسێبەر ویستی یاری، مامەگیان؟ (۸

عەقڵ بێژیت ئێرەئەو جێگا نییە — شارەزا ڕووی زیا د، لەوەی، زانا نییە (۹

لێرەدا جا، ڕۆژی ڕوونی ئەنوەری — خزمەتی زەڕڕەی دەکا، وەک نۆ کەری (۰

لێرەشێر تەعزیمی ئاهووی بوو بەکار — لێرەبۆ مەل ؛ باز دەکا خۆی پەست و خوار (۱

بەو وتانەت گەر ئەتۆ باوەڕ نەبێ — چۆن دوعای داوا لەمسکین کرد، نەبی (۲

گەر بڵەی تۆ، ئەو لەبەر تەعلیم بوو — کەی چ کات، تەجهیل، لەبەر تەفهیم بوو؟ (۳

بەڵکەدەیزانی کەگەنجی شاهوار — نێو کەلاوان دا دەنێ، ئەو شەهریار (۴

خۆ کەلاوان ڕاز دەکەن ئاشکار، بەلام — بەد گومانی ون دەکا ڕێگا، لەعام (۵

بەل، حەقیقەت نێو حەقیقەت بوو غەریق — بۆیەحەفتا، بەڵکەچابوون، سەت فەریق (۶

من لەبۆ تۆم کرد و تاری پووچ بەیان — واز کەسۆفی ئێستە تۆش،جا، گوێی گیان (۷

هەر بەڵایەک گەر لەئاسمان هاتەلات — تۆ لەپاشان مونتەزیر بە، بۆ خەلات (۸

ئەو، نەئەو شا یە، کەلێت دا زللەسەخت — پێت نەدا، جا، دوایەئەو هیچ تاج و تەخت (۹

باڵی پێشکە، بۆ هەموو دونیا بەها — زللەیەک هەیتی عیوەز، بێ مونتەها (۰

مل، لەتۆقی زێڕی دونیا دە، نەجات — بگرەزللەی کردگارت تۆ خەلات (۱

چــون بــەڵایان زۆر بەســەرهات ئــەنبیا سـەرفیرازی هــەردوو دونیــابوون وەهــا (۱۶۴۲)
خۆت بەڵام حازر کەزۆر چاک، ئەی فەتا ئــەو ببینــی تــۆ لــەماڵی دڵ، هــەتا (۱۶۴۳)
خۆ دەنا، ئـەو دیتـەدەر، خەلعـەت بـەدەس چونکەنەمـدی من،لـەنێو ئـەو ماڵە،کـەس (۱۶۴۴)

## دووبارەپرسیاری سۆفی لەقازی ..

پێیـدەکوت سـۆفی لەبـەرچی بوو،جیهـان نـەی ڕژانـد ڕەحمـەت لەسـەرعام،جاویدان (۱۶۴۵)
ئیزتیرابـــی قـــەت نەهینابایـــەپێش قـــەت بەتـــەلوینات نەیـــدابا، چ ئـــێش (۱۶۴۶)
نەیدزی با، شەو، چرای ڕۆژ قەت، چ جار لای نـەنا بـادەی، چ جـار، عەیشـی بـەهار (۱۶۴۷)
جـامی سـاغی ورد نـەکردبا بـەردی تـەب ئیمەنیشـی قـەت نـەکردبا، بیم،کـوڕەب (۱۶۴۸)
چـی دەبـوو کـەم ئـەو لـەجوودو ڕەحمـەتی گـەر نـەبان دەرد و بـەڵا، نێـو نیعمـەتی؟ (۱۶۴۹)

## جواب دانەوەی قازی بەپرسیاری سۆفی و میسال هینانەوەی قازی بەتورک و خەییات ..

قـازی پێیکـوت بـەس بـڕۆ تـۆ سەرسـەری ئـەی لـەهۆش و زیرەکـی زۆر، تـۆ بـەری (۱۶۵۰)
تـۆ مەگـەر نـەت بیسـتووەئەو خـۆش بـەیان مـەکری خـەییاتانی کرد، یـەک شـەو بـەیان (۱۶۵۱)
چـون دزی خـەییاتی بیس بـوو، ئـەو لـەپێش هەر وەهاش دەیکرد، بەجوززار، پێش کێش (۱۶۵۲)
باسـی لـەت لـەت کردنـی پارچـەو، بـڕین دەیکـوت ئـەو جـا، بـۆ عمـوومی حـازرین (۱۶۵۳)
ئـەو لەدزنامـەی دەکـرد، داسـتان بـەیان جـا لـەدەوری کـۆ دەبـوون پیـرو جـەوان (۱۶۵۴)
چونکـەدیتی گفتـی وی کـردی ئەسـەر بـۆ حیکایـەت خـۆی، لـەپێ تـا تـۆقی سـەر (۱۶۵۵)

## قال النبی علیەالسلام، ان اللەیلقن الحکمەعلی لسان الواعظین بقدر همم المستمعین ..

گوێ گرن، باعیس کە یەک بوو خۆش بەیان بـەس لەشـاگرد، بـۆ موعـەللیم دێ، تـەوان (۱۶۵۶)
گەر کەسێک چەنگ لێبداتن بیست و چوار گوێ گری گـەرکو نـەبێ، چـەنگ بوو، بەبار (۱۶۵۷)
ئـەو لـەیادی د ەر دەچـێ قـام و غـەزەل هـیچ تـەکان نـاخۆن قـامکی بـۆ عەمـەل (۱۶۵۸)
گـەر نـەبا قـەت هـیچ گوێیـەک غیـب گیـر وەحی ئاسمان کوا دەهات بۆ یـەک بەشیر؟ (۱۶۵۹)
گـــەر نـــەباناهیچ چـــاوی ســـونع بـــین ئاسمان هـیچ، نـەی دەبـوو عەردیش،کـەنین (۱۶۶۰)
بۆیـە( لـولاک ) هـات لـەلای پـەروەردگار دێ فەقـەت، بۆ چاوی تیژ، خیلقـەت بـەکار (۱۶۶۱)
چونکەشـەهوەت هـەم غـەزا، بـۆ عـام مـەرام کـوا دەبـن عاشـق بەسـونعی لایـەنام؟ (۱۶۶۲)
ئـــاوی توتمـــاج نـــاڕژێنی نێـــو تـــەغار گەر نەبن لات، سەی خورەندە، سێ و چوار (۱۶۶۳)

خۆت کەسەی کەهفی خودایی زاتی خوای — لەو تەغارەت، تا نەجات دا، ئیستیفای (۶۶۴)

ئەو کەدەیکوت چۆن دەیان کرد، دز، دزی — چۆن لەلای وان بۆی دەهات ویجدان کزی (۶۶۵)

دەو دەمەی دا هات تورکێک لای خیتا — توورەبوو بێ حەد کەلاچووبوو، غیتا (۶۶۶)

رازی وەک رۆژ روون دەکردن، ئەو بەشەو — بۆ کەسانێک ساحەبی عەقڵی پتەو (۶۶۷)

تۆ لەهەرجێت دی، دوو کەس دەعوا دەکەن — رازی یەکتر بۆ عمووم ئیفشا، دەکەن (۶۶۸)

چاک بزانەتۆ، کەئەو دەم مەحشەرە — سوور، ئەو دەم، ئەوگەرووی راز بێژەرە (۶۶۹)

عیللەتی خەشمی دروست کرد، کردگار — ئەو فەزایح بوو ن لەعالەم، ئاشکار (۶۷۰)

هێندەباسی غەدری خەیاتانی کرد — تورکی بۆ لای قەهرو خەشم و دەرد، دەبرد (۶۷۱)

دەیکوت ئەی قەسساس، لەشاری ئێوە دا — کێیە ئەو کەس، چاک دەکا مەکران ئەدا؟ (۶۷۲)

**ئیددیعاکردنی تورک وگرێو کردنی وی کەخەییات ناتوانێ هیچ لەمن بدزێ ..**

پێیدەکوت خەییاتە کە، نێو، پووری شو ش — چوست و چالاک و دزێکەخەڵق کوش (۶۷۳)

تورکەدەیکوت گەرچی بش کا، فێڵ هەزار — غەیرەمومکین لام بەرێ، یەک دانەتار (۶۷۴)

جا دەیانکوت بەو کەزۆر چوست تر لەتۆ — ماتی وی بوون، دوور کەلەو دەعوایەخۆ (۶۷۵)

تۆ، مەبە، مغروور بەعەقڵت وا، دەنا — زوو بەفێڵی وی دەبی، مەفح و فەنا (۶۷۶)

تورکەبوو زیاتر حەریس، بەستی گرێو — هیچ نەبا، ئەو، من دەکەم مەعلووم لێو (۶۷۷)

موتمیعان بێ حەد تەماعیان خستەبەر — رەهنی دانا، شەرت و مەرجی کرد لەسەر (۶۷۸)

دادەنێم لاتان گرێو، من ئەسپی باش — پێو دەدەم گەر، لێم بەفێڵ بدزێ قوماش (۶۷۹)

ئەسپی ئێوە، من دەسێنم لێو ئەگەر — نەیتوانی، چون گرێو مان کرد لەسەر (۶۸۰)

تورکەئەو شەو، هیچ نەنوست تا کو سەحەر — هەرخەیاڵی جەنگی گەڵ دز، بوو لەسەر (۶۸۱)

گەر بەیان هات پارچەکەی هەڵگرت زوو — ئەو لەبۆ دوو کانی ئەو فێڵبازەچوو (۶۸۲)

جا، سەلامی کرد لەوەستا زۆر بەجۆش — راپەری دای بەو جەواب، زۆر نەرم و خۆش (۶۸۳)

حاڵی تورکەی زیاد لەحەد کرد پرسیار — تا دەقەلبی تورکەئەو گرتی قەرار (۶۸۴)

چون لەوی دی، خۆشنەوایی وڕووگوڵی — دایدەنا، بۆی، ئەتڵەسی ئیستەنبوڵی (۶۸۵)

لەو هەبیرەبۆم عەبا، بۆ رۆژی جەنگ — ژێری نافم واسیع و، لای ژوور تەنگ (۶۸۶)

تەنگ ژوور تا چاک بگرێتن بەدەن — ژێر گوشاد، تا لاق دەویدا، گیر نەکەن (۶۸۷)

پێیدەکوت ئەمرت موتاع، ئەی میهرەبان — بۆ قەبووڵ، دوو دەستی سەرچاو دادەنان (۶۸۸)

میتـری کـردو، چـاک دیتـی ڕوویـی کـار — جـا لـەبۆ بێهـوودە، وەی کـرد لێـوو، زار (١٦٨٩)
لــەو حیکایــاتی ئــەمیرانی ســەلەف — لەو عەتایای ئەو گرووهەی خۆش هەدەف (١٦٩٠)
لـەو خەسیسـانەی کـەکۆیان کـرد مـاڵ — زۆر قسـەی کـرد، تابکـا ئـەو شـاد حـاڵ (١٦٩١)
چوست و چالاک یەک مقەستی خستەدەر — دەی بـڕی وەلێـو پـڕ لـەگفتی وەک شـەکەر (١٦٩٢)

## شۆخی کوتنی خەییات وبەستنی تورک لەشیددەتی پێکەنین دووچاوی تەنگی خۆی، وفرسەت وەدەس هینانی خەییات ..

پێکــەنی تورکەکەبیســتی داســتان — چـاوی تـەنگی بەسـترا، جـا، ئـەو زەمـان (١٦٩٣)
قیســمەتێکی ئـەو دزی نـای ژێـری ڕان — غەیری حەق ئەو بوو لەگشت ئەحیا، نیهان (١٦٩٤)
خـوا ئـەوی دیـت و، بـەڵام سـەتتارە، ئـەو — زیـاد لەحـەد، بێ‌فـاش دەکـا ئـەوجارە، ئـەو (١٦٩٥)
تورکــەدی لــەززەت لەئەفســانانی وی — چــوو لــەیادی، ئیــددیعای پێشــانی وی (١٦٩٦)
ڕەهـن و پارچـەو ئیـددیعا،هیچ نـین لـەبۆی — تورکەمەستە، مەستی شۆخی کـاکی خـۆی (١٦٩٧)
ئیلتیماسـی تورکـەکرد، تـۆ بـی و، خــودا — بێژەشـۆخی چـون لـەبۆ مـن، بـۆ غــەزا (١٦٩٨)
شـۆخی یێکـی دی دەکـوت، ئـەو نالـەبار — جـا، بـەرەو پشـت ئـەو بـەقاقا، کەوتـەخوار (١٦٩٩)
قیســمەتێکی پارچــەزووکرد ئـەو، نیهــان — غەفڵـەتی بـوو تورکـە، هـێن بـوو شـادمان (١٧٠٠)
جاری سێهەم، دەیکوت ئەو تـورکی خیتـا — شـۆخی یێکـی دی بلـێ، بـۆم، تـۆ خـودا (١٧٠١)
شۆخی یێکی کوت، کەزۆر بوو خەندەدار — جا تەواو ئەو تورکی کرد، ئەو دەم، شکار (١٧٠٢)
کوێروحەیران، عەقڵ وهۆشیش هیچ کەنین — مەسـتی کـرد ئـەو تورکـە، قاقـاو پێکـەنین (١٧٠٣)
سێهەمین جـار، لـەو لیباسـەی کـرد، دزیـن — چونکــەدای بــەو، فرســەتی زۆر، پێکــەنین (١٧٠٤)
جاری چوارەم گـەر کـو ئـەو تـورکی خیتـا — جــۆک و شــۆخی کردلەوەســتا، ئیقتیــزا (١٧٠٥)
ڕەحمـی هـات بـەو تورکەئـەو وەستایەجا — فێڵـی دیکـەی هـیچ نـەدی بـۆ وی ڕەوا (١٧٠٦)
ئـەوکوتی زۆر بـوو حـەریس بـۆ گفتـی مـن — بێ خەبـەر بـوو چـەن زیـانی هـەن، لـەبن (١٧٠٧)
تورکەوەسـتای غـەڕقی ماچـان کـرد، هـەتا — داســتان و جــۆکی دی بــۆ، کــا، ئــەدا (١٧٠٨)
تـۆ فــەنای خــۆ، ئێسـتەخۆتی داسـتان — چەنـدەدەت وێ، داسـتان کـەی ئیمتیحـان؟ (١٧٠٩)
خـۆ، چ داسـتان نینـەوەک تـۆ، خەنـدەدار — بگرەسـەر گـۆڕی خەرابـەی خـۆت قـەرار (١٧١٠)
ئەی لەگۆڕی جەهل و شەک دا چوویەخوار — چەنــــدەدەت وێ داســــتانی ڕۆژگــــار؟ (١٧١١)
تاکو کەی تۆ نۆش دەکەی عیشوەی جیهان؟ — عــەقڵ و گیانـت هـیچ لـەلا، سـالم نـەمان (١٧١٢)

ئەوگەمــەی دەیکــا لــە بــۆ عــام ڕۆژگــار ... ئــاوی ڕووی وەک تــۆی دەبــردن ســەتهــەزار (
دەی بــڕێ ودەرووی، ئــەو خــەییاتی عــام ... پۆششــی ســەت ســاڵەکانی تیفلــی خــام (
شـــۆخیانی وی کـــەجوانیان دا بـــەباغ ... گەر کو دەی هات، جوانیەکان چوون بۆ قەراغ (
بــۆ گــەدایی وان، لــەپێش وی، پیــر منــاڵ ... تــا بەســـەعدو نەحســـی وی بنوارنـــەحاڵ (

**خەییات بەتورکەکەی کوت بێ دەنگ بە، چونکەئەگەر لەتیفەو جۆک و شۆخی دی بڵەم عەبایەکت تەنگ دەبێ ..**

وای بەوی خەییات دەکوت ئەی بێ هۆنەر ... یــەک لەتیفــەی دیــم، دەکــا، خۆڵــت وەســەر (٦
چون عەباکــەت تــەنگ دەبێتن بێ حیساب ... کوا دەگەڵ خۆی کەس دەکا،وا،کار خەراب؟ (٧
تـــۆ کەهۆشـــت بـــا، لـــەباتی پێکـــەنین ... خــوێن لــەچاوی تــۆ دەبــوو جــاری، بەشــین (٨

**بەیانی ئەومەتڵەکەبێکاران و ئەفسانەخوازان وەک ئەو تورکەوان، ودونیـای فـەریبکارو زاڵم وەک ئەو خەییاتە، وشـەهوەت و ژن وەک شۆخی لەتیفـەکانی ئـەو دونیایـەوان، وعومر،وە وەک ئەو پارچەئەتڵەسەی لای خەییاتە بۆ عەباو لیباسی تەقوا دروست کردن**

ئەتڵەسی عــومرت بــەدەس قــەیچی شــهوور ... پارەپـــارەی کـــرد خـــەییاتی غـــروور (٩٠
دەتهـــەوێ ئەســـتێرەکەی تـــۆ بـــەردوام ... شــۆخی خۆشی سەعدی تۆی، بێتن کەلام (٩١
نفرەتــت زۆر بوولەگشــت نەحســـاتی وی ... هــەم لەعیشــوەو، کینــە، هــەم ئافــاتی وی (٩٢
تــۆ دەکـــەن زۆر دەردەدارو زۆر غـــەمین ... نەحس وخامووش بوونی وی، هەم قەبزو کین (٩٣
زوهرەناکــا، ڕەقــس و شــادی ئێســتەبۆ؟ ... ســەعدو نەحســی وی، مەکەقــەت، تەکیــەتۆ (٩٤
پێــت دەڵــێ ئەســتێرەکەت ئێســتا ئەگــەر ... زیــاد بکــەم شــۆخی دەکــەی تــۆ زۆر زەرەر (٩٥
تـــۆ مـــەنۆڕەفێڵی ئەســـتێران چ جـــار ... عاشــقی فێڵبــازی تــۆ، ئــەی پەســت و خــوار (٩٦

**مەسەل ..**

یــەک نەفــەر دەی ویســت بچێ بۆ لای دوکان ... دی کــەڕێ بەســراوە، هــێن زۆر بــوون ژنــان (٩٧
پــای دەســووتا،ئەو بەتــەعجیل، ڕێگەکــەش ... بەســـترابوو،بەو ژنانـــەی جـــوان و گـــەش (٩٨
ڕووی لەیــەک ژن کــرد کوتی ئــەی ناتــەوان ... ئێـــوەزۆرن هێنـــدەبۆ؟ ئـــەی وەک گیـــان (٩٩
ڕووی لــەوی کــرد ئــەو ژنــە، وای دا جــەواب ... زێـــدەبوونی مەت،نـــەبێ، تـــۆ لا، خـــەراب (١٠٠
جـــا تەماشـــا،گەرچی زۆریـــن خـــۆ ئەمـــە ... ئیلتیــزازو، عــەیش و هێســتاش پــێ کەمــە (١٠١

جـا لــەقاتی ژن، لیــوات ئــەنجام دەدەن　　فاعیـل و مـەفعوول، دەبـن، ڕیسـوای زەمـەن (۱۷۳۲)

تــــۆ مەنۆرەحادیســــاتی ڕۆژگـــــار　　گـەر لەگـەردوون دێـن و تـاڵ و،نـاگووار (۱۷۳۳)

تـۆ مـەنۆرەرزق و ڕۆزی هــەم مــەعاش　　تــۆ مــەنۆرەترس و قــاتی و ئیرتیعــاش (۱۷۳۴)

چـاو، کـەدونیا، بــەو هــەموو دەردانــەوە　　بێ حـەزەر، وەک تۆی گـەلێک بـەدوا نـەوە (۱۷۳۵)

ئیمتیحــانی تــاڵی یــەزدان ڕەحمەتـــە　　مـوڵکی بـەلخ و مڵکـی مـەرویش، نەقمەتـە (۱۷۳۶)

قـەت خـەلیلی ڕاو نـەنا، تـرس و تەلـەف　　ئیینـی ئەدهـەم لای دەنـا، عیـززو شـەرەف (۱۷۳۷)

نــاگرێ ئــاگر خـــەلیل و، ئەوهـــە، بــا　　بـۆ وسـوول بوویـان ئـەوان، دوو ڕێـی جـودا (۱۷۳۸)

### تیکرار کردنی سۆفی پرسیار لەقازی ..

سـۆفی دەیکـوت قـادرە، خـوای موستەعان　　گــەر بکــا، ســەو دایــی ئیتمــەبێ زییــان (۱۷۳۹)

ئــەو کەســەی ئــاگر دەکاتـــەوەردو دار　　دێ لــەدەس وی ژیــن بکــاتن، بــێ غوبــار (۱۷۴۰)

ئەوکەسـەی کـە، دەردەخـاتن گـوڵ، لـەخار　　دێ لـەدەس وی، دەی بکـا، خـوڕڕەم بـەهار (۱۷۴۱)

ئـەو کەسـەی سـەروان دەکـا بـاڵاو، جـووان　　دێ لـەدەس وی، غوسسـەدار، کـا، شـادمان (۱۷۴۲)

ئەو کەسەی کردی بەمەوجوود، گشت عـەدەم　　ڕای گـرێ داثیم ئەگەر،لـەو بـوو،چ کـەم؟ (۱۷۴۳)

ئەو کەسەی کەدای بەتـەن گیان، بۆ ژییان　　نــەی مرێنــێ گەر،لــەبۆ وی کــوا زییــان؟ (۱۷۴۴)

چـی دەبـێ گـەرکو ببەخشـێ ئـەو جـەواد　　بۆ عیباد مەقسوودی گیان، بێ، ئیجتیهاد؟ (۱۷۴۵)

دوور لەســـت و ناتــەوان کـا، نێوکــەمین　　مـەکری نـەفس و مـەکری شـەیتانی لـەعین (۱۷۴۶)

### جوا بدانەوەی قازی بەسۆفی ..

قـازی دەیکـوت گـەر نەبایەئـەمری مـوڕ　　گەرنەبان قـەت جـوان و ناحـەز، بەردو، دوڕ (۱۷۴۷)

گــەر نــەبانا، نــەفس و شــەیتان و هــەوا　　گەرنــــەبان ئاســـیب و پــــەیکارو، وەغــــا (۱۷۴۸)

جـا، بـەکام نێـوی دەکـردن گـاز، خـودا؟　　بەنـدەگان و عەبـدی خـۆی، ئـەی بـەد ئـەدا (۱۷۴۹)

چۆن بڵێ ئەو، ئـەی سـەبوورو، ئـەی حـەلیم؟　　چۆن بڵـێ ئـەو ئـەی دلێر و ئـەی حـەکیم؟ (۱۷۵۰)

ســـــابرین و ســـــادقین و مــــــونفیقین　　چـۆن دەبـوون بێ ڕێ گـرو، دێـوی لـەعین؟ (۱۷۵۱)

ڕوستەم وحەمزەو موخەننەس،یەک دەبوون　　عیلم و حیکمـەت باتیل و،مونـدەک دەبـوون (۱۷۵۲)

عیلم وحیکمـەت جیا دەکەن ڕێی بـەد، لەباش　　ڕێ کـەباش بن،گشت دەبـن حیکمـەت بـەلاش (۱۷۵۳)

تـۆ لــەبۆ دوو کــانی تــەبعی ســوێر، ئــاو　　کـوا ڕەوایەهــەردوو عالـەم کـەی خـەراو؟ (۱۷۵۴)

مــن دەزانــم تــۆ کــەپاکی خــۆ، نــەخام　　ئـەو سـوئالانەت ئـەتۆ کـرد بـۆ عـەوام (۱۷۵۵)

غەفڵەت و دووری لەحەق بێ حەد گران — خۆ لەحاس، وان سەهلەگشت ڕەنجی جیهان ۶)

چون دەڕۆن ئەو هانە، ئەو ناڕوا، بەڵام — دەو لەمەن، ئەو کەس، کەگیانی بوو بەفام ۷)

**حیکایەت لەبارەی ئەوەمەتڵەبەدا، کەسەبر دەموقابیل ڕەنجی کار ئاسانترەلەسەبر دەموقابیل فیراقی یار..**

یەک نەفەرژن هاتەلای شووی خۆی کوتی — ئەی لەژێر پێی خۆت دەنا، تۆ پیاوەتی ۸)

وەزع و حاڵم تاکو کەی ناکەی تەراز؟ — تاکو کەی بم، پەست وخوارو، بێ مراز؟ ۹)

شووکوتی خەرجت دەدەم من چاک و باش — گەرچی دەستم کورتە، نیمەبێ، تەلاش ۰)

خەرج و بەرگت واجبەخۆ ئەی سەنەم — مـن دەدەم ئەو دوانەپێت،هیچ نینەکەم ۱)

دای نیشانی وی ژن ئەمگوچکی کراس — زێدەزوورو،چڵکن و، زۆر بەد، لیباس ۲)

پێیدەکوت زۆر زوورە، ئازارم دەدا — کەس بەکەس دای قەت وەها، کیسوەو، ڕیدا ۳)

دەیکوت ئەی ژن، یەک سوئالم لێتەبەس — مـن فەقیرم هەر ئەوەندەم دێ لەدەس ۴)

ئەوهەزوورەو زۆرغەلیزەو ناپەسەند — تێ بفکرەئەی ژنی ئەندیشەمەند ۵)

ئەو هەزۆرتر زوورو ناحەز، یا تەڵاق؟ — ئەو هەناخۆشتر لەبۆ تۆ، یا فیراق؟ ۶)

جا وەهایەئەی فڵانەی بەد دەهەن — بۆ بەڵا، بۆ فەقرو،بۆ ڕەنج و میحەن ۷)

بێ گومان تەرکی هەوا تاڵی دەدا — زۆر لەوی خۆ، تاڵ ترە، دووری خودا ۸)

گەر جیهاد و ڕۆژو سەختن زۆرخەشین — باشترن ئەمما، لەدووری مومتەحین ۹)

کوا دەمێنێ ئێش؟ئەگەرکو زولمینەن — پێت بڵێتن، ئەی نەخۆشم، چۆنەتەن؟ ۰)

گەر نەڵێتن چونکەفەهمی سەختەبۆت — هەرسوئال و پرسیارەزەو قی خۆت ۱)

ئەو مەلیحانەی تەبیبی دڵ، بەئێش — لای نەخۆش بۆ پرسیار، هەر دەچنەپێش ۲)

گەرکو پەرهێزکەن لەنەنگ ونام ئەوان — ڕێ دەکەن، بۆ چارەجا، پەیغام ئەوان ۳)

یا دەدڵیان دا دەبێ ئەو موفتەکەر — نینەهیچ مەعشووق لەعاشق بێ خەبەر ۴)

تۆ کەدەت وێتن عەجائیب داستان — زەمزەمەی کە، داستانی عاشقان ۵)

گەرچی عومرت زێدەکرد و زێدەمای — هێستەخامی، چۆن هەوەڵ بووی هەر وەهای ۶)

تۆ لەعومرت زێدەدیتت، عەدڵ و داد — لەو نەدیتوان، بێ خەبەرتربووی، زیاد ۷)

بوو بەوەستا، هەرچی شاگرد بوو، هەوەڵ — تۆ لەبۆ دواتر دەچی، کوێری چەپەڵ ۸)

فێر نەبووی تۆ، هیچ لەدایک و باب چ جار — ئەو شەوو ڕۆژەش، لەلات بێ ئیعتیبار ۹)

**مەسەل ..**

عارفێک پرسی لەیەک پیری کەشیش    بێژەبۆمن تۆی موسین تر،یا نە، ڕیش؟ (١٧٨٠)

پێیدەکوت نا،من لەپێش ڕیش هاتمەدی    من بەبێ ڕیشیش، جیهانم زۆر دەدی (١٧٨١)

پێیدەکوت ڕیشت سپی بوو، چۆنەحاڵ؟    خووی کەسیفت ماوەهەر وای بێ جەماڵ (١٧٨٢)

ئەو لەپاش تۆ هات لەتۆش جا تێپەڕی    ئێستەکەش خواهانی دونیای پڕ شەڕی (١٧٨٣)

تۆ لەئەووەڵ هەرچلۆن بووی هەر وەهای    یەک قەدەم بۆ پێش نەچووی، جا، وا دەمای (١٧٨٤)

چەشنی دۆی ترشی لەنێو یەک مەشکەدا    نەت دەکرد لەو دۆیەتۆ، هیچ ڕۆن جودا (١٧٨٥)

گەرچی عومرێک نێو تەنووری پڕ گڕی    هەر هەویری، تۆ لەنێو خومرەی قوڕی (١٧٨٦)

وەک گیای نێو قوڕ، لەسەر یەک تەپکەوای    گەرچی سەرگەشتە، بەدەستی بای هەوای (١٧٨٧)

قەومی مووسا، مان لەنێو گەرمایی تیە    تۆش دەمای چل ساڵ،لەجێی خۆت، ئەی سەفیە (١٧٨٨)

تاکو شەو دێ توند دەڕۆی تۆ،گشت بەیان    وەک هەوەڵ تۆ، خۆت دەبینی بێ تەکان (١٧٨٩)

بوعدی سێ سەت ساڵەڕێ، دژوارەبۆت    تا کو مەعشووق بێت ئەو گوێلپارە، بۆت (١٧٩٠)

تا لەگیانیان عیشقی گوێلک دەر نەچوو    تیە، لەبۆ وان بێ حیساب، گەرما دەبوو (١٧٩١)

غەیری ئەو گوێلکەی کەحەق، داویە، بەتۆ    بێ نیهایەت نیعمەتی دیت، دیوەخۆ (١٧٩٢)

گاو تەبعی،بۆیەچاکەی وا عەزیم    عیشقی گوێلک کردی نێو قەلبت، عەدیم (١٧٩٣)

تۆ لەئەجزات پرسیار کە، وەزع و حاڵ    چون زبانیان زۆرە ئەو ئەجزایی لاڵ (١٧٩٤)

بێنەبیر خۆت، نیعمەتانی کردگار    بوو ن لەنێو ئەو ڕاقی ڕۆژگار، نادیار (١٧٩٥)

ڕۆژو شەو خواهانی ئەفسانانی تۆ    یەک بەیەک، ئەجزات دەڵێن داستانی تۆ (١٧٩٦)

لەو دەمەی ئەجزات بەجێ یان هێشت عەدەم    بێ ژماریان دیت شادی و دەردو غەم (١٧٩٧)

چون بەبێ لەززەت، وەدی نایەت، چ جوزو    دەردو غەم لاواز دەکەن، ئەجزاوو، عوزو (١٧٩٨)

چوون هەموو خۆشی لەیاد، ئەجزا دەمان    خۆشییان هەر هەن، لەپێنج و حەو، نیهان (١٧٩٩)

هەر وەکوو هاوین کەپەنبەی دا، زییاد    پەنبەهەر ما، چوو بەلام، هاوین لەیاد (١٨٠٠)

یانەوەک یەخ، وەختی زستان چا دەبێ    ون دەبێ زستان و، یەخ هەروا دەبێ (١٨٠١)

یەخ لەبۆ سەرمای شەدید بوو یادگار    یادگاری سەیفە، زستانان، سیمار (١٨٠٢)

یەک بەیەک ئەعزای تەنی تۆ ئەی جەوان    یادگاری نیعمەتی خوای پڕ تەوان (١٨٠٣)

وەک ژنێک هەی بێت نۆزدەو یەک، مناڵ    یەک بەیەک جاکین کەئەو بوو خۆشحاڵ (١٨٠٤)

کـوا بــەبێ شـۆخی دەبــێ ژن بــار دار؟    کـوا لـەنێو بـاغ گـوڵ دەبێـتن، بـێ بـەهار؟ (۸۰۵)

گــەر دەبینــی تــۆ لــەلای داران ســیمار    بـۆ دەلیـل، بـۆ عیشـق بـازی گـەڵ بـەهار (۸۰۶)

بــۆ منـاڵی خــۆ دەدەن شــیر، گشــت دار    وەک لەشــای پنهــان، مەریــەم، بــاردار (۸۰۷)

گــەرچی ژێـر ئـاو، ئاگرێـک بـوو نادیـار    بوون حوباب زاهیر، لەسەروی سەت هەزار (۸۰۸)

گـەرچی ئـاگر زۆر بەشـیددەت بـوو نیهـان    کـەف بـەدەە قامکـان دەداتـن، پـێن نیشـان (۸۰۹)

هــەروەها ئــەجزایی مەســتانی ویســاڵ    حـامیلی جیلـوەی جـەلال و، حـاڵ و قـاڵ (۸۱۰)

بـۆ جـەماڵی حـاڵ، حـەیران بـوو، زەبـان    چاو دەبەسرا، خۆ، لەحاس نەقشی جیهان (۸۱۱)

ئـەو مەوالیـد هـیچ لـەرێی ئـەو چـوارەنین    چــاو لــەبۆ بینینــی وان، هیچکــارەنین (۸۱۲)

گشـتی مـەو لـوودی تەجـەللین جـا، ئـەوان    بۆیـەبوون نێـو پەردەیـەک، سـادە، نیهـان (۸۱۳)

مـن کوتم مـەو لوودو،مـەو لـوود نـین ئـەوان    بـۆ هیـدا یـەت مەتڵـەبم وا کـرد بـەیان (۸۱۴)

تـۆ مـەڵێ هـیچ، بـا ببێـژێ خـوای جیهـان    واز نەکـەی قـەت تـۆ، بـەلوتفی وا، زەبـان (۸۱۵)

چونکەئـەوگوڵ، خـۆی دەکـا، مەتڵـەب ئـەدا    وس بە، ئەی بولبول خەمووش بەو بێ سەدا (۸۱۶)

حاڵ و گفتی پاک، مەنیش هەم پاک مـەقاڵ    شــاهیدی عــەدڵن لەســەر ڕازی ویســاڵ (۸۱۷)

حــاڵ و گفتــی جـوانی شەخسـی موڕتـەزا    شاهیدن بۆ حـەمل و حەشری ( ما مـەزا ) (۸۱۸)

وەک ســەهۆڵی فەســڵی هــاوینی نــووێ    بـاس دەکـا ئاکـاری زسـتان، جـوێ جـووێ (۸۱۹)

یــاد دەکــا بایــانی ســارد و زەمهــەریر    بــۆن لــەڕۆژان و لــەدەورانی عەســیر (۸۲۰)

چەشــنی ئــەو میــوەی لــەنێو زســتان دا    بــاس دەکــا داســتانی ئــەلتافی خــودا (۸۲۱)

بـاس دەکـا دەو ڕانـی لەبخەنـدی هـەتاو    باسـی مــەفحو نـازی بـووکی دەم دەراو (۸۲۲)

نیعمــەتان چــوون، مــاوەجوزوت یادگــار    بینــەبیر خــۆت، یــا بکەلــەو، پرســیار (۸۲۳)

گەرکو چابوک بی و هات غـەم ئەو دەمە    تـۆ دەکـەی تـەحقیق لـەبارەی ئـەو غەمـە (۸۲۴)

بـەو دەڵـەی ئـەی غوسسـەیی ئینکـار کـەر    نیعمــــەتی دائــــیم لــــەزاتی دادگــــەر (۸۲۵)

گـەر هـەموو دەم، نـی، ئـەتۆ شـادو بـەهار    بۆ تـەنت خـەرمانی گـوڵ هـەم سـەو زەزار؟ (۸۲۶)

تـەن خـەیانی گـوڵ بـوو، فیکـری تـۆ گـوڵاو    زۆر عەجیب، مونکیر بـەگوڵ بێ، خۆ گوڵاو (۸۲۷)

حەیفە خۆ «کا»ش، بۆ کەسێک مەیموونسیفەت    هەوروڕۆژ،پێشـکێش بەئـەهلی مەعریفـەت (۸۲۸)

عـادەتی مـەیموون سـیفەت بـوو، خـۆ عینـاد    ئـەو سـپاس و شـوکرە ڕێگـای پـاک نیهـاد (۸۲۹)

چی بەسەر هات بێحەیای مـەیموون سیفەت؟    چـی بەسـەر هات،زاهیـدی بامەعریفـەت؟ (۸۳۰)

تــالیبی دونیایــە، کەلبــە، هــەم عــەقوور    نێـو کـەلاوان دایـە، گـەنجی عیـززو نـوور (۸۳۱)

گەر نەبایەئەو دەرەخشیش نێو خسووف رێگەیان چۆن ون دەبوو، لێ، فەیلەسووف (١٨٣٢)
رێگەون کەن عاقڵ و زیرەک ئەگەر لووتی خۆ ئەو دەم دەبینن داغ لەسەر (١٨٣٣)

**پاشماوەی داستانی فەقیری ڕۆزی خواز بەبێ کەسب و کار..**

**خولاسەی داستان ..**

فەقیرێکی موفلیس لەبەر فەقری شەدید زۆر دەعەزاب دابوو دەنوێژو دوعادا ڕزق و ڕۆزی بێ تەلاش و کەسب و کار لەخودا داوا دەکرد، بەو ئومێدەکەلەبەد بەختی وعەزاب نەجاتی بێ،ئەو ماوەیەک زۆر ئەو کارەی کرد تا کو شەوێک دەنگی غەیبی پێیکوت گەنجنامەیەک دەنێو کاغەز باتیلەی فلان کاغەز فرۆشەدا هەیەبرۆ دوکانی وی ومەخفیانەئەو گەنجنامە هەڵگرە و دەخەڵوەت دا بی خوێنەوە و تیبقی دەستوور عەمەل بکە، تا گەنج پەیدا بکەی .. فەقیر چۆ دووکانی کاغەز فرۆش، گەنجنامەکەی پەیدا کرد وچۆ خەڵوەت وخوێندیەوە.. دەو گەنجنامەدا وا هات بوو، دەچیەدەرەوەی شار، فلان بارەگا، پەیدا دەکەی، پشت دەوی دەکەی و ڕوو بەقوبلەڕادەوەستی،تیرێک دەکەوان دەنێی،تیر لەهەرجێ کەوت،ئەوێ د ەکۆڵیەوەوگەنجەکەی پەیدا دەکەی ..فەقیرتوندو تۆڵ هەڵات وکەوانێکی سەخت و محکەمی هینا و تیری دەنێو ناو هاویشتی . وجێی کەوتنی تیرەکەی کوڵیەوە، بەڵام خەبەرێک لەگەنج نەبوو، چونکەزۆر ڕۆژان ئەو کارەعەجیبەی تیکرار کردەوە، عالەم مەخسووسەن ئەشخاسی فزوول نیسبەت بەوی بەدگومان بوون، وکەمکەمەسرت و قورت و سەرو سەدا پەیدابوو، چونکەئیحتیمالی فزوولی و شەیتەنەت هەبوو، فەقیر لەترسی شکەنجەو ئازار دانی شا، جێ بەجێ گەنجنامەکەی دا بەوی، شا کەلەعەزەمەت و گەورەیی وعەجیبی گەنجی مەو عوود زۆر خۆشحاڵ بوو، تیرئەندازانی ماهیری مەسئوولی ئەو کارەکرد وچەند مانگان تیبقی دەستوور، کاری کرد.. بەڵام هیچ گەنج پەیدانەبوو، لەئاخیر دا ماندوو بوو وگەنجنامەکەی داوەبەفەقیرەکە،فەقیر دوو بارەکارەکەی دەست پێکردەوە، بەڵام مەگەر گەنج پەیدا دەبوو؟ ئەو کەلەپەیداکردنی گەنج نائومێد ببوو، لەکاتی دوعاو نیایش بەدڵێکی شکاو لەخودای داوا دەکرد کەڕازی ئەو گەنجەلەوی مەعلووم بکا، دەو بەینەدا دەنگێکی غەیبی پێکوت دەستوور وابوو کەتیر دەنێو کەوان بنێی، ئەتۆ بۆچی ژێی کەوانت کێشا؟ئاخر کێ بەتۆی کوت کەوانەکە،بەتەواوی قودرەت بکێشە؟،ئێستەهەستەتیر

دەنێو کەوان بنێ بەڵام ژێ مەکێشە،لێگەڕێ تیر هەر بۆخۆی لەکەوان بکەوێتەخوار، فەقیر جوورەکاری کرد، تیر لەپێش لاقی کەوت جێ بەجێ کۆڵیەوە، وگەنجی پەی داکرد..

موفلیسێک بێچارەبوو، زۆر دەردەدار    چونکەنەی بوو هیچ، هەیبوو دەرد، هەزار
ئەو لەحەق دەی ویست، دەنوێژ دا هەم دوعا    ئەی نیگەهبانی هەموو کەس، ئەی خودا
خۆ منت چاکرد ئەتۆ، بێ هیچ تەلاش    وێم دەلێرە، بێ تەلاش، جا، ڕزقی باش
پێنج گەو هەر داتنەمن، داتنانەسەر    پێنج حیسسی دیکەشت،دان، موستەتەر
نیعمەت و ئەلتافی تۆ، هەن بێ ژمار    بۆ سوپاس، من نا تەوان هەم، شەرمەزار
چونکەچاکت کرد ئەمن، تەنها ئەتۆ    ڕزق و ڕۆز یشم بدە، ئەی خوا ئەتۆ
ماوەیەک زۆر ئەو دوعای تیکرار کرد    عاقیبەت ناڵین چاکی کار کرد
چەشنی ئەو شەخسەی کەڕزقی زۆر حەڵاڵ    بێ عەزاب دەی ویست لەزاتی بێ هەواڵ
ئەو بەگایەگ شادمان بوو، عاقیبەت    بوو لەدەوری داوودی با مەعدیلەت
ئەو عەشیقەش زێدەگریا، زار زار    تا دوعا کەی وی قەبوو ڵ،کا، کردگار
نێو دوعا،دڵ سار دەبوو جارجارە، ئەو    چونکەنەی بوو زوو جەزای ئەو کارە، ئەو
ئەو چەلەش دەیدا ئومێد بەو، کردگار    نێو دڵی وی موژدەدەیگرت چاک قەرار
چون لەکۆشش نائومێدی کرد، مەلال    وای لەلای حەق بۆ دەهات دەنگێک،تەعال
خوا دەکاتن یەک بڵیند و یەک نەوی    غەیری ئەو دوو کارەنایەن قەت لەوی
چاو لەپەستی عەردو، بەرزی ئاسمان    گەردشی ئەفلاک دەبێ بەس بەو دووان
بەرزو پەستی ئەو زەمینەش ئاشکار    نیسفی ساڵ ئەو ئیشکە، نیوەش سەو زەزار
جووری دیش هەن بەرزو پەستی ڕۆژگار    نیوەلەیلەو، نیوەکەی دیکەش نەهار
بەرزو پەستی ئەو میزاجەی تێکەڵاو    یەک دەکەن ساغ، یەک نەخۆشی تێک شکاو
هەر وەهان جا گشتی ئەحواڵی جیهان    خەسب و قاتی، سوڵح و دەعواو، ئیفتینان
ئەو دوو باڵەن ئیعتیدالیان دا جیهان    مەو تەنی بیم و ئومێد گیان، بەو دووان
تاکودونیا بێتەلەرزین، چەشنی بەرگ    لای شەماڵ و لای سەمووم و، بەعس و مەرگ
تاکو جیلوەی وەحدەتی پەر وەردگار    عاڵەمی کەسرەت، بکاتن تارو مار
وەک نەمەکزار ئەوجیهان،ئەی خۆش نەفەس    هەرچی چۆ وێ،ڕەنگی خۆی زوو دا، لەدەس
چاولەخاک کە،خەڵکی ڕەنگاوڕەنگ ئەگەر    بچنەخاک یەک ڕەنگ دەکا،بێ دەردەسەر
خاک نەمەکزار، بۆ تەنانە، ئەی کیا    خۆ نەمەکزاری مەعانی لەو جیا

مەعنـەوی بـوو ئـەو نەمـەکزاری مـەعان — نـوێ دەمێنی، گـەرچی ئـەش مێنی زەمـان (١٨٥٩)

نـوێی جیهـانی،کۆن بـوونی، بـوو بەزیـد — نـوێی مـەعانی، بێ عـەدەد، بێ زێد ونیـد (١٨٦٠)

وەک لـەڕوونی نـووری پـاکی موستەفا — سـەت هـەزاران جوورەزوڵمـەت، بـوون زیبا (١٨٦١)

موشریک و جوو ، هەم مەسیحی هەم مەجووس — بوون بە یەکڕەنگ ،لەو ڕەئیسی گشت ڕئووس (١٨٦٢)

سێبەری کورت و درێژ، چەن سەت هەزار — بـوون بەیـەک، ژێـر نـووری ڕۆژی ڕازدار (١٨٦٣)

هـیچ نـەمان کـورتی و، درێـژی یانـەپان — چونکەسـێبەر ڕەهنـی ڕۆژن،گشـتییان (١٨٦٤)

غـەیری یـەک ڕەنگی کـەجێگای مەحشـەرە — ئاشـکرا بـۆ بـاش و بـۆ بـەد، زاهیـرە (١٨٦٥)

چـون مـەعانی دەبنەسـووڕەت، لـەو جیهـان — سووڕەتا ن وەک خوو، دەبن ئەو دەم، عەیان (١٨٦٦)

فکـرو بیـرت دەبنەنامـە، ئـەودەمی — دیـار دەکـا، هـەرچی دەدڵـدا، سـەرجەمی (١٨٦٧)

لێرەدا ئەسـراڕ گـەلێک هـەن بـێ ژمـار — نێـو میلـەل گوفتـار دەیـان کـا، ئاشـکار (١٨٦٨)

لێرەنۆبـەی سـەت دڵـی و سـەت ڕەنگییـە — لێـرەدا یـەک ڕەنگـی خـۆ، مـومکین نییـە (١٨٦٩)

ئێسـتەنۆبەی زەنگییـە،ڕۆمی نیهـان — چـون شـەوە، ڕۆژ بـوو نیهـان، تـاکو بـەیان (١٨٧٠)

ئێسـتەنۆبەی گورگە،یووسـوف، وا لـەچا — ئێستەنۆ بـەی قیبتـە، خـۆ فیرعەونـە، شـا (١٨٧١)

تـا لـەڕزقی بـێ حیسـابی نێـو جیهـان — چەنـد ڕۆژێک بەهرەمـەن بن، ئـەو سـەگان (١٨٧٢)

شـێر لـەنێو نـەیزاری دونیـا مونتـەزیر — تـا بـبێ ئـەمری (تعـالوا ) مونتەشـیر (١٨٧٣)

دێتـەدەر شـێران جـا، لـەو سـەبزەزار — خـودەدا نیشـانی وان، پاداشـی کـار (١٨٧٤)

جەوهـەری ئینسـان دەگـرێ، بـەڕوو بـەحر — گاوی ئەبلـەق دەچتـەژێر تیغ، ڕۆژی نـەحر (١٨٧٥)

ڕۆژی نـەحری مەحشـەری زۆر سـامناک — جێژنـەبۆ مـوئمین، لـەبۆ گـاوان هـیلاک (١٨٧٦)

گشـتیان تـەیرانی ئـا و لـەوڕۆژی نـەحر — چەشنی کەشتی وان، لەسـەر دەریاوو، بەحر (١٨٧٧)

تاکو هالیک هـەم ئـەوەی دەی بێ نـەجات — هـەردوو بگـرن مـوزدی خۆیـان، بـەیینات (١٨٧٨)

تـاکو بـازان ڕوو بـەلای سـوڵتان بـڕۆن — تاکوزاغـان ڕوو بەگۆڕسـتان بـڕۆن (١٨٧٩)

ئێسک و ئەجزای پەین و پاڵ، هەر چەشنی نان — نۆغڵـەبۆ زاغـان گـەلێک خـۆش، نێو جیهان (١٨٨٠)

قەندی حیکمـەت، بوو لـەزاغان زۆر بـەدوور — کرمـی پـەین و پـاڵ لـەباغان زۆر بـەدوور (١٨٨١)

فاحیشـە، قـەت غـەزوی نەفسی ناچتەسـەر — لایقـی عەنبـەر نییـە، خـۆ قـوونی کـەر (١٨٨٢)

ژن کـەبۆی واجـب نییـەجـەنگ و غـەزا — چـۆن جیهـادی ئەکبـەری، بـۆ دەس، دەدا؟ (١٨٨٣)

نێوژنـان دا، پیـاوەتی بـێ، زۆر کەمـە — یـەک میسـالی ئاشـکراو ڕوون، مەریەمـە (١٨٨٤)

جـار و بـاریش ژن دەبـێ نێـو پیـاو نیهـان — وەک کەسـێکی ترسـەنۆکی دڵ جـەبان (١٨٨٥)

لـەو جیهـان سـوورەت دەبـێ ناپیـاوەتی هـەرچی بـۆ مـەردی نـەیێتن عـادەتی (١٨٨٦)

ڕۆژی عەدڵـــەڕۆژی دادی دادگـــەرە کەوشـەلایق پـێ، کڵاویـش بـۆ سـەرە (١٨٨٧)

تـا بەمەتڵـەب خـۆی بگـا هـەرتالیبێک تـا بەغـەرەیی خـۆی بگـا هـەرغاریبێک (١٨٨٨)

تالیب و مـەتلووب نـین هـیچ لێک بـەدوور ئـاوەجووتی هـەورو،ڕۆژیش جـووتی نـوور (١٨٨٩)

ئـــەو جیهانەجێگـــەقاری کردگـــار قـار ببینـە، تـۆ کـەقار کـەی ئیختیـار (١٨٩٠)

تـۆ ببینەئێسـک ومـووی مـەقهوور بـەچاو چـۆن بـەتیغی قـار دەبـوو، پـەرت و بـڵاو (١٨٩١)

بـاڵ و پـای تـەیران ببینـەدەوری دام شەرحی قەهری خوادەکەن بێ هیچ کەلام (١٨٩٢)

ئـەو دەمـرد، گۆڕیـان لـەجێی وی دادەنـا گۆڕ کەکۆن بوو، چوو ئەویش بۆ لای فەنا (١٨٩٣)

عـەدڵی حـەق بـوو کردنـی ئەشیا ئـەنیس فیل دەگەڵ فیل،پێشکە، پێشکەی بوو جەلیس (١٨٩٤)

ها و دەمی ئەحمەد لەمەجلیس چوار یار یـاری بـوو جـەهلن عوتەیبـەو، زولخیمـار (١٨٩٥)

کەعبـەبۆ جـەبریل و پاکـان سـیدرەیە زگ پەرەسـتان قوبڵـەیان هەرسـفرەیە (١٨٩٦)

نـووری وەسـڵەقووبڵەبۆ ئـەهلی کـەماڵ عەقڵی فیلسووف، قوبڵەبۆ وی، بەس خەیاڵ (١٨٩٧)

قوبڵـەبۆ زاهیـد فەقـەت خـوای بێ هـەواڵ بـۆ تەمـەعکار قوبڵـەپووڵ و، زێـڕو، مـاڵ (١٨٩٨)

ئـەهلی مـەعنا، قوبڵـەیان، سـەبرو درەنـگ قوبڵـەبۆ زاهیـر پەرەستان، نەقشی سـەنگ (١٨٩٩)

ئـەهلی باتین قوبڵـەیان بـوو، خـوای جیهان قوبڵــەبۆ زاهیــر پەرەســتان، ڕووی ژنــان (١٩٠٠)

هــەر وەهــا بژمێرەتــازەو کـۆن، ئــەتۆ خەستەبووی گـەر، تـۆ بـڕۆ لای کـاری خـۆ (١٩٠١)

ڕزقــی ئێمــە، وا، دەکاســەی زێــڕ دا نێـو وجوودیـان ئەوسـەگان بوویـان غـەزا (١٩٠٢)

لایقـی ئـەو خسـڵەت و،خـووی ئێمـە، دان تیبقـی وان ئیعتـا دەکـەین، خـۆراک و نـان (١٩٠٣)

خـووی یـەکێکمان عاشـقی نـان کـردووە خـووی یـەکێکمان مەستی گیانـان کـردووە (١٩٠٤)

گەر بەخووی خۆت خوڕەمی، هەم شادمان بۆ سـەزات بۆ چی دەدەی نفرەت نیشان؟ (١٩٠٥)

مادەگیت پێ خۆشەگەر، چا ڕشێو کە، سەر بگرەخەنجـەر ڕۆسـتەمیت پـێ خۆشـەگەر (١٩٠٦)

ئــەو وتــارەدوایی نایــە، ئــەو فــەقیر بوو بەدەستی فـەقرو تـەنگ دەستی ئەسیر (١٩٠٧)

**داستانی ئەو گەنجنامە، کەلەقەراغ گومبەزێک ڕوو دەقووبڵەبکەوتیر دەکەوان بنێ و بێ هاوێ ئەو جێگای تیر لێی کەوت گەنجی تێدایە..**

ئـەو شـەوێک دیتـی دەخـەو دا، خـەوکووا؟ بـێ خـەویش سـۆفی دەکـا، ئاگـا خـووا (١٩٠٨)

هاتفێـک دەیکـوت بـەوی ئـەی ڕەنجبـەر تـۆ لـەلای وەڕاق، نامێـک بێنـەدەر (١٩٠٩)

تـۆ، بـەبێ، وەڕاقـی جیرانـت، نیهـان ڕوو کـەلای جێگـایی کاغـەز پارەکـان (١٩١٠)

تـا مەیـەک بـەو شـکڵ و ڕەنگەبێنـەدەر جا لەخەڵوەت، چاو کە لەو، بێ دەردەسەر (١٩١١)

گـەر دزیـت تـۆ، وەک دەڵـەم مـن، وا،بکـە خۆت بەدوور لەو خەڵک و لەو دەعوا، بکە (١٩١٢)

بـێ خوێنـە، تـۆ، بەتـەنها،زۆر تـەریک کەس نەکەی لەو کارەدا، بۆ خۆت شەریک (١٩١٣)

گەرکو فاشیش بێ، مەبە، تۆ هیچ غەمین بـەهرەوەر لـەو، چونکەغـەیری تـۆ، چ نـین (١٩١٤)

گەرکو تەئخیر بێت، نەت بێ تۆچ غەم ویـردی تـۆ(لاتقنطـوا ) بـێ، دەمبـەدەم (١٩١٥)

وایکـوت و، دەسـتی لەسـەر دڵ دا دەنـا جـا بکێشـە، دەی بـڕۆ ڕەنـج و عـەنا (١٩١٦)

گەر لەوەسڵی حەق وەهۆش هات ئەو جەوان هێندەشاد بوو، تەنگەبەر بوو،بۆی جیهان (١٩١٧)

خۆ زراوی وی، دەکرد لەت لەت، قەلەق گەر نەبوو با، حیفزو لوتفی خوای فەلەق (١٩١٨)

شادییەک بووئەوهە،پشت شەش سەت حیجاب گوێی ئەوی،دەی بیست لەزاتی حەق جەواب (١٩١٩)

حیسسـی سـەمعی وی حیجـابی، لاکـەنـان بـوو سـەرەفـرازو، بـەجێی هێشـت ئاسمان (١٩٢٠)

بەڵکـەچاوی وی لـەگوێ، عیبـڕەت گـرێ لـەو حیجابانـەی نیهـان گشـت، بگـزەرێ (١٩٢١)

گەر بەجێ یان هێشت حەواسی وی حیجاب دەمبـەدەم دەی بێـت ئـەو دیـدو خیتـاب (١٩٢٢)

هاتـەلای دووکـانی وەڕڕاق، دوایـەجا ئـەو تەماشـای کـرد لەئـەوڕاق، هـەر دوولا (١٩٢٣)

ئـەو، وەبـەر چـاوی دەهـات ئـەو نامـەزوو بـەو نیشـانانەی لـەهاتیف هـاتبوو (١٩٢٤)

نامەکەی هـەڵگرت کوتی خـوا، خێر بـدات دێمەوەئێسـتاکەئەی ئوسـتاد، لات (١٩٢٥)

چوو لەگۆشێک نامەکەی خوێند، موو بەموو وای کەدی ئەو مات و سەرگەردان دەبوو (١٩٢٦)

گەنجنامـەی هێنـدەباش و قیمـەتی چۆنـەوا، نێـو کاغـەزی پـووچ، جـێ یـەتی (١٩٢٧)

جـا لـەناکاو هـات ئـەو فیکـرەی لـەبۆ خوایـەحافیز بـۆ هـەچی مـەو جوودەخـۆ (١٩٢٨)

کـوا موجـازەلای خـودای عالـەم پـەنا سەر بەخۆ هەر کەس هەچی ویستی ببا؟ (١٩٢٩)

دەشت و دۆڵ پڕ بن لە زێڕ و زێو، ئەگەر کـەس، چ نابـا، بـێ ڕەزای خـوای دادگـەر (١٩٣٠)

سـەت کیتابـان تـۆ کـەبخوێنی لەبـەر نوکتـەیێکت یـاد نـابێ، بـێ قـەدەر (١٩٣١)

گەربکەی خزمەت نەخوێنی هیچ کیتاب دێتەسینەت عیلمـی نـادر، بـێ حیسـاب (١٩٣٢)

دەستی مووسا بوو، لەسینگ و بەر، بەنوور مـانگی ئاسمان کـەو تـەژێر و، ئـەو لـەژوور (١٩٣٣)

چیت لەگەردوون ویست ئەی مووسا،ئەو ت تۆ لەسینەو جەیب و ئێقەت دەس کەوت؟ (١٩٣٤)

تـا بزانـی تـۆ کەئاسـمانانی شـین ئینعیکاسـی مودرەکـاتی ئـادەمین (١٩٣٥)

چـاک بزانەدەسـتی زاتـی موسـتەعان عـەقڵی چـاکرد، پێش لەخەڵقی دوو جیهان (١٩٣٦)

ئـەو وتارەهـەم نیهـان هـەم ئاشـکار مـێش کـەنابێ مـەحرەمی عـەنقا، چ جـار (١٩٣٧)

بێرەوەلای داستان ئەی تازەلاو ‌ ‌ ‌ داستانی گەنج و دەروێش کە، تەواو (۹۳۸)

### داستانی ئەو فەقیرەونیشان دانی جێگای ئەو گەنجە، بەتەواوی ..

جا لەنێو ئەو نامەنوسرابوو وەها ‌ ‌ ‌ گەنجەکەی مەدفوون، لەخاریج شاردا (۹۳۹)

ئەو فلان قوببەی کەقەبرێک دەو، دیار ‌ ‌ ‌ ڕوو بەسەحرا و چۆل و دەشتە، پشت بەشار (۹۴۰)

پشت دەوی کەڕووکەقوبڵە، ئەی جەوان ‌ ‌ ‌ ئەو دەمی تۆ، دابنێ تیر، نێو کەوان (۹۴۱)

تۆ کەتیرت کردەدەر ئەی بەختیار ‌ ‌ ‌ هەڵقەنە، ئەو جێی کەتیر، لێی کەوتەخوار (۹۴۲)

جا، کەوانی سەختی هینا ئەو فەتا ‌ ‌ ‌ نێو فەزای باز،کردی جا، ئەو تیر، ڕەها (۹۴۳)

پێمەڕەو پاچی دەهینان شادمان ‌ ‌ ‌ جێگەتیری هەڵدەقەند، هەر ئەو زەمان (۹۴۴)

خۆی و، پاچ و پێمەڕەی دیتیان ڕەنج ‌ ‌ ‌ هیچ نەبوو پەیدا بەڵام، پنهان گەنج (۹۴۵)

جا هەموو ڕۆژ، تیری داویشت ئەو جەوان ‌ ‌ ‌ جێگەگەنجی بۆ نەبوو ئەمما، عەیان (۹۴۶)

چونکەئەو هەی بەردەوام بۆ، بوو، بەکار ‌ ‌ ‌ سرت و قوڕتیان کەو تە، تێ، جا خەڵکی شار (۹۴۷)

### ئاشکرابوونی خەبەری ئەو گەنجەوگەیشتنی ئەو خەبەرەبەگوێی شا..

شەهریاریان کرد لەو کار، باخەبەر ‌ ‌ ‌ ئەو کەسانەی گرتبوویان ژێر نەزەر (۹۴۸)

وا،خەبەریان دا بەشا، ئەشخاسی پەست ‌ ‌ ‌ خۆ فلانی گەنجنامەی کەوتەدەست (۹۴۹)

ئەو کەبیستی باخەبەر بوو شەهریار ‌ ‌ ‌ غەیری تەسلیم و ڕەزا، نەیدی، چ چار (۹۵۰)

پێش ئەوەی شا، بەو بدا ڕەنج و عەنا ‌ ‌ ‌ نامەکەی هات زوو لەپێش وی، دادەنا (۹۵۱)

پێیدەکوت لەو دەم، هەمە، ئەونامەیە ‌ ‌ ‌ گەنج کەنا، ڕەنج و عەزابم زۆر هەیە (۹۵۲)

زەڕڕەیێکم بۆ نەبوو گەنج ئاشکار ‌ ‌ ‌ زۆر خەمم خوارد من بەڵام جا، چەشنی مار (۹۵۳)

موددەتی یەک مانگەلێم شێواوەحاڵ ‌ ‌ ‌ چون لەسوودو، زەڕ بوو، دەستی من بەتاڵ (۹۵۴)

بەڵکەلابا، بەختی تۆ پەردەی لەسەر ‌ ‌ ‌ ئەی شەهی پیرۆز لەجەنگ و، بەختەوەر (۹۵۵)

موددەتی شەش مانگ و زیاد، شا،خۆشحاڵ ‌ ‌ ‌ تیری هاویشت، جێگەتیری کردەچاڵ (۹۵۶)

ئەو کەوانداری دەهینان توندو تۆڵ ‌ ‌ ‌ تا بەتیری وان، وەدەس بێ، گەنج، لەچۆڵ (۹۵۷)

غەیری تەشویش، غەیری غەم پەیدا نەبوو ‌ ‌ ‌ چەشنی عەنقا، نێو، هەبوو، مەعنا نەبوو (۹۵۸)

**نائومێد بوونی شا، لەوەدەس هێنانی ئەو گەنجە، وخەستەو مەلوول بوونی وی لەپەیدا بوونی ئەو گەنجە..**

چون گەڕان لەو گەنجەزۆر بێهوودە، جا زۆر دەبوو خەستەو مەلوول، لەو کارەشا (١٩٥٩)
دەشتی هەڵقەند، پێ بەپێ، دەیکرد بەچاڵ نامەکەی ئەو داوەدەروێش، تووڕەحاڵ (١٩٦٠)
پێید ەکوت، ها، نامە، چون هیچ دیار نییە ئەو هەبۆ تۆ چاکە، چون بۆت کار نییە (١٩٦١)
وا کەناکا، هەرکەسێ هەی بێت کار گڕ بدا گوڵ، خۆی بکا قوربانی خار (١٩٦٢)
کەم دەبێتن مالیخولیاش، ئەی پدەر مونتەزیربێ، گیا، لەئاسن، بێتەدەر (١٩٦٣)
کاری گیان سەختانە، ئەی دەروێش ئەوە تۆ کەگیانت سەختە، زۆر، وەدوای کەوە (١٩٦٤)
گەر کو نەت دی، تۆ کەنابی حاڵ تاڵ گەرکو دیتت من لەتۆم کرد ئەو حەلاڵ (١٩٦٥)
کوا عەقڵ قەت ڕێی یەئس دەگرێتەبەر؟ عیشقەبەو ڕێ دا دەچێ توند، هەر بەسەر (١٩٦٦)
لا ئوبالی، خۆ نەعەقڵە، عیشقەبەس عەقڵەدەی وێ، سوودو نەفعی بێتەدەس (١٩٦٧)
حەملەکەر سووتێنەری تەن، بێ حەیاش بۆ بەلایان چەشنی بەردی ژێر ی ئاش (١٩٦٨)
لای بەڵا، بێ پشتە، بێ حەد سەخت ڕوو سوودی نێوخۆی کوشتو،وەک گیای گشت دروو (١٩٦٩)
بێ عیوەز دەیدا هەچی هەی بێت زوو هەر وەکوو دەگرێ هەموو شت ئەولە( هوو) (١٩٧٠)
خوا بەبێ عیللەت بەوی هەستی دەدا واش بەحەق ئەو، خۆی بەدوودەستی دەدا (١٩٧١)
بێ غەرەز دان، فتووەت و، مەردانەیە خۆ فیداکردن، دوڕی، تەک دانەیە (١٩٧٢)
میللەتان تالیب بەفەزلن، یاخەلاس بوون فیداکاران، قوربانانی خاس (١٩٧٣)
عاشقان ناکەن خودا، قەت ئیمتیحان قەت کەنینە، تالیبی سوودو زییان (١٩٧٤)

**وێدانەوەی شا، گەنجنامەکەبەو فەقیرە، کە، ها، بگرەنامەکەت ئێمەلەخێری ئەو نامەگوزەراین..**

چونکەنامەی گەنجی پڕشەڕ، شای کەبیر دای بەدەس دەروێشی غەمگین و فەقیر (١٩٧٥)
بووی لەدەردو ڕەنجی خەسمان ئەو ئەمان چون خەریکی کاری خۆی بوو ئەو زەمان (١٩٧٦)
عیشقی دەر داوی لەبۆ خۆی کردەیار سەگ دەکا دەرمان، برینی خۆی بەزار (١٩٧٧)
کەس ڕەفیقی عاشقی بیمار نییە مەحرەمی وێ، خۆ، لەدێ، دەییار نییە (١٩٧٨)
شێتی وەک عاشق دەدونیا دانییە هیچ لەکاری وی عەقڵ ئاگا نییە (١٩٧٩)
شێتیەتی عاشق، وەکوو شێتان نییە خۆ، دەتیب، دا، بۆوی هیچ دەرمان نییە (١٩٨٠)
گەر تەبیب شێت بێت بەو حاڵاتەوە دەفتەری تیب، ئەو بەخوێن دەشواتەوە (١٩٨١)

تیببی عەقڵان، بیلعمووم مەنقووشی وین — ڕووی هەموو جوانان، ڕوو پۆش بۆ ئەوین (٩٨٢)

ڕوو لەخۆت کە، نەک لەخەڵکی ئەی عەشیق — نیتەغەیری خۆت عاشق،ئەی ڕەفیق (٩٨٣)

قەلبی کردەکەعبە، جا کردی دوعا — چونکەبۆ ئینسان دەبێ بەس ( ما سعی ) (٩٨٤)

گەرچی نەی بیست، ئەو لەپێش دا هیچ جەواب — بێ وچان دەیکرد دوعا، پڕ تین و تاب (٩٨٥)

بێ جەوابیش ئەو لەحەق هەر دەیهەویست — لوتفی حەق بوو، ئەو کەلەبیەیکی دەبیست (٩٨٦)

چونکەبێ دەف، هەر دەرەقسی ئەو نەدار — چون بەجوودی خوای هەبوو، ئەو ئیعتیبار (٩٨٧)

هاتیفێک پەیکێک، نەهات بۆ لایی وی — بوون بەلەبیەیک، پڕ دوو گوێی،هیوایی وی (٩٨٨)

بێ زبان دەیکوت ئومێدی وی، تەعال — ئەو تەعال لای برد، لەقەلبی وی مەلال (٩٨٩)

گەرکو دەرکەی کۆترەکی خووی گرت بەبان — بانگ مەکەئەو، دێتەوەچون، بێ گومان (٩٩٠)

ئەی حیسامەددین ئەوی تۆ، دەرکەلات — هاو دەمیت، باعیس، کەباڵ، بۆ گیانی هات (٩٩١)

تەیری گیانی وی کەدەرکەی تۆ لەلات — دێ، تەوافی دەوری سەربانت دەکات (٩٩٢)

جێگەدان و، نوغڵی وی، سەربانی تۆ — لەو حەوایەمەستە، بەو داوانی تۆ (٩٩٣)

ئەی ئەوەی باعیس لەبۆ فەتح و فتووح — گەر نەکاتن شوکری تۆ، یەک لەحزە، ڕووح (٩٩٤)

ئەو شتەی مەئمووری عیشقەو، کینەدار — دادەنێ سەر سینگی وی، یەک تەشتی نار (٩٩٥)

دەی، وەرە، لای مانگ و، تۆ، تۆز لا بەرە — شای ئەوین بانگت دەکا، تۆش، جا، وەرە (٩٩٦)

دەوری ئەوجی کوترو ئەو سەربانە، من — لێدەدەم کوترانەباڵ، مەستانە، من (٩٩٧)

جەبرەئیلی عیشقم و، سیدرەم، ئەتۆی — من نەخۆش، عیسای کوڕی مەریەم، ئەتۆی (٩٩٨)

بێنەجۆش جا، ئەو یەمەی، دوو بارەتۆ — خۆش بپرسە، ئێستە، لەو بیمارەتۆ (٩٩٩)

گەرچی ئێستا زۆر نەخۆشە، حاڵی وی — چون ئەتۆ مەڕبووت بەوی، یەم، ماڵی وی (٠٠٠)

مەسنەوی ناڵەی وییە، بوو ئاشکار — داد لەدەس ئەو ناڵەناڵی نادیار (٠٠١)

با، نەوا، وەک نەی هەنە،دوو دانەزار — یەک لەنێو دوولێوی وی بوو، نادیار (٠٠٢)

تۆ دەبیسی ناڵەناڵی یەک لەوان — دەنگی ناڵەی وی دەچێ تا ئاسمان (٠٠٣)

ساحەبی فیکری دەقیق، موستەحزەرە — ناڵەناڵی ئەو سەرەش دێ لەو سەرە (٠٠٤)

دەم لەوی هات، بەو نەیەی دا،دەمدەمە — هەیهەیی وی، دای بەڕووحم، هەمهەمە (٠٠٥)

نەی نەبا، دەمسازی لێوی وی، ئەگەر — نەی جیهانی پێ نەدەکرا، پڕ شەکەر (٠٠٦)

هاو نشینت کێ بوو، دوێ شەو وا ئەتۆ؟ — پڕخڕۆش و جۆشی وەک دەریا ئەتۆ (٠٠٧)

یا (ابیت عند ربی ) ت بوو وتار — چوویەنێو دەریایی ئاگر تۆ بەغار (٠٠٨)

نارەتەی ( یا نارکونی باردا )    بۆ پەناگای گیانی تۆ، ئەی موقتەدا (٢٠٠٩)

ئەی زیائی حەقق و تیغی قەلب و دین    ڕۆژ کەناگیریێ بەقوڕ، بێ شک، یەقین (٢٠١٠)

ویستییان جا ئەو نەفامانەی نەزان    دا بپۆشن ڕۆژی تۆ، بیکەن نیهان (٢٠١١)

گشت دەلیلی تۆنەلەعلی نێو شاخ    پڕ لەشادی و پێکەنینی تۆنە، باخ (٢٠١٢)

کوا لەبۆ ئەسراڕ و ڕازت، مەحرەمێ؟    تا بەیان کەم بۆی لەسەت دەریا، نەمێ (٢٠١٣)

بەم هەوێ گەر ڕازی تۆ بێژم کەمێ    شۆڕ دەکەم سەر، وەک عەلی نێو چاڵ، دەمێ (٢٠١٤)

چون برایان زۆر حەسوود بوون، دڵ بەکین    یووسوفم بۆی چاکە،ژێر چاڵ، جێگەژین (٢٠١٥)

چیم بەچاڵ دا؟، مەستم و غەوغا دەکەم    من لەسەحرا، خێوەتێک بەرپا دەکەم (٢٠١٦)

وێم دەجامێک، پڕ شەرابی ئاگرین    جا ببینە، هێرشی مەردانەژین (٢٠١٧)

ئەو فەقیر،با، هەی بێ، بێ گەنج ئینتیزار    چونکەگرتم ئێستەنێومەستی قەرار (٢٠١٨)

ئەی فەقیر ئێستا لەحەق داواکە، بەس    نەک لەمن،چون غەرقی مەستیم، بێ نەفەس (٢٠١٩)

ئێستەناکرێ باسی ئەو داستانەبۆم    غافڵم ئێستا لەخۆم و ڕیشی خۆم (٢٠٢٠)

ئەو شەرابەی نای بێ، موو جێگا، لەوێ    بۆ غرووروو تەمتەڕاق، جێ کوا، لەوێ؟ (٢٠٢١)

تێکە ساقی جامەکی پڕ زۆر ئەتۆ    تا لە خواجە، بەو غرووور کەی، کۆر ئەتۆ (٢٠٢٢)

ئەو بەنەخوەت، بووی لەسەرمان، ئیفتیخار    بوو لەداخی ئێمەئەمما، دەردەدار (٢٠٢٣)

عاقیبەت هەر ئەو دەبێ مەغلووب و،مات    چون دەزانین مەکرو فێڵان چۆن دەکات (٢٠٢٤)

هەرچی بیکا، جا درەنگ بێ، یانەزوو    پیر دەبینێ،ئاشکرا ئەو، موو بەموو (٢٠٢٥)

چی دەنەینووک دا دەبینێتن عەوام    پیر کەنەی بینێت ئەو نێو خشتی خام؟ (٢٠٢٦)

ئەو شتەی نەی دی لەماڵ خۆی، ڕیش دار    کۆسەدیتی دانەدانە،ئاشکار (٢٠٢٧)

چون لەماسی بووی، بڕۆ دەریا ئەتۆ    بۆ دەرپیش کەوتی بەچەشنی کا، ئەتۆ؟ (٢٠٢٨)

تۆ، کەکا، نی جێ حەسوودی گەو هەری    تۆ لەنێو ئەمواج و یەم بێ چاتری (٢٠٢٩)

بەحری وەحدەت بێ نەزیر، یەک دانەیە    گەو هەرو ماسیشی ئەو مەو جانەیە (٢٠٣٠)

فیکری هەمتا بوون و هەم ئیشراکی وی    دووربێ لەو دەریاوو، مەوجی پاکی وی (٢٠٣١)

خۆ دەدەریا هیچ شەریکێک دیار نییە    چی بەخێڵ، بێژم بەڵام سوود دار نییە (٢٠٣٢)

چون دەگەڵ خێلان دەژین ئەی بوت خوواز    زار دەبێ وەک موشریکان کەین، ئێمەواز (٢٠٣٣)

وەسفی وەحدەت ناکرێ هیچ جار بەزار    غەیری دوویی قەت نیشان نادا وتار (٢٠٣٤)

یانەوەک خێل، بگرەدوویی تۆ، بەیار    یا خەمووش بە، تۆ ببەستەلێوو زار (٢٠٣٥)

| | | |
|---|---|---|
| یـا بەنۆبــەجار ســكووت و جــار كــەلام | چەشـنی خێـل تـۆ، لێدەتـەپڵت وەسســەلام | ٣٦- |
| مــەحرەمت گــەر دی ببێــژەرازی گیــان | گەر گوڵت دی، بێ سەدات، وەک بولبولان | ٣٧- |
| گـەر كـو دیتـت مەشـكی پـڕ حیلـەو درۆ | لێـو ببەسـتەخۆت كەچەشـنی بـەر، ئـەتۆ | ٣٨- |
| هــیچ مەكــە، لای دوژمنــانی ئــاو ئــەدا | بەردی جەهلی وان نەكا، لەت، خـومرە، تا | ٣٩- |
| لای جــەفای نــادان ببــەتۆ زۆر ســەبوور | تـۆ مـودارات بێ،بەعـەقڵی خـوای غـەفوور | ٤٠- |
| سەبر گەڵ ناكەس دەكاتن كەس، جەلی | گــەر ســەبر بــێ، دڵ دەكــاتن ســەیقەلی | ٤١- |
| ئــاگری نــەمروود ســافی كــرد خــەلیل | چەشـنی نـەینووک بـێ نـەزیرو بـێ بـەدیل | ٤٢- |
| جەوری كفری قەومی نووح و سەبری نووح | بـوو لـەبۆ نـووح سـەیقەلی نـەینووكی ڕووح | ٤٣- |

**حیكایەتی موریدی شێخ حەسەنی خەرەقانی (قدس اللەسرە)..**

**خولاسەی داستان ..**

دەروێشێک لەموریدانی شێخ حەسەنی خەرەقانی (نورالله مضجعه الكریم) لەمەنتەقەی تاڵە قان بەقەستی زیارەتی شێخ چۆ خەرەقان، ئەو دەروێشەپاش ئەوەی كەرێگایەكی زۆر دوورودرێژی بەدەشت و كێو دا بڕی،گەیشتەخەرەقان وجێ بەجی وەدوای پەیداكردنی شێخ كەوت، وەختێک كەگەیشتەدەركی مەنزڵی شێخ، لەدەركەی دا، هاو سەری شێخ هاتەدەر،كاتێک كەزانی كەبۆ دیتنی شێخ هاتووە،دەستی كرد بەتانەلێدان وقسەی ناحەزكوتن بەشووی خۆی (شێخ)وئەو موریدەشی زۆر تەوهین ومەسخەرەكرد،ژن ئەوەندەی قسەی ناحەزوجنێو بەشێخ دا،كەمورید بەو هەمووسەبرو ئیحتیاتەكەهەیبوو، توورەبوو وبەشیددەت تەهدیدی كرد، كەئەگەر ئەتۆ وابەستەبەخانەدانی پیرم نەبای زۆرم ئەزیەت دەكردی، و لەوێ ڕۆیشت و لەخەڵكی جێگای شێخی پرسیار كرد وپێیان كوت كەشێخ چۆتەفلان جەنگەڵە، تا دار كۆ كاتەوە،مورید بەپەلەبۆ وێ چوو،بەڵام لەرێگادا فكری دەكرد كەبۆچی شێخ دەگەڵ ژنێكی بەو جوورەزینەدەگی دەكا؟وكەمكەمە، خەیاڵاتی نادروستی بەسەرد ڵدا دەهات، وبەخۆی كوت ڕەنگەشێخ بەخاتری ئارەزووی نەفسانی ئازارو ئەزیەتی ئەو ژنەتەحەممول دەكا،ولەو جوورەفكرەبێ فایدانەی بەسەر د ڵدا ختوور دەكرد،جارجاریش خۆی سەرزەنیش دەكردكەئەوە، چ فكرێكەكەدەبارەی پیری خۆتی دەكەی؟دەو فكرانەدا بووكەلە ناكاوشێخی دی كەتێلەكە یەكی دار لەسەر پشتی شێرێكی درندەدانابوو و بۆ خۆشی لەسەر بار دانیشتووە، ومارێكی سەممی خەتەرناک وەک قامچی دەدەست دایەو دەی سووڕێنێ، شێرەكەی وەک كەر لێدەخوڕێ، شێخ دەگەڵكو چاوی بەمورید

کـەو ت قـەلبی وی خوێنـدەوە،و بـێ موقەددیمـەپێیکوت بەخاترهـەواوئارەزووی نـەفس نـەبوو کـەئازارو ئەزیـەتی ئـەو ژنـەم تەحـەممول کردووە،بەڵکـەچون بـەدخویی و بـەد ئـەخلاقی ئـەو ژنەتەحەممول دەکەم بەکەرامەتێک گەیشتووم کەشێری دڕندەبێگاریم بۆ دەکا ..

هـات دەروێشـێک لەشـاری تاڵـەقان | تـا ببینـێ، بولحوسـەینی خارەقـان (٢٠٤٤)
دەی بـڕی ئـەو دەشـت و کێـوی زۆر دراز | تـا ببینـێ، شـێخ بەسـیدق و بانییـاز (٢٠٤٥)
ڕەنـج و دەردی زۆری لـەو ڕێ هاتەبـەر | من بـەڵام مەتڵەب دەکەم زۆر موختەسەر (٢٠٤٦)
گەر گەیشت دەروێش بەشاری شەهریار | مـاڵی ئـەو شـای کـرد لەخـەڵکی پرسـیار (٢٠٤٧)
زۆر بەقـەدرو ئیحتیـرام گـەر دای لـەدەر | ژن لەدەرکـەی مـاڵ، سـەری هینایـەدەر (٢٠٤٨)
پێیدەکوت تۆ چیت دەوێ؟ ئەی با کەرەم | ئـەو کـوتی هاتوومـەتا زیـارەت بکـەم (٢٠٤٩)
پێکـەنی ژن، چـاو کـە، بـەو ڕیشـی درێـژ | چەندەکێشای ڕەنجی شاخ و دەشت و لێژ (٢٠٥٠)
تـۆ لەشـاری خـۆت نـەبوو،کارت، مەگـەر | ڕێـی وەهـا بـێ سوودو سـەختت گرتەبـەر؟ (٢٠٥١)
تـۆ گـەڕانی دوور لەسـوود داوا دەکـەی | یا لەمـەو تـەن خەستەبووی،؟ جا، وادەکەی (٢٠٥٢)
یـا مەگـەر شـەیتان وەهـای هینایەسـەر؟ | تاکو بۆ جێی هێنـدەدوور کەی تۆ سەفەر (٢٠٥٣)
زۆر بـەوی دا گفتـی پـیس و نالـەبار | سـەختەبۆ مـن گەربڵـەم، هـەموان بـەزار (٢٠٥٤)
چـون لـەژن تـەوهینی زۆر ی دی موریـد | کەوتـەنێو دەردو غـەم و، ڕەنجـی شـەدید (٢٠٥٥)

**پرسیاری ئەو دەروێشە لە هاوسەری شێخ، کە شێخ لەکوێیە و لە کوێی پەیدا بکەم؟ وجواب دانەوەی ناحەزی هاوسەری شێخ بەو دەروێشە..**

تەشـکی دەڕژانـدو لـەوی وا، کـرد سـوئال | کوێ یـەجێگای ئەو شەهی شیرین مەقال؟ (٢٠٥٦)
پێیـدەکوت ئـەو فێڵـەبازی حیلەگـەر | داوی گومراهـان و گێـژو بـێ هونـەر (٢٠٥٧)
چەشـنی تـۆ گێـژو نـەفامان سـەت هـەزار | بـەو لـەگێژاوی گوناهـان چوونـەخوار (٢٠٥٨)
گـەر بـڕۆی سـالم نـەبینی جـا ئـەوی | سـوودی تـۆی تێـدا، نـەبی تـا تـۆ غـەوی (٢٠٥٩)
موفتـەخۆرە، زۆر خـۆر، زۆر وێـژەرە | شـوهرەبۆ ئـەتراف وبـۆ دەو رو بـەرە (٢٠٦٠)
چەشنی سیبتین ئەوگرووە،گوێلک پەرەست | چۆن دەکەن تەعزیمی گای،وا پووچ وپەست (٢٠٦١)
شـەو وەکـوو منـدارو، ڕۆژبـێ کـارو بـار | هەرکەسـێ ئـەو موفتـەخۆرەی بـوو بـەیار (٢٠٦٢)
ئـەوگرووە، عـیلم وکـەماڵیان لادەنـا | مـەکرو تـەزویریان لـەجێی وان، دا دەنـا (٢٠٦٣)
ئـالی مووسـا خۆزگـەبان، ئێسـتا هـەتا | خـوێنی هـەرچی گـوێلکی خـوا بـا، ڕشـتبا (٢٠٦٤)

| | | |
|---|---|---|
| شـەرع و تـەقوایان وەلا نـا پشـتی سـەر | ئەمری مـەعرووفی شەدید کوا؟، کوا عومـەر؟ | ٠٦٥) |
| ئـەو ئیباحـەت لـەو جەماعـەت فـاش بـوو | فرسـەت و ڕوخسـەت، لـەبۆ قـەللاش بـوو | ٠٦٦) |
| کوا ئـەدی ڕێـی ئەحمـەد و ئەسحابی وی؟ | نـوێژو سـوبحەکوان، هــەم ئـادابی وی؟ | ٠٦٧) |

**جواب دانەوەی مورید ومەنع کردنی مورید ئەو ژنەتەعنەو تەشەر لێدەرە، لەکفرو قسەی بێهوو دەکوتن ..**

| | | |
|---|---|---|
| کردی داد سەرزن،جەوان،دەیکوت کەبەس | ڕۆژی ڕەو شەن کوا،لەکوێ ڕا هات عەسەس؟ | ٠٦٨) |
| نووری مەردان شەرق و غەربی کرد ڕوون | ئاسمانیان مـان عەجـەب، بۆ سـەجدەچوون | ٠٦٩) |
| ڕۆژی حەق دەر هات، لەلای بورجی بەهار | ژێر نیقاب چوو، ڕۆژ کەبوو زۆر شەرمەزار | ٠٧٠) |
| توڕڕەهاتی وەک تۆ ئیبلیس، کوا، چ کات؟ | مــن لــەخاکی ئــەو ســەرایە، لا دەدات | ٠٧١) |
| چەشنی هـەو ران نیم بەبایـەک هـات بـم | تــا بــەتۆزێک لێــرەلاچم، مــات بــم | ٠٧٢) |
| گوێڵ،کەبەو نوور بێ، دەبێ قوبڵەی کەرەم | قوبڵـەبێ ئـەو نـوور، دەبـێ کفـرو سـەنەم | ٠٧٣) |
| ئــەو ئیباحـــەی لای هــــەوا، تەزلیلییــە | ئــەو ئیباحـــەی لای خـــودا، تەکمیلییــە | ٠٧٤) |
| دای لەهـەر لا، نووری زۆری خوای سەمیع | بـوو بـەئیمان کفـرو، شـەیتان بـوو موتیـع | ٠٧٥) |
| خۆشەویسـتی حەققـە، بـۆ عیـز، مەزهـەرە | ئـەو لـەلای کـەرِوبییان، جێـی لای سـەرە | ٠٧٦) |
| ســەجدەبۆ ئــادەم یــەنی ئــەو بــەر تــەرە | بـۆ مـەجاز، دائـیم حەقیقـەت سـەر وەرە | ٠٧٧) |
| ئەی عەجووز فووکەی لەشەمعی خوا ئەگەر | گشت دەسووتێن،خۆت وزاری گەنـدو سـەر | ٠٧٨) |
| کەی دەبێ دەریا بەزاری سەگ کەسیف؟ | کەی دەبێ خامۆش بەفوو، ڕۆژی نەزیف؟ | ٠٧٩) |
| گــەر دەلیلــت غــەیری زاهیــر بــۆ نییــە | زاهیـری وی عــەیب و نەقسـی خـۆ نییـە | ٠٨٠) |
| خـۆ لەحاسـتی ئـەو زهوورە،گشـت زهـوور | وان لەغایــەت نــەقس و ئیــراد و قســوور | ٠٨١) |
| هـەر کەسـێک فووکـا، لەشـەمعی کردگـار | شـەم کـەنامرێ، لـەو دەسـووتێ، لێـوو زار | ٠٨٢) |
| وەک تـۆ خوففـاش، زۆر دەخـەو دا، دیتیـان | مـا، هـەتیو بێ ڕۆژی ڕوون و گـەش،جیهان | ٠٨٣) |
| مــەوجی زۆرو تیــژی دەریــا یــانی ڕووح | زۆر بـەقودرەت تـر لەسـەت تووفـانی نـووح | ٠٨٤) |
| هات بەڵام لەو چاوی کەنعان مووی دزێو | نووح و کەشتی جێ دەهێشت، ڕووی کردەکێو | ٠٨٥) |
| کێوو،کــەنعانی دەخـــۆی دا بردەخـــوار | نێـو شـەپۆلێک کردنـی زۆر پەسـت و خـوار | ٠٨٦) |
| سـەگ دەکا عەوعەو،کەدای مانـگ ڕەو شـەنی | کـوا لـەنووری مانـگ دەخوا،سـەی دەنـی؟ | ٠٨٧) |
| ئەوکەسانەی شـەو دەڕۆن ژێرنـووری مانـگ | کوا دەوێستن،گەرلەسەگ بێ،دەنگ وبانگ؟ | ٠٨٨) |
| جوزء، بۆلای کول دەچێ، تونـد، چەشنی تیـر | کوا دەوێستێ ئەو لەبـەر هـەر خوێرِیـە، پیـر؟ | ٠٨٩) |

ڕووحـی شـەرع و ڕووحـی تـەقوا عاریفـە مەعریفـەت مەحسـوولی زوهـدی سـالیفە (٢٠٩٠)

زوهـد، چەشـنی دانەچانـدن نێـو زەوی مەعریفەت وەک شین بوون و ڕوشدی وی (٢٠٩١)

وەک تـەنن جـا، ئیجتیهـاد و ئیعتیقـاد ڕووح لەبۆ ئەو چاندنش بوو، گیاو حەساد (٢٠٩٢)

ئەمری مەعرووف هەرئەوە، مەعرووف ئەوە کاشـیفی ئەسـرار ئـەوە، مەکشـووف ئـەوە (٢٠٩٣)

ئـەو لـەدونیا و ئـاخیرەت بـۆم شـەهریار پێست بەنـدەی مـەغزی نـەغزە، بێ وتـار (٢٠٩٤)

شێخ (انـا الحـق) ی، د ەکـوت زۆر ئاشـکار کـوێر دڵان غـەمگین دەبـوون و شـەرمەزار (٢٠٩٥)

گـەر (انـا) ی، بەندەنـەما، هـیچ نێـو وجـوود چـی دەمێنـێ؟ تێ بفکـرە، ئـەی جـەحوود (٢٠٩٦)

چـاک بنۆڕەچاوەکـەت بینایەگـەر پێم نیشان دە، ئەوشتەی پاش (لا) یە، گەر (٢٠٩٧)

بـا نـەبن ئـەو لێـوو حـەڵق وزار،چ ئـان گـەر لـەمانگ یاتاسـمان تـف کـەن، ئـەوان (٢٠٩٨)

دێتەوەسـەر ڕوویـی خۆت،تـف، بێ گومـان تـف، چ ڕێگـای خـۆ نییـەبۆ ئاسـمان (٢٠٩٩)

دێتەسـەر وی تـا قیـام، تـف لایـی ڕەب چەشنی (تبت )سـەر ڕەوانـی بوو لەهـەب (٢١٠٠)

تـەپڵ و پەرچـەم موڵـک و مـاڵی شـەهریار سـەگ کەسێکەبەو دەڵێتن پەسـت و خـوار (٢١٠١)

ئاسـمانان گشـت لـەژێر فـەرمانی وێـن شـەر ق و مـەغریب داخـوازی نـانی وێـن (٢١٠٢)

چونکە(لولاک ) بوو لەسـەر دەستووری وی گشت لەبۆ ئینعام دەبوون مـەجبووری وی (٢١٠٣)

گەرنـەبا ئـەو، نەیـدەبووهیچکات فەلـەک گەردیش ونوورو مـەکان بوو ن،بۆ مەلـەک (٢١٠٤)

گـەر نـەبا ئـەو،کوا دەیـان بـوو، قـەت بیحـار هەیبـەت و ماسـیی و، دوڕڕی شـاهوار؟ (٢١٠٥)

گەرنـەبا ئـەو، نەیـدەبوو خـۆ قـەت زەمـین گـەنج دەداخیـل دا، لـەخاریج یاسـەمین (٢١٠٦)

ڕزق و ڕۆزیـش ڕزق و ڕۆزی لـەو دەخـۆن چـاو لـەباران میوەگشـتی، نـوێ وکـۆن (٢١٠٧)

لێـرەدا مەعکووسـەکار، بـت بێـت هـۆش بـەو کەسـەی موعتیتـە، موعتی بـە، ئەتۆش (٢١٠٨)

دای فـەقیر پێت، ئـەو هـەموو زێڕو حـەریر تۆش زەکاتێک دەس غـەنی دە، ئەی فـەقیر (٢١٠٩)

تۆی کەسیف، بووی زەوجی ئەو مـەقبووڵ ڕووح وەک دەبوویەک کافری بەد، زەوجی نـووح (٢١١٠)

بـەو سـەرایەت گـەر نـەبا نیسبەت، یـەقین مـن لـە لەوسی تۆم دەکرد، خاوێن زەمـین (٢١١١)

مـن لـەتۆ دەمکرد بێ شک، نـووح خـەلاس تـا شـەهیدبم، ئـەو دەمـی بکـرێم قیسـاس (٢١١٢)

سـەختەئەمما خـۆ لـەماڵی شـەهریار هێنـدەپڕ ڕوو بـم، بکـەم ئـەو جوورەکـار (٢١١٣)

تـۆ دوعاکـە، ئـەو سـەرایەت بـوو پـەنا هـەرچی لازم بایـەدەمکرد مـن، دەنـا (٢١١٤)

## گەڕانەوەی مورید لەماڵی شێخ وپرسیارکردن لەخەڵکی، وپێ یانکوت کەشێخ چۆتەفلان جەنگەڵە..

ئەو لەهەرلا، دوایەکردی پرسیار | جستۆجۆی شێخی لەبۆ وی بوو، بەکار (۱۵

یەک کوتی پاشان کەئەو قوتبی دیار | چوو، کەدارکۆکا، لەشاخ و کۆهسار (۱۶

ئەو موریدی تیژهۆش و تیژبیر | ڕووی دەجەنگەڵ کرد، بەهیوای عیشقی پیر (۱۷

دایدەنا سەرقەلبی وی دێوی نەیار | فیکری بەد، تا مانگی وی، ون کا، غوبار (۱۸

بۆ دەگەڵ یەک ژن وەها ئەو شێخی دین | بوو بەیارو هاوسەرو، هەم هاو نشین؟ (۱۹

زید، دەگەڵ زید،کوا دەبێ هاو سەرێ کات؟ | کوا لەبۆ ناس،ڕەهبەری نەسناس، دەکات؟ (۲۰

ئەوچەلەش گەرهات وەهۆش، دەیکوت یەقین | ئیعتیرازی من بەوی، بوو کفرو کین (۲۱

چیم بەکارو باری خوای باڵاو نەوی؟ | تا کو نەفسم حەملەکا، سەر کاری وی (۲۲

بەو شناختی بووی لەپێش، حەملەی دەکا | ئەو چەلەش سەر وی، بەچەشنی دوودی کا (۲۳

نیسبەتی شەیتان دەگەڵ جەبریل چییە | هاو نشین و هاو دەم وییاری وییە؟ (۲۴

کوا دەگەڵ ئازەر دەسازێ قەت خەلیل؟ | کوا دەگەڵ ڕێگر دەسازێ، قەت دەلیل؟ (۲۵

## پەیداکردنی مورید موڕادی خۆی ودیتنی مورید، شێخی خۆی لەنێزیک ئەو جەنگەڵە..

وایدەکرد بیر، ئەو لەشێخی نامدار | زوو دەبوو پەیدا لەسەرشێرێک سووار (۲۶

شێر، دەی نەڕڕاند و دەیکێشان دار | نیشتبووسەر بارەدار، ئەو بەختیار (۲۷

مار دەبوو قامچی لەبۆ ئەو خۆش نەفەس | چەشنی خەرزەن گرتبووی ئەو مار، بەدەس (۲۸

لات یەقین بێ تۆ هەموو شێخی جیهان | سواری شێری نەفسی خۆیانن ئەوا ن (۲۹

گەرچی ئەو مەحسووسەئەوهەش نادیار | خۆ بەڵام بۆ چاوی دڵ بوو ئاشکار (۳۰

سەت هەزاران شێر لەژێر ڕانیان ئەوان | دار کێش، ئاشکار لەچاوی ڕاز دان (۳۱

جارو بار دەیکا بەڵام ئاشکار خودا | تاکو نامەردیش ببینێ کاری وا (۳۲

گەر لەدوور دی، پێکەنی جا، ئەو خەدیو | پێیدەکوت شەیتان نەداتن، تۆ فریو (۳۳

چی دەدڵ دابوو هەمووی دی، ئەو جەلیل | نووری دڵ،چاک ڕەهنەمایە، چاک دەلیل (۳۴

چی لەڕێگا هاتەفکری ئەو مورید | یەک بەیەک بۆی خوێندەوەچاک، ئەو سەعید (۳۵

جا، لەبارەی هاو سەری و، ئینکاری وی | بۆ بەیان کردن دەبوو، واز، زاری وی (۳۶

نیمەسابیر من لەبەر نەفس و هەوا | نەفسەوای کوت پێت، نەکەی فیکری ئەوا (۳۷

گەر نەبام سابیر لەسەر ئازاری ژن | شێر چلۆن دەیکرد وەها،بێگاری من (۳۸

توند دەڕۆم وەک وشترانی زۆر قەوی ‌ ‌ ‌ مەست مەست، ژێر باری خوای باڵاو نەوی (٢١٣٩)

من لەفەرمانی خودانیم هێندەخام ‌ ‌ ‌ بێتەفیکری من جنێو دانی عەوام (٢١٤٠)

عام و خاسی ئێمەگشت فەرمانی وی ‌ ‌ ‌ گیانی ئێمەخۆ بەسەر خواهانی وی (٢١٤١)

تاق وجووت بوونمان نییە خۆ، بۆ هەوا ‌ ‌ ‌ ئێمەگشت دەس خاڵقین، وەک مۆرە، وا (٢١٤٢)

نازی گێژی وا دەکێشین ئێمەگەر ‌ ‌ ‌ نینەعاشق، خۆ بەڕەنگ و سینگ و بەر (٢١٤٣)

دەرسی شاگردمانە، حەملی ناز وەها ‌ ‌ ‌ تۆ بنۆڕەمەرتەبەو جێی ئێمەجا (٢١٤٤)

تاکو ئەو جێگای لەوێ جێگا نییە ‌ ‌ ‌ غەیری نووری بەڕقی مانگی خوا نییە (٢١٤٥)

تاکو ئەوجێگای لەئەوهام زۆر بەدوور ‌ ‌ ‌ هیچ دەوێدا دیار نییەخۆ غەیری نوور (٢١٤٦)

من لەبەرتۆ گفتو گۆی خۆم کرد خوار ‌ ‌ ‌ تا قەبووڵت بێ ڕەفیقی نالەبار (٢١٤٧)

هەلگری تا شادمان، باری حەرەج ‌ ‌ ‌ دیارەچون (الصبرمفتاح الفرج) (٢١٤٨)

گەر بسازێی تۆ دەگەڵ نامەردی پەست ‌ ‌ ‌ ڕەوشەنی خووی ئەنبیات، تۆ دیتەدەست (٢١٤٩)

ئەنبیا ڕەنجی خەسانیان دی هەزار ‌ ‌ ‌ ڕەنجی زۆریان دی لەدەس ئەو جوورەمار (٢١٥٠)

چون مورادو حوکمی یەزدانی غەفوور ‌ ‌ ‌ بوو لەئەووەڵ دا، کەخۆی کاتن زهوور (٢١٥١)

زید بەبێ زید قەت کەنابێ ئاشکار ‌ ‌ ‌ زیددی بۆ پەیدا نییە، پەروەردگار (٢١٥٢)

**حیکمەت دە(انی جاعل فی الارض خلیفه)..**

جا، خەلیفەی کرد ساحەب سینەیەک ‌ ‌ ‌ شایەتی وی هەبێ تا ئاوێنەیەک (٢١٥٣)

جا سەفای بێ حەددو زۆری بەو دەدا ‌ ‌ ‌ زوڵمەتیشی کرد، بەزیددی وی خودا (٢١٥٤)

چاندی دوو پەرچەم خودای ئەو عالەمە ‌ ‌ ‌ ڕەش لەبۆ شەیتان، سپی بۆ ئادەمە (٢١٥٥)

بەینی ئەودوو لەشکران زۆر ئاشکرا ‌ ‌ ‌ ئەو شەڕو دەعوای دەبوو بکرێ،کرا (٢١٥٦)

هەروەها دەوری دووەم هابیل بوو ‌ ‌ ‌ زیددی نووری پاکی وی، قابیل بوو (٢١٥٧)

پەرچەمی عەد ڵ و ستەم هەر وا دەمان ‌ ‌ ‌ تا بەنەمروودی گەیشت، دەورو زەمان (٢١٥٨)

بۆ خەلیل ئەو بوو بەزید و بوو نەیار ‌ ‌ ‌ ئەو دوو لەشکەر کردیان جا کارزار (٢١٥٩)

چون درێژی شەڕ ئەوی کرد زۆر مەلوول ‌ ‌ ‌ هەردوو ویستیان ناری دەعواکەن زەلوول (٢١٦٠)

ئاگری کردەحەکەم جا، کردگار ‌ ‌ ‌ حەل ببێ تا موشکلی ئەو دوو نەیار (٢١٦١)

بەر دەوام بوو شەڕ دەبەینی ئەو دووان ‌ ‌ ‌ تا بەفیرعەو ن و، بەمووسای میهرەبان (٢١٦٢)

بوو لەنێو وان جەنگ و دەعوا زۆر ساڵ ‌ ‌ ‌ گەر دەبوو زۆرو نەما کەس، خۆشحاڵ (٢١٦٣)

ئاوی دەریای کرد حەکەم جا کردگار ... تا عەیان بن، هالیکان وڕەستگار
هەروەها تادەورو عەسری موستەفا ... گەڵ ئەبو وجەهلی زەمامداری جەفا
هەر وەها ناردی خودا بۆ سەر سەموود ... سەیحەیەک وا، کردنی بێ تارو پوود
هەروەهاناردی لەبۆ سەرقەومی عاد ... بای شەدیدو سەخت و بێ ئامان و داد
ناردی سەرقاڕوون عەزابی هووشیار ... بردی بۆ نێو خۆی، زەمینی بوردبار
بورد باری عەرد،گشتی بوو بەقار ... گەنج و قاڕوونی دەخۆی دا، بردەخوار
لوقمەیێکی تەن بەوی دەی بێ ژییان ... جەو شەنەبۆدەفعی تیغی جووع، نان
گەر خودا دانێتەنێو نانی تۆ قار ... گیر دەکا نان، نێو گەرووی تۆ،ناچتەخوار
ئەو لیبا سەی دەفعی سەرمات لێ دەکا ... بیهەوێ حەق، زەمهەریر لەو چێ دەکا
تا لیباسی باشی تێت کێشاوەقوڵ ... وەک بفر، موزی بێ و، سار وەک سەهۆڵ
ناتهەوێ جا پێستی زۆر نەرم و حەریر ... تۆ دەبەی ئەو دەم پەنا، بۆ زەمهەریر
نی ئەتۆ دوو قووللە، بەس یەک قوللە تۆ ... نی خەبەردار هیچ لەڕەنجی زوللە تۆ
هات ئەمری کردگار بۆ دێ و شار ... هیچ نەبن دیوارو خانو،سایەدار
هیچ مەبن مانیع لەبارانەو هەتاو ... تاکوئوممەت چوونەلای مورسەل، بەتاو
ئێمەمردین زۆر، ئەمان ئەی خۆش نەفەس ... پاشماوەش تۆ، لەتەفسیر بێنەدەس
چون عەسای گێڕا بەمار ئەو تەڕ دەسە ... گەرتۆ عەقڵت بێت ئەو نوکتەت بەسە
تۆ دەقیق نی گەرچی هەی ساحەب نەزەر ... کانیاوی ڕاکیدی،ئاو ناچتەدەر
بۆیەوای فەرموو بەئێمەدادگەر ... تۆ، بکەئەی بەندە، ئیمعانی نەزەر
نایهەوێ تۆ هیچ نەکەی فیکرو نەزەر ... چاک لەکامیل بگرە، ئەمما تۆ فیکەر
گەر تەنت مرد، ڕووکەئیسڕافیل بەتاو ... گەر دڵت سست بوو، بڕۆ بۆ لای هەتاو
هێن خەیاڵی پووچ دەکەی ئەی وایی تۆ ... چیت نەماوەبیەسەو فەستایی تۆ
نیعمەتی عەقڵی وەلانا، ئەو جەحوود ... ئاشکرا مونکیر بەحیسسەهەم وجوود
ئەی سوخەنوەر، بەسکەلەو نوکتانەتۆ ... تا لەبۆ خەڵکی نەبی جێی تانەتۆ
دیققەت و ئیمعانە، کانی،کەی ڕەوان ... گیان لەتەن دەرچێ، دەبێژن بەو ڕەوان
ئەو حەکیمی گیانی وی لەو بەندی تەن ... بووی نەجات وچوو خەرامان نێو چەمەن
دای دوو عینوان بەو دووان تا بن جییا ... ئافەرین بۆ گیانی پاکی ئەو کییا
باسی ئەو شەخسی موتیعی خوا دەبێ ... بی هەوێ گوڵ بێ بەخار، خۆ، وا دەبێ

## موعجیزەی هوود علیەالسلام دەنەجات بوونی موئمینانی ئوممەت لەکاتی هاتنی با ، دا ..

تـا نـەجاتیان بـێ لـەدەس بـا، موئمینـان گشـت لـەنێو دائیرەدانیشـتن ئـەوان (٢١٩١)

بـا، وەکـوو تووفان،گـەمی لـوتفی خـوا خـوا گـەمی و، تووفـانی زۆری هـەن،وەها (٢١٩٢)

خوا دەکا یـەک پادشا، کەشتی نـەجات تـا بـەئاز، سـەر دوژمنـان هێـرش بکـات (٢١٩٣)

نـەک هـەتا بێنـێ لـەبۆ میللـەت، ئـەمان دەیهـەوێ دوور کا لـەمولّکی خـۆی، نـەمان (٢١٩٤)

ئـەو کـەری ئـاش زۆر بەتونـدی ڕا دەکا تا لـەزەخم و ئـێش نـەجات بـێ، وا دەکا (٢١٩٥)

نەیدەویست ئـاوێ هـەڵێنجێ ئـەو لـەچاڵ یـا بکـاتن ئـەو لـەکونجود، ڕۆن بـەتاڵ (٢١٩٦)

گـا، لەترسـی زەخـم و لێـدان، ڕا دەکـا نـەک لەبـەر ئەسـباب بـردن، وا دەکـا (٢١٩٧)

خـوا بـەڵام داینـا دەگـا، ترسـی عـەزاب تـا بـدا، ئـەنجام ئـەو کـاری سـەواب (٢١٩٨)

هـەروەها گشـت کاسـبانی نێـو دوکـان کـار دەکـەن بـۆ خـۆ، نەئیسـلاحی جیهـان (٢١٩٩)

ولێ لـەدووی دەرمـان هـەموویان دەردەدار بۆیـەدونیا هێنـدەجوان مـا، بەرقـەرار (٢٢٠٠)

ژێـر بینـای دونیـایی بـیم کـرد، کردگـار تا لەترسـان گشـت بـبن مەشـغووڵ بـەکار (٢٢٠١)

حەمـدی ئـەو خوایـەی کە،ئەوکردوویـە،بیم عیللـەتی سـامانی عـەردی، واعـەزیم (٢٢٠٢)

گشـت لـەچاک و بـەد، دەترسـێن گیانـدار کەس لەخۆی ئەمما نەترسا، قەت چ جار (٢٢٠٣)

جـا بەڕاسـتی حـاکمی ئـەو عالەمـە ئەو کەسەی مەحسووس نییەو، نیزیک لەمە (٢٢٠٤)

ئـەو دەبینـرێ نێـو نیهانخانـەو کـەمین قـەت کـەنابینرێ بـەچاوی سـەر،یەقین (٢٢٠٥)

ئـەو حیسـەی کـە، خـوا لـەلای پەیدایەئـەو غـەیری حیسسـی زاهیـری دونیایەئـەو (٢٢٠٦)

حیسسی حەیوان گەر کو دیبای ئەو سووەر بایەزیـدی عەسـری خـۆ بـوون گـاوو، کـەر (٢٢٠٧)

ئـەو کەسـەی کـردی بـەدەن جێگـایی ڕووح ئەوکەسـەی کەشتی دەکرد، بوڕڕاقی نـووح (٢٢٠٨)

بیهـەوێ گـەر عـەینی زات و خـووی گـەمی بـۆت دەکا،تووفـان بـەبێ زیـادو کـەمی (٢٢٠٩)

لەحزەلـەحزەی تۆیـە تووفـان هـەم گـەمی دائیمـەن تـۆ وەسـڵی شـادی هـەم غـەمی (٢٢١٠)

گەر گـەمی و کەشتیت لـەلا، لـەو نینـە تـۆ تـەن کـە لـەرزی چاوکـە لـەو لەرزینـە تـۆ (٢٢١١)

گـەرکو نەیـدی مەنشـەئی بـیم ئـادەمی بـیم دەداتـن بـەو خـەیاڵات ئـەو دەمـی (٢٢١٢)

مەسـت لـەنابینا دەدا، یـەک مسـتی بـەد وا دەزانـێ کـوێر، لەوشـتر بـوو لەگـەد (٢٢١٣)

چون لەوشتر بیستی ئـەودەم دەنـگ و قـاو دەرکـی نـا بینـا بـەگوێ یـە، نـەک بـەچاو (٢٢١٤)

ئـەو چەلـەش بـەردی دەکـرد، تەقسیر بـار لـەو سـەرایەی زۆر بڵینـد ئـەو کەوتـەخوار (٢٢١٥)

بەر نەبوو، وشتر نەبوو، خۆ ئەی فلان — خالیقی بیم بوو، بەوی وا دا نیشان ۶)

ترس و لەرزین دێن لەئەغیار خۆ یەقین — کەس کەناترسێ لەخۆی، خۆئەی حەزین ۷)

وەهمی زانی مەنشەئی بیم، فەلسەفی — جوابی وی بوو، بێ گومان و شک، نەفی ۸)

بێ حەقیقەت نینەخۆ، وەهم و گومان — زێڕ کەغەش بێ، بێ سەحیح ناڕواچ ئان ۹)

کەی درۆ بێ ڕاس، کەسێ لەدوا دەبێ؟ — چی درۆبێ، هەر لەڕاس پەیدا دەبێ ٠)

چونکەدیتی ڕاس کەهەیتی موشتەری — ئەو درۆی کرد، ڕاستی خستە، پشت سەری ١)

ئەی کەزووب،بۆت هاتلەڕاستی،ویست وخواست — شوکری نیعمەت کە،مەکەئینکاری ڕاست ٢)

بۆت لەفیلسۆف بێژم و ئەوهامی وی — یا لەکەشتی و بەحری خوای باڵاو نەوی؟ ٣)

باس دەکەم گەمیان کەبۆ دڵ، بوونەپەند — باس دەکەم کول،کول لەبۆ جوزئانەبەند ٤)

کێ وەلی بێ نووح وکەشتیوانەخۆ — سوحبەتی ئەو خەڵکەوەک تووفانەخۆ ٥)

کەم لەشێرو ئەژدیهات بێ، تۆ فیرار — بەر حەزەر بە، تۆ لەخزم و ناسیار ٦)

بچیەلایان عومری تۆ دەڕوا، بەبا — یادی وانیش مەعنەویت، چی بێ، دەبا ٧)

وەک کەری تینوو، خەیاڵی گشتییان — شەر بەتی مەعنات، لەنەی تەن مشتییان ٨)

جەزبی خۆی کرد یادی تۆ، لەو ناکەسان — شەونەمێکی بووت، لەو دەریای، ژییان ٩)

جا، نیشانەی ئاو نەمانی نێو لکان — ئەو هەبوو، ناخۆن ئەوان لک، هیچ تەکان ٠)

عوزوی ئازاد، ئەو لکی ئاو دارو جوان — ئەو دەکێشرێ بۆ هەموو لا، بێ شکان ١)

بت هەوێ قەرتاڵەلەو، تۆ چادەکەی — بت هەوێ، لەو دەستەچاکەی، وا، دەکەی ٢)

گەرکو نەی ما، ئاو لەڕیشەو نێو بەری — غەیرەمومکین ئەو لەبۆ هەر لا، بەری ٣)

ئاو لەڕیشەگەر نەهات بۆ لک تەمام — ئایەتی (قاموا کسالی )ت، بێ کەلام ٤)

بەس بکەم با، لەو سوڕانەی زۆر بەتین — چاکەباس کەم گەنج و، دەروێشی غەمین ٥)

ئاگرێکت دیوەدەیکرد، دار زوغاڵ — ئاگری گیان، چاو، دەسووتێنێ، خەیاڵ ٦)

هەم حەقیقەت هەم خەیاڵ مان بێ ئەمان — خۆ لەدەس ئەو ناری هاتە دەر لە گیان ٧)

دوژمنی گشت شێرو گشت ڕووبایە، ئەو — شت دەبن فانی فەقەت بەڕپایە، ئەو ٨)

خۆت فەنای زات و سیفاتی خواکە، تۆ — وەک ئەلیف خۆت دەرجی بیسمیللا کەتۆ ٩)

ئەو ئەلیف نێو بیسم، هیچ پەیدانییە — ئەو دەنێو بیسمەو، دەبیسمیش دا نییە ٠)

هەر وەهان جا گشت حرووفی نێو مەقال — گەر دەبن مەحزووف بەخاتر ئیتتیسال ١)

وەسلی سین وبێ ئەلیف کردی وسووڵ — وەسڵ سین وبێ ئەوی ناکا قەبووڵ ٢)

چونکەهیچ حەرفی قەبووڵ نین ئەو ویسال   من بەواجب دیم،کەکۆتاکەم مەقال (٢٢٤٣)

چون دەکا حەرفێک سین و بێ، جودا   واجبەخامۆش ببم من لێرەدا (٢٢٤٤)

گەر ئەلیف هات بوو فەنا، جا، بوو نیهان   سین وبێ بێژن ئەلیف مەوجوودەلان (٢٢٤٥)

هەرچی بی کا ئەو، خودا دەیکا، نەئەو   گفتی حەق دێ، گەر نەکا ئەو واز دەو (٢٢٤٦)

نیتی دەرمان بێ تەغەییو ر هیچ عەمەل   گەر فەنا بوو،ئەو دەکا دەفعی عیلەل (٢٢٤٧)

گەر قەڵەم بن جەنگەڵان، جەوهەر بحوور   مەسنەوی من ئاخری نایێ زهوور (٢٢٤٨)

تاکودونیا بەرقەرار بێ، مەسنەوی   خاس و عام تەقتیع دەکەن ئەشعاری وی (٢٢٤٩)

گەر نەمێنێ خاکی دونیا، دادگەر   خاکی دیکەچادەکا، بێ وێ، ئەگەر (٢٢٥٠)

گەرنەمێنن جەنگەڵانی رۆژگار   سەر لەدەریا دێننەدەر، جەنگەڵ هەزار (٢٢٥١)

بۆیەفەرمووی ئەو شەهەنشاهی فەرەج   (حدّثوا عن بحرنا اذ لاحرج) (٢٢٥٢)

باسی دەریا، بەسکە، باس کە، بەڕ، ئەتۆ   چون بەئەسباب بازی، منداڵ شادەخۆ (٢٢٥٣)

چون بەئەسباب بازیان،کەمکەم منالْ   گیانی وی گەڵ یەم دەبێ، ئاشناو هەواڵ (٢٢٥٤)

چادەبێ لەو بازیان عەقڵی منالْ   گەرچی لای عەقڵان بوون پووچ و بەتاڵ (٢٢٥٥)

کوا دەکا بازی، چ کات منداڵی شێت؟   دەچتەلای کول جوزئەکی مەو جوود بێت (٢٢٥٦)

## گەڕانەوەبۆ لای قوببە و گەنج ..

باسی ئەو دەروێشەئێستا ئارەزووم   هێن دەبێژێ ئەو بەمن دەی، خەستەبووم (٢٢٥٧)

من دەبیسم نەک ئەتۆ، هاواری وی   ڕازدارم چون لەبۆ ئەسراڕی وی (٢٢٥٨)

گەنجەبۆخۆی، ئەو بەگەنج تالیب نەبوو   هەردوو ئێکن، عاشق و مەعشووق، نەدوو (٢٢٥٩)

خۆ، سجوود بۆ خۆی دەبا ئەو خۆش نەفەس   سەجدەبۆ نەینووک بەخاتر ڕوویەبەس (٢٢٦٠)

گەر لەنەینووک بێ خەیاڵ دیبای کەمێ   لەو یەمی تەن، نەی دەماوەئەو، نەمێ (٢٢٦١)

جا خەیاڵی چەشنی خۆی فانی دەبوو   دانیشی وی مەحوی نادانی دەبوو (٢٢٦٢)

دانیشێکی دێ، لەجەهلی ئێمەجا   دێتەدەر ئاشکار دەڵێ (انی انا ) (٢٢٦٣)

( ئوسجودولئادەم) نیدای خوای عالەمێ   ئادەمن چون، چاو لەخۆتان کەن، کەمێ (٢٢٦٤)

ئەحوەلی لابرد لەچاوی وان خودا   جا، زەمینیان لا جیوەرد، دی، وەک سەما (٢٢٦٥)

(لاالـه)ی، پێش (الاالله) خودا   کوت بەوان، وەحدەت بیێ ئاشکار هەتا (٢٢٦٦)

ئەو حەبیب و ئەو خەلیلی ڕەهنەمان   وەختەئێستا، بێ بکێشێ، گوێچکەمان (٢٢٦٧)

تـا بشـۆین زار ئێمـەتا سـەر چەشـمەزار چـیم نیهـان کـرد ئێوەمەیکـەن ئاشـکار (٦٨

تـۆ کـەبش لـەی قـەت کـەنابن ئاشـکار قەستەچون کەشفت، دەبـی تـۆ، جـورم دار (٦٩

تـا نەبیسـێ ئـەو هـە، لـێم ئینسـانی خـەس وێــژەرو گــوێگر مــنم تــەنهاوو، بــەس (٧٠

سوورەتی دەروێش بلّـێ هـەم نەقشی گـەنج ڕەنج بـەرن ئـەو دەستە، باس کـەتۆ لەڕەنج (٧١

جـا، لـەوان، کانیـاوی ڕەحمـەت بـوو حـەرام هــەر دەنۆشــن ژەهــری قاتیــل پــڕ بــەجام (٧٢

پڕ دەکـەن دامـەن لـەخۆڵ و،خـاک ئـەوان تــاکو بگــرن کانیــاوی پــاک ئــەوان (٧٣

کـوا دەبـێ کانیـاو کـەدەریای بـێ مـەدەد پڕ، بەمستێک خـاک و خۆڵی باش و بەد؟ (٧٤

ئـەو دەڵـێ مـن بـووم لـەئێوەخۆ حـەرام بۆکەسانی ئـەهل و باش، مـن هـەم مـودام (٧٥

خەلک،مەعکووســــن لــــەکارو ئیشــــتیها خـاک دەخـۆن و، ئاوی خۆشیان کرد ڕەها (٧٦

خولـق و خـووی عالـەم خیلافـی ئـەنبیا موتتــەکایان کــرد بــۆ خــۆ، ئــەژدیها (٧٧

کـوا دەزانـی خـەتم و بەنـدی چـاو ئـەتۆ؟ کــوا دەزانــی بەسـتەچاوی تـۆ، لــەبۆ؟ (٧٨

چاو لەهەرچی کەی لەجێی وی،بێ گومان یەک بەیەک (بئس البدل) بوون گشت ئەوان (٧٩

خــۆ بــەلّام دەرهــات ڕۆژی کردگــار کردنــــی زۆر نــــا ئومێــــد ئومێــــد وار (٨٠

لـوتفی حـەق ئـەنجامی دا کـاری عـەجیب عـەینی کفـری کردەتـۆ بـەی زۆر نـەجیب (٨١

جا لەبەد بەختی عمـووم خوای عـەدڵ و داد بــێ ژمــاری دەر دەخســت کــانی وەداد (٨٢

چادەکـا غونچـەو گـوڵی زۆر جـوان لـەخار زیــوەری عالــەم دەکــا مۆرێــک، لــەمار (٨٣

ئــەو لەلــەیلی تــار دەردێنــێ نــەهار ئـەو دەکا پەیدا لـەدەس موعسیر، یەسار (٨٤

بــۆ بــرایم، ئەولـەخیز ئـارد سـاز دەکـا کێــو لەگــەڵ داوود هــەم ئــاواز دەکــا (٨٥

کێـوی پرقـودرەت لـەژێر هـەو رانـی تـار چــاو، بــەزیرو بــەم، دەکــا، نــاڵین و زار (٨٦

هەستەئەی داوود کەخۆت دوورکرد لەجـەم چیـت لـەدەس دا،مـن عیوەز ویت، پێدەدەم (٨٧

**پەنابردنی ئەو تالیبی گەنج بۆلای خودا، پاش جستوجۆی زۆر و عەجز و ئیزتیرار، کە ئەی پەروەرگار ئەو نیهانەی خۆت بیکە ئاشکار ..**

دەیکوت ئـەو دەروێش کەئـەی پـەروەردگار زۆر بەدووی ئەو گەنجەدا، من چووم بەغار (٨٨

دێـوی حیـرس و ئـازو، تونـد تونـد غـاردان هەربـەدووی ئەوگەنجـەدا بـوو، بـێ وچـان (٨٩

نەمـدەدی لـەو دیگـەلوقمێک مـن چ جـار غـەیری دەس ڕەش کـردن و سـووتانی زار (٩٠

یەک کەڕەت نەمکوت،کەچون نیم باخەبەر بـۆم وەکـا، بـا، ئـەوگرێ، خـوای دادگـەر (٩١

شەرحی قورئان کە، لەحەق داوا ئەتۆ     نەک بەوەهمت پووچ بکەی ئیجرا ئەتۆ (٢٢٩٢)

واز دەکا ئەو کەس گرێ، بەستوویەئەو     مۆرەهەڵدەگرێ کەسێک، خستوویەئەو (٢٢٩٣)

گەرچی زاهیر سادەیەگوفتاری وی     نینەئەزهان جێگەبۆ ئەسراری وی (٢٢٩٤)

لەو عەجەل تۆبەی دەکرد دەیکوت وەها     خۆت دەرت بەست،وەیکەوەخۆت،ئەی خودا (٢٢٩٥)

جارەکی دیش ڕێی فەنام من، کەوتەبەر     بۆ دوعا کردن کەنیمەهیچ هونەر (٢٢٩٦)

کوا هونەر؟کوامن؟دڵی سالم کووا؟     گشت تەجەللی تۆیە، چیم بێ ئەی خووا (٢٢٩٧)

شەو دەنوون فەرهەنگ و بیری من تەواو     چەشنی کەشتی گشت دەبن جا،غەرقی ئاو (٢٢٩٨)

من کەنامێنم،وەکوو خۆشم هونەر     تەن وەکوو مندار لەسەر خاک،بێ خەبەر (٢٢٩٩)

ئەو شەهی والامەقام شەو تا بەیان     هەم ئەلەست و، هەم بەلایتی، ئەو بەیان (٢٣٠٠)

کوان(بلی) بێژ؟ بردنی سێڵاو گشت     یانەهەنگێک خواردنی وردو درشت (٢٣٠١)

تیغی جەو هەرداری خۆی گەرکو سەحەر     لەو غیلافی زوڵمەتی شەو خستەدەر (٢٣٠٢)

ڕۆژی تابان ئەو شەوی تار، تەی دەکا     ئەو نەهەنگەش هەرچی خواردی قەی دەکا (٢٣٠٣)

چەشنی یوونوس لەو نەهەنگ دەن بێ،نەجات     جا دەبین پەخش و بڵاو،گشت نێو وڵات (٢٣٠٤)

خەڵک، وەک یوونوس موسەببیح بوون هەموو     چونکەدەو زوڵماتە، ڕاحەتیان هەبوو (٢٣٠٥)

یەک یەکەی عالەم دەڵێ وەختی سەحەر     گەرلەبەتنی حووتی شەو، ئەو هاتەدەر (٢٣٠٦)

دەو شەوی زۆر پڕ لەبیم ئەی خوای کەریم     گەنجی ڕەحمەت دات دەنان زۆرو عەزیم (٢٣٠٧)

چاوو گوێی تیژو تەنی سووک وەک پەلەنگ     دات نەجات تۆ لەو شەوی چەشنی نەهەنگ (٢٣٠٨)

جا لەوەی پاش هیچ لەڕێگای پڕ خەتەر     نیمەباک من، چون دەگەڵ تۆم هاو سەفەر (٢٣٠٩)

دی لەسەحرا نار، مووسا، نوور بوو     ئێمەدیمان شەو بەزەنگی، حوور بوو (٢٣١٠)

جا لەوەی پاش لێن دەوێی بینایی بەس     تاکو دەریای دانەپۆشێ پووش و خەس (٢٣١١)

ساحیران چاویان کەنەی ما، هیچ عەما     چەپڵەڕێزانیان دەکرد بێ دەست و پا (٢٣١٢)

بەندی چاوی خەڵکی هەر ئەسبابە بەس     بۆمەنین ئەسباب خوواز،ئەسحاب و،کەس (٢٣١٣)

خۆ بەڵام بۆ یارو ئەسحاب خوای غەفوور     وەی دەکرد دەر،بردنی تا، لایی ژوور (٢٣١٤)

کردنی مەشموولی لوتفی خۆیی حەق     هەردوو لا، نا موستەحەقق و، موستەحەق (٢٣١٥)

نێو عەدەم بوومان ئیستیحقاق خۆ     دانیشی واو، مەرتەبەی وان بێ، لەبۆ (٢٣١٦)

ئەی ئەوەی تەبدیل دەکەی ئەغیار بەیار     ئەی ئەوەی خەلعەت دەدەی تۆ،گوڵ بەخار (٢٣١٧)

جارەکی دیش خاکی ئێمە، پاک کە، تۆ     ئەو وجوودی هیچی ئێمە، چاک کەتۆ (٢٣١٨)

تۆ لەئەووەڵ دات فەرمانی دوعا
چون بەئیمەت داوەفەرمانی دوعا
شەو شکا، لێیان گەمی دەرک و حەواس
بۆ یەمی ڕەحمەت دەبا،جا،من،خودا
پڕ دەکا ڕووحێک لەنووری بێ هەواڵ
گەرکو هەمبا،من لەبۆ خۆم ڕای و بیر
هۆش دەما،لام شەو لەژێر فەرمانی من
جا دەبوو ئاگا لەگشت جێگای گییان
من کەخەونیشم لەدەس خۆم دا نییە
من ئەوەی دیتم بەنادیار فەرزەلام
وەک ئەلیف من نیمەهیچ شت، ئەی کەریم
ئەلف و میمن دایکی هەستین ئەی هەواڵ
ئەلفی ڕووتو قووت، نیشانەی غافڵی
هیچ کە نیمە وەختی بێ هۆشی ئەمن
هیچ لەسەر ئەو هیچەچیدی دامەنێ
نیمەهیچ حاڵم بەوی خۆش بێت و ڕوون
نیمەهیچ خۆ، خوا بکا دارا، ئەمن
من لەبەر دەرگات لەنێو فرمێسکی خۆم
بیکەخاتر ئەشکی بەندەی چاو نەماو
ئاوی چاو م گەر نەما ئەی کردگار
ئەو کەویستی حەق بدا بەو ئاوی چاو
چۆن نەبێ لاواز بەئەشکی خوێنی سوور
عاشقی ئەشکان کەئەو جوور چاو بێ
چەشنی قەترێک لەودوسەت سەیل چاک نین
باغی واجوان چاو کەئاو، داوا دەکات
گەڵ دوعا تۆ، خۆت ئەنیس کە، ئەی برا
نان کەسەدد و مانعی ئەو ئاوەبوو

چۆ ن دەنا جورئەت دەکا، خاکێک وەها
لێن قەبووڵ کە،ئەو دوعای خۆت ئەی خودا
جا نەمان،هیچیان،ئومێدو بیم و یاس
لەوکەمالات و،لەفەن چیم پێدەدا؟
پڕدەکا ڕووحێک لەئەو هام و خەیاڵ
ڕای وبیریش، بان بەدەس خۆم وەک ئەسیر
هەر لەژێر داوم دەمان، تەیرانی من
وەختی بێهۆشی و خەو، هەم ئیمتیحان
ئەی عەجەب ئەو کیبرو خودخواهیم چییە؟
جارەکی دیش دەس بەدامانی دوعام
غەیری قەلبی تەنگ تر،لەو چاوی میم
میمی (ام ) تەنگەو ئەلیف ڕووت و ڕەجاڵ
میمی دڵتەنگیش نیشانەی عاقڵی
وەختی هۆش خۆ، نیمەهیچ خۆشی ئەمن
نێوی دەوڵەت ڕەنجە، ئیدی دامەنێ
سەت عەزابی دا بەمن، وەهمی هەبوون
ڕەنجی زۆرم دیت، شاد کە، جا ئەمن
ڕادەوەستم، چون نەمان چاوم لەبۆم
پێم عەتاکە، لەو عەتای نابێ تەواو
پێم دەچاوی وەک موحەممەد، ئەشکبار
بەو هەموو ئیقباڵ و ئیجلالی تەواو
ئەو کەسەی وەک من فەقیر و پڕ قسوور
خۆ دەبێ ئەشکم وەکووسێلاو بێ
چون نەجات بەوقەترەبوون گشت ئینس و جین
چۆن دەبێ ئاوی نەوێتن شۆرەکات؟
چیت لەوەیدا، لێت قەبووڵ،یا ڕەدکرا
بەردەلەونان دەستی خۆت تۆ، زووکەزوو

چوست و ڕێک و پێک کەخۆت، تۆ ئەی فلان چاکــەبۆخۆت تــۆ، بــەئاوی چــاو نــان (٢٣٤٦)

## هاتنی دەنگی غەیبی بۆ ئـەو تـالیبی گەنجەوئاشکرا کردنـی حەقیقـەتی ئەسراڕی ئـەو گەنجە..

بـۆی دەهـات ئیلهـام کـەبوو دەوفیکـرەدا موشکیلی وی حـەل دەکرد ئـەو دەم خـودا (٢٣٤٧)
پێـت دەکـوترا، دابنـێ تیـر، نێوکـەوان کێ بەتۆی کوت، زێ بکێشەئەی جەوان؟ (٢٣٤٨)
پێـت نـەکوترا زێ بکێشـە تـا بنـێ پێت دەکـوترا نێـو کـەوان تیـر دا بنـێ (٢٣٤٩)
تـۆ فزوولیـت کـرد بڵێنـدت کـرد کـەوان خـۆت بـەتیر ئەنـدازی مـاهیر دا نیشـان (٢٣٥٠)
توند مەکێشە زێ لەوەی پاش ئەی جەوان دابنـێ تیـر بـێ فڕێـدان، نێـو کـەوان (٢٣٥١)
کەوتـە هـەرجی هەڵقەنـە تـۆ زوو ئـەوێ جا بە زاری نەک بە زۆریت، زێڕ بوێ (٢٣٥٢)
خـۆ خـودا ئـەقرەب بـوو، لەو،حەبلولوەریـد تیری فیکری خۆت هاویشت، جێی بەعید (٢٣٥٣)
ئـەی ئـەوەی دات نـاوەتیرت نێـو کـەوان ڕاو نزیکـە، تیـر دەهـاوێی دوور مـەکان (٢٣٥٤)
هـەرچی بـاوێ دوورتـر ئـەو دوور تـرە ئـەو لەگـەنجی وا گـەلێک مـەهجوور تـڕە (٢٣٥٥)
فەلسـەفی کێشای بە فیکری زێدە، ڕەنج بەو بلّێ ئێستا دەڕۆی تۆ، پشت بەگەنج (٢٣٥٦)
بـەو بلّـێ تـۆ غـار دەهەرچـەن، غـار بـدا ئـەو لەویسـتی دڵ دەبـێ زیـاتر جـودا (٢٣٥٧)
(جاهـدوا فینـا )ی، دەکـوت ئـەو شـەهریار (جاهـدوا عنـا )ی، نـەکوت ئـەی بێ قـەرار (٢٣٥٨)
چەشنی کەنعان، نووح لەلای وی نەنگ و عار چـوو هـەتا سـەرنووک وقوللـەی کێو، بـەغار (٢٣٥٩)
هـەرچی زیـاتر بـۆ نـەجات، بـۆ کێـو دەچـوو ئەو لەجێی ئەمن و نەجات دوور تر دەبوو (٢٣٦٠)
چەشنی ئەو دەروێشـەگەر بۆ گـەنج و کان ڕۆژ بـەڕۆژ ئەو توند تری داویشت کـەوان (٢٣٦١)
هەرکـەوانێکی کـەدەیگرت زێدەسـەخت زێدە ترلێی دوور دەبوو، ئەوشانس و بەخت (٢٣٦٢)
ڕائیجەئـەو قەولـەلای خـەڵکی جیهـان بـۆ عـەزاب شایسـتەیە، گیـانی نـەزان (٢٣٦٣)
چونکەئوسـتاد نـەنگ و عـارەلای، نـەزان لاجـەرەم چـوو وەی دەکـرد، بۆخـۆی دوکان (٢٣٦٤)
گـەردوکان بـاڵایی وەسـتای گـرت قـەرار بــۆ گــەنیوەپڕ لــەدوو پشــکەو لــەمار (٢٣٦٥)
وەڕ گەڕێ تۆ ئـەو دوکان کـە، زوو خـەراو ڕووکـەلای سـەو زەوگـوڵان و، گۆمـە ئـاو (٢٣٦٦)
نــەک وەکووکــەنعان لەبــەرکیبروغروور ئەو نەجاتی خۆی لەکێو ویست، نەک غەفوور (٢٣٦٧)
عیلمـی تیرەنـداز حیجابێـک بـوو عـەجیب مەقسەدی خۆی ئەو هەبوو، حازر لەجیب (٢٣٦٨)
عـیلم و زیخـی زۆر کـەڕەت، جـا، وادەکـەن سـالیکانی حـەق لـەڕێ گـومڕا دەکـەن (٢٣٦٩)

| | |
|---|---|
| ئەبلـەهن ئەکسـەر بەهەشـتی بـێ گومـان | تـا لەفیلسـووفی بـەدوور کـەن، خـۆ ئـەوان ٠) |
| خـۆت بەدوورکـە، تـۆ لەفـەزلی نالـەبار | ڕەحمـەتت تـا دەمبـەدەم، بـۆ بێتـەخوار ١) |
| زیرەکـی زیـددی نییـازەو ئینکیسـار | زیرەکـی لانـی، بەلاهـەت، بگرەیـار ٢) |
| زیرەکـی داو بـوو، لـەبۆ سـوودی جیهـان | چـی لـەزیخی وزیرەکـی دا، پـاک ڕەوان ٣) |
| شەخسی زیرەک بەس بەمـەوزووع قانیعـە | شەخسی ئەبلەه، ڕووی فەقەت لای سانیعە ٤) |
| چونکـەدایک بـۆ منـاڵی شـیرخوار | دەست و پێ و، وشیار لەوی لەیل و نەهار ٥) |

**حیکایەتی ئەو سێ موسافیرانە، موسەڵمان و مەسیحی و یەهوودی کەلەمەنزڵی خۆیـان ڕزقێکیان کەو تەدەست، مەسیحی و یەهوودی تێر بوون، کوتیـان ئـەو ڕزقـەی سبەی دەخۆین، موسەڵمان بەڕۆژوو بوو، برسی ماوەچون دەئەقەللیەت دا بوو..**

**خولاسەی داستان ..**

یـەک یـەهوودی و مەسیحی وموسـەڵمان هاو سەفەربوون چوونەماڵێک، ساحەب ماڵ هـەڵوای دانـێ و ئـەو لـەحزەوەختی نـوێژی مـەغریب بـوو، موسـەلمان زۆر برسـی بـوو چونکەبـەڕۆژوو بوو،بـەڵام ئـەو دوو نەفـەرەی دی زۆریـان خواردبـوو مـەیلی هـەڵوایان نـەبوو، موسـەڵمان کـوتی واچاکە،کەئەو شەو هەڵواکە، بخۆین ئەو دوو نەفەرەکانی دی کوتیان نـەخێر دەی هێڵینـەوەبۆ سبەی، پاش ڕەدد و بەدەڵ کردنی چەند قسەیەک دەبارەی ئەوەدا کەهەڵوایەکەئەو شەو بخۆن یاسبەی، عاقیبەت وایان قەرار دانا کەهەرسێ نەفەر سبەینێ خـەونی شـەوی ڕا بـردووی خۆیـان بگێڕنەوەتا کو هەرکام خەونی باشترو جالبتری دیتبێ هـەڵوا بۆ وی بێ،یـەهوودی کـوتی دوێنـێ شـەوێ دەخـەونم دا دیـتم کەمووسا علیەالسـلام هـات و ئـەمنی بردەکێوی تـوور وکەشـفیاتی عەجیب و غەریبی دا بەمن، جا خەو نەکەی خۆی بەتەفسیل گێڕاوە، مەسیحیش کوتی دەخـەو نم دا دیتم کەعیسا علیەالسلام ئەمنی بردەئاسمانی چوارەم و دەگـەڵ وی ئەسراڕی جالبم بۆ کەشف و عـەیان بـوو، جا ئـەو مەسیحیە بۆ ئـەوەی کەفەزیلـەتی خـەونی خۆی بەسـەرخەونی یەهوودی نیشان بدا کوتی سوورەتی خەونی تۆ هەرچی بێ دەزەمـین دا واقیع بوو دەحاڵێک دا خەونی من لەبڵیندایی ئاسمان، وچون ئاسمان بەسەر زەمین شـەڕافەت و بەرتـەری هەیەخـەونی من لەخەونی تۆ چاترەلـەئاکام دا هـەڵوا یەکەبـەمن دەگا بـەڵام ئـەو دوونەفـەرە، بێ خەبـەربوون کەموسـەڵمان نیوەشـەو پێشدەسـتی کـردووە، وهەڵوایەکـەی تـەواو خواردووە،وەختێک کەنۆبـەی موسەڵمان هات بەلـەحنێکی تێکـەڵ بەتانەوتەشـەرکەدرۆی وانی دەگەیاند کوتی دوێنـی شـەوێ

ڕەسوولی خودام (ص) دەخەو دا، دی،کەبەمنی فەرموو ئێستا کەڕەفیقەکەت دەگەڵ مووسا چۆتەکێوی توور وموکاشەفاتێکی وەدەس کەوتووەوئەوی دیکەش چۆتەئاسمان وئەسراڕی بۆ ئاشکرا بوونە، جا ئەدی بۆ چی ئەتۆ ڕاوەستاوی؟ زوو هەستەوئەو هەڵوایەبخۆ وئەمنیش چارەم نەبوو کەفەرمانی ڕەسوولی خودا بجێ بێنم،کوتیان بەڕاستی خەون ئەوەیەکەئەتۆ دیتت ..

داستانێک گوێ دەیەتۆ ئەی جەناب — تا نەبینی تۆی هونەرمەند، هیچ عەزاب (٢٣٧٦)

موئمین وجوو گەڵ مەسیحی سێ نەفەر — بوون دەگەڵ یەکتر لەڕێگا، هاو سەفەر (٢٣٧٧)

گەڵ دووگومڕا بوو بەهاوڕێ موئمینێک — وەک عەقڵ گەڵ نەفس وگەڵ، ئەهریمەنێک (٢٣٧٨)

مەروەزی و ڕازی دەبن جا، جارو بار — هاو سەفەر گەڵ یەکتری چەشنی دوو یار (٢٣٧٩)

زاغ و جوغد و باز دەبن، نێو یەک قەفەس — پاک وناپاکیش دەزیندا ن، هاو نەفەس (٢٣٨٠)

وا دەبێتن شەو لەیەک کاروانسەرا — ئەهلی شەرق و ئەهلی غەرب و، ماوەرا (٢٣٨١)

بەفرو سەرما بێ، دەمێنن بێ، هەرا — مەزن و چووک گەڵ یەک،لەیەک کاروانسەرا (٢٣٨٢)

گەرنەمێنێ بەفرو، ڕێگا بێت واز — هەرکەسە، دەڕوا لەبۆ جێی دڵخواز (٢٣٨٣)

گەر قەفەس بشکێ بەعەقڵی شاهوار — جەمعی تەیران دێنەدەر، دەفڕن، بەغار (٢٣٨٤)

حازری پەروازبوون پێشان زیاد — جینسی خۆیان ئارەزوو بوو، هەم موراد (٢٣٨٥)

زۆر بەشەو ق و ئارەزوون، بۆ هەڵفڕین — ڕێگەبۆ پەرواز بەڵام مومکین، چ نیین (٢٣٨٦)

ڕێ وەبێ، دەفڕن وەکوو با، شادحاڵ — لای ئەوەی وازیان بەبۆی وی کرد، باڵ (٢٣٨٧)

ڕێ کەواز بێ، دەچنەئەو جێگا، ئەوان — زۆر لەبۆ وێ کردیان ناڵەو فیغان (٢٣٨٨)

چاو لەجیسمی خۆت کە، ئەو ئەجزایی تەن — چۆن و لەکوێ کۆ وەبوون،جا نێو بەدەن؟ (٢٣٨٩)

کۆ دەبوون نێو جیسمی تۆ زید، تێکەڵاو — عولوی، سوفلی،ناروخاک و باوو، ئاو (٢٣٩٠)

چوو لەنێو کاروانسەرا عەودەت، لەدەست — چونکەبەفری بێ ئەمان، ڕێگەی دەبەست (٢٣٩١)

بەفری سەخت و زۆر، دەهێنێ، ئینجیماد — بەفرەدوور بوونت، لەڕۆژی عەدڵ و داد (٢٣٩٢)

گەر لەژێر ڕۆژی بەقار بێ، کێو سەری — کێو دەبێتەخیزو، جار جارەش خوری (٢٣٩٣)

دەبنەئا و بەو قار، جەماداتی گران — چەشنی تەن ئەو دەم کەدەردێتن گیان (٢٣٩٤)

گەرکوچوون بۆ ماڵەکی ئەو سێ نەفەر — هەدیە،هەڵوای دا بەوان، یەک خۆش نەزەر (٢٣٩٥)

بردی هەڵوا بۆ ئەوان سێ کەس غەریب — موحسینێک لەو مەتبەخی(انی قریب ) (٢٣٩٦)

نانی گەرم و قاپی پڕهەڵوای عەسەل — بردی ئەو کەس، بەس سەوابی بوو، ئەمەل (٢٣٩٧)

زیرەکی زۆر چاک لەئەهلی شار دێ — قەدری میوان گرتنیش، بۆ خەڵکی دێ (٢٣٩٨)

ئــەو خــودای زانــا بەئەســرارو بــەڕاز
قــەت، چ ڕۆژێــک، دێ، بــەبێ میــوان نییــە
شــەو بــەبێ میــوانی نــوێ، دێ، خــۆ نییــە
زیــاد لەحــەدیان خواردبــوو ئــەو دوو نــەیار
وەختــی مــەغریب هــات هــەڵوا، بــۆ ئــەوان
جا دەیان کوت ئەو دووکەس، تێرین ئەمە
چاکەســەبرن بــێ، نــەخۆین با،تــا، بــەیان
پێیکــوتن مــوئمین دەخــۆین ئــەو شــەو ئــەوە
جا دەیــان کــوت بــەو، ئــەتۆ فێڵ چادەکــەی
پێیکــوتن ئــەو ئێمــە، ســێ کــەس زیــدەنین
هەرچی ویستی سەهمی خۆی کا، نۆشی گیان
ئەو دوو کوتیان مەیکە سەهمی جوێ جووێ
ئــەو کــوتی (قەسســامی فیننــار) بــوو ئــەوا
تۆ،بــەکامیل ســەهمی زاتــی خــوای تــەکی
گــەر نەبایــەدەوری ئــەو دوو بــەد ڕەگــان
ویســتییان بــێ، ئــەو موســەڵمان دەردەدار
ئــەو موســەڵمان بــوو مــوتیعی ئــەو دووان
شــەو دەنوستن،هەڵدەســان، هەرسێ،ســەحەر
شوشــتییان هەرســێک دەســت و ڕوو و، زار
ویردی خۆیان یەک بەیەک ئێجرا دەکرد
مــوئمین و جوو،گــەبرو نەسرانی و،مــەجووس
بەڵکەبــەردو خــاک و خیــزو کێــوو، ئــاو
ئــــەو وتــــارەدوایی نایــــەخۆ، چ جــــار
عاقیبــەت دەیکــوت وەهــا ئێکێــک لــەوان
بیخــووا، هــەر کــەس کەکەخــەونی چــاترە
ئــەو کەســەی کــە، عــەقڵی زۆر باڵایەئــەو
زیــاد لەخەڵکــە، گیــانی پــڕ ئــەنواری وی

خووی ئەهالی دێی دەکرد، میهمان نەواز
یــاوەری وی، غــەیری خــوای ڕەحمــان نییــە
هیچ پەنا ی ئەو غەیری یەزدا ن، بۆ نییە
مــوئمین ئــەمما بــوو ئــەوێ ڕۆژ، رووزەدار
بــوو لەبرســان شەخســی مــوئمین ناتــەوان
ئێستــەنا، دەیخــۆین سبەینێ یــەک جەمــە
بــــۆ زەخیرەئێســــتەبا بیکــــەین نیهــــان
بــــا ســــبەی ســــەبرن ببێــــتن پێکــــەوە
دەتهــەوێ تــەنهای بخــۆی، جــا وادەکــەی
بەش دەکەین ئەو، تاکونەن بێ بوغزو کین
هــەرچی ویستی سەهمی خۆی کاتن نیهان
بگــرە بــۆ ( قەسســامی فیننــار ) تــۆ گــووێ
خــۆی بکــا تەقسیم بــەینی خــواو، هــەوا
سەهمی غەیری خوا بدەی گەر، موشریکی
شێر دەبوو غاڵب، لەسەر جەمعی سەگان
بێ عــەزایی شــەو، غــەمی بــۆ بــێ، هــەزار
مــن لــەحاس، ئێوەمــوتیعم، بــێ زەبــان
ڕێــک وپێکیــان کــرد خــۆ، هەرسێ نەفــەر
ویــردی خۆیــان کــرد بــەزیکری کردگــار
فــەزڵی یــەزدانیان، ئــەو ان داوا دەکــرد
گشت لەدەرگای ئەو شەهەنشا،خاک بووس
گشت نیهــان بــۆ لای خودایــان کــرد چــاو
ڕوو بەڕووی یێک بوون ئەو سێ، چەشنی یار
هەرچی دوێ شەو خەونی دی، بیکا، بەیان
ســەهمی مــەفزوول بــۆ کەســێک بــاڵاترە
خــــواردنی وی خــــواردنی دونیایەئــــەو
فــەخرەبــۆ عــام بینەخزمــەتکاری وی

عاقڵان چون، تا ئەبەد بوون جاویدان — وا دەدا نیشان، کەجاوید بوو جیهان (٢٤٢٦)

جوو بەیانی کرد بۆیان خەونی خۆی — پێیکوتن، شەو ڕووحی وی، بۆ کوێ دەڕۆی (٢٤٢٧)

ئەو کوتی دیتم لەڕێ مووسا ئەمن — هەرچلۆن دەمویست دیتم، وا ئەمن (٢٤٢٨)

چووم بەدووی مووسا ئەمن تا کێوی توور — ئێمەهەرسێکمان دەبووین جا، غەرقی نوور (٢٤٢٩)

هەرسێ سێبەر بەو هەتاو بوون،زوو فەنا — واز دەبوو دەرکێک لەو نوور،دوایەجا (٢٤٣٠)

جا، لەنێو ئەو نوورە، نوورێک هاتەدەر — چوست و چالاک ڕێی تەڕەققی گرتەبەر (٢٤٣١)

من دەگەڵ مووسا، دەگەڵ مەش کێوی توور — ون دەبووین هەرسێک، بەو ئیشراق و نوور (٢٤٣٢)

دیم لەپاشان،من کەکێو، سێ پارەبوو — چون لەوی دا، نووری حەق، ئەو کارەبوو (٢٤٣٣)

کێو کەدیتی هەیبەتی خوای کردگار — لەت دەبوو، چوو، بۆ هەموو لا یەک، بەغار (٢٤٣٤)

پارەیەک لەوکێو دەهات خۆی خستەیەم — بوو بەشیرین ئاوی تاڵی چەشنی سەم (٢٤٣٥)

پارەیێکی دیکەشی چوو، نێو زەمین — هاتەدەر کانیاوی دەرمان و مەعین (٢٤٣٦)

بۆ شەفا ئەو ئاوە، بۆگشت دەردەدار — بەس بەلوتفی وەحیی پاکی کردگار (٢٤٣٧)

پارەیێکیش کردی جا، پەرواز زوو — هاتەلای کەعبە، کەئەو عەرفات بوو (٢٤٣٨)

گەرکو بێ هۆشی لەمن خۆی کرد بەدوور — دیم ئەمن بێ زیاد و بێ کەم، کێوی توور (٢٤٣٩)

کێو بەڵام ژێر پایی مووسا وەک سەهۆڵ — بوو بەئاو، هیچ لەو نەما، نەک خاک و خۆڵ (٢٤٤٠)

کێو لەهەیبەت بوو بەهاو سەتحی زەوی — لای سەرووشی بوو، لەبەرهەیبەت نەوی (٢٤٤١)

گەر وەهۆش هاتم ئەمن لەو ئینتیشار — دیم کەمووساو توور لەجێی خۆن بەر قەرار (٢٤٤٢)

دیم لەژێر ئەوکێوەعالەم دیاربوون — هەروەکوو مووسا، بەڕووو، ڕوخسار بوون (٢٤٤٣)

وەک عەسا، وەک خەرقەکەی وی، خەرقەیان — گشت لەبۆ لای توور دەچوون زۆر شادمان (٢٤٤٤)

جا، هەموو لێکرا دەبوون دەستەو دوعا — نەغمەیان بوو، خۆت نیشان دە، ئەی خودا (٢٤٤٥)

ئەو چەلەش هۆشم ئەمن گەر هاتەبەر — جوورەکی دیکەم ئەمن دیتن سووەر (٢٤٤٦)

ئەهلی وەد بوون، ئەنبیا بوون، گشت ئەوان — لێم عەیان بوو وەحدەتی پێغەمبەران (٢٤٤٧)

ئەو چەلەش دیتم مەلا ئێک زۆر عەجیب — دیم لەبەفرەسووڕەتی وان، زۆر غەر یب (٢٤٤٨)

دیم گرووهێک دی، مەلائیک موستەعین — هەیبەتی تێکڕای ئەوان، بوو ئاگرین (٢٤٤٩)

لەو وتانەی کوت گەلێک ئەو شەخسی جوو — واش دەبێ جوو، ئاخری زۆر چاک دەبوو (٢٤٥٠)

تۆ لەهیچ کافر مەنۆڕەبەست و خوار — چون بەموسلیم، مەرگی وی ئوومێد وار (٢٤٥١)

کوا لەخەتمی عومری وی ئاگای ئەتۆ؟ — وەڕبگێڕی تا لەوی تۆ ڕوویی خۆ (٢٤٥٢)

جـا مەسـيحی دوايـەهات کەوتە،کـەلام | حـەزرەتی عيسـام ئـەمن دی نێـو مـەنام
چـووم دەگـەڵ وی تـاکو چـوارەم ئاسـمان | مەرکەزو و مەسوای هـەتاوی گشت جيهان
زۆر عـەجيب بـوون ئـەو قـەڵای نێو ئاسمان | زۆرەفـەرقی وان و مـەو جـوودی جيهـان
خـۆ هـەموو عالـەم لـەلايان بوو،يـەقين | زۆرەفـەرقی فـەزڵی ئاسـمان و زەمـين

**حیکایەتی وشترو گـاو بـەڕان لـەڕێگادا، کەکـەمێکیان گیـا پەیـداکرد، هەریـەک لـەوا دەیکوت کەئەمن دەیخۆم ..**

**خولاسەی داستان ..**

وُشـترێک و گایـەک و بـەرانێک هـاو سـەفەربوون، لـەڕێگا دا بەسـتەگيايەکيان پەيـ کرد،چونکەئەوگياکـەم بـوو، بـەران کـوتی ئـەی ڕەفيقـان ئەگـەر ئـەو گيـا کەمـەدەنێو خۆمـان تەقسيم بکەين هيچمان تێر ناخۆين جا واچاکەئەو ەی عومری زياترەئەو بيخوا، هەمووويان ئـا پێشنيهادەيان قەبووڵ کرد، بـەران بۆ ئەوەکەسابيت بکا کـەعو مـری زۆرە،کوتی ئـەمن دەگـە ئەوبەرانەی کەخودا کرديەفيديەی حەزرەتی ئيسماعيل لەيەک لەوەرگەدەلەوەڕاين يانی تاريخ وەلادەتی من دەگاتەزەمانی حەزرەتی ئيبراهيمی خەليل (ع) وەختێک کەگا ئەو قسەناردروستە بيست ئيدديعايەکی زياتر لەئيدديعای وی کرد، وتازيادی عومری خۆی سابيت بکا کوتی ئەم ڕەفيقی ئەو گايەم کەباب ئادەم (ع) عەردی بەوەسيلەی وی دەکێڵا، يانی تاريخی وەلادەتی م دەگاتەزەمانی حەزرەتی ئادەم (ع) وشترکاتێک ئەو ئيدديعايانەی وا پووچ وبێ ئەساسی بيسـ بەبێ ئەوەی کەهيچ بڵێ،ملی درێژکرد و بەستەگيايەکەی خوارد، وکوتی ئـەی ڕەفيقـان تەماش کەن، جيسمی وا گەو رەوملی وادرێژم نيشان دەدەن کەئەمن لەئێوەبەعومر ترم،جا بـەو خـاترە ئيسباتی بەعومربوونم نيازم بەنيشاندانی ئەسنادومەداريکی تاريخی نييە..

گـاو بـەران و وُشـترێک بـوون هـاو سـەفەر | بەستەيەک گيا،کەوتـەدەس ئـەو سێ نەفـەر
وای بەران کوت گەرکو تەقسيم کەين ئەمە | ئێمـەنابين تێـر بـەوی، چـون زۆر کەمـە
خـۆ بـەڵام هەرکـەس کـەعومری زيـاترە | ئـەو گيـا بەئـەو کـەبيخوا چـاترە
قـەدری پيـران چـون لەسـەرمان لازمـە | چونکـەوايکوت سـوننەتی ئەحمـەد بەمـە
گـەرچی دەو دەورو زەمانەشەخسـی پـەس | پيـر دەخـا بـۆ پـێش، لـەدوو جێگـاوو، بـەس
يـا لەچێشـتێک گـەرم و زۆر سـووزان بـێ | يـا لـەپردێک بيهـەوێ وێـران بـێ
شەخسـی پەسـت و نالـەبار هـەربێ دەليـل | نـاگرێتن قـەدری پيرانـی جـەليل

چاکەکەی گەر بێت تا ئەو حەددەبەد    بۆ بەدی وی هیچ کەنابێ مەرزو حەد (٢٤٦٤)

چوو لەبۆ مەسجید چەلێک یەک شەهریار    زۆر لەخەڵکیان دا، نیگەهبانان بەدار (٢٤٦٥)

یەک لەوێ دەشکا بەزەربی دار سەری    یەک لەوێ دەدڕا بەکێش، جامەی بەری (٢٤٦٦)

تا بەدوور کەن خەڵکی لەو ڕێی شەهریار    وێی کەوت بێچارەیەک، بێ خود، دە، دار (٢٤٦٧)

ئەو دەخوێن دابوو شەڵاڵ، دەیکوت بەشا    زوڵمی مەڕئیت وایە،باتین چۆنەجا؟ (٢٤٦٨)

تۆ کەخێرت بێ لەمەسجید چوون وەها    زوڵم وجەوری تۆ دەناسێ بەس خودا (٢٤٦٩)

قەت لەنامەرد پیر نابیسێ سەلام    تا مەگەر نەی بێ عەزابی وی، مەرام (٢٤٧٠)

پاک کەحەملەی پێ بکاتن گورگی هار    چاکترەتا بێ بەنەفسی بەد دوچار (٢٤٧١)

چونکەگەرچی زاڵمەگورگی نەیار    خۆ بەلام ئەو مەکرو فێڵ ناکا، چ جار (٢٤٧٢)

چۆن،کەفێڵباز با دەکەوتەنێو داو؟    مەکر وفێڵ مەخسووسی ئینسانان تەواو (٢٤٧٣)

جا بەران دەیکوت بەوُشتر هەم بەگا    کەوتەدەسمان چونکەئێستا بەستەگیا (٢٤٧٤)

عومری خۆتان یەک، بەیەک کەن ئاشکار    کێهەپیرتر بێت، گیا، کەن بەو نیسار (٢٤٧٥)

وای بەران کوت یەک لەوەڕگەن ئێمەبوو    گەڵ قوچی فیدیەی سمایل، دوو بەدوو (٢٤٧٦)

گا، کوتی هیچتان وەکوو من پیرکە، نین    من دەگەڵ گای ئادەمم کێڵا، زەمین (٢٤٧٧)

من دەگەڵ گای بابەئادەم جووت بووم    بۆ زەمین کێڵان دەگەڵ ئەوگا دەچووم (٢٤٧٨)

گەر لەگاو قوچ بیستی وشتر وا وتار    تا کو بگرێ گیا، سەری هینایەخوار (٢٤٧٩)

جا بڵیندی کرد ئەو وشتر، گیا    بێ هەراو بێ دەنگ و باس، بێ هیچ سەدا (٢٤٨٠)

من بەتاریخم نییەخۆ هیچ نیاز    بەو تەنی وا گەو رەم و، ئەستۆی دراز (٢٤٨١)

لای هەموو کەس ئاشکرایەهەم عەیان    من لەئێوەنیمەچووکتر بێ گومان (٢٤٨٢)

خۆ لەلای هەرکەس کەعەقڵی بێ بەیار    هەیکەلم زیاتر لەئێوەبوو، دیار (٢٤٨٣)

چونکەمەعلووم بوو لەلایان عاقڵان    سەت ئەوەندەی عەردی تارەئاسمان (٢٤٨٤)

بێ گومان زۆر لێک بەدوورو لێک جییان    جێ ومەکانی عەردی خاکی و ئاسمان (٢٤٨٥)

### بەیان کردنی موسەڵمان ئەوەی کەدیبووی بەیارانی جوو ومەسیحی خۆی وحەسرەت و ئەفسووس خواردنی وان ..

جا موسەڵمان دەیکوت ئەی یارانی من    هاتەلای من موستەفا، سوڵتانی من (٢٤٨٦)

پێیکوتم یەکیان دەچوو سەرکێوی توور    شادو خۆشحاڵ گەڵ کەلیمی خوای غەفوور (٢٤٨٧)

ئێکی دیشیان ئەو مەسیحی بەختەوەر    تاکو چوارەم ئاسمانی بردەسەر (٢٤٨٨)

ئەی زیان دیتووی فەقیر، دەی هەستەتۆ — بێ تەوەققوف ئەو غەزاو هەڵوا بخۆ (

ئەو هونەر مەندانی پڕ فەن هەر دووان — نامەیی ئیقباڵی خۆیان کرد بەیان (

ئەو دوو فازیل فەزڵی خۆیان کەوتەدەس — بەو فەزیلەت گەڵ مەلەک بوون هاو نەفەس (

ئەی موسەڵمانی نەفامی هیچ نەزان — هەستەئەو هەڵوایەتۆ کە، نۆشی گیان (

بەو دەیانکوت ئەی حەریس ئەو دوونەفەر — ئەی عەجەب خواردت ئەتۆ هەڵوا مەگەر؟ (

پێیکوتن،چون پێیکوتم ئەو شای موتاع — کوا لەدەستم دێ، بکەم من، ئیمتیناع؟ (

کوا ئەتۆی جوو بێ قسەی مووسا دەکەی؟ — خۆ ش و نا خۆش ئەمری وی ئیجرا دەکەی (۱

تۆی مەسیحی کوا لەفەرمانی مەسیح — لادەدەی خۆت؟جا چ باش بێ، یا قەبیح (۶

چۆن وەلانێم فەخری دوو دونیا ئەمن؟ — شادم و هەڵوا م خواردن، تەنها ئەمن (۲

جا دەیان کوت سوێن بەیەزدان خەونی تۆ — ڕاستەچاتر سەت لەخەونی ئێمەخۆ (۸

خەونی تۆ هوشیاریەئەی شادمان — چون لەهوشیاری ئەسەر لەو بوو عەیان (۱

وێڵ کەتۆ جا، زیرەکی هەم فەزڵ و فەن — کار، یەنی خزمەت خوداو،خولقی حەسەن (۰

دا ی بەئێمەبۆیەجا، یەزدان بوون — ئینس و جینم چا دەکرد، تا ( یعبدون ) (۱

چی هەبوو بۆ سامیری سوود، ئەو هونەر؟ — ئەوهونەرکردی لەدەرکی خوا بەدەر (۲

کیمیا چی دا بەقاروونی غەوی؟ — شەق دەبوو بردی لەبۆ بن خۆی زەوی (۳

بولحەکەم چی هاتەدەستی لەو هونەر؟ — ئەو بەکوفران سەر نەوی چوو، نێو سەقەر (۴

با هونەر ئەو کەس بوو دیتی نار عەیان — نەک بڵێ ناری دەکا ئاشکار دوخان (۵

ئەی دەلیلت بۆ گەنیو تر لای لەبیب — لەو دەلیلەی بۆ نەخۆش هەیتی تەبیب (۶

گەر کونیتەهیچ دەلیلی دیکەتۆ — چاک بنۆڕەتۆ، لەمیزو،گوو بخۆ (۷

ئەی دەلیلی تۆ شەبیهی ئەو عەسا — دەستی کوێرەو،کوێر دەکاتن ڕەهنەما (۸

هەمهەمەو داد و هەراو هوریا دەکا — جا لەخەڵکیش عوزری خۆی داوا دەکا (۹

**ئیعلام کردنی سەیید، شای تیرمەز،کەهەرکەس دەماوەی سێ یا چوار ڕۆژ بچتە سەمەر قەند بۆ فلان کارەموهیمەخەلات و ئەسپ وکەنیز وزۆریشی زێڕ دەدەمێ، وبیستنی دەلقەک خەبەری ئەو ئیعلامییە، دەدێ دا، وهاتنی وی بۆ لای شا، کەئەمن ناتوانم بچم**

**خولاسەی داستان ..**

شای ویلایەتی تیرمەز دەدەسگای حکوومەتی خۆی دا دەلقەکێکی زیرەکی هەبوو ڕۆژێک جاڕ چیان دەشار دا جاڕیان کێشا کەهەرکەس دەماوەی پێنج ڕۆژ لەتیرمەزبچتەسەمەر قەند و

لەویّ خەبەر بۆ شا بێنێ، پاداشی باشی دەدرێتێ، دەڵقەک دەو کاتەدا لەدێ یەک بوو.. ئەو خەبەرەی کەبیست فەورەن سواری ئەسپێکی توند ڕەو بوو و توند بۆ لای تیرمەز ڕۆیشت بەحەددێک ئەو ئەسپەی توند غار دەدا کەئەو بەستەزمانەدەرێگا دا سەقەت بوو،جێ بەجێ ئەسپەکی دیکەی وەرگرت دوو بارەوەک با، غاری دا، ئەو حەیوانەش بەهەلاّتنی سەریع و بەردەوام تەلەف بوو، خولاسەی کەلام بەئەسپی سێهەم خۆی گەیاندەدەرباری شا،و بەسەرو وەزعی ئاڵۆزو تۆزاوی کەلەبەر هەیەجان بەشیددەت نەفەسی لێی دەدا لەمەئموورانی ئیجازەی مولاقاتی شای داوا کرد، قیافەی تووڕەو نارەحەتی دەڵقەک نیشانەی واقیعییەتێکی گەو رەبوو ودەر باریان لەو حاڵەتەی دەڵقەک نیگەران بوون چونکەتا ئەو کاتەئەویان بەو حاڵەتەنەدیبوو کەمکەمەسرت و قورت کەوتەنێو دەرباریان وپەرێشانی و ئیزتیراب لەڕەنگ و گوفتاریان ئاشکرا بوو، شا، ش موتەوەججیهی وەزعی غەریرەعادی نێو دەرباریان بوو، ونەی توانی نیگەرانی خۆی پنهان بکا، چون لەمێژ بوو نیگەرانی حەملەی ئیحتیمالی سوڵتان موحەممەد خوارەزمشا بوو هەموویان بەخۆیان دەکوت ئیحتیمالی وقووعی حادیسەیێکی ناخۆشەکەدەڵقەکی ڕوو بەپێکەنین ئێستا وای بەسەرهاتووە، کەمکەم خەڵکی شار لەو نیگەرانیانەئاگادار بوون، وبەپەلەلەدەوری دەربار کۆ بوونەوە، تا بزانن چ کارێکی خەراپ و ناخۆش دەحاڵی واقیع بوون دایە، ئایا دوژمنێکی ماڵ وێرانکەر ڕووی دەمەملەکەتی ئێمەکردووە؟ ئایا بەلاّیەکی خانمان سووزدەحاڵی نازڵ بوون دایەوئەمسالی ئەو سوئالانە، کەهەموو فکرو خەیاڵیان پڕبوو، گەرچی شا، ئەو وەختی ئیجازەی مولاقاتی بەکەس نەدەدا، بەلاّم چونکەشا، زۆر ترسابوو جێ بەجێ دەڵقەکی بۆ لای خۆی بانگ کرد، وفەو رەن بەنیگەرانی پێیکوت بلێ بزانم خەبەرچییە؟چ قەو ماوە؟ شا زۆر ئەو سوئالانەی تیکرار کردنەوە، بەلاّم دەڵقەک هیچی نەدەکوت، فەقەت قامکی لەسەر لێوی خۆی دا دەنا کە،س، س، قسەمەکە، ئەوکارەی غەیرەعادی دەڵقەک وەهم و نیگەرانی شاو ئەتڕافیانی دوو چەندان کرد دوو بارەشا، بەشێواوی وپەرێشانی ئەو سوئالەی لێ تیکرار دەکرد، دەڵقەکیش بەئیشارەدەیکوت ئەی شا، مولەت بدە ماندووم، با بحەسێمەوە، تا ما جەرات پێ بڵەم، شا ئارام و قەراری نەمابوو عاقیبەت بەسەری دا نڕاندو کوتی زوو بلێ بزانم چ خەبەرە؟ دەڵقەک کەڕەنگی چرژابوو و هەناسەبڕکەی بوو، کوتی قوربان ئەمن لەدێ بووم کەبیستم شا، فەرموویەتی هەرکەس لەماوەی چەند ڕۆژێک دا بچتەسەمەرقەند و فلاّن خەبەرەبێنێ موزدو پاداشێکی زۆر باشی دەداتێ، ئێستا هاتوومەخزمەت جەنابت کەعەرزت

بکـەم کەئـەمن نـاتوانم دەو ماوەکەمـەدا خـۆم بەسـەمەر قەنـد بگـەیێنم، شـا، بەبیسـتنی ئـەو جوابەپووچ و بێهوودەیەزۆر توورەبوو،وکوتی ئەی نەفام، لەعنـەتی خـودات لـێ بێ، بۆ قسێکی وا پووچ و بێهوودەشارێکت ئاڵۆز کردووە، وەزیر کەکینەی زۆری دەڵقەکی دەدڵدا بـوو کـوتی ئـەی جـەنابی شـا، پێـت وانـەبێ کەئـەو دەڵقەکەسـادەیەو هـیچ نـازانێ وسـەرفەنەزی لێبکـەی، ئەوەخەبەرێکی موهیممی پێ یە، بەڵام لەکوتنی ئەو خەرەپەشیمان بۆتەوەو ئێستا دەیهـەوی بـەو شۆخیانەو قسەی پووچ وبێهوودەدای پۆشێ، واچاکەسوئال و جوابی لێ بکەین تا لەژێر شەللاق و کوتـەک مـەجبووریێ بەمەسـائیل ئیعتیـراف بکـا، شـا، دەسـتووری دا کـە دەڵقـەک بـۆ شکەنجەببەنەزیندان، دەڵقەک ڕووی دەشاکرد و ئەوی بەسەبرو حەوسەلەو بوردباری دەعـوەت کـرد،و لەعەجەلـەو کـاری ئەبلەهانـەی بەرحـەزەرکرد، خولاسـەدەبەینی ئـەو دووانـەدا گوفتوگۆدەبـارەی زەروورەت ولزوومـی سـەبرو حـەو سـەلەدەکەیفەر وموجـازات وهـەروەها زەروورەت ولزوومی کەیفەر وموجازاتی بەمەو قیع، ڕەددو بەدەڵ بوو، کەشامیلی نوکاتی باش و پڕ موحتەوایە..

سـەییدی تیرمـەز کەشـای ئـەو شـار بـوو ... مەسـخەرەی وی، دەڵقـەکێک وشـیار بـوو (٥١٠)

نێـو سـەمەرقەند هـەبیووکارێک زۆر مـوهیم ... دەیهەویست، یەک بێ، لەبۆ ئەوکار، موتیم (٥١١)

جـاڕی کێشـا، زێـڕ دەدەم زۆر بـەو نەفـەر ... بـۆم بـەپێنج ڕۆژان، لـەوێ بێنـێ خەبـەر (٥١٢)

بوو لەدێ دەڵقەک لەوێی بیست ئەو وتار ... سوار دەبوو جا، هات هەتا، تیرمەز، بەغار (٥١٣)

دوو عـەدەد ئەسپی سـەقەت کـردن بـەغار ... دەیهەویسـت چـون، زوو بگاتـە، شـەهریار (٥١٤)

هاتـەدەربار ئـەو بـەتۆزو گـەردی دێ ... ویسـتی بچتـەلای شەهەنشـا، جـێ بـەجێ (٥١٥)

سـرت و قورتیـان کەوتـەتێ، دەربارییـان ... شـاگرفتار بـوو بەئـەو هـام و گومـان (٥١٦)

بـوون هەراسـان و دەترسـان خـەڵکی شـار ... چـون دەترسان، بن بـەدەردی بـەد، دوچار (٥١٧)

دوژمنێکـی بـێ ڕەزامـان دێتەسـەر ... یـا بـەڵا یـەک دێ، دەبـا گیانمـان لەبـەر (٥١٨)

چۆن دەنـا دەڵقـەک بـەغار دێ، بێ دەلیل ... کوشـتنی لـەو ڕێگەچـەن ئەسـپی ئەسیل (٥١٩)

کـۆ وەبـوون عالـەم لەبـەر دەرگـایی شـا ... بۆچی دەڵقەک هات سەریع و توند وەها؟ (٥٢٠)

لـەو پەلـەو لـەو کۆشیشـە و لـەو ئیجتیهـاد ... کەوتـە ترمـەز، هەمهـەمـە و تەشویش زیـاد (٥٢١)

یـەک بـەدوو دەسـتان بـەچۆکی دادەدا ... لـەفزی وا وەیـلای دەکـرد، ئێکێـک، ئـەدا (٥٢٢)

چـون دەترسان زۆر، کەبێ، بۆ یـان عـەزاب ... دڵ نـەبوو نـەیبێ خـەیاڵ و،ئیزتـراب (٥٢٣)

جـا بەمـەیلی خـۆ دەیـانگرت خـەڵک، فـاڵ ... کامـەئاگر دێتـەپاڵن، یانـەماڵ (٥٢٤)

ڕێی تەڵەب کرد، شا، بەوی دا، ڕێگەزوو عەردی ماچ کرد شا بەویکوت دەی، چ بوو (٢٥٢٥)

هەرچی پرسیبایی ئەو زاغ، لەو عەبووس دەس لەسەر لێو دایدەنا، یانی کە ووس (٢٥٢٦)

بەو پەرێشانی وعەبووسی بوویی دەڵق مات و سەرسام مان، گشت حوززارو خەڵق (٢٥٢٧)

جائیشارەی کرد کەئەی شای خۆش نەزەر مۆڵەتم دە، با هەناسەم بێتەدەر (٢٥٢٨)

تا کەمێکم عەقڵ و هۆش من بێتەبەر چونکەگێژم من لەزۆری دەردەسەر (٢٥٢٩)

ساعەتێک پاش، شا،لەبەر وەهم و خەیاڵ لێی دەبوون جا، هەم گەروو هەم زار تاڵ (٢٥٣٠)

چونکەنەی دیبوو وەها، دەڵقەک غەمین خۆشەویستر لەو نەبوو،لای، هاو نشین (٢٥٣١)

دائیمەن دەیکوت مەزاح و داستان شا، بەوی خەندان دەبوو، هەم شادمان (٢٥٣٢)

شای بەشادی وا، دەکرد خەندان و مەست دای دەنا شا،جا لەسەر زگ، هەر دوو دەست (٢٥٣٣)

ئارەقی زۆر بەو دەکرد، جا پێکەنین جا بەسەر زگ ئەو دەکەوتەسەرزەمین (٢٥٣٤)

ئەو بەڵام ئەورۆکە، وا زەردو عەبووس دەس لەسەرلێو دادەنێ، یانی کە، ووس (٢٥٣٥)

کەوتەنێو دەریای خەیاڵات وگومان چی بەسەر دێتن بەڵا شا، ناگەهان؟ (٢٥٣٦)

شای غەمین کرد فکری وا دوورو درێژ چونکەخوارەمشا گەلێک بوو خوێن ڕێژ (٢٥٣٧)

شای گەلێک چون کوشتبوون لەو دەورو بەر یا بەقودرەت یا بەفێڵ ئەو حیلەگەر (٢٥٣٨)

پادشای تیرمەز، لەوی بوو بیم زیاد کاری دەڵقەک شادمانی برد، لەیاد (٢٥٣٩)

شا، بەوی کوت بێژەبۆ من تۆ خەبەر ئەو غەم و دەردەت لەکێ ڕا هاتەسەر؟ (٢٥٤٠)

پێدەکوت بیستم لەدێ دا، شەهریار وای لەگشت ڕێگاو گوزار کێشاوەجار (٢٥٤١)

دمهەوێ بڕوا کەسێک سێ ڕۆژە، شاد تا سەمەر قەن، جا دەدەم بەو،زێڕ زیاد (٢٥٤٢)

هاتمەلای تۆ هێندەتوندو توڵ هەتا پێت بڵێم نایەت لەدەستم کاری وا (٢٥٤٣)

من لەدەستم نایەکاری وا،چ ئان لێت نەوێم تۆ کاری وا، جا، هیچ زەمان (٢٥٤٤)

دای جنێو بەو سورعەتەی وی، شەهریار چون پەرێشانی گەلێک ئەو، خستەشار (٢٥٤٥)

ئەی نەزان ئەی گێژو وێژ، ئەی نا بەکار تۆ، بەهیچێ ئاگرت بەردا دەشار (٢٥٤٦)

وەک کەسانێک گێژو وێژ،پڕ ئیددیعا خۆ دەکەن قاسید، لەبۆ فەقر و فەنا (٢٥٤٧)

لاقی شێخ بوون لێدەدەن جا نێو جیهان خۆ دەدەن وەک بایەزید ی پاک، نیشان (٢٥٤٨)

موددەعی وەسڵ و سلووک بێ ڕەهنەمان بۆ دەعاوی جێگەیان ساز کرد ئەوان (٢٥٤٩)

ماڵی زاوا پڕ لەغەوغاو هەمهەمە قەو می کچ، بوون بێ خەبەر لەو زەزەمە (٢٥٥٠)

نیوە، کارمان کرد جا، واین، شادمان کاری مەر بووت بێ بەئیمە، کردمان (٢٥٥١)

مالْمان جوان کردو گەسکن لێدەدا
کوا لەبۆ یان هات پەیام، لەو لا؟کەنا
جواب لەبۆ نامانی نووسیتان،گەلێ
جوا ب نەهات بۆمان بەڵام یارباخەبەر
بۆ ئەدی لەو خۆشەویست و یار ئەتۆ
سەت نیشان هەن هەم نیهان هەم ئاشکار
داستانی دەڵقی گێژ، بێژە تەمام
جا بەشاهەنشای دەکوت ئەو دەم وەزیر
بۆیەدەڵقەک هات لەدێ،چون بوویی کار
ئەو بەئاوو،ڕۆن،کۆنان، نوێ دەکات
دای نیشان کالان و تیغی کرد نیهان
گوێزو پستان تۆ کەنەشکێنی چ جار
مەگرەئەی شا، گوێ، لەبۆ نەیرەنگی وی
هەر وەکوو فەرمووی خودای پەروەر دگار
زاهیری دەڵقەک بوو، زیددی ئەو خەبەر
بەو، وەزیرەی کوت بەشین دەڵقەک کەبۆ
زۆر گومان و شک، کەمەو جوود، نێو دڵن
زۆر گومان هەن خۆ گوناهن، ئەی وەزیر
شا کەناکا، ئەزیەتی ئازار دەری
عاقیبەت گفتی وەزیر جێ گیر بوو
ئەمری حەپسی دەڵقەکی دا، شەهریار
لەو بدەن جا، وەک دەهۆڵی نێو بەتاڵ
وشک و تەڕ بێ،گەر دەهۆڵ، پڕ، یا بەتاڵ
تا بەناچار ئەو بکا ڕاز ئاشکار
چونکەهەیتی نوور،کەڕاس بێتن وتار
وەک خەس وخار بوو درۆ،دڵ چەشنی زار
جا دەسووڕێتن زبان، بەدوایی خار

بۆیەشادین، بۆیەخۆشین، ئێمە، وا
کوا پەڕەندێک هات لەو بان؟ کوا؟ کەنا
کوا لەبۆ تان هات لەولارا، چەلێ؟
چون لەدڵ بۆ دڵ هەیەڕێگاو گوزەر
جوابی نامەت بۆ نەهات، هیچ جار ئەتۆ؟
پەردە، ئیدی لا مەبە، لەو دەر، چ جار
چی بەلا هینا بەسەر خۆی ئەو نەفام
گوێ دە، یەک گفتی منی،بەندەی فەقیر
بوو پەشیمان لێرە،نەیکرد ئاشکار
ئەو بەشۆخی دەیهەوێ خۆی دا نەجات
هەر دەبێ ئازار د ڕێ، ئەو بێ گومان
مەغزو ڕۆنی وان کەنابن ئاشکار
چاو، تەماشا، لەرزەلەرزو، ڕەنگی وی
باتینان، سیما، دەیان کا، ئاشکار
چون بەشەڕ، بوو تێکەڵاو تەبعی بەشەر
تالیبی بۆ ڕشتنی خوێنم، ئەتۆ؟
ئەی ئەمیرم، نینەسادق، باتڵن
زوڵم و زۆر، بەد، بیلخسووس بێ بۆ فەقیر
چۆن ئەدی ئازار دەدا، ئەو شادکەری؟
کاشیفی ئەو مەکرو ئەو تەزویر بوو
قەت بەشۆخی وی مەدەن هیچ ئیعتیبار
تا بمان کا، وەک دەهۆڵ ئاگا، لەحاڵ
دەنگی وی ئاگا دەکا، ئێمەلەحاڵ
ئەو دڵەی غەمباری مەش، بگرێ قەرار
دڵ بەگوفتاری درۆ ناگرێ قەرار
قەت دەنێو زار دا، نیهان نابێت خار
تا بەئەزمان، دەربخاتن، خار لەزار

پیلخسووس گەر با، بخاتەچاو خار — چاو دەبەسرێ و، واز دەبێ، ئاو دێتەخوار (٢٥٧٩)

زۆر لەچاووزار دەدەین ئازار بەخار — تا ببن ئاسوودەلەو خار، چاوو زار (٢٥٨٠)

جا کوتی دەڵقەک بەشا، ئەی شەهریار — حیلم و غوفرانت، لەلا بێ نازدار (٢٥٨١)

هێندەبۆ تەعجیل دەکەی بۆ ئینتیقام؟ — خۆ بەدائیم من دەدەستتی ئێوەدام (٢٥٨٢)

گەرکو تەئدیب کەی ئەمن تۆ بۆ خودا — ئەو دەمیش تەعجیل خۆ نابێ ڕەوا (٢٥٨٣)

هەرکەسێک بۆ خەشمی خۆی بێتن ئەسیر — زوو دەکا مەغزووب بێچارەو فەقیر (٢٥٨٤)

چون دەترسێ ئەو کەڕازی بێ لەوی — لەززەتی تۆڵە، لەسەر وی دەرکەوی (٢٥٨٥)

مەیلی کازیب زوو دەچێ بۆ لای تەعام — خەوفی فەوتی ئیشتیها، یەک جوور سەقام (٢٥٨٦)

چاکەتەئخیر بێ کەڕاس بێ ئیشتیها — تا بەئارامی هەزم بکرێ غەزا (٢٥٨٧)

لێم دەدەی تاکو بدەم ڕەخنان، نیشان — جا ببەستی یەک بەیەک، تۆ، گشتییان (٢٥٨٨)

تا لەوان ڕەخنان بەلا، سەر دەر نەخا — غەیری وان ڕەخنەی لەلا، هەن، زۆرقەزا (٢٥٨٩)

چارەبۆ دەفعی بەلا، نابێ ستەم — چارەچاکەو، چارەئیحسانەو کەرەم (٢٥٩٠)

وای نەبی کوت، ڕەد دەکا، سەدقە، بەڵا — تۆ مەریزی خۆت بەسەدقان کە، دەوا (٢٥٩١)

سەدقەخۆ سوو تاندنی دەروێش نییە — هەڵقەنینی چاوی حیلمەندیش نییە (٢٥٩٢)

شا، کوتی ئیحسان گەلێک باش بوو ئەگەر — ئەو لەجێگاو مەوزیعی خۆی، نەچتەدەر (٢٥٩٣)

شا لەجێی ڕوخ دابنێی، وێرانییە — گەر لەجێی شابێ ئەسپ، نادانییە (٢٥٩٤)

نێو شەریعەت هەم عەتا هەم کەیفەرە — سەدرە، جێی شا، بۆ فەرەس جێ، بەردەرە (٢٥٩٥)

عەدڵە، دانان خۆ، لەجێگاو مەو زیعی — زوڵمەدانان، خۆ، لەغەیری مەو قیعی (٢٥٩٦)

نینەباتڵ هەرچی چاکی کرد ڕەب — حیلم و نسحەت،یانەخۆ کەیدو غەزەب (٢٥٩٧)

خەیری موتڵەق نینەهیچ کامیان ئەوان — شەڕڕی موتڵەق نین ئەوان، خۆ بێ گومان (٢٥٩٨)

سوودو زەڕڕی وان لەجێی خوی دا، هەیە — بۆیەقەدری عیلم دانیش، وا، هەیە (٢٥٩٩)

زەجری بێچارەو فەقیران زۆر جار — بۆ سەواب خۆشتر لەهەڵواو، نان، هەزار (٢٦٠٠)

چۆنکەهەڵوای دوورلەکات سەفرا دەکا — زەربەتیش نامەرد موستەنقا، دەکا (٢٦٠١)

تۆ، بەمەو قیع زللەیەک دە، لەو فەقیر — تا کو سالم بێت ئەستۆی وی، لەشیر (٢٦٠٢)

لەو دەدەی تۆ چون دەویدا خوویی بەد — دار لەتۆز دەدرێت نەک فەرش و نەمەد (٢٦٠٣)

بەزم و زیندانیان هەیە، خۆ حاکمان — بەزمەبۆ دۆستان و زیندان بۆ نەزان (٢٦٠٤)

پۆرگی واز نەکراوەمەڵحەم سەر ئەوی — چلکی وی زیاتردەکا، بێ شک قەوی (٢٦٠٥)

گۆشتی ژێر ئەو پۆرگەدەخوا ئەو دەمە — سەت زیبانی پێوەیەو، قازانج کەمە (٠٦)

پێیدەکوت دەڵقەک کەناڵیم، خۆش بەڵێم — من دەڵێم تەحقیق کە، خۆ من هەر لەجێم (٠٧)

دەرکی سەبرت تۆ مەبەستەقەت چ جار — چەند ڕۆژێک بیر کە، تۆ ئەی شەهریار (٠٨)

جورمی من گەر بێ یەقین، ئەی سەر وەرم — تۆ بەخاتر جەمعی، وێم دەکەیفەرم (٠٩)

گەر لەدەستت دێ بڕۆی ساف و ڕەوان — بۆ دەرۆی وا خوارو خێچ، وەک کەج ڕەوان (١٠)

مەشوەڕەت کە، گەڵ دروستکار ئەی ئەمین — بۆ نەبی هات ئەمری (شاورهم ) یەقین (١١)

بۆیەدەیکوت (امرهم شووری) خودا — چون بەشوورا کەم دەبێتن ئیشتیبا (١٢)

وەک چرا، وان عەقڵی عالەم ئەی برا — ڕوون نییەخۆ یة ک چرا، وەک سەت چرا (١٣)

ڕەنگەئێکێک لەو چرایان ئەی فلان — گرتبێتی نوور لەنووری ئاسمان (١٤)

وای بەباش دی ئەو خوداوەندی غەنی — بن لەلای ئێکتر، عقوول، عالی ودەنی (١٥)

خوا کوتی(سیروا ) تەڵەب کەن، نێو جیهان — ڕزق و ڕۆزی خۆ بکەن،جا، ئیمتیحان (١٧)

چون لەئەحمەد بوو بەمیرات عەقڵی وا — غەیب و پنهان بەو دەبێتن ئاشکرا (١٨)

چاوەکت بێ تۆ لەچاوان ئارەزوو — ناکرێ شەرحی بدەم من لێرەزوو (١٩)

بۆیەمەنعی کرد ڕەسوولی کردگار — هەم تەڕەههوب، هەم پەنا بۆ کێوو،غار (٢٠)

تا لەدەس نەڕوات ئەو جوور ئیلتیقا — ئەو نەزەر بوو، بەخت و ئیکسیر ی بەقا (٢١)

ئەسڵەحێک مەوجوودەخۆ نێو ساڵیحان — کردی ئیمزای وی قەبووڵ، شای دوو جیهان (٢٢)

بۆ ئیجابەت بوو، دوعای وی موقتەرین — وەک وی نابن هیچ کیباری ئینس و جین (٢٣)

زیددی وی هەرچی بکوتریتن دەلیل — لای خوداوەند باتیلەو پەستەو عەلیل (٢٤)

چون مەقام و ڕوتبەبۆوی، ئێمە، دان — ناردمان حوججەت هەموو بۆ نێو نەمان (٢٥)

دەستی حەق چون کردی قوبڵەئاشکار — جستوجۆ بۆ قوبڵەهیچ نا یەت، بەکار (٢٦)

بەس کەجستو جۆ ئەتۆ جا، ئەی برا — چون مەعاد و ومستەقەڕ بوون ئاشکرا (٢٧)

لەحزەیەک لەو قوبڵەلادەی ڕوویی خۆ — دەبیەسوخرەی قوبڵەیەک باتیل ئەتۆ (٢٨)

گەر لەبۆ تەشخیس دەرت بی ناسپاس — بۆت دەبن قوبڵەی خەڕاپ و باش نەناس (٢٩)

تۆ کەڕۆزیت ویست لەحەمباری خودا — خۆت نەکەی هیچ کات لەهاو دەردان جودا (٣٠)

گەر وەلات نا لەحزەیەک تۆ، ئەو موعین — بۆت دەبێتەدۆست و یار( بئس القرین ) (٣١)

**حیکایەتی عەلاقەی مشک بەبۆق و بەستنی لاقی هەردووکیان بە داوە دەزوێکی درێژ و هەڵکێشانی کەلاغ ئەو مشکە، ومعەللەق بوونی بۆق، لەحەوا، ونالین و پەشیمانی وی لە عەلاقە و دۆستایەتی دەگەڵ غەیری هاوجینسی خۆی ..**

**خولاسەی داستان ..**

مشکێک و بۆقێک لەقەراغ ئاوێک زیندەگیان دەکرد، ڕۆژێک مشک بەبۆ قەکەی کوت ئەی دۆستی خۆشەویستم دەمهەوێ لەوەزیاتر دەگەڵ تۆ بم، بەڵام زۆر حەیف کەئەتۆۆ زۆر دەنێو ئاودا مەشغووڵی خۆ هەڵاویشتنی، وچون ئەمن حەیوانێکم کەلەئیشکایی دا دەژیم، ناتوانم بێمەنێو ئاو، بۆق وەختێک کەئیلحاح و ئیسراڕی مشکەکەی دی، تەسلیم بوو، وعاقیبەت قەراریان دانا کەداوەدەزوێک بێنن سەرێکی لەلاقی مشکەکەبیەستن وسەرەکەی دیکەی لەلاقی بۆقەکەبیەستن هەر وەخت کەویستیان کەیەکتر ببینن ئەو داوەدەزووەبەعەلامەتێکی مەخسووس تەکان بدەن ڕۆژێک مشک هاتەقەراغ جۆگە، کەلەناکاو کەلاغ گەیشتەوێ و دەچاو هەڵێنانێک دا، بەدەندووک ئەو مشکەی گرت وچۆ حەوا، و بەتەبەعییەت لەوی بۆق دەنێو جۆگەئاو دا، بۆ حەوا، هەڵکێشرا ودەبەینی عەرزو حەوا دا، بەو داوەدەزووەهەڵاوەسرا، وەختێک عالەم ئەو سەحنەعەجیبەیان دی کوتیان عەجەب کەلاغێکی فێڵبازە، ئاخر چۆن چۆتەنێو ئاو و ئەو بۆقەی شکارکردووە؟ بۆقی بەد بەخت کەلەحەوا هەڵا وەسرابوو،بەخۆی دەکوت ئەو هەیەجەزای کەسێک کەدەگەڵ غەیری هاوجینسی خۆی ببێتەڕەفیق و هاودەم ..

ئیتتیفاقـــەن مشـــک وبۆقێـــک باوەفـــا   بـوون لەسـەرجۆگێک دەگـەڵ یـەک ئاشـنا (٢٦٣٢)

وەختی خاسیان کرد موعەیيەن، ئەو دووان   جـا لـەبۆ گۆشـێک دەهـاتن، گشـت بـەیان (٢٦٣٣)

مـا وەیـەک ئـەودوو لـەلای یـەکتر دەمـان   فکـری بـەدیان دەردەکـرد لای خـۆ، ئـەوان (٢٦٣٤)

جـــا دەبـــوو دڵیـــان بەدیـــدار شـــادمان   گوێگری یـەکتر دەبوون، هـەم قیسسـەخوان (٢٦٣٥)

جـا دەیـان کـرد ڕاز بـەحاڵ و قـال بـەیان   (ئەلجەماعەڕەحمـــەتون )لای وان، عـــەیان (٢٦٣٦)

گەردەهات ئەو مشکی مەست لای بۆقی شاد   بـاس و خواســی زۆر قـەدیم دەیهاتـەیاد (٢٦٣٧)

دێ لـەدڵ گوفتـار دەگـەڵ یـارو حـەلیف   زار دەبەسـرێ گـەرلـەلات بـێ، نـائـەلیف (٢٦٣٨)

کوا دەبێتن دڵ عەبووس لای دۆست ویار؟   کـوا دەبـێ بولبـول لـەلای گـوڵ، بـێ وتـار (٢٦٣٩)

چـون لـەخزری بـوو قـەریب ماسـی کـوڵاو   گیـانی تـازەی گـرت و چـو بـۆ نێـو ئـاو (٢٦٤٠)

گـــەربیێتن هـــاو نشـــینی یـــار، یـــار   سـەت هـەزار زیـاتر دەبـن، ڕاز ئاشـکار (٢٦٤١)

لـەوحی مـەحفووز بگرەنێـو چـاوانی یـار ‌ رازی دوو عالـەم دەکـا بـۆت ئاشـکار (۴۲)

ڕەهنەمایـەیاری بـا سـیدق و سـەفـا ‌ بۆیـە(اصـحابی نجـوم) کـوت موسـتەفا (۴۳)

ڕەهنـەمان، ئەسـتێرەنێو خێـزو یـەمان ‌ چاو لەئەستێران کـە، تـۆ، چـۆن ڕەهنـەمان (۴۴)

چاو لـە ئەستێران کـە ئـەی تالیـب ئـەتۆ ‌ چـا مەکـە، تـۆ، تـۆز لـە ڕێگـای گوفتوگـۆ (۴۵)

چـون دەبـێ ئەسـتێرەپنهان بـەو غوبـار ‌ چـاکترە چـاو، لـەو زبانـەی ڕاسـت و خـوار (۴۶)

مەهبـەتی ئیلهامـەتابێژیت وتـار ‌ چـون دەبـا ئـەو تـۆزو، چـا ناکـا غوبـار (۴۷)

چـون دەئـادەم بـوو زهـوور وەحیـی خـودا ‌ (علـم الاسـما )ی دەکـرد یـەک یـەک ئـەدا (۴۸)

نێـوی ئەشـیا هـەرچلۆن بـوو هـەر وەهـا ‌ ئـەو دەدڵـدا هـەروەها دەیکـرد ئـەدا (۴۹)

جـا خسووسـییات و ماهییـاتی وان ‌ هـەرچی دی، ئـەزمانی وی دەیکـرد بـەیان (۵۰)

دایـدەنان نێـو، لایقـی ئەشـیا دەبـوون ‌ نـەک بڵێـتن ئـەو بەشـێر، حیـزی زەبـوون (۵۱)

دای بەعالـەم پەنـد، نـۆ سـەت ساڵ، نـووح ‌ پەندی تازەڕۆژ بـەڕۆژ، جوان چەشنی ڕووح (۵۲)

لـەعلی وی دەیکـوت لـەیاقووت القلـووب ‌ بـێ ریسـالەخوێندنو قـووت القلـوب (۵۳)

وەعزو پەنـدی یاد نـەدان بەو هیچ شرووح ‌ بەل، لەسەر چاوەی کشووف وشەرحی ڕووح (۵۴)

لەو مەیـەی گـەرکو کـەمێک بکرێـت نۆش ‌ ئـاوی نـوتقی لاڵـی بـێ دەنـگ دێتـەجۆش (۵۵)

تیفلـی نـەو زادیـش دەبـێ زانـاو فەسـیح ‌ حیکمـەتی بـالیغ دەخـوێنێ، وەک مەسـیح (۵۶)

کوێر کەبەو مـەی، زۆر بەسـۆز بوو دەنگی وی ‌ سـەت غـەزەل فێـر بـوو لـەوی، داود نـەبی (۵۷)

گشت پەڕەنـدان تـەرکیان کـرد جیکەجیک ‌ هـاو زبـان و یـاری داوودی مـەلیک (۵۸)

کوا عەجەب تەیران ببن گـەر مەستی وی؟ ‌ ئـەو کەئاسـن بیسـتی دەنگـی دەسـتی وی (۵۹)

سەڕ سـەڕێک بۆ عـاد کوشـەندەی حاڵ بوو ‌ بـۆ سـولەیمان ئـەو وەکووحـەمباڵ بـوو (۶۰)

سەڕ سـەڕێک دەیبا، بەسـەر خۆی، تـەختی شا ‌ ڕێگـەمانگێک هـەر سـەباح و هـەر مەسـا (۶۱)

هـەم دەبـوو حـەمباڵ هـەم جاسووسـی وی ‌ گفتـی غائیـب ئـەو دەکـا مەحسووسـی وی (۶۲)

بیسـتبای گـەر گفتـی غائیـب تونـد بـا ‌ ئـەو دەبـا، بـۆ گـوێی پاشـای بردبـا (۶۳)

پێیـدەکوت ئێسـتاکەدەیکوت وا، فـلان ‌ ئـەی سـولەیمان ئـەی شەهەنشاهی زەمـان (۶۴)

**تەگبیرکردنی مشک دەگەڵ بۆق کەئەمن ناتوانم وەختی ئیحتیاج و نیاز بێمەنێو ئاو لای تۆ، واچاکەلەنێو ئێمەدا ئیرتیباتێک بەر قەرار بێ کەهەرکات کەئەمن بێمەقەراغ جۆگەبتوانم ئەتۆ خەبەردار بکەم وئەتۆش هەرکات کەبێیەسەرکونی مشکی ماڵ، بتوانی ئەمن خەبەردار بکەی..الی اخره..**

ئەو وتارەدوایی نایە، دوایەجا — مووش بەبۆقی کوت کەئەی بۆ هۆش چرا (٢٦٦٥)

زۆر کەڕەت دەم وێ بڵێم، من بۆ ت ڕاز — تۆ دەکەی ئەمما لەنێو ئاو تەقڵەباز (٢٦٦٦)

من لەلێوی جۆگە، هەرهاوار دەکەم — نایەناڵەی عاشقان بۆ گوێت کەم (٢٦٦٧)

ئەو دەمی مەعلووم ئەمن خۆ، ئەی دلێر — بێ گومان نابم لەگوفتاری تۆ تێر (٢٦٦٨)

گەرچی بۆ عام پێنج کەڕەت نوێژ، ڕێ نموون — عاشقان ئەمما دەنوێژ دا،( دائیموون) (٢٦٦٩)

دەو سەران ناگرێت ئارام ئەو خومار — خۆ بەپێنج جار نوێژ یا پانسەت هەزار (٢٦٧٠)

خۆ نەهات (زرغب ) لەبارەی عاشقان — چون شەدید تینوونە، گیانی سادقان (٢٦٧١)

زیکری (زرِ غبا ) نەبوو بۆ ماسییان — چون بەتەنیاو، بەس، بەیەم بوو ئونسییان (٢٦٧٢)

ئاوی دەریا گەر خەتەربوو، بۆ گیان — هەرقومێک بوو، بۆ خوماری ماسییان (٢٦٧٣)

بۆ ئەویندا ر، هیجری لەحزێک چەشنی ساڵ — وەسڵی ساڵێک بەردەوام، لای وی خەیاڵ (٢٦٧٤)

عیشق، زۆر تینوویە، تینوو خوازە ئەو — وان بەدووی یەک، ئەو دوو چەشنی ڕۆژ و شەو (٢٦٧٥)

گەر دەبینی ڕۆژی ڕوون عاشقی شەوە — سەت بەرا بەر زێدە، شەو عاشق بەوە (٢٦٧٦)

جستو جۆی یەکتر دەکەن دائیم ئەوان — نین لەجستو جۆیی یێک، غافڵ، چ ئان (٢٦٧٧)

ڕۆژ دەکێشێ گوێی شەو، شەو پایی وی — ڕۆژ بەشەو عاشق، شەویش شەیدایی وی (٢٦٧٨)

قەلبی مەعشووق پڕ لەزاتی عاشیقە — نێو دڵێ عەزرا، هەمیشەوامیقە (٢٦٧٩)

قەلبی عاشق جێگەبۆ مەعشووقەبەس — نین لەنێو وان، فاریق و فاڕووق، چ کەس (٢٦٨٠)

ئەو دوو زەنگوڵە، دەمل یەک وشترن — چۆن دەبێ بۆ وان (زرغبا ) بەرن؟ (٢٦٨١)

کەس دەگەڵ خۆی جارو بار دیدار دەکا؟ — کەس بەنەو بەت خۆی لەبۆ خۆی،بار دەکا؟ (٢٦٨٢)

وەحدەتی وا بۆکەسێک مەفهوومەگەر — ئەو فەنا بێ، نەک فەنابێ گیان لەبەر (٢٦٨٣)

گەر بەعەقڵی جوزئی مەفهووم بایەوا — قەهری نەفست چۆن دەبا واجب ببا؟ (٢٦٨٤)

بێ زەرروورەت کوا شەهەنشای میهرەبان — پێت دەڵێ تۆ نەفسی خۆت کەی بێ گییان؟ (٢٦٨٥)

**ئیلتیماس کردنی بێ حەددی مشک بۆ گەیشتن و وەسڵەت بەبۆقی ئاو ..**

دەیکوت ئەی یاری عەزیزوخۆش وتار — نیمەبێ ڕووت، لەحزەیەک، خۆ من قەرار (٢٦٨٦)

رۆژ، نوورو کاسبی و تابم ئەتۆی | شەو قەرارو ڕاحەتی وخوابم ئەتۆی (٢٦٨٧)

مەردییەخۆ، گەر ئەتۆ شادم بکەی | تۆ بەلوتفت جارو بار یادم بکەی (٢٦٨٨)

تۆ شەوو ڕۆژ،وەختی چێشتانان بەس | وەسڵەتی خۆت دا بەمن ئەی هاو نەفەس (٢٦٨٩)

زۆردەکەم ئیحساسی تینوایی جگەر | چەندەتینووم واش هەمە( جوعو لبەقەر ) (٢٦٩٠)

بێ نییازی لەو غەمانەم ئەی ئەمیر | تۆ زەکاتی جاه، بدەبەمنی فەقیر (٢٦٩١)

ئەو فەقیرە، بێ ئەدەب، ناسازوار | لوتفی تۆ ئەمما لەبۆ یارو نەیار (٢٦٩٢)

عامەلوتفت، نایهەوێ تەکیەو سەنەد | ڕۆژە، داوێ نوور بۆ سەرتەرسی بەد (٢٦٩٣)

هیچ کەنای بێتن زیان لەو تەرسە، نوور | نوورە، دەیکا وشکەئاوردووی تەنوور (٢٦٩٤)

گەرکو چۆ توون، نوور دەگرێ، ئەو یەقین | جا دەبێ حەممام ئەو دەم پڕ لەتین (٢٦٩٥)

بوو لەئەووەڵ پیس و، دوایەش جوان بوو | چون لەسەر وی، ڕۆژی ڕوون تابان بوو (٢٦٩٦)

ڕۆژ بەتینی کرد، زۆر مەعدەی زەوی | تاکو پەس ماندەی حەدەس گشت بچتەوی (٢٦٩٧)

بوو بەخاک وشین دەبێ جا، لەو نەبات | جا وەها نابوود دەکا، خوا، سەییئات (٢٦٩٨)

گەڵ حەدەس گەر پیسترینە، وا دەکا | لەو نەبات و نەرگس و گوڵ چا دەکا (٢٦٩٩)

چی دەبەخشێتن ئەدی ئا خۆ، خودا؟ | بۆ گوڵی تاعەت، بەعینوانی جەزا (٢٧٠٠)

گەر بەپیسان خەلعەتی وا چاک دەدا | خۆی دەزانێ چی دەدا پاکان، خودا (٢٧٠١)

خوا دەدا، وان، ئەو شتەی نەیدی چ چاو | قەت بەئەزمان ئەو کەناکوترێ تەواو (٢٧٠٢)

کێم ئەمن؟ ئەی یار وەرە، ئەی میهرەبان | ڕوون کەڕۆژی من بەئەخلاقی جووان (٢٧٠٣)

لێم مەنۆڕەتۆ،کەزۆر پیس ڕوومەمن | چون لەزار وەک ماری کێو، پڕ بوومەمن (٢٧٠٤)

نا لەبارم، گشت خیسالم نالەبار | چۆن دەبم گوڵ، خوا کەچاندی من بەخار؟ (٢٧٠٥)

ئەو بەهاری حوسنی گوڵ، بەو خارەدە | زینەتی تاووس ئەتۆ، بەو مارەدە (٢٧٠٦)

بێ نیهایەت ناحەزم هەم نالەبار | لوتفی تۆ گرتی لەئەعلا، جێ، قەرار (٢٧٠٧)

تۆ نییازی من،کەپیسم زیاد لەحەد | بێنەدی ئەی سەروی شاد، بووی پێت حەسەد (٢٧٠٨)

شین دەگێڕێ فەزڵی تۆ بۆ من ئەگەر | گیان بدەم بمرم لەتەن ڕووح بێتەدەر (٢٧٠٩)

دێ لەسەر قەبرم دەکا گریان و زار | جا لەچاوی جوانی ئا و دەڕژێتەخوار (٢٧١٠)

شین دەگێڕێ ئەو لەسەرحیرمانی من | چاو دەبەستێ ئەو لەگشت ناجوانی من (٢٧١١)

تۆ، لەوان ئەلتاف کەمێک، ئێستا بکە | بەو، وتان، حەڵقێک دەگوێی من، جا، بکە (٢٧١٢)

تۆ ئەو ەی دەت وێ لەسەر گلکۆم بڵەی | دەمهەوێ ئێستا ئەوی بۆ خۆم بڵەی (٢٧١٣)

**ئیلتیماس کردنی مشک لەبۆق کەبەهانەمەگرەو ئەنجام دانی ئەو نیازەی من وەدوا، مەخەو دەتەئخیردا ئافەت و دەردەسەر زۆر هەنە، وسۆفی ئیبنولوەقتە، ومنداڵ دەس لەدامێنی بابی بەرنادا و بابی میهرەبانی سۆفی کەوەختەئەوی موحتاج سبەی ناکا، وەگوڵزاری سەریعولحیسابی خۆی قەرار دەدا، نەک وەکوو خەڵکی دی، وەمونتەزیری ئایەندەنابێ( نەهری دەبێ، نە دەهری .. یانی وەک چۆم هەمیشەدەچەرەیان دادەبێ ووابەستەبەزەمان نابێ)چونکە( لاصباح عنداللەولامساء)مازی وموستەقبەل وئەزەل و ئەبەد لەوێ مەوجوودنین ئادەمی سابیق و دەجالی مەسبووق نابێ، چونکەئەو ڕسووم و عادەتانەمەربووت بەعەقڵی جوزئی وڕووحی حەیوانین . دەعالەمی لا مەکان و لازەمان دا ئەو ڕەسم و عادەتانەنین.. جا ئەو ئیبنو وەقتێکە، کەلەوێ فەهم ناکرێ غەیری نەفیی تەفرەقەی زەمان وەک لە(اللەواحد) نەفیی دوویی فەهم دەکرێ نەک حەقیقەتی واحیدی و یەک بوون ..**

وای بەیەک سۆفی دەکوت سەرمایەدار ... ئەی فیدای تۆ بێت وەک من سەت هەزار (٢٧١٤)

دەتهەوێ ئەوڕۆکە، پێت دەم یەک درەم ... یا سبەینێ سێ درەم، من پێت بدەم (٢٧١٥)

پێیدەکوت دوێ نیو درەم چاترلەوەی ... یەک درەم ئەوڕۆم بدەی،یا سەت، سبەی (٢٧١٦)

زللەیەک حازر لەهەڵوای نیسیە خۆ ... چاکترە، ها، پشت ملم، جا لێیدەتۆ (٢٧١٧)

بیلخسووس زللێک کەبی دا، دەستی تۆ ... پشت مڵ و، زللەکەهەردوون، مەستی تۆ (٢٧١٨)

جا، وەرەئەی گیانی گیان و سەت جیهان ... جا، غەنیمەت بگرە نەقدینەی زەمان (٢٧١٩)

وُن نەکەی ڕوو ی مانگ لەچاوی شەو ڕەوان ... لانەدەی لەو جۆگە، ئەی ئاوی ڕەوان (٢٧٢٠)

شاد بکا،تا لێوی جۆ ئاوی مەعین ... جا لەهەرلا، بێننەدەر سەر، یاسەمین (٢٧٢١)

گەر لەدوورت لێوی جۆ، دی سەوزو شین ... تۆ وجوودی ئاو لەوێ، لێت بێ یەقین (٢٧٢٢)

حەق کوتی باتین لەزاهیر بوو دیار ... وەک دەکا بارانی، ئاشکار سەو زەزار (٢٧٢٣)

قەت چ کەس نەیدیوە، باران، نیوەشەو ... چونکەگشت نەفسان ئەو دەم چوونەخەو (٢٧٢٤)

تازەگی وجوانی گوڵستانی جەمیل ... بۆ هەبوونی غەیبی پنهانین دەلیل (٢٧٢٥)

من دەخاک دا، تۆش دەئاو، بووت، زیندەگی ... تۆ بەڵام شای ڕەحمەت و بەخشەندەگی (٢٧٢٦)

وا کەتۆ، بەو قیسمەت و دان و، عەتا ... جارو بار من بێمەخزمەت تۆ، هەتا (٢٧٢٧)

من بەدڵ بانگت دەکەم لای لێوی جۆ ... هیچ کەنابیسم جەوابی ڕەحمی تۆ (٢٧٢٨)

نیمەڕێگا، بێمەنێو ئاو، لایی تۆ ... چونکەجیسمی من لەخاک چاکراوەخۆ (٢٧٢٩)

یـا ڕەسـوولێک یـا نیشـانێک بـێ، هـەتا — تـۆ لـەدەنگ وبـانگی مـن ئاگـا بکـا (۳۰

بەحسـیبان لـەو بـارەداکرد ئـەو دوو یـار — عاقیبـەت بـەو جـوورە، دایـان نـا، قـەرار (۳۱

داوەدەزوێـک زۆر درێـژ بێـنن ئـەوان — گـەر بکێشـرێ، ڕاز لـەوان بێـتن عـەیان (۳۲

یەک سەری وی بگرێ، پای ئەمنی چەماو — ئەو سەری دیش بێتەپات، ئەی خۆش ناو (۳۳

تـاکو بـەو جـوور، باخەبـەر بین، لێک ئەمـە — تێکـەڵاو بـێ ڕووح و گیانمـان، ئـەو دەمـە (۳۴

تـەن وەکـوو ڕیسـمانەگرتی پـایی گیـان — کێشـەری وی سـەر زەوی، جێـی ئاسـمان (۳۵

بـۆقی گیـان نێـو ئـاوی بـێ هۆشـی و خـەو — گـەر لەمشـکی تـەن نـەجات بـێ، شـادەئەو (۳۶

مشـکی تـەن بـەو بـەن دەکێشـێتن گیـان — گیـان دەچێـژێ ئـەو دەمـی تاڵیـان سـەدان (۳۷

گــەر نەبا،کێشــانی ئــەومشــکی دەنــی — بـۆق دەنێـو ئـاودا دەژی، شـاد و خـەنی ۷۳۸

بگرەپاشـماوەش، کـەهات مەحشـەر ئـەتۆ — لـەو هـەتاوی نـوور دەری ئـەنوەر ئـەتۆ (۷۳۹

یـەک سـەری بـەن، یـا لـەلاقی مـن درێ — بەو سەری دیکەش بدە، پای خۆت گرێ (۷۴۰

تاکوبـت هێـنم لـەبۆ خـاک جـارو بـار — ئێســـتەمەعلووم بـــوو لەئێمـــەکاروبار (۷۴۱

زۆر لەبۆی ناخۆش دەهات بۆق، ئەو حەدیس — دەیهـەوێ چـون گیـر بـدا مـن، ئـەو خـەبیس (۲۷۴۲

گـەر کەڕاهـەت بێتەقـەلبی شەخسـی دوون — بـێ گومـان تێیـدا، لەحیکمـەت زۆر قشـوون (۲۷۴۳

وەسفی حـەق بێ ئەو فەڕاسـەت لات، نـەوەهم — نـووری دڵ، لـەو، لـەوحی کـوللی،کرد فـەهم (۲۷۴۴

ئیمتینـاعی فیـل، لـەچوون، بـۆ لایـی بـەیت — بـەو تەلاشـی فیلـەوان و بـانگی هـەیت (۲۷۴۵

گـەرچی زۆری وێ کـەوت ئـەو نێرەفیـل — هیچ نـەچوو لای کەعبـە، ئـەو، زۆرو قـەلیل (۲۷۴۶

وەک بڵـەی تـۆ، وشـک بـوویێ، پـایی وی — یـــا نـــەمابێ قـــودرەتی دەعـــوایی وی (۲۷۴۷

لای یەمـەنیان گـەر دەکـرد جـا ڕوویـی وی — پێـی نەدەشـکا هـیچ، تـۆزی دوویـی وی (۲۷۴۸

حیسسـی فیـل گـەر قـەهری پنهـانی دەدی — چۆ ن دەبێ ئیحساسی پیاوی خوا، ئەدی؟ (۲۷۴۹

چـاو،کوتی یـەعقووبی پـاک تـین و نـەبی — ئەو لەبەر یوسووف، بەگشت ئیخوانی وی (۲۷۵۰

وا، لــەبابیان ویســت برایــان گشــتییان — تا بەرن یوسووف لەبۆ چۆڵ، یەک زەمان (۲۷۵۱

گشـتییان کوتیـان نەکـەی فیکـری زییـان — مۆ ڵەتی دە، یەک دوو ڕۆژ، ئەی بابە، گیان (۲۷۵۲

بــۆچی ناکــەی تــۆ بەئێمــەئیعتیبار؟ — تا بـەرین یـو سووف لـەبۆ گەشت و گوزار (۲۷۵۳

تـا هـەموون بـازی بکـەین نێـو مێرغـوزار — غــەیری چاکەنینەقەســتی هــیچ کــار (۲۷۵۴

پێکـوتن لـێم ڕوونەگـەر لای بـەن لـەلام — زیـاد دەبـێ بـۆ قـەلبی مـن دەردو سـەقام (۲۷۵۵

ئـەو دڵـەم نـاڵێ درۆ، خـۆ هـیچ کـات — چون لەقەلبم نووری عەرشی حەق، دەدات (۲۷۵۶

ئەو دەلیلی واقیعی بوو، بۆ زەرەر ... ئەزقەزا، نەیکرد، بەڵام، بەو هیچ نەزەر (٢٧٥٧)

لا دەچوو ئەو دەم لەقەلبی وی خەتەر ... چونکەحوکمی دی هەبوو، ئەو دەم قەدەر (٢٧٥٨)

کوێر کەنەیدی چاڵ لەڕێگا تێکەوێ ... خۆ نەسەیرە، سەیرەبینا تێکەوێ (٢٧٥٩)

وەزعی دونیا زۆر دەگۆڕێتن، قەزا ... چاو دەبەستێ (یفعل اللەما یشا ) (٢٧٦٠)

دڵ بەفەننی وی عەلیمە، هەم جەهوول ... دڵ لەحاستی وی هەموو ڕام و زەلوول (٢٧٦١)

دڵ دەکا، ئەودەم لەبۆ وی سەر نەوی ... جا دەڵێ ڕازیم بەمەیل و ویستی وی (٢٧٦٢)

ئادەمی غافڵ دەکا خۆی، ئەو دەمی ... جا دەبەندی خۆی دەکاتن ئادەمی (٢٧٦٣)

شەخسی کامیل بۆ قەزا گەرببێت مات ... ئەو نەماتە، ئیبتیلایە، بۆی کەهات (٢٧٦٤)

یەک بەڵا دەیدا لەسەت ڕەنجان، نەجات ... یەک هبووت بۆ سەت مەعاریج، ئەو دەبات (٢٧٦٥)

وەک نەجاتی دا شەراب، یەک شەخسی خام ... لەو هەزاران ناحەزی شەخسی نەفام (٢٧٦٦)

عاقیبەت ئەو کامیل و ئوستاد بوو ... ئەو لەدەس بەندی جیهان ئازاد بوو (٢٧٦٧)

لەو شەرابی لا یەزالی بوو بەمەست ... ئەو تەمیزی پاک و پیسی کەو تەدەست (٢٧٦٨)

ئیعتیقادی سستی خەڵکی لا دەنێ ... فکری قەلبی کوێری وانیش، ڕا، دەنێ (٢٧٦٩)

کوا لەدەستی دێت قەت هیچ، فەهمی وان ... لای مەدو، لای جەزری بەحری بێ نیشان؟ (٢٧٧٠)

لەو بیابان چا دەبن خۆ، ساختمان ... قودرەت و شاهی و وەزارەت، گشتییان (٢٧٧١)

دەستەدەستەدێن لەلای سەحرای عەدەم ... دێن دەبن مەحسووس ئەوان، تێکڕا، بەجەم (٢٧٧٢)

لەو بیابان دێن بەدووی یێک کاروان ... دێن دەبن مەحسووس ئەوان، شام و بەیان (٢٧٧٣)

دێت و دەگرێتن وەتاغ و، جێ، لەمە ... من کەهاتم، تۆ بڕۆ، من نۆبەمە (٢٧٧٤)

گەرکووازی کرد، کوڕ، چاوی شعوور ... کۆچ دەکا باب و، لەوێ دەڕواتەدوور (٢٧٧٥)

جاددەیێکەزۆر عەزیم و پان جیهان ... کاروانێک دێ، دەچێ یەک کاروان (٢٧٧٦)

ئێمەدانیشتووین دەڕۆین گشت جوێ جووێ ... قاسیدین بۆ جێگەیەک، تازەو نووێ (٢٧٧٧)

نایهەوێ بۆ حاڵ، چ کەس، سەرمایەخۆ ... دەیهەوێ بۆ کارو باری دوایەخۆ (٢٧٧٨)

جا موسافیرئەو کەسەو ئەو بەندەیە ... مەقسەدو، ڕووگەی، فەقەت ئایەندەیە (٢٧٧٩)

وەک لەپەردەی دڵ بەبێ هیچ دەردەسەر ... دەمبەدەم خەیلی خەیاڵات دێتەدەر (٢٧٨٠)

گەرکو، یەک مەغرەس نەبا، بۆ گشت خەیاڵ ... چۆن خەیاڵ نێو دڵ دەهاتن پاڵ وەپاڵ؟ (٢٧٨١)

دەستەدەستەئەو خەیاڵاتی عەدید ... دێتەکانی دڵ،کەتینوون،زۆر شەدید (٢٧٨٢)

پڕ دەکەن گۆزان لەکانی دڵ ئەوان ... دێن دەڕۆن دائیم دەبن پەیداو نیهان (٢٧٨٣)

یەک بەیەک ئەفکار، وەکوو ئەستێرەوان — ئاسمانی وان و ئەستێران، جوودان (۲۷۸۴)

شوکر کە، سەعدت کەدی ئیسار کە — بۆ نەحس گەڵ سەدقە، ئیستیغفار کە (۲۷۸۵)

کێم ئەمن سەعدم هەبێ ئەی شایی من؟ — تالیعی من باش کە، ئەی هیوایی من (۲۷۸۶)

ڕوون کەڕووحی من بەئەنواری قەمەر — چونکەدەی بێتن خسووف بۆ ڕووح، زەرەر (۲۷۸۷)

تۆ نەجات دە، ڕووح لەفکرو وەهم و زەن — هەم لەچاڵی موهلیک و جەو ری ڕەسەن (۲۷۸۸)

تا دڵم بەو حوببی جوانی چەشنی دوڕ — پەڕ دەرێنێ، جێ بهێڵێ ئاوو قوڕ (۲۷۸۹)

ئەی عەزیزی میسرو پەیمان ڕاس ئەتۆ — یوسووفی مەزڵووم دەبەندی تۆیەخۆ (۲۷۹۰)

بۆ نەجاتی وی ببینە، تۆ، خەوێ — چون نیکوکاری خوداوەند خۆش دەوێ (۲۷۹۱)

حەو عەدەد گای لاغەری دیتن دەخەو — دێن دەخۆن حەو گای تەوانمەندو قەڵەو (۲۷۹۲)

حەو عەدەد هێشووی گەلێک وُشکو — دێن دەخۆن هێشووی گەلێک تازەو تەمیز (۲۷۹۳)

نێو وجوودی ئادەمی قاتیەو، ئەتۆش — لات نەبێتن ئەی عەزیز ئەو حاڵە، خۆش (۲۷۹۴)

یوسوفم نێو بەندی تۆ، ئەی شای جیهان — تۆ نەجاتم دەلەدەس مەکری ژنان (۲۷۹۵)

من لەئەووەڵ عەرشی ئەعلام جێگەبوو — شەهوەتی دایکم بوو، هینای (اهبطوا) (۲۷۹۶)

گەرچی هەمبوو من، بەبێ نوقسان کەماڵ — بەندی کردم نێو ڕەحیم، یەک کاری زاڵ (۲۷۹۷)

ڕووحی هینا خوار لەعەرشی خوای قەدیم — لا جەرەم کوترا بەمەکری ژن، عەزیم (۲۷۹۸)

ئەووەڵ و ئاخیر هبووتی من لەژن — نێو ڕەحیم من بوومەتەن، ڕووح بووم ئەمن (۲۷۹۹)

شینی یووسووف گوێ دەیەوەختی عیسار — یا نە، ڕەحمی تۆ، بەیەعقووبی هەژار (۲۸۰۰)

من لەدەس ئیخوان بناڵم یا ژنان؟ — چون وەدەریان نام لەنێو جەننەت ئەوان (۲۸۰۱)

وەک گەڵای دەی، نیمەمن هیچ ڕەنگ و حاڵ — چونکەگەنمم خوارد، لەنێو باغی ویساڵ (۲۸۰۲)

گەر کو دیتم لوتفی تۆ و، ئیکرامی تۆ — ئەو سەلامی سیلمی تۆو، پەیغامی تۆ (۲۸۰۳)

من سپەندم کرد لەچاوی تۆ بەدوود — بۆ سپەندیش هات، بەد چا وی عەنوود (۲۸۰۴)

چاوی بەد گەر بی هەوێ بم خاتەدەس — دافیعی وی چاوی مەستی تۆیەبەس (۲۸۰۵)

چاوی چاکت، چاوی بەد ئەی شەهریار — مات و موستەئسەل دەکات و تارو مار (۲۸۰۶)

بەڵکەچاوت کیمیا پەیدا دەکا — چاوی بەد تەبدیل بەچاوی چا، دەکا (۲۸۰۷)

دای لەچاوی بازی دڵ، چا، چاوی شا — بۆیەچاوی باز، هیممەت دار کرا (۲۸۰۸)

چون لەهیممەت بوو، بەلوتفی شاه، تێر — بازی شاناگرێ، بەغەیری شێری نێر (۲۸۰۹)

شێر کەهیچ، چون شاهبازی مەعنەوی — بۆت شکارەو تۆش شکاری بۆ ئەوی (۲۸۱۰)

ئەی عەجەب کوا، لەعلی شەککەر باری تۆ؟ ئـەو جەوابـەی جـوان و، هـەم ئەسـرارِی تـۆ (٣٣١١)
ئـەی عەجـەب کـوا، گفتی خۆشی ئەودەمـە؟ ئـــەو کلیلـــی قفڵـــی ئیشـــکالانی مــــە (٣٣١٢)
ئەی عەجەب کوا، ئەو وتەی وەک زولفەقار؟ عــەقڵی زۆری ئــەو دەکــردن، بــێ قــەرار (٣٣١٣)
تـاکو کـەی وەک، فاختـەی ئاشیان تەڵـەب بەس بەکوو کوو،وازبکەم من هەردوو لەب؟ (٣٣١٤)
کوێیـــەجێی وی؟ لای ســـیفاتی ڕەحمەتـــە قودرەتــە، هــەم نوزهەتــە، هــەم فیتنەتــە (٣٣١٥)
جێگـــەبۆ وی جێـــی دڵـــەو ئەندیشـــەیە وەک لـــەبۆ شـــێر جێگـــەدائیم بیشـــەیە (٣٣١٦)
جێگەیـەک بـوو، جێگـەبۆ وی،پیـاوو، ژن تـا نـەجاتیان بـێ لەغـەم، بـۆ وێ دەچـن (٣٣١٧)
جێگەیـــەک بـــوو جێگـــەبۆ وی، دەردەدار بـۆ سـەلامەت بـوون، بـەوێ، ئوممێـد وار (٣٣١٨)
جێی وییە، جێی ڕەفعی ڕەنج و، دەردی تاڵ بـا، لـەوێ داوا دەکـەی بـۆ کشـت و کـاڵ (٣٣١٩)
زیکـری یـا هـو، گـەر لەئـەزمان دەر کـەوێ جـێ یــەبۆ وی، ڕووگەیــەبۆ دڵ، ئــەوێ (٣٣٢٠)
ئـەو بـەدائیم هـەس دەگـەڵ پـەروەردگار خۆزگـەزاکیر بـام، بـەدڵ، نـەک هەربـەزار (٣٣٢١)
عــەقڵی ئێمــەکوا، ببینــێ غــەڕب وشــەڕق دێتەسەر ئەڕواح لەحەق سەت جوورە، بەڕق (٣٣٢٢)
جـەزرو مـەددی بـوو لـەدەریا وەک زەبـەد مونتــەفی بــوو، جــەزرو، بــاقی ماوەمــەد (٣٣٢٣)
تـۆ هــەزارم، وامــە، مــن بــێ دەســترەس یـار مـەتیم بۆ هات، بەسـەت، دینار بـەس (٣٣٢٤)
نێـو بـەڵا مـام، تـۆی کـەبرد، پـەروەردگار ئـەی ئـەتۆ، خـاک پاک، دەڕۆم من خاکسار (٣٣٢٥)
هیممــەتێک کــە، تـۆ لـەبۆ پـڕ حەسـرەتت ئـەی موبـارەک ڕوو و،دەسـت و، هیممـەتت (٣٣٢٦)
هاتمەســەر ئەسـڵی هــەموو کانیـاو ئــەمن دیــم لــەباتی ئــاو، خــوێنی چـاو ئــەمن (٣٣٢٧)
ئاسـمان وەک پـێش، بـەڵام بـێ مانگەشـەو جــۆ، هــەمان جــۆ، ئاوەکــەی گۆڕاوەئــەو (٣٣٢٨)
پاک وەکوو وی نین، کەچی هەن، موحسینین زۆر ستێران هـەن، بـەڵام، وەک تـاو، کـەنین (٣٣٢٩)
چـووی ئـەتۆ بـۆ لای خـودا، ئـەی بـا وەفـا جـا منیش وەک تـۆ دەچـم بـۆ لای خـودا (٣٣٣٠)
مەجمــەع و مــەئوا، لــەبۆ ئــەعلاوو، دوون خوایەبــــەس (کـــل لــــدینا محضــــرون) (٣٣٣١)
گـەر نقـووش بـن باخەبـەر یـایێ خەبـەر گشت دەدەست نەققاش دا هەن، موحتەزەر (٣٣٣٢)
دەمبــەدەم نێــو ســەفحەیی ئەندیشــەیان سەبت و ئیمحای شت دەکا ئەو بێ نیشان (٣٣٣٣)
خەشــم و قــار دێنــێ، ڕەزا جــا، لا دەبــا بوخــڵ دێنێــت و، ســەخا جــا، لا دەبــا (٣٣٣٤)
لەحزەیـەک سـەفحەی دڵـم شـام و سـەحەر لــەو سـبووت ومـەحوە، نـایێ بـێ خەبـەر (٣٣٣٥)
کــوا دەبێــتن گۆزەقــەت، بــێ گۆزەســاز گۆزەبـۆ خـۆی کـوا دەبـێ پـان و دراز؟ (٣٣٣٦)
دار لـــەدەس نـــەجار دا، گرتـــی قـــەرار خـۆی دەنـا، چـۆن والـەدەبڕێ و، وا لـەبار (٣٣٣٧)

| | |
|---|---|
| کەوتــەدەس خەییات،کــەدەی بینــی کــراس | خۆی دەنا دەدڕێ و دەدرووی، چۆن لیباس؟ ٨) |
| مەشکەدەس سەققایەپڕ، ئەی خۆش خـەیاڵ | خـۆی دەنـا چـۆن پـڕ دەبێـتن، یـا بـەتاڵ ٩) |
| دەمیــەدەم تــۆ پــڕ دەبــی و خــاڵی دەبــی | جــا بزانـــە، تـــۆ بەتـــەقلیبی ڕەبـــی ٠) |
| ئـەو دەمــەی ڕوو بــەن لەســەرچاو باردەکـا | عیشـقی مـەسـنووعات بەسـانیع دیـار دەکـا ١) |
| تـۆ بـەچاوی خـۆت لـەدونیات بـێ نـەزەر | نـەک بـەچاوی گێـژو وێـژی بـێ خەبـەر ٢) |
| بـەس بـەگوێی خـۆت تـۆ ببیسەگشـت وتـار | بـۆچی دیتـی گـوێی نـەفامان، تـۆ بـەکار؟ ٣) |
| تـۆ بـەبێ تەقلیـد لەئەشـیات بـێ نـەزەر | بێنەکایەعـــەقڵی خـــۆت تـــۆ، بـــۆ فیکـــر ٤) |

**دیتنی خوارەزمشا (ڕحمەاللـە)دەگەشت وگوزارێـک دا دەنێو دەستەیەک لەسوارەکانی خۆیدا، ئەسپێکی زۆر کەمیاب کەجوانی و چالاکی ئەو ئەسپەتەوەججوهی شـای بۆلای خۆی جەلب کرد وساردکردنەوەی عیمادولمولک دڵی شا لەو ئەسپەو ئینتیخـاب کردنـی شا، قسەی وی نەک نەزەری خۆی .. وەک حەکیم (رحمەاللە) دەئیلاهی نامەدا فەرمووی**

چون زبان حسد شود نه خاس          یوسفی یابی از گزی کرباس..

لـەدەڵاڵی برایـانی یووسـوف بەسـووڕەتی حەسـوود،دەدڵی موشـتەریان دا جـوانی پنهـان کـرا وناحەزی ئاشکرا( وکانوا فیەمن الزاهدین )

**خولاسەی داستان ..**

یـەکێک لەئـەمیرانی سپای خوارەزمشـا ئەسـپێکی زۆر جـوان و ئەسـیلی هـەبوو، بـەیا نەیـەک کەهـەموو ئـەمیران و سـوپا حـازر بـوون چـاوی بەوئەسـپەکەوت،وبێ ئیختیـار حـەیرانی ئەنـدامی جوان ورێک و پێکی ئەو ئەسپەبوو، بەڵێ شا، بەتەواوی وجوودی عاشقی ئەو ئەسپەبیوو.. جا بـەو خاترەپاش گەڕانەوەبۆ کاخی خۆی بەعیددەیەک لـەکار بەدەسـتانی سوپای خـۆی مەئموورییـەت دا کـەبڕۆن بەهــەر جوورێــک کەمومکینەئــەو ئەسپەلەسـاحەبەکەی وەر بگـرن و بـۆلای وی بێنن.ئەوانیش وەک ئەمواجی ئاگرین هێرشیان برد بۆ ماڵی ئـەمیر و بـەزۆر ئەسـپەکەیا ن لێ ئەسـتاند، و بەڕاکێشـان بـۆ لای شـایان هینـا، ئـەمیری مـاڵ لـەدەس چووکەئەسـپەکەی خـۆی زۆرخـۆش دەویسـت هـیچ چارەیـەکی نەدۆزیەوە،غـەیری ئەوەکەپـەنا بـۆ وەزیـری شـا، یـانی عمادولمولک بـەرێ، وئـەویش بەباشـی و ڕوونـاک بیـری مـەعرووف بـوو، عیمادولمولـک پـاش بیسـتنی گیلایــەی پـڕ سـۆزی ئـەمیر نـا ڕەحــەت وپەرێشـان بوو،وویسـتی بـەفکرو تـەدبیری مەخسـووس، ئەسـپەکەی بـۆ وەر بگرێتـەوە،جا بەپەلـەبۆ لای شـا، چـوو، ئـەفرادی سـوپا ئـەو

ئەسپەئەسیلەیان بەشا نیشان دا، لەوکاتەداعیمادولمولک لەلای شا ڕاوەستا بوو،شا ڕووی دەوی کرد وکوتی عەجەب ئەسپێکەدەڵەی لەبەهەشت ڕا هاتووە.. عیمادولمولک کوتی ئەی شا، ڕاستەکەئەو ئەسپەجوان و دڵچەسپە، بەڵام ئەگەر چاک دیققەتی لێ بکرێ، عەیب و ئیرادی لەئەندام دا دەبینرێ، مەسەلەن ئەگەر تەماشای سەری بکەی، سەری وەک سەری گایە، بەڵێ، مەعلوومەچون شا ئەوئەسپەی پێ جوانە، ناحەزی ونالەباری ئەو ئەسپەی وەبەرچاو ناکەوێ، چونکەئینسان وەختێک عەلاقەی بەدێویش پەیدا کرد وەک فریشتەی دەبینێ،بەقەو لی ساحەبی بەیهەقی،ئەگەربەچاوی ڕەزا، چاو لەشتێک بکرێ عەیبی وی نابینرێ، قسەکانی باش و ڕێک و پێکی عیمادولمولک تەئسیری کرد کەلەو ئەسپەدڵ سارد بوو، و بەئەفرادی سوپای خۆی کوت کەئەو ئەسپەبۆ ساحەبی خۆی بەرنەوە..

ئەسپەکی بوو زیاد لەحەد جوان یەک ئەمیر — نێو ڕەوەی شا، ئەو ئەسپ بوو بێ نەزیر (٣٣٤٥)

میر دەگەڵ مەو کیب دەبوو سوار یەک، بەیان — خوارەزەمشا ئەسپەکەی دی ناگەهان (٣٣٤٦)

شا بەرەنگ و فەڕی وی شەیدادەبوو — تاکو ڕیجعەت، ئەسپی زێر چاو دا دەبوو (٣٣٤٧)

کیهەعوزوی ئەو کەزۆر بەجوان دەدی — زۆر لەوی جوانتر دەدی ئەعزای دەدی (٣٣٤٨)

غەیری چاکی و غەیری چالاکی وگەشی — حەق لەئەو سافی عەجیب، دابووی، بەشی (٣٣٤٩)

شا، لەعەقڵی خۆی وەهاکرد پرسیار — چاو، کەچۆن عەقڵان دەخاتن ئەو لەکار (٣٣٥٠)

چاوی من خۆ پڕ بوو، هەم تێرو غەنی — بووی بەدووسەت ئەسپی زۆرجوان ڕەو شەنی (٣٣٥١)

خۆ ڕوخی شایان لەلام سەربازەمن — بۆ دڵم بەو ئەسپەوا دا خوازەمن؟ (٣٣٥٢)

ڕمنگەجەزبەی خوام هەبێ وام لێ کەهات — وەسفی وای نایێ دەنا،ئەسپێک چ کات (٣٣٥٣)

فاتیحەی خوێند و گەلێک لاحەولە، جا — فاتیحا، زیادی دەکرد، ئێش زۆر لە، شا (٣٣٥٤)

یەک دوعایە فاتیحا،باش بێ نەزیر — عەکسی کار کرد، بۆ شەهەنشاهی شەهیر (٣٣٥٥)

گەر بدا مەعکووس نیشان، تەمویهەلەو — گەر حەقیقەت دا نیشان تەنبیهەلەو (٣٣٥٦)

لێی یەقین بووکاری خوایە، شەهریار — حەق دەکا زۆر کاری جالب، ئاشکار (٣٣٥٧)

ئەسپی بەردو گاوی بەرد بۆ ئیمتیحان — دەبنەمەسجوود، وای دەوێ خوای بێ مەکان (٣٣٥٨)

بوت لەلای کافر شتێکەبێ نەزیر — بێ فەڕو بێ ڕووحە بوت، پەست و فەقیر (٣٣٥٩)

ئێن نەبوو مەعلووم جەزووبی زۆر نیهان — لەو جیهانی دیکەڕوونی کرد جیهان (٣٣٦٠)

ئەو نیهانگا، عەقڵ و گیان مان بێ خەبەر — ئەو ببینەتۆ، لەدەستت دێ، ئەگەر (٣٣٦١)

گەر لەسەیران ڕاگەڕاوەشەهریار — جەلسەێێکی گەڵ خەواس کرد بەر قەرار (٣٣٦٢)

جا بەسەر دەستانی کوت شا ئەو زەمان — ئێوەبێنن ئەسپی جوان لەو خانەدان (٣٣٦٣)

حەملەیان کرد ئەوگرووە، وەک ناری گەرم — بوو ئەمیری چەشنی کێو، وەک پەنبەنەرم (٣٣٦٤)

گیان دەهات تا لێو لەترسان و زییان — بەس عیمادولمولکی دی ئەو بۆ ئەمان (٣٣٦٥)

چون عیمادولمولک بوو،جێگای ئەمان — بۆ هەموو مەزلووم و کوژراوی غەمان (٣٣٦٦)

موحتەرەم تر خۆ نەبوو، لەو، سەروەرێ — ئەو لەلای شابو، وەکوو پێغەمبەرێ (٣٣٦٧)

بێ تەماع بوو هەم ئەسیل و پارسا — رەنجبەرو دیندارو حاتەم بۆ سەخا (٣٣٦٨)

هەم مودەببیر هەم موبارەک رای زیاد — بوون موجەڕڕەب رایی وی بۆ گشت موراد (٣٣٦٩)

ئەو لەبەزلی گیان و ماڵ، بوو بێ میسال — تالیبی ڕۆژی حەقیقەت، وەک هیلال (٣٣٧٠)

بۆ ئەمارەت وەک غەریبێک بێ لەبەند — بۆ سیفاتی فەقرودۆستی دڵپەسەند (٣٣٧١)

چەشنی باب بوو بۆ فەقیرو دەربەدەر — ئەو لەلای شا، شافیع و دەفعی زەرەر (٣٣٧٢)

ساتیری عەیبان وەکوو حیلمی خودا — خولقی وی زۆر بوو لەخووی خەڵقان جودا (٣٣٧٣)

زۆر کەرەت ئەو رووی دەکردە کێو، تەنێ — نەی دەهێشت شا، ئەو کەبچتەبەندەنێ (٣٣٧٤)

لەحزەلەحزەبۆ گناهشافیع کەبا — چاوی شا دەیکردلەوی شەرم وحەیا (٣٣٧٥)

چوو ئەمیر لای ئەو عیمادولمولکی پاک — خۆی بەسەر ڕووتی لەپێش وی خستەخاک (٣٣٧٦)

حازرم شا، بێ بەرێ، ژن هەم منال — یانەتالانچی بەرن هەرچیمەماڵ (٣٣٧٧)

خۆ بەڵام ئەو ئەسپەگیانم بۆی ڕەهین — گەرکو شا، بی بات دەمرم من یەقین (٣٣٧٨)

گەرکو ئەو ئەسپەم لەدەس دەربێ، یەقین — چاک دەزانم من دەبم مەحرووم لەژین (٣٣٧٩)

چون بەوەسڵی کردگار بووی شادو مەست — سەر سەرم تۆ وەک مەسیح، دابێنەدەست (٣٣٨٠)

بێ ژن وبێ زێرو ماڵ من سابیرم — بێ ئەسپ نا، بێ ڕییا، ئەی سەروەرم (٣٣٨١)

گەر بەگفتم باوەڕی ناکەی ئەتۆ — قەول و فێعلم ئیمتیحان کە، دەی ئەتۆ (٣٣٨٢)

ئەو عیمادولموکە، ئەشکی هاتەخوار — زۆر پەرێشان چوو لەبۆ لای شا، بەغار (٣٣٨٣)

ڕا دەوەستا ئەو لەلای شا، بێ سەدا — ڕازی خۆی ئێزهار دەکرد جا لای خودا (٣٣٨٤)

ڕادەوەستا گوێی بەڕازی شا، دەدا — فکری وای ئەو دەم دەدڵدا، جا، دەدا (٣٣٨٥)

ئەی خودا گەر ئەو جەوان کردی گوناە — غەیری زاتی تۆی لەبۆ خۆ، کرد پەناە (٣٣٨٦)

مەگرەلەوتۆ، سەروەری کە، ئەی خودا — گەرچی گرتی بۆ نەجات، بەندەی گەدا (٣٣٨٧)

چونکەموحتاجن بەتۆ خەڵقان هەموو — جا لەسواڵکەر بگرەتا سوڵتان هەموو (٣٣٨٨)

گەر لەئاسمان ڕۆژی ڕوون بێ، دوور لەتەم — ڕەهنەماشت، بێ فتیلەیا نەشەم (٣٣٨٩)

باوجوودی ڕۆژی ڕوون و ئاشکرا    نوور تەڵەب کردن لەشەمعان یاچرا (۳۳۹۰)

بێ گومان وشک ئەدەب لاتانە، وا    کفری نیعمەت کردن و فیعلی هەوا (۳۳۹۱)

هۆش گەلێک ئەمما لەکاتی ئیفتیکار    وەک خوفاشن تالیبی جێگایی تار (۳۳۹۲)

گەرکو بخواتن خوفاش یەک شەو کرم    چاکراوی ڕۆژی گیانەئەو کرم (۳۳۹۳)

گەر بەشەو خوففاش بەکرمێک بێت مەست    دێ لەڕۆژ بۆ ئەو کرم، جونبش بەدەست (۳۳۹۴)

ئەو هەتاوەی نوور لەوی دەتکێتەخوار    نیعمەتی وی عام لەبۆ یارو نەیار (۳۳۹۵)

خۆ بەڵام شاباز، وەکوو خوففاش نییە    چاوی واقیع بینی وی، نوورانییە (۳۳۹۶)

وەک خوفاش گەربی هەوێ زیاد بێ بەشەو    بۆ ئەدەب گوێی دێتەدەستی تاو ئەو (۳۳۹۷)

پێی دەڵێ ئەو گەرخوفاش هەیبێ مەرەز    چیت ئەتۆ هەس دەردو بیماری و غەرەز (۳۳۹۸)

ولم دەکرد من تۆ غەمین و دەردەدار    سەر لەلای ڕۆژ لانەدەی تۆ، قەت چ جار (۳۳۹۹)

## موجازات کردنی یووسوفی سددیق (صلوات الله علیه ) بەچەند ساڵ زیندان بە سەبەبی یارمەتی ویستن لەغەیری خودا و کوتنی(اذکرنی عندربک) مع تقریره..

هەر وەکوو یووسوف لەمەحبووسێک فەقیر    خازیع و خۆشبەخت و نێو زیندان ئەسیر (۳۴۰۰)

یارمەتی ویست پێدەکوت گەرچوو بەدەر    بوو حیسابت پاک، لەلای شای موعتەبەر (۳۴۰۱)

یادی من کەتۆ لەلای شای موعتەبەر    تا نەجاتم دا، لەزیندان بێمەدەر (۳۴۰۲)

کوا کەسێکی بێ لەزیندا ن دەس بەسەر    دێ لەدەس وی، بەندییەک بێنێتەدەر؟ (۳۴۰۳)

ئەهلی دونیا گشت لەنێو زیندان دان    مونتەزیر بۆ مەرگی نێو دونیان ئەوان (۳۴۰۴)

غەیری ئەو شەخسەی کەبێ هەمتایەئەو    تەن دەزیندان، گیان دەئاسمان دایەئەو (۳۴۰۵)

چونکەیووسوف یاوەری خۆی بەندە، دی    ماوەنێو بەند، ئەو هەتا چەن ساڵی دی (۳۴۰۶)

یووسوفی لابرد، لەزیهنی بەندەدێو    ئەو وتەی پاک کرد، لەزیهنی بەندەدێو (۳۴۰۷)

ئەو گوناهەچون لەوی پەیدا دەبوو    ماوەیەک زۆر ئەو دەزیندان دا دەبوو (۳۴۰۸)

کام قسوور هات بۆت لەتاوی عەدڵ و داد؟    تا وەکوو خوففاش، پەنابەی بۆ سەواد (۳۴۰۹)

کام قسوور هات بۆت لە لای بەحرو سەحاب؟    بت هەوێ تا یارمەتی خێزو سەراب (۳۴۱۰)

گەرچی وەک خوففاشەتەبعی گشت عەوام    چاوی تۆ خۆ بازە،ئەی یووسوف تەمام (۳۴۱۱)

گەر خوفاشێک چوو لەبۆ نەقس و بەدی    بازی شا، بۆچی؟ مەگەر ڕێگای نەدی؟ (۳۴۱۲)

یووسوفی بەو جوورەتەئدیب کرد خودا    تا بەهیچ داری ڕزیو تەکیەی نەدا (۳۴۱۳)

یووسوفی مەشغووڵ بەخۆی کرد، خوای جەلیل    تا نەبێ بەو بەندە، بۆ دەر دان دیل (٣٤١٤)

ئونس و مەستی وا دەدا بەو، زاتی حەق    نەیدەدی ئەو زەرڕەیەک بەندو، غەسەق (٣٤١٥)

وەک ڕەحیم مووحیش نییەزیندان،چ چار    تارو ناخۆش، پڕ لەخوێن، ناسازگار (٣٤١٦)

چون دەریچەی بۆت وەکرد خوا، لایی خۆ    نێو ڕەحیم هەر دەم دەبێ زیاد، جیسمی تۆ (٣٤١٧)

جا دەنێو ئەو بەن، لەخۆشی بێ قییاس    لەو نەمامی جیسمی تۆ، دەڕوێن حەواس (٣٤١٨)

ئەو دەمەی دەت وێ کەتۆ بێی بۆ دەرێ    وێت کەوێ، دەستێک دەڕۆی بۆ لای سەرێ (٣٤١٩)

ڕێی تەلەززوز داخیلە، زاهیر نییە    ویستنی کاخی موجەلەل شیتییە (٣٤٢٠)

یەک نەفەر نێو کونجی مەسجید مەست و شاد    یەک نەفەر نێو باغەگرژو بێ موراد (٣٤٢١)

تەن کەوێران،کاخ نیتی هیچ ڕەواج    گەنج لەنێو وێرانەدا، ئەی خۆش میزاج (٣٤٢٢)

تۆ مەگەر نەت دیوەنێو بەزمی شەراب؟    ئەو دەمەی مەست خۆش دەبێ،گەرێ خەراب (٣٤٢٣)

تێک دە،گەرچی پڕ نقووش بێ خان و مان    جستوجۆکەگەنج و دوایەش ئاوەدان (٣٤٢٤)

تەن وەکوو ماڵ، پڕ لەنەقش و پڕ خەیاڵ    خاجیبن ئەو نەقشە، سەر گەنجی ویساڵ (٣٤٢٥)

پەڕتەوی زێڕانی جوان و گەنجە، گەر    چادەبن نێو سینە، زۆر نەقش و سووەر (٣٤٢٦)

بەس لەلوتف و عەکسی ئاوی باشەرەف    بوون بەپەردەی ڕوویی ئاو، ئەجزایی کەف (٣٤٢٧)

بەس لەلوتف و جۆشی گیانی پاکەگەر    تەن دەبێتەپەردەبۆ گیانی بەشەر (٣٤٢٨)

بگرەگوێ تۆ بۆ مەسەل ئەی باهونەر    ئێمەخۆن هینان، هەچیمان هات بەسەر (٣٤٢٩)

بەو حیجابەتینوانی کەف پەرەست    مان لەئاوی ساف و زۆر ڕوون، دوورەدەست (٣٤٣٠)

ئەی هەتاو گەرچی ئەتۆی ڕووگەو ئیمام    شەو پەرەستین ئێمە، وەک خوففاشی خام (٣٤٣١)

هەڵفڕینەئەو خوفاشان بێنەلات    جا بییان دە، تۆ لەخووففاش بوون، نەجات (٣٤٣٢)

لەو ئەمیرە، مەگرەتۆ جورم وگناه    گەر لەجێی تۆ هاتەلای من، ئەی ئیلاه (٣٤٣٣)

بۆ عیمادولمولک فکری وا بەجۆش    چادەبوون، وەک شێر لەجەنگەڵ، پڕ خرۆش (٣٤٣٤)

زاهیرەن وێستابوو ئەو لای شەهریار    ڕووحی وی تا ئیر، لەباغی نادیار (٣٤٣٥)

وەک مەلائیک بوو لەنێو دونیای ئەلەست    لەحزەلەحزەبوو بەشوڕبی تازەمەست (٣٤٣٦)

زاهیرەن پڕغەم، لەباتین شادمان    نێو تەنی وەک گۆڕ، هەیبوو خۆ، ژییان (٣٤٣٧)

ئەو دەنێو ئەفکاری وا بووی ئینتیزار    چی دەبێ زاهیر لەدونیای نادیار؟ (٣٤٣٨)

ئەسپییان هینا بەڕاکێش ئەو زەمان    ڕاس لەبۆ پێش شاهی خۆیان، سەر وەران (٣٤٣٩)

ڕاستەگەربێژم لەژێر ئاسمانی شین    ئەسپی هێندەتوندو جوان نەبوە، یەقین (٣٤٤٠)

ڕەنگی وی لای خۆی دەکرد، بینەندەبانگ / ئافەرین بۆت ئەی منالّی بەرق و مانگ (٣٤٤١)

هەر وەکوو مانگ و عوتارید توند ڕۆ / تۆ دەڵەی دەی خوارد، بای سەر سەر، نەجۆ (٣٤٤٢)

تۆ، بەچاوی خۆت دەبینی ئەی فلان / مانگ بەیەک شەو تەی دەکاتن ئاسمان (٣٤٤٣)

گەر بەیەک شەو مانگ دەکا، ئەبراج تەی / تۆ ئەدی میعراج لەبۆ ئینکار دەکەی؟ (٣٤٤٤)

سەت بەرابەمانگە، ئەو دوڕی یەتیم / یەک ئیشارەی کرد مانگی کرد دونیم (٣٤٤٥)

زۆر عەجەب گەر دای نیشان، شەققەلقەمەر / تیبقی زەعفی حیسس و ئیدڕاکی بەشەر (٣٤٤٦)

کارو باری ئەنبییاو پێغەمبەران / زۆر لەبالای ئاسمان و ئەختەران (٣٤٤٧)

تۆ لەئاسمانان بڕۆ دەر ئەو دەمی / کارو باری وان دەبینی بێ کەمی (٣٤٤٨)

تا، وەکوو جووجەی دەنێو یەک هێلکەدا / نایەبۆ گوێت زیکری تەیرانی هەوا (٣٤٤٩)

لیرەناکرێ شەرح و بەستی موعجیزات / ئەسپی خوارەمشا، بلێ چی لێدەهات (٣٤٥٠)

گەر هەتاوی حەق لەهەرچی دا، بەسە / زوو دەبێ بالا، ئەسپ بێ، یانە، سە (٣٤٥١)

سوودی تینی لوتفی وی یەک جوور نییە / چاو لەلەعل و بەر کە، ڕێگا دوور نییە (٣٤٥٢)

لەعلی جوان لەو ڕێگە، لوتفی کەو تەدەس / سەهمی بەر ئەمما فەقەت گەرمایە بەس (٣٤٥٣)

گەرلەدیوارێک دەدا پەڕ تەو، هەتاو / ئیزتیراب نایەت لەوی، وەک دێ لەئاو (٣٤٥٤)

چون دەمێک حەیران دەبوو لەو ئەسپە، شا / ڕووی دەکردەئەو عیمادولمولکە، جا (٣٤٥٥)

ئەی برا، ئەو ئەسپەلات جوان نیەمەگەر؟ / نەک لەعەرزی، بەل، لەجەننەت هاتەدەر (٣٤٥٦)

وای عیادولمولک کوت بەو شایی خۆ / وەک فریشتەجوان دەکا دێو، مەیلی تۆ (٣٤٥٧)

هەرچی جوان بێ پێت، ئەو والا مەقام / زۆر قەشەنگ و جوانەئەو مەرکەب، بەلام (٣٤٥٨)

نین موناسب ئەو سەرو ئەو پەیکەرە / زۆر شەبیهی کەللەگایە، ئەو سەرە (٣٤٥٩)

ئەو، وتە، نێو قەلبی شای چاک کار کرد / ئەسپەکەی پێش چاوی شا، زۆر خوارکرد (٣٤٦٠)

گەر غەرەز بێتن دەلال و واسیفت / زۆر بەکەم پوول، دێتەدەستت یووسوفت (٣٤٦١)

ئەو دەمەی وەختی فیراقی گیان دەبێ / دێو دەلالی ئەو دوڕی ئیمان دەبێ (٣٤٦٢)

جا نەفام ئیمان دەفرۆشێ بەتاو / لەو دەمەی حاستەم، بەیەک لیوانەئاو (٣٤٦٣)

خۆ، نەلیوانەو نەئاوە، بەل خەیاڵ / غەیری ئیغوای،کار نییەخۆ ئەو دەلال (٣٤٦٤)

تۆ کەئێستا سالمی هەم شاد حال / هەرچی سیدقت بێت د ەیدەی بۆ خەیال (٣٤٦٥)

دوڕی کان، دەفرۆشی تۆ گشت ئان وکات / وەک منال دەستێنی تۆ گوێزان لەبات (٣٤٦٦)

هیچ عەجەب نابێت جا، ڕۆژی ئەجەل / بەو عەزاب و ڕەنجەبت بێ، واعەمەل (٣٤٦٧)

سووڕەتێک پەیدا دەبێ بۆت نێو خەیاڵ    چەشنی گوێزێک وەختی لەت کردن بەتاڵ (٣٤٦٨)

ئەوخەیاڵ وەک بەدرە، ئەووەڵ، بۆ میسال    عاقیبەت باریک دەبێ، ئەو وەک هیلال (٣٤٦٩)

گەرلەئەووەڵ چاک بنۆڕی ئاخری    تۆ دەبی ڕاحەت لەمەکری فاتری (٣٤٧٠)

چەشنی گوێزی نێو ڕزیوە، خۆ جیهان    دوورلەوی بنوارەمەیەکە، ئیمتیحان (٣٤٧١)

شا، بەچاوی زاهیری دی ئەسپی جوان    ئەو عیمادولمولکەبەو چاوی نیهان (٣٤٧٢)

چاوی شا، دوو گەز دەبینێ ڕێ و، بان    چاوی باتین بین دەبینێ سەت گەزان (٣٤٧٣)

کامەکل بوو، خوا کەدەی هێنێ، بەکار؟    دڵ دەبینێ بەو لەپشت پەردان، هەزار (٣٤٧٤)

چاوی ئەحمەد بوو دەگەڵ ئاخیر، بەجووت    جا بەچاوی وای،بەدونیا جیفەکووت (٣٤٧٥)

تاقەزەممێک بەس بوو، بیستی شەهریار    حوببی ئەسپی بەو وەلانا، بۆ کەنار (٣٤٧٦)

چاوی خۆی لاناو چاوی دی، دەویست    هۆشی خۆی لاناو قەولی دی دەبیست (٣٤٧٧)

بوو بەهانەئەو وتار، خوای کردگار    بەو دوعای کردسارد، قەلبی شەهریار (٣٤٧٨)

دەرکی جوانی بەست لەچاوی شا، خودا    ئەو وتار، وەک بێت لەو دەرگا سەدا (٣٤٧٩)

ئەو وتارەی کردەپەردەی چاوی شا    مانگ دەبێ بەو پەردە، جا، وەک قیر سییا (٣٤٨٠)

چادەکا، قەلعان لەگوفتارو وتار    نێو جیهانی نادیار خوای کردگار (٣٤٨١)

لات وتار بێ، دەنگی دەرکی قەسری ڕاز    تا عەیان بێ، دەر،دەبەسرێ، یانەواز (٣٤٨٢)

دەنگی دەر، مەحسووس و دەرکەش نادیار    ئەو سەدا، مەحسووسە، دەرگا، نا، چ جار (٣٤٨٣)

چەنگی حیکمەت کاتێ خۆش ئاواز دەبێ    کامەدەر لەو باغی جەننەت واز دەبێ؟ (٣٤٨٤)

دەنگی قەولی بەد، دەبێ گەر ئاشکرا    دەرکی دووزەخ کامەیان بوو، وازکرا؟ (٣٤٨٥)

گوێ دە،دەنگی دەر، ئەگەر دووری لەدەر    خۆش بەحاڵی وەی کەوازی کرد بەسەر (٣٤٨٦)

خۆ دەبینی گەرکوو چاکەت کرد، خۆت    زیندەگی زۆر پاک و ڕاحەت دێ لەبۆت (٣٤٨٧)

گەر خەراپەت کردو، کاری نالەبار    زیندەگی وا پاک، لەلات دەڕوا بەغار (٣٤٨٨)

تۆ مەڕۆ بەدوایی تەبعی ناکەسان    چونکەدەت بەن لای کەلاک، ئەو کەرکەسان (٣٤٨٩)

تۆ کەبەستت، چاوی جوانت، وەک چرا    یانی کوێرم تۆم عەساکێش، ئەی برا (٣٤٩٠)

ئەو عەسا کێشەی کەکردت ئینتیخاب    ئەو لەتۆ زۆر کوێر ترەخۆ ئەی جەناب (٣٥٩١)

چەشنی کوێر تۆ بگرەڕیسمانی خودا    خۆت لەغەیری ئەمری یەزدان کە،جودا (٣٥٩٢)

ڕیسمانی خوا، یەنی تەرکی هەوا    چون هەوا بۆ قەومی عاد بوو توند با (٣٤٩٣)

هەر هەوا خەڵکی دەنێو بەند خست، پەست    هەر هەوابوو باڵی تەیرانی دەبەست (٣٤٩٤)

هەرهــەوا بــوو ماســی چــۆ، تــاوەی گــەرم هــەر هــەوابوو چــوو لــەرووی پاکــان، شــەرم (٣٤٩٥)

هـەر هـەوا بـوو خەشمی شیحنەو تینی نـار هــەر هــەوابوو چــوار مــیخ و ترســی دار (٣٤٩٦)

شــیحنەی ئەجســام دیتــت نێــو زەوی تۆببینەشــــیحنەی رووح، مەعنـــــەوی (٣٤٩٧)

زۆر شــکەنجەهەن لــەبۆ ئــەرواح نیهــان تــا لەزینــدان، دان، شــکەنجان نێــو خــەفان (٣٤٩٨)

گــەر نــەجات بــوو رەنــج دەبیــنن بــێ ژمـار چــون بەزیــد چــاک زیــد دەبێــتن ئاشــکار (٣٤٩٩)

ئەو کەسـەی ئاوی رەش و چاڵ مـەو لیدی لــوتفی دەشــت و رەنجــی چــاڵی خــۆ نــەدی (٣٥٠٠)

گــەر لەترســی حــەق رەهاکــەی تــۆ هــەوا پیاڵــەدێ، بــۆ تــۆ، لەتەســنیمی خــودا (٣٥٠١)

تۆ مـەڕۆ بـەدوای هـەوای خۆت،قەت چ جار تــۆ لەحــەق ڕێــی سەلســەبیل کــە، پرســیار (٣٥٠٢)

چەشنی پـووش پـەیڕەو مەبـە، تـۆ بـۆ هـەوا خەیمە، نایێ چەشنی سایەی عەڕشی خوا (٣٥٠٣)

شـا کـوتی لابـەن لـەلام ئـەو ئەسـپەزوو مــن لەجــەو ری وا نــەجاتم ئــارەزوو (٣٥٠٤)

نەیدەفــەرموو شــا، لــەلای خۆشــی وەهــا بــەس فریــو دەشــێر ئــەتۆ، بــەو کەڵلــەگا (٣٥٠٥)

باســی گــاوت کــرد بەمــەکرو فێــڵ و داو حــەق کەناڕوێنێ،لەئەســپان شــاخی گــاو (٣٥٠٦)

ســانیع و میعمارەئــــەو، زۆر شـــــارەزا کــوا بەئەســپان ئــەو دەدا ئــەعزایی گــا؟ (٣٥٠٧)

رێـک و پێکـی کـرد بـەدەن، وەسـتایی فـەن کــاخی ســەیبارن، لــەواقیع دا، بــەدەن (٣٥٠٨)

نێـو ئـەوان کاخـانی کـرد تـەخریج زۆر هــەر وەهــا چــاکی دەکــرد ســیهریج زۆر (٣٥٠٩)

داخیلـــی وان عالـــەمی بـــێ مونتـــەها خێوەتێــک تێدایــەبێ ئــەژمار فــەزا (٣٥١٠)

جارو بار ئـەو مانگ دەکا، زۆر، تـر سناک جـارو بـار ژێـر چـاڵ دەکا،یـەک بـاغی پـاک (٣٥١١)

قـەبزو بەسـتی چـاوی دڵ لـەوبێ هـەواڵ لەحزەلــەحزەچادەکا، ســیحری حــەڵاڵ (٣٥١٢)

بۆیەلەخوای ویست ڕەسوولی خۆش بـەیان پێم نیشان دە، پیس بەپیس و، جوان بـەجوان (٣٥١٣)

تــا، نــەبم وەختــی وەرت گێــڕا وەڕەق هـێن پەشیمان، بچمـەنێو دەریـای قەلـەق (٣٥١٤)

مــەکرو فێڵــی ئــەو عیمادولمولکەگــەر کــرد بــۆ وی ڕەهنــەما بــوو، دادگــەر (٣٥١٥)

مــەکری حــەق ســەرچاوەبۆ مەکرانــەخۆ دڵ لــەنێو دوو قــامکی ئــەو یەزدانــەخۆ (٣٥١٦)

ئـەوخودای نێـو دڵ دەنـێ مـەکرو قییـاس ســەهلەبۆ وی،گــەر بــدا، فــەرش و لیبــاس (٣٥١٧)

**گەڕانەوەبۆ داستانی ئەو یارمەتی دەر و ئەو غەریبی قەرز دار و گەڕانەوەی وان لەسەر قەبری موحتەسیب ودیتنی یارمەتی دەر ئەو موحتەسیبەدەخەودا ..الی اخرە..**

تــوولی کێشــا داســتانی ئــەو غــەریب گــەر گەڕاوەئــەو لــەگۆڕی موحتەســیب (٣٥١٨)

یارمەتی دەر تاکو ماڵی خۆی دەبرد | مۆری سەت دینا ری بەو تەسلیم دەکرد (۳۵۱۹)

دای بەوی خۆراک، بۆی کوت داستان | قەلبی وی کرد پڕ ئومێدو شادمان (۳۵۲۰)

یوسری بەعدەلعوسر، چی دی بوو بەچاو | بۆ غەریبی کرد حیکایەت ئەو تەواو (۳۵۲۱)

شەو زرینگا هەردەیان کوت داستان | خەو ئەوانی برد تا مەڕعای گییان (۳۵۲۲)

یارمەتی دەر دی دەخەو دا، ئەو شەوە | سەدری مەجلیس موحتەسیب دانیشتووە (۳۵۲۳)

دەیکوت ئەی یاری دەری زۆر با نەمەک | چی کوتت تۆ،من هەمووم بیست یەک‌بەیەک (۳۵۲۴)

من بەڵام نەم بوو، چ فەرمان بۆ جەواب | بێ ئیجازەسەختەبۆ من خۆ، جەواب (۳۵۲۵)

چونکەئێمە بووین لەکاران باخەبەر | لێوی ئێمەمۆرو قفڵی هاتەسەر (۳۵۲۶)

تا نەبێ ڕازی نیهان، ئاشکارو فاش | مونهەدیم تاکو نەبن عەیش و مەعاش (۳۵۲۷)

تاکو نەدڕێ پەردەیی غەفڵەت تەواو | تانەمێنێ دیگی میحنەت، نیوەخاو (۳۵۲۸)

ئێمەگۆشین گەرچی زاهیر کەڕ، بەگۆش | ئێمەنوتقین گەرچی لێومان بوو خەمۆش (۳۵۲۹)

هەرچی دامان،لێرەئێستا دیتمان | ئەو جیهانەپەردە، راستەئەو جیهان (۳۵۳۰)

ڕۆژی چاندن ڕۆژی پنهان کردنە | تۆو، دەنێو خاک دا، پەرێشان کردنە (۳۵۳۱)

ڕۆژی درووێنان و داس هینان بەکار | ڕۆژی پاداش، ڕۆژی ئاشکاربوونی کار (۳۵۳۲)

**کوتنی موحتەسیب دەخەو دا بەو یارمەتی دەر وەبلەغی قەرزی ئەو دۆستەکەهاتبوو، ونیشان دانی جێگای ژێر خاک کردنی ئەو گەنجەو پەیام ناردن بۆ واریسان کەئەو گەنجەبەزۆر مەزانن وهیچی لێ وەر نەگرنەوە..وئەگەر ئەو گەنجەقەبووڵ نەکا یا قیسمەتێک قەبوو ڵ نەکا، هەر لەوێی بهێڵنەوە، تا هەرکەسێک کەدیتی بۆ خۆی بەرێ،چونکەئەمن نەزرم کردووەکەلەو گەنجەهیچ بەمن و وابەستەگانی من تەعەللوق نەگرێ .. الی اخرە...**

بگرەگوێ تۆ، چی کەبەو میوانەدام | چونکەدەمدی ئەو کەحەتمەن دێتەلام (۳۵۳۳)

من لەقەرزو وامی وی بووم با خەبەر | حازرم کرد من لەبۆ وی چوار گوهەر (۳۵۳۴)

زیاد لەقەرزی وینەئەو زێڕانی من | تانەبێ غەمگین ئەو میوانی من (۳۵۳۵)

نۆ هەزار زێڕ وامدارەئەوکەسە | بۆ ئەدای وام،قیسمەتێک لەو زێڕ بەسە (۳۵۳۶)

زۆر دەمێنێ زێڕ، بڵێ، با خەرج کا | بەو بڵێ، من نێو دوعای خۆی، دەرج کا (۳۵۳۷)

دەمهەویست، بەو من بەدەستی خۆم، بدەم | نێو فلان دەفتەر ئەمن نووسیم قیسەم (۳۵۳۸)

نەیدەدا ئەمما بەمن مۆڵەت، ئەجەل | تا بدەم دووری عەدەن، بەو خۆش عەمەل (۳۵۳۹)

دلەدەنا نێو زەرفێ، دووڕڕی شاهوار     نێوی وی نوسرا و لەسەر دیار، ئاشکار (٣٥٤٠)

ژێر فلان سەقفم دەکرد من زێڕ نیهان     من نەبووم غافڵ لەوی خۆ قەت،چ ئان (٣٥٤١)

قیمەتی وی لای شەهان مەعلوومە بەس     فێڵ نەکەن لێت، بۆ فرۆش جا، قەت چ کەس (٣٥٤٢)

تا نەیەت وەختی فرۆشتن، هیچ غیرار     وەک نەبی، سێ ڕۆژ کە، بۆ خۆت ئیختییار (٣٥٤٣)

مەیخەسەرخۆت فیکری کا سید بوونی وی     با ڕەواجە، قەت کەنابێ مونزەوی (٣٥٤٤)

تۆ سەلام بێژەبەوڕراسم هەموو     ئەو پەیامەش بێژەبوان، موو بەموو (٣٥٤٥)

با، نەبن غەمگین لەزۆری زێڕ ئەوان     زێڕ وەدەس میوانی من دەن، شادمان (٣٥٤٦)

گەر بلێ من نامهەوێ ئەو زێڕی زۆر     بەو بلێ بی بەخشە، ویستت هەر، چ جۆر (٣٥٤٧)

هەرچی پێم دای نامهەوێ لێت یەک نەقیر     ناچتەوەبۆ نێو مەمک، گەر هات شیر (٣٥٤٨)

وەک سەگێک وایەلەبۆ قەی خۆی ئەکوول     موستەریددی هەدیە، وای فەرموو ڕەسوول (٣٥٤٩)

بۆی لەپشتی دەرکەدانێن زێڕ ئەگەر     دەرکی قایم کرد و نەی ویست بێتەدەر (٣٥٥٠)

زێڕ دەبا هەرکەس بەوێی دابێ گوزا ر     هەدیەناکا، موستەڕەد، موخلیس، چ جار (٣٥٥١)

من دووساڵ پێش بۆم دەکرد،ئەو گەنج دەفین     نەزری زۆرم کردئەمن،گەڵ خوای موعین (٣٥٥٢)

گەر بەرن لەو گەنجەهەرچەن، واریسان     بیست بەرابەر دێ لەبۆ وان خۆ زییان (٣٥٥٣)

گەرکو ئازاردەن ڕەوان و گیانی من     سەت دەری میحنەت لەبۆ وان واز دەبن (٣٥٥٤)

ئەمنی خۆش ئەخلاق دەموێ لەو خودا     جێ بەجێ ئەو حەق وەدەس حەقدار بدا (٣٥٥٥)

دوو قەزییەی دیکەشی ئەو کرد بەیان     نامهەویتن من بلەم هیچ یەک لەوان (٣٥٥٦)

تا ببن ئەو دوو قەزییە، سیڕ و ڕاز     هەم نەبێتن مەسنەوی بێ حەد دراز (٣٥٥٧)

هەستەلەو خەو لێدەبشکەن،ئەی ئەمین     جار غەزەل بێژ جارو بار گریان و شین (٣٥٥٨)

جاکوتی میوان ئەی یاری دەدەر     مەست، هەستای چیت ئەتۆ هات بەر نەزەر (٣٥٥٩)

چیت دەخەودی،دوێ شەوێ ئەی خۆش وتار؟     جێت کەنابێ هەم لەدەشت و هەم لەشار (٣٥٦٠)

فیلی تۆ دیتی مەگەرهیندووستان؟     وا هەلاتی توند، لەحەلقەی دووستان (٣٥٦١)

پێیدەکوت،دیم خەونی سەوداناک، ئەمن     دیم لەدڵ خۆم تاوی زۆر ڕووناک ئەمن (٣٥٦٢)

دیم دەخەو ئەو موحتەسیب ئەو هووشیار     ئەو کەسەی بۆ وەسڵ کردی گیان، نیسار (٣٥٦٣)

دیم دەخەونم موحتەسیب ئەوکار ساز     وەک هەزار کەس بوو لەبۆ ئەهلی نییاز (٣٥٦٤)

مەست و بێ هۆش دەیژمارد ئەوسافی وی     تاکومەستی بردی هۆشی سافی وی (٣٥٦٥)

ئەو دەنێو ماڵ دا، بەرەو پشت کەوتەخوار     کۆ دەبوون عالەم لەدەورەی، بێ ژمار (٣٥٦٦)

هات وەهۆش دەیکوت کەئەی دەریایی خۆش ... ئەی لەنێو بێ هۆشی، تۆ دات ناوەهۆش (٣٥٦٧)

ئەی لەنێو خەو دات دەنا بێدار بوون ... دات دەنا نێو بێ دلّی، دلّدار بوون (٣٥٦٨)

دەو لەمەندیت دادەنا نێو زوللی فەقر ... نێو ملی ئیقبالّ دەکەی تۆ غوللی فەقر (٣٥٦٩)

زید لەنێو زید دایە پنهان موندەرەج ... نار دەبوو نێو ئاوی سووزان موندەرەج (٣٥٧٠)

ناری نەمروود گولشەنی تێدایەدەرج ... دەخلّ و حاسلّ، بوون نیهان نێو بەزل و خەرج (٣٥٧١)

بۆیەفەرمووی موستەفا پاشای نەجاح ... ئەی نیعەمدار، سوود و نەفعن،خۆ سەماح (٣٥٧٢)

قەت بەبەخشیش مالّ ناهێنێ کەمی ... حیفزی مالّ خەیرات دەکەن چاک، ئەی عەمی (٣٥٧٣)

جۆشش و زیاد بوونی زێڕ بوو نێو زەکات ... عیففەت و پاکی لەفەحشا، نێو سەلات (٣٥٧٤)

بوو لەبۆ کیسەت، زەکاتت پاسەوان ... بوو لەبەرگورگانی هار، نوێژت، شوان (٣٥٧٥)

نێو گەلاو لک، میوەیی شیرین،نیهان ... زیندەگی جاوید، لەنێو مەرگ و نەمان (٣٥٧٦)

بۆ زەمین بوون، زبلّ و کود خۆراکی چاک ... بەو غەزا میوەی دەدا خاک، جوان و پاک (٣٥٧٧)

نێو عەدەم یەک شت نیهان، مەو جوودەئەو ... گەرچی زاهیر ساجیدە، مەسجوودەئەو (٣٥٧٨)

گەر چی زاهیر بەردو ئاسن موزلیمن ... باتینەن خۆ، نوورو شەمعی عالەمن (٣٥٧٩)

دەرجی ترسەسەت هەزاران ئیمەنی ... نێو ڕەشایی چاو، هەیەزۆر ڕەو شەنی (٣٥٨٠)

گای بەدەن تێیدایەشازادێک، عەزیز ... نێو کەلاوەت دادەنا گەنجێک، تەمیز (٣٥٨١)

تا فیرار کا یەک کەری پیر، لەو نەفیس ... گا، ببینێ ئەو نەشا، یانی بلیس (٣٥٨٢)

**حیکایەتی شا و وەسیەت کردنی وی بۆ سێ کوڕانی خۆی کەدەسەفەریا دەنێو مەمالیکی من لەفلان جێگا ئەو کارەبکەن ولەفلان جێگا کار بەدەستان دابنێن بەلّام ئاگاتان لە خۆ بێ مەچنەفلان قەلعە، ولەدەورەی مەگەڕێن ..**

**خولاسەی داستان ..**

پاشایەک سێ کوڕی زۆر باشی بوون ئەو کوڕانەویستیان بچنەگەڕان و سیاحەت لەنێو شارو قەلّاو سەرزەمینی جێگای حکوومەتی بابیان تا لەژیان دا تەجرەبەوەدەست بێنن..شا،ئەو قەست ویستەی وانی پەسەند کرد ولەوازیم ومایەحتاجی سەفەری بۆ ئامادەکردن، وپێیکوتن هەرجێگایەک کەویستان، برۆن، بەلّام ئاگاتان لەخۆ بێ مەچنەفلان قەلعەکەنێوی (ذات الصور) ە، ساحەبی نەقش و سووڕەتان و قەلّایەکی هۆش بەرە، ونەکەن کەبچنەوێ چونکەوا بەد بەخت دەبن کەیاخوا هیچ چاوێک نەی بینێ وهیچ گوێ یەک نەیبیسێ .. هەرسێ شازادەبەڕەسمی

ئیحتیرام و خودا حافیزی دەستی بابیان ماچ کرد و وەرێ کەوتن . سەفەرێکی زۆر خۆش و دڵنشین دەست پێکرا، ئەو برایانە تەسمیمیان گرت کەهەموو جێگایەک ببینن و بچنە هەموو شارو مەنتەقان، و لەئەحواڵی ئەو مەنتەقانەخەبەردار بن، لەگەرماو گەرمی سەیرو سیاحەت دابوون کەلەناکاو هەرسێکیان قەڵای هۆش بەرو ترساندنی موکەڕڕەری بابیان وەبیر هاتەوە، مەنعی موئەککەدی بابیان وەسوەسەو کونجکاوی لەدڵی وان ئیجاد کرد و ڕەنگەئەگەر بابیان ئەو هەموو تەزەککورەی نەدابا ومەنعی نەکردبان بەفکری ئەو قەلایەنەکەو تبان ونەیان ویستبا کەبچنەوێ وەک کوتویانە(الانسان حریص علی ما منع) جا بۆیەبەر خیلافی تەحزیراتی موکەڕڕەری بابیان چوونەنێو قەڵای مەمنووع.. بەڕاستی قەڵایەک بوو زۆر موجەللەل وڕازاوە بەئەنواعی نقووش، نقووشی دڵ ڕفێن و جوان .. پێنج دەرکەی بەلای دەریا وپێنج دەرکەی بەلای ئیشکایی دابوو، وەها سەر مەست و خۆشحاڵ بوون کەدەت کوت جیسمیان نییەونەرم و سووک بۆهەموو لایەک دەڕۆیشتن وهیچ نەقشی تیکراریان نەدی وهەریەک لەو نەقشانەبینەریان بۆ لای خۆ دەکێشا و مات و موتەحەییریان دەکرد، لەناکاو چاویان بە موجەسسەمەیەکی زۆر جوان کەوت کەهۆشی لێ بڕین .. برایان بەشیددەت عاشقی وی بوون و ویستیان کەساحەبی ئەو موجەسسەمەپەیدا بکەن و بەویسالی بگەن، دەنێو ئیحساسی موتەناقیز دا مورەددەد بوون، لەلایەک لەتەماشای ئەوموجەسسەمەیەمەست وشادمان بوون ولەلایەک شکاندنی پەیمانی بابیان یەک کێوی نارەحەتی وغەمانی لەسەر دڵی وان دانابوو و بەخاتری ئەو دوو ئیحساسی موتەناقیزەزۆر دەعەزاب دابوون .. برایان، بۆ پەیداکردنی ساحەبی ئەو موجەسسەمە، جستو جۆ و پرسیاریان دەست پێ کرد و بەسەر لێ شێواوی وحەیرانی بەپەلەدەچوون بۆ هەمووشارومەنتەقەیەک بەڵام هیچ نیشانیکیان لەمەقسوود وەدەست نەکەوت تاکو پیرێکی ڕووناک بیر و باشکۆ، ئەوانی دی و خەبەری ئەو مەعشووقەیێ نیشانەی پێکوتن، بەوانی کوت ئەوسوورەتەموتەعەللیق بەکچی پاشای چینە. بەڵام موشکیل دێرەدایەکەئێوەناتوانن ئاشکرا وەدوای وی کەون،چونکەپاشای چین خسڵەتێکی زۆر عەجیبی هەیەکەکەس جورئەت ناکا نیسبەت بەخانەوادەی وی قسەیەک بڵێ چونکەئەوپیاوێکی زۆربەغیرەت و حەسوودەوتاکو ئێستا زۆرکەسانی بێ ئیحتیات لەو بارەدا پرسیاریان کردووە، وسەریان دەو ڕێیەدا داناوە..میللەتی چین هەر وەها پەروەردەبوونە، وهەرکات کەسێک لەبارەی کچی شا، پرسیاریان لێ بکا زۆر پەرێشان دەبن وئیزدیواجی شاو خانەدانی وی ئینکار دەکەن .. عاقیبەت شازادەکان

بەزەحمـەتێکی زۆر خۆیـان گەیاندەمەملەکـەتی چین،بـەڵام غـەریب و ناشـناس .. وئـەوان چـاک دەیان زانی کەبەئاشکرا وەدوای سۆراغی کچی شا کەوتن کارێکی عاقڵانەنییە، جا بەفکرو هۆش و فەراسـەتی خۆیـان وەجستو جـۆ کـەوتن و مەقاسـیدی خۆیـان بەرەمزوکینایەئـەدا کـرد .. تـا گرفتاریان بۆ پێش نەیە،زۆر گوزەرا بەڵام هیچیان وەدەست نەکـەوت، جـا لەبۆیەبوو،کەعیشق و ئەوین سەبری لەبرای گەو رەبرِی وتەسـمیمی گرت کەبەبێ هیچ مولاحـەزەو پـەرهیزو تـرس، بچێتەلای شا،ورازی نیهانی خۆی بەئاشکرا بـەوی بڵێ، جـا یـا دەبێتەسـەردار، یـا دەچێتەسـەر دار، هەرچی دەبێ با ببێ .. برایان هەرچەنـد تـەزەککوریان پێدا وعاقیبـەتی سـەختی ئـەوکارەیان بـۆ بەیان کرد هیچ فایدەی نـەبوو رۆی کـەرۆی .. بـرای لەهـەموان گـەورەتر گەیشـتەحزوور پاشـای چین و ئیتتیفاقەن شا، عارفێکی خودایی و پیرێکی سەمەدانی بوو، کەئەسرارِی دڵانی بێ دەنـگ و وتار دەزانی، بەڵام خـۆی بـەعارفی خـودایی نیشـان نـەدەدا،تا موعـەرریفی مەخسووسـی دەربـار ئەحواڵی وی بەیان وشەرح بـدا .. موعـەرریف پـاش بـەیانی مـەناقیبی شازادەبەسوورەتی کامیـل، مەتڵەبی خۆی بەو جوورەخولاسەکرد .. ئەو شازادەزۆر لەمێژەدەیهەوێ بەخزمەت تۆ شەرەفیاب بێ،بـەڵام زەعـف و فتووروسسـتی ونـەبوونی ئامـادەگی مـانیعی ئـەو شـەرەفیابەبوونە، تاعاقیبـەت زینـدەگی خـۆش و مورەففـەهی خـۆی وەلانـاو بەپەلـەخۆی گەیاندەئـەو دەرگـا و ئاسـتانەتا ببێتەیەکێک لەخزمەتکارانی ئەو دەرگایە، شای چین ئەوی هینا لای خۆی ولوتف و عینایـەتێکی زۆری دەگەڵ کرد تا ئەو حەددەکەغەمی قەدیمی لەبیر خۆی بردنەوە، و مەشموولی فیووزات و ئـەلتافی خـودایی شـا بوو،بـەڵام هێنستا عیشـق و ئـەوینی ئـەو موجەسسـەمەیەی دەدڵ دا بـووو نیسـبەت بـەوی بـەئارەزوو نەگەیشـت و دەوحاڵەدابووکەئەجـەل گەیشتەسـەری وچـۆ جیهـانی جاویدان، وجەنازەی وی بەئیحترامێکی مەخسووس تەشییع و تـەدفین کـرا، لـەو کاتـەدا کـەبرای گەورەکۆچی دوایی کرد برای لەهەموان چووکتر نەخۆش کەوتبو،جابۆیەهەربرای نێونجی لەسـەر جـەنازەی حازربووپاشـای چـین ئـەو برایـەی بـەیادگاری بـرا گەورەبەمولازەمـەتی دەرگـای خـۆی ئینتیخاب کرد و زۆر قـەدرو ئیحتیرامـی لێ نا، برای نێونجی بەئاستانی شا، شـەرەفیاب بـوو، و بەبەرکەتی ئەنفاسی پاکی شا،بەفتووحات گەیشت و لەئەسرارِی غـەیبی ئاگا دار بـوو ومـەقامی مەعنەوی بەدەست هینا بەڵام کەمکەم تەکەببور و بێ نیازی دەدڵدا پەیدا بوو ودرووی ئـازار دەهەنـدەی کیبـرو غـروور وخودخـواهی دەقـەلبی وی رۆچـوون کـە ( ان الا نسـان لیطغـی ان را هاستغنی).. ئەو بەخۆی دەکوت مەگەر ئەمن چیم لەشا کەمترەکەئیختیاری خۆم وەدەستی وی

بدەم؟ هەم جەوانم با تەوانم، هەم شیرین زەبان هەم سوورەت جوانم،هەم ساحەبی حەسەب و نەسەبی والامەقامم .. شای رووناک بیر باتینی وی خوێندەوە، ولەڕازی دڵی وی ئاگا دار بوو ولەحاڵەتی عوجب و تەکەببورو ئیستیغنا وبێ نییازی وی زۆر نارەحەت بوو،ولەپاشان ئەحواڵی مەعنەوی بەرەو کەمی و ئوفوول چوو، وبەشیددەت قەبزی بۆ عاریز بوو،کەنەیدەزانی بۆ وایە.. لەلایەکی دیش دڵ شکانی شا، سەبەب بوو کەتیرێک لەتیردانی غەیب دەنێو کەوانی قەزا بنرێ و گیانی لێ بستێنێ .. بەڵام برا چووکەکەی لەڕێگای وەدەست هێنانی ساحەبی موجەسسەمە، وەک دوو برای دیکەی تەلاش نەکرد بەڵکەم سست ترلەو دووانەی ئیقدام کرد،بەو جوورەهەم بەساحەبی موجەسسەمەگەیشت هەم بەمەقاتی مەعنەوی ..

سێ کوڕی بوو ن، یەک نەفەر باش شەهریار — بوون ئەوان سێ، زیرەک و زۆر هوو شیار (۳۵۸۳)
گشتیان ئەو سێ برا، بوون ڕەندومەند — بۆ سەخا و بۆ جەنگ و دەعوا، دڵپەسەند (۳۵۸۴)
ڕا دەوەستان لای شەهەنشای باب بەجەم — نووری چاوی شەهریار، چەشنی سێ شەم (۳۵۸۵)
ئاو لەدوو چاوی کوڕی کێشا، نیهان — داری جیسمی باب، دەبوو،بەو شادمان (۳۵۸۶)
تا لەمنداڵ هەڵقوڵێ ئەو کانیاو — بچتەباغی دایک و بابی خۆی بەتاو (۳۵۸۷)
شین دەبێ بەو کانی جاری ئەو دوو عەین — باغ و ڕەوزەی دڵپەسەندی والیدەین (۳۵۸۸)
گەربێ ئەو کانیاوە، دەردەدار — گشت گەڵای ئەو دار، دەبن سیس و نەزار (۳۵۸۹)
جا دەڵێتن ئاشکرا وشکایی دار — بۆی دەهات ئەو دار، لەمنداڵ جۆبار (۳۵۹۰)
هەن گەلێک کارێز کەنابینرێن چ جار — وەسڵی گیانی ئێوەنە، لەیل و نەهار (۳۵۹۱)
ئەی ئەوەی گرتت لەئاسمان و زەوی — مایەیێ حەد، تاکو جیسمت بوو قەوی (۳۵۹۲)
عارییە، تێکڕا هەموو نین موعتەبەر — هەرچی گرتت خۆ لەدەستت دێتەدەر (۳۵۹۳)
غەیری ڕووحی پاک کەدای ئەو،کردگار — بگرەڕوو ح تۆ، غەیری ڕوو ح نایەن،بەکار (۳۵۹۴)
خۆ بەنیسبەت گیان وڕووح نایەن بەکار — نەک بەنیسبەت سەنعەتی زۆر ئیستیوار (۳۵۹۵)

**بەیانی ئیستیمدادی عارف لەسەرچاوەی حەیاتی ئەبەدی وبێ نییازبوونی وی لەئیستیمداد و جەزب کردن لەکانیاوی ئاوی بێ وەفا کە( علامە ذلک التجافی عن دارالغرور ) کەئینسان ئەگەر ئیعتیماد بەو کانیاوانەبکا لەجستو جۆی کانیاوی باقی ودائیمی سست دەبێ ..**

خۆش بەحاڵ کارێزی ئەسڵی گشت ئوموور — ئەو لەکارێزی دەدی دەت کا بەدوور (۳۵۹۶)

ئاو لەسەت کانیاو دەکێشی ئەی فلان — کەم دەبێ خۆشی کەکەم بێ لەو سەدان (٣٥٩٧)

گەر لەباتین هەڵقوڵێ کانیاوی خۆش — سیرقەتی کانیاوی دی ناکەی ئەتۆش (٣٥٩٨)

نووری چاوت چونکەبەس ئاوو،گڵە — موزدی تۆ، لەو نوورەبەس، دەردی دڵە (٣٥٩٩)

ئاو لەخاریج بێتەنێو قەلعە، ئەگەر — زیاد دەبێ ئاو، گەر نەبێتن هیچ خەتەر (٣٦٠٠)

گەرکو دوژمن هات و،قەلعەی کرد حەسار — تاکو خەڵکی وێ، بکاتن تارو مار (٣٦٠١)

ئاو لەخاریج ڕا دەبەستن ئەو سوپا — تا نەبێ بۆ خەڵکی دی، پشت و پەنا (٣٦٠٢)

ئاوی بیرێک سوێر لەداخیل، ئەو دەمە — بۆ ئەهالی ئەو قەلایە، زەمزەمە (٣٦٠٣)

(قاطع الا سباب ) یەنی مەرگ و نەمان — دێ، وەکوو دەی، نایەڵێ بۆ دار ژییان (٣٦٠٤)

یارمەتی نایەت لەدەس، ئەو دەم بەهار — گەرنەبێ نێو گیان بەهاری ڕوویی یار (٣٦٠٥)

بۆیەخاک نێوی نرا ( دارالغرور ) — چونکەناکا هیچ دیفاع (یوم العبور) (٣٦٠٦)

ئەو لەئەووەڵ یارمەتی دا،وەعدەپێت — گەرچی نەیکرد خۆ، چ دەردێک،دوور لێت (٣٦٠٧)

ئەو بەتۆی وەعدەدەدا، وەختی غەمان — گشت غەمانت لا دەبەم بۆ لای نەمان (٣٦٠٨)

گەر سوپای غەم هات، دەبەستێ لێوو، زار — قەت کەناڵێ من ئەتۆم، خۆ، دیوەپار (٣٦٠٩)

وای مەسەل لێدا لەمەڕ شەیتان خودا — ئەو بەمەکرو فێڵ لەڕێگات لادەدا (٣٦١٠)

من لەبۆ تۆ یاوەرم یاری دەدەر — من لەپێش تۆ دا دەچم بۆ نێو خەتەر (٣٦١١)

من دەبم بۆ تۆ، لەکاتی تیر، سپەر — ڕێی نەجاتی تۆم لەکاتی تەنگەبەر (٣٦١٢)

تا تۆ شاد بی من دەکەم گیانم فیدات — تۆ نەخۆی بۆ وی فریو، هیچ ئان و کات (٣٦١٣)

جا بەفێڵی وا لەڕێ،دەی باتەدەر — ئەو بلیسی فێڵەبازی حیلەگەر (٣٦١٤)

گەر کو چۆ پێش و، لەکەنداڵ،کەوتەخوار — ئەو بەقاقا، واز دەکاتن لێوو، زار (٣٦١٥)

بێرەیاریم،من ئومێدم زۆرەپێت — ئەو دەڵێ نا، من دەڕۆم، تۆش ئێرەجێت (٣٦١٦)

تۆ نەترسای هیچ لەعەدلی کردگار — بەردەلێم دەس،من دەترسم، بێ قەرار (٣٦١٧)

حەق دەڵی خواردی فریو دەر چوو لەڕێ — بەو هەموو فێڵ،کوا نەجاتت؟ دا بڵێ (٣٦١٨)

فاعیل و مەفعوول، کەدێت ڕۆژی ژمار — ڕوو ڕەشن هەر دووش دەکرێن سەنگسار (٣٦١٩)

ڕێ گرو هەم ڕووت کراو، لای حوکم و داد — هەردوو نێو چاڵی هیلاک،( بئس المهاد) (٣٦٢٠)

گێل وگێژێکی کەدای شەیتان فریو — ڕەستگاری تا ئەبەد، لەو بوو نەدیو (٣٦٢١)

مان کەرو کەر گر، لەنێو قوڕ، لێرەدا — غافڵن هەم تیرەڕوو حن، بەد ئەدا (٣٦٢٢)

غەیری ئەو کەس خۆی لەشەیتان لابدا — پشت لەپایز، نێو بەهار خۆی جا، بدا (٣٦٢٣)

دەس بــــەداری تۆبـــەبگرێ ئــــەو دەمـــی ئــەمـری حــەق ئــەنجام بـداتن بـێ کــەمی (٣٦٢٤)
گـــەر بنـــاڵن مـــوزنیبینی تـــۆ بـــەکار دیتەلــەرزین تــەخت و عەرشــی کردگــار (٣٦٢٥)
وا دەلــەرزێ، چەشــنی دایــک بـۆ پسـەر دەسـتی وی دەگرێـت و جـا دەی باتــەدەر (٣٦٢٦)
تۆی کەحەق دوورکرد لەخود خواهی وغروور بـۆی موهـەییاکردی جەننـەت،خوای غـەفوور (٣٦٢٧)
جـا لـەوەی پاش عیشـقی جاویـدان لـەڕەب دێ لەبۆت، بێ عیللەت و، بێ هیچ سەبەب (٣٦٢٨)
غیرەتـی دەریـا لـەحاس ئەسـباب بـزووت دوورلەمەشکەی کرد تینوو، چەشنی حووت (٣٦٢٩)

**وەرێ کەوتنی شازادان بۆ موسافەرەت دەمەمالیکی ژێر سەیتەرەی بابیان، پاش خودا حافیزی کردن لەشا،و تیکرار کردنی شا، وەسیەتی خۆی، بەشا زادان وەختی خودا حافیزی ..**

جا شـرووعیان کـرد ئـەو سێ کـوڕ، سەفەر چوونــەلای ئــەملاکی ژێـر حـوکمی پـدەر (٣٦٣٠)
تـا کـو فێـر بـن تەجرەبـەو حـوکمی ژییـان ئــەو تـــەوافی مـــوڵکی بابیـــان ویســـتییان (٣٦٣١)
دەسـتی شـایان مـاچ دەکرد،کردیـان ویـداع جـا بـەوانی وا، دەکـوت ئـەو شـای موتـاع (٣٦٣٢)
شـــاد و خەنـــدان بچنەهـــەر جێگایە،گـــەر دڵپەسـەن، بـێ، حافیزشـتان خـوای لەسـەر (٣٦٣٣)
غـەیری ئـەو قەلعـەی کـەبوو نێو هۆش بـەر ئـــەو لەشـــایانیش دەکـــا جـــێ، تەنگەبـــەر (٣٦٣٤)
نەچنەئـــەو قەلعـــەی کەتێیـــدا زۆر ســـووەر دوورلـەوی بـن، تـا نەیـەت، بۆتـان خەتـەر (٢٦٣٥)
پشت و ڕووی ئـەو، بورجەهـەم بـاڵاو، خـووار پـڕ لەعـەکس و سـووڕەت و نـەقش و نیگـار (٣٦٣٦)
چەشنی ئـەو حـوجرەی زولـەیخا، پـڕ سووەر تـــا بکـــا یووســـوف بـــەبێ دڵخـــواز، نـــەزەر (٣٦٣٧)
چونکەیووسـوف نـەی دەنـۆڕی هـیچ لـەوی پــڕ لەنەقشـــی کـــرد مـــاڵ، بـــاڵاو، نـــەوی (٣٦٣٨)
تــــا لەهەرلایــــەک کــــەنۆڕی ئــــەونیگار هــــەر ببینـــێ ڕوویـــی وی بـــێ ئیختییـــار (٣٦٣٩)
خوا لەبۆ ڕەو شەن دڵان گشت ئان و کات مەزهەری ئایاتی خۆی کرد، شەش جیهات (٣٦٤٠)
تــا ئەگــەر دیتیــان گییــا، یــا گیــان دار سـوود بـەرن لـەو بـاغ و باغچـەی کردگـار (٣٦٤١)
بۆیەفـــەرمووی خـــوا لـــەبارەی مـــوئمینین ڕوو لەهــەرلا کــەن، دەبیــنن خــوای مـوبین (٣٦٤٢)
وەختـی تینـوو بـوون، وەخـۆی تـۆ ئـاو ئەگـەر خـۆ لـەنێو ئـەو ئـاو، دەبینـی خـوای لەسـەر (٣٦٤٣)
بـەس دەبێـتن سـووڕەتی خـۆی لـەو دییـار ئەوکەسـەی نـەی بێـت عیشـقی کردگـار (٣٦٤٤)
سـوو ڕەتـی عاشـق فـەنا بـێ، دەو، ئەگـەر دا، بڵـێ، چیـت ئـەو دەمـی دێ، بـەر نـەزەر؟ (٣٦٤٥)
جـا دەبینـی حوسـنی حـەق نێـو ڕوویـی حـوور وەک دەکـا بـۆ وی دەنێـو ئـاو، مانـگ زهـوور (٣٦٤٦)
خـوا لـەبۆ عوششـاق و سـادق بـوو غـەیوور نـەک لـەبۆ شـەیتان و حـەیوان و سـتوور (٣٦٤٧)

گـەر بەحـەق عاشـق ببـێ شـەیتان، یـەقین — ئـەو وەکـوو جـەبریل دەبـێ ڕاسـت و ئـەمین (۳۶۴۸)

ئــەو دەمــە، تەسلیمەشــەیتانی عەنیــد — گـەر بـەلوتفی حـەق یەزیـد بـێ، بایەزیـد (۳۶۴۹)

ئــەو وتــارەبێ بــن و پایانــەخۆ — لــەو قەڵایــەوەر بگێــڕەن، ڕوویــی خــۆ (۳۶۵۰)

قـەت نـەبن تـابیع لـەبۆ ئـەهوایی بـەد — چـون دەبـن بـەد بـەخت و ڕیسـوا تـا ئەبـەد (۳۶۵۱)

فەرزەپـەرهیز خـۆ لەهـەرچی بـێ خەتـەر — بگرەگـوێ، بـۆ ئـەوتارەی، بـێ زەرەر (۳۶۵۲)

عـەقڵی زۆر بـاش بـۆ نـەجات بـوون، لازمـە — لای بـەلاو دەردان، وەلا چـوون، لازمـە (۳۶۵۳)

گـەر کـو نـەی کوتبایەئـەو گوفتارەبـاب — گـەر کو نـەی کوتبایەتـەحزیر، بێ حیساب (۳۶۵۴)

قـەت نـەچوو بـان ڕەنگـەبۆ نێـو ئـەو قـەڵا — مـەیلی وێ یـان قـەت دەنێـو سـەر دانـەبا (۳۶۵۵)

چـون لەشـوهرەت ئـەو قـەڵا مـەهجوور بـوو — زۆر لەقــەلعان و لــەڕێگا، دوور بــوو (۳۶۵۶)

چونکەمــەنعی کـرد قـەڵا ئـەو شـەهریار — هاتــەدڵیان وەسوەســەو بیــر، بــێ ژمــار (۳۶۵۷)

زیـاد دەبـوو بـەو مەنعـە، مـەیلی قـەلبیان — خـۆ دەبـێ ئـەو ڕازەلێمـان بـێ، عـەیان (۳۶۵۸)

کـوا کەسێک بێـتن لەمـەمنووع مومتـەنیع؟ — چونکەئینسـان بـوو حەریسـی ( مـامونیع ) (۳۶۵۹)

مــەنعی پــەرهیزکار، تــەبغیز چــا دەکــا — مـەنعی شـەهوەت خـواز، تـەحریز چـا دەکا (۳۶۶۰)

ون دەکـەن بـەو، مەنعـەڕێگای خـۆ کەسیر — دێ هـودا بـەو مەنعـە، بـۆ قـەلبی مـونیر (۳۶۶۱)

کـوا لەبـەر نـەی کـۆتری ئـەهلی ڕادەکـا؟ — بەڵکــەکۆتری غــەیری ئــەهلی وا دەکــا (۳۶۶۲)

جـا دەیـان کـوت ئـەمری تـۆ ئیجـرا دەکـەین — هـەرچلۆن فـەرمان بـدەی، هـەر وا دەکـەین (۳۶۶۳)

ئێمــەلانانێین، چ کــات، فــەرمانی تــۆ — کفرەغەفڵــەت لــەو هــەموو ئیحســانی تــۆ (۳۶۶۴)

چـون بـەخۆیان زیـاد لەحـەد بـوو ئیعتیمـاد — هیچ نەیان کوت بی هەوێ، گەر خوای ویداد (۳۶۶۵)

زیکـری ئیستیسـنا ئـو، حـەزمی زۆر قـەوی — ئاشکرای کـوت، پـێش شـرووعی مەسـنەوی (۳۶۶۶)

سـەت کتێبیش گـەر هـەبن، یـەک مەتڵەبـە — مەزهـەبیش هەرچەنـدەبن، مەتڵـەب، ڕەبـە (۳۶۶۷)

مونتـەهای گشت ئـەو تـوڕوق یـەک خانەیـە — ئەسـڵی وان سـونبول بـەعام، یـەک دانەیـە (۳۶۶۸)

گـەر تەماشـاکەی غـەزایان سـەت هـەزار — گشـتیان خـۆ یـەک شـتن، بـۆ ئیعتیبـار (۳۶۶۹)

گـەرکو تێـر بی تـۆ لەیـەک خـۆراک تـەمام — تـۆ دەبـی دڵ سـار، لەهـەرچی هـەن تـەعام (۳۶۷۰)

وەختی جووعت دی گەلێک تۆ، خێل و خوار — چونکـەدیتت یـەک تـەعام تۆ، سـەت هـەزار (۳۶۷۱)

باســمان کــرد لــەو کــەنیزەی دەردەدار — لــەو تەبیبانــەی عــەلیل و هــۆش نــەزار (۳۶۷۲)

ئـەو تـەبیبان چەشـنی ئەسـپی بـێ فسـار — بێ خەبـەر مـابوون، لەپشـتیان یـەک سـووار (۳۶۷۳)

پــڕ برینــی کــرد زاری وان، لغــاو — زەخمــی زۆری دا بەســمیان، غــارو ڕاو (۳۶۷۴)

بێ خەبەر بوو ن گەر لەپشتیان یەک سووار    توندو تۆڵ و ماهیرو ئوستاد کار (۳۶۷۵)

بەو لغاوەئێمە، ئەن سووڕاند، سەر    وای لەئێمەکرد سواری خۆش نەزەر (۳۶۷۶)

بۆ گوڵانمان کرد لای گولزار ڕوو    گوڵ نەبوو دیمان بەگوڵ، ئەو بوو دڕوو (۳۶۷۷)

قەت لەڕووی عەقڵ و خیرەد،نالێن، چ جار    کێ لەئێمەی دا، وەبەر شەق لێوو زار؟ (۳۶۷۸)

ئەو تەبیبان وا ئەسیر بوون بۆ سەبەب    بوون لەتەقدیراتی یەزدا ن، موحتەجەب (۳۶۷۹)

گاو ببەستی تۆ لەئیستەبڵێک ئەگەر    جا ببینی تۆ لەجێی ئەو گایەکەر (۳۶۸۰)

ئەحمەقی تۆ، خۆت لەگێلی دەی، ئەگەر    تۆ نەڵەی کێ بردی گا، داپناوەکەر؟ (۳۶۸۱)

تۆ کەناڵێی کێ یەگۆڕی گا، بەکەر    ڕەنگەبێژی کاری غەیبە، نەک بەشەر (۳۶۸۲)

تیر لەبۆ لای ڕاستەداوێی تۆ، کەچی    خۆت دەبینی تیر کەبۆلای چەپ، دەچی (۳۶۸۳)

ێنگ دەدەی ئەسپت کەئاهوو کەی شکار    خۆت دەکەیتەڕاو، لەبۆ یەک خووکی هار (۳۶۸۴)

تۆ دەچی بەدووایی سوودی دڵپەسەند    سوود نەبوو، بۆ تۆ کەهیچ، خۆت خستەبەند (۳۶۸۵)

زۆر لەبۆ خەڵکت ئەتۆ هەڵقەند چاڵ    خۆت لەنێو ئەو چاڵ دەبینی گرژو تاڵ (۳۶۸۶)

بۆ سەبەب چون بێ موراردی کردی ڕەب    بۆ لەلای تۆ بێ ڕەواج نایێ سەبەب؟ (۳۶۸۷)

بوون لەکەسبێک زۆرکەسان سەرمایەدار    زۆرکەسیش بەو کەسبەبوون،ڕووت و هەژار (۳۶۸۸)

زۆر بەعەقدی ژن وەکوو قاڕوون دەبن    زۆر بەعەقدی ژن،گەلێک مەدیوون دەبن (۳۶۸۹)

چون سەبەب نیتی دەوام و ئیعتیبار    چاکەتەکیەبەو نەکەی تۆ قەت، چ جار (۳۶۹۰)

گەر سەبەب بگری، مەبە، تۆ، زۆر دلێر    چونکەئافاتی گەلێک هەن، ون لەژێر (۳۶۹۱)

ڕازی ئیستیسنایەئەو حەزم و حەزەر    چون بەبزنی کەر، دەدا نیشان، قەدەر (۳۶۹۲)

چاوی وشیاریش ببەستێ گەر قەدەر    خێل دەبێ، جا، وا دەزانێ، بزنەکەر (۳۶۹۳)

چونکەتەقلیبی عیوون دەس خوایەبەس    قەت دڵ و ئەفکار ناگۆڕێن بەکەس (۳۶۹۴)

چاڵ دەبینی تۆ، بەماڵێک زۆر لەتیف    داو دەبینی تۆ بەدانێک، زۆر زەریف (۳۶۹۵)

سەفسەتە، نین بەڵکەتەقلیبی خودان    جێی حەقیقەت خوا دەدا، پێمان، نیشان (۳۶۹۶)

ئەو کەسەی لای وی حەقیقەت بوو بەتاڵ    ژێر بیناو پایەو ئەساسی وی خەیاڵ (۳۶۹۷)

ئەو بەخۆی ناڵێ خەیاڵە، خۆ خەیاڵ    دا بماڵەچاو، ببینی، تا تۆ حاڵ (۳۶۹۸)

## چوونی کوڕانی پاشا بەموقتەزای (الانسان حریص علی ما منع) ..

ما بندگی خویش نمودیم ولیکن    خوی بد تو، بنده ندانست خریدن ..

بۆلای قەڵای پاوان کراو، ئەو هەموو سفاریش و پەند و نەسیحەتی بابیان وەژێرپێ نا، تاکو دەچاڵی بەڵا کەوتن و نەفسی لەووامە بەوانی دەکوت (الم یاتکم نذیر) ئەوانیش بەگریان و پەشیمان دەیانکوت (لو کنا نسمع او نعقل ما کنا فی اصحاب السعیر) ..

دوایــی نایەئــەو قســە، ئــەو ســێ نەفــەر　　رێــی قــەڵای پــاوان کراویــان گرتەبــەر (٣٦٩٩)

داری مەمنووعــەی گــەنم بــوو یاریــان　　هاتنــەدەر لــەو ســیلکی پاکــان، کاریــان (٣٧٠٠)

چون بەمەنعی باب حەریس تر بوون ئەوان　　لای قەڵای مەمنووعەزۆر توند چوون ئەوان (٣٧٠١)

بــەر خیلافــی قــەولی پاشــای موجتــەبا　　چــوون ئــەوان بۆ ئــەو قەڵایــەی، هۆش‌ڕوبا (٣٧٠٢)

بــەرخیلافــی عــەقڵ و پەنــدی شــەهریار　　رۆژ کــــەنا، تاریکەشــــەویان ئیختیــــار (٣٧٠٣)

ئــەو قەڵایــەی دڵ ڕفێنــی پــڕ ســووەر　　پێنج دەری لای یەم بوو،لای بەڕ، پێنج دەر (٣٧٠٤)

پێنج لەوان وەک حیس لەبۆ لای ڕەنگ و بۆ　　پێــنج لــەوان وەک حیسســی بــاتین ڕازجــۆ (٣٧٠٥)

لــەو هــەزاران ســووڕەت و نــەقش ونیگــار　　بــۆ هــەموو لایــەک دەســووڕان بــێ قــەرار (٣٧٠٦)

تۆ لەکاسەی زاهیری خۆت کەمکە، مەست　　تــا نــەبی تــۆ، بــوت تــەراش و بــوت پەرەســت (٣٧٠٧)

لــەو زڕووفــی زاهیــری تــۆ، لادەخــۆت　　مــەی دەجــام دا، جــام کــەنابێ، بــادەبــۆت (٣٧٠٨)

ئاوەڵاکـــــە، زار ئـــــەتۆ بـــــۆ بـــــادەدەر　　جام کەنابێ کەم، وەدەس بێ، مەی، ئەگەر (٣٧٠٩)

مەقســەدی دڵخــوازی مــن کەجســتو جــۆ　　وێڵکەپێســـت و ســـووڕەتی گەنـــدوم ئـــەتۆ (٣٧١٠)

چونکەتەبدیل بــوو بــەئارد خێــز، بــۆ خــەلیل　　تــۆ بزانەعــەزلی گەنــدوم، ئــەی نــەبیل (٣٧١١)

ســووڕەتان بوویــان لــەبێ ســووڕەت وجــوود　　وەک لـــەئاگر چـــادەبێ و، پەیدایـــەدوود (٣٧١٢)

کــەمترین ئیــرادو نەفســی خــوو و، خیســال　　گــــەرکوتیکراربێت دێنێـــــتن مــــەلال (٣٧١٣)

مــات و حــەیرانت دەکــا، بــێ ســووڕەتی　　چــا دەکــا، ســەت ئالــەتان، بــێ ئالــەتی (٣٧١٤)

ئــەو بــەبێ دەس، چا دەکا، دەستان، هــەزار　　چــا دەکــا ئینســان، موســووەر کردگــار (٣٧١٥)

وەک لــەنێو دڵ وەســڵ و هیجــران چــادەبن　　ســەت خــەیاڵی جــوور بــەجوور پەیــدا دەبــن (٣٧١٦)

وێــک دەچــن ئایــا موئەسسیر گــەڵ ئەســەر　　کــوا شــەبیهی یــەکترن شــین و زەرەر؟ (٣٧١٧)

شین بەسووڕەت بوو، زەرەربێ هیچ سووەر　　دەس دەچوون وەختی زەرەر،بێ دەس،زەرەر (٣٧١٨)

نارەوایەئەومیســـــــــالانەم تــــــــــەمام　　مــن مــەرامم بــوو فەقــەت تــەفهیمی عــام (٣٧١٩)

خــوای بــەبێ ســووڕەت، دەچێنــێ ســووڕەتان　　شــین دەکــا، تــەن گــەڵ حــەواس و ئالــەتان (٣٧٢٠)

تیبقــی ئیســتیعدادی خــۆی ســووڕەت هــەتا　　تــەن لــەبۆ لای چــاک و بــاش یــا بــەد ببــا (٣٧٢١)

ســووڕەتی نیعمــەت کــەبێ، شــاکیر دەبــێ　　ســوو ڕەتــی مۆڵــەت کــەبێ، ســابیر دەبــێ (٣٧٢٢)

سووڕەتی ڕەحمی کەبێ، خەندان دەبێ　　سوو ڕەتی زەخمی کەبێ گریان دەبێ (٣٧٢٣)

سووڕەتی شار بێ ئەگەر،دەڕوا سەفەر　　سووڕەتی تیر بێ، ئەگەر، دەگرێ سپەر (٣٧٢٤)

سووڕەتی جوانان کەبێ، عەشرەت دەکا　　سووڕەتی غەیبی کەبێ، خەڵوەت دەکا (٣٧٢٥)

سوو ڕەتی موحتاج بوون، دەی باتەکەسب　　سوو ڕەتی زۆر داری دەی با، لایی غەسب (٣٧٢٦)

زۆر لەحەددو زۆر لەئەندازەن بەدوور　　باعیسی ئەفعال، خەیاڵی جوور بەجوور (٣٧٢٧)

بێ نیهایەت مەزهەب و ئەفعال و کار　　سێبەرن بۆ سووڕەتی ئەفکار هەزار (٣٧٢٨)

دەستەیەک وێستان لەلێوی بان خۆش　　سێبەری هەموان دەبینی جا ئەتۆش (٣٧٢٩)

سووڕەتی فکرن، لەلێوی بان دیار　　ئەو عەمەل وەک سایە، سەر تەن ئاشکار (٣٧٣٠)

کار لەسەرتەن ئاشکار فیکریش نیهان　　مورتەبیت بۆ وەسڵ و، تەئسیر ئەو دووان (٣٧٣١)

سووڕەتی نێو بەزمی مەی،کە، خۆشییە　　فائیدەی وی چوون لەخۆو، بێ هۆشییە (٣٧٣٢)

سوو ڕەتی پیاوو ژن و بازی و جیماع　　فائیدەی بێ هۆشییە، وەختی ویقاع (٣٧٣٣)

سوو ڕەتی نان و نەمەک کە، نیعمەتە　　فائیدەی وی قووەتی بێ سووڕەتە (٣٧٣٤)

وەختی جەنگ ئەو سووڕەتی تیغ و سپەر　　سوود دەدەن بێ سووڕەتی، یانی زەفەر (٣٧٣٥)

سووڕەت و تەعلیق و مەشق و مەدرەسە　　دانیش و عیلمەت کەکەو تەدەس، بەسە (٣٧٣٦)

بەندەبۆ بێ سووڕەتن، سووڕەت بەجەم　　بۆ ئەدی ئینکار دەکەن ساحەب نیعەم؟ (٣٧٣٧)

بۆ سووەر چون هات لەبێ سووڕەت وجوود　　بۆ دەبن بۆ موجیدی خۆیان جەحوود؟ (٣٧٣٨)

بەس لەحەق پەیدا دەبێ ئینکاری وی　　ئینعیکاسی خوایەخۆ، ئەوکاری وی (٣٧٣٩)

سێبەری ئەفکاری میعمار بێ، لەلات　　سەقف و دیواری هەموو جێگا، وڵات (٣٧٤٠)

گەرچی نین نێو زیهنی میعمار ئاشکار　　خشت وخیزو گێچ وسیمان، بەردو دار (٣٧٤١)

فاعیلی موتڵەق فەقەت بێ سووڕەتە　　سوو ڕەتیش نێو دەستی وی وەک ئالەتە (٣٧٤٢)

جارو بار بێ سووڕەتیش بەس بۆکەرەم　　خۆی لەنێو سووڕەت دەدانیشان بەجەم (٣٧٤٣)

تا لەبێ سوو ڕەت مەدەد بگرن سووەر　　بۆ کەماڵ و بۆ جەماڵ و بۆ هونەر (٣٧٤٤)

دیار نەبێ ئەو جارەبێ سووڕەت ئەگەر　　ڕوودەکەن لای ڕەنگ و بۆن، بۆ سواڵ،سووەر (٣٧٤٥)

گەڕ لەسووڕەت سووڕەتێک بی وێ کەماڵ　　ئەو بەحەق گومڕایە، لێی شێواوەحاڵ (٣٧٤٦)

پێم بڵێ تۆ ئەی نەفام بۆ وادەکەی؟　　تۆ لەموحتاج ئیحتیاج داوادەکەی (٣٧٤٧)

سووڕەتان بەندەن، خودانین خۆ ئەوان　　دوور لەسووڕەت بگرەتۆ خوای دووجیهان (٣٧٤٨)

جستوجۆ کەخوا لەنێو شین و فەنات　　بەس بەئەفکار، سووڕەتان چون دێنەلات (٣٧٤٩)

گـەر لـەبێ سـوو ڕەت ئـەتۆ نـابێ، فـرە ... سـوورەتێک مـەولوود نـەبێ لێـت، چـاترە (۳۷۵۰)

سـوو ڕەتـی شـارێک کـەتۆ ڕێـت کەوتـەوێ ... زەوقی بێ سوورەت بوو باعیس، وات دەوێ (۳۷۵۱)

جـا بەمـەعنا تـۆ دەڕۆی تـا لامـەکان ... چونکەخۆشـی، غـەیری جێگایـەو زەمـان (۳۷۵۲)

زاهیـرەن تـۆ بۆیەدەچیـەلایی یـار ... چونکـەبۆ تـۆ ئـەو ئەنیسـەو غەمگوسـار (۳۷۵۳)

باتینـەن ڕووت کردەبـێ سـوورەت ئـەتۆ ... گەر چی لەو مەقسوودەبووت، غەفڵەت ئەتۆ (۳۷۵۴)

جا حەقیقەت، بەس حەقەمەعبوودی کول ... چـون بـەخاتر زەوقـە، ئـەو ڕێگـاو سـوبول (۳۷۵۵)

کلکەڕووگـەی ئـەو کەسـانەی بـێ خەبـەر ... ون لەو ان بوو سەر، ئەگەرچی ئەسڵە، سەر (۳۷۵۶)

سـەر بـەوان، ڕێ ون بـووان، ئیعتـا دەکـا ... بـەس لـەڕێگای کلکـە، ئـەو سـەر، وادەکـا (۳۷۵۷)

یـەک عـەتا دەگرێ لـەکلک و یـەک لەسـەر ... یەک دەبێ بێ حاڵ و، نای بێ، هۆش لەبەر (۳۷۵۸)

غەیری خوایان چون نەویست، بوویان هـەموو ... چـون فـەنابوون، چوونـەلای کـول تونـدو زوو (۳۷۵۹)

**دیتنی ئەو سێ برایانەدەکاخی ئەو قەڵای پڕ نەقش و نیگـار(قلعـه ذات الصـور) نەقشی ڕووی کچی پاشای چین، وبێ هۆش بوونی هەرسێکیان وگرفتاربوونیان وجستوجۆ کردنی وان بۆ پەیدا کردنی ساحەبی ئەو عەکسە..**

ئـەو وتـارەبێ بنـە، ئـەو سـێ جـەوان ... سـوورەتێکیان دی، کـەبوو، بێ حـەد جـوان (۳۷۶۰)

لـەو هـەجوانتر دیتبوویـان زۆر زیـاد ... بـەو هـە، ئـەمما، هـۆش وخۆیـان چـوو لـەیاد (۳۷۶۱)

چـون گەیشـت دەوکاسـەدا، ئـەفیوون بـەوان ... کاسەمەحسووسـن هەموو،ئـەفیوون نیهـان (۳۷۶۲)

کاری خـۆی کـرد ئـەو قەڵایـەی هـۆش ڕوبا ... خسـتنی هەرسـێ دەنێـو چـاڵی بـەڵا (۳۷۶۳)

تیـری غەمزە،کەوتـەدڵیان بـێ کـەوان ... کەس لەدەس ئەو عەکسەنەی بوو هیچ ئەمان (۳۷۶۴)

سـوورەتی بـەرد، ئـاگری بـەردا، دەوان ... دیـن و دڵیـان سـووت، بـەبێ ئـەو دوو، دەمـان (۳۷۶۵)

چـۆن دەبـوو گـەرکو گیـانی بـا لەبـەر؟ ... کۆ دەبـوون عوششاق لـەلای وی، خـاک وەسـەر (۳۷۶۶)

عیشـقی سـوورەت نێـودڵی ئـەو سێ جـەوان ... ڕۆ دەچـوو جـا، هـەر وەکـوو نـووکی سـەنان (۳۷۶۷)

وەک هـەور گریـان و ئەشـکیان هاتـەخوار ... دەسـتییان جـووت و، ئەسـیف و دەردەدار (۳۷۶۸)

پـێش لەئێمـەی دیتبـوو ئـەو شـەهریار ... زۆر لەئێمـەی ویسـت نـەچین بۆ وێ، چ جار (۳۷۶۹)

زۆر لەسـەرمان سـاحەبی حـەق ئـەنبیان ... باخەبـەر بـووین لـەو قـەڵای دونیـا، بـەوان (۳۷۷۰)

چـون لـەوەی چانـدت بەدەسـتت دێ دڕوو ... هـەڵفڕی بـۆ وێ،دەبـێ، بـێ جـێ ئـەتوو (۳۷۷۱)

تـۆ لـەمن، تـۆو، بگرەتـا بـت بـێ سـەمەر ... بگـرەڵێم بـاڵ، بـۆ هـەدەف تـا بچیەسـەر (۳۷۷۲)

واجبـی تاعـەت لـەوی ئینکاردەکـەی ... عاقیبـەت تـۆ، بـەو وجـووب، ئیقـرار دەکـەی (۳۷۷۳)

ئەو ئەتۆیە، نەک ئەتۆی ئێستا، کەهەی — ئەو ئەتۆ، ئاخیر دەکا، ڕێی ڕاست تەی (٣٧٧٤)

تۆی دووەم لای تۆی هەوەڵ کردی گوزەر — تا کو وەسڵی کات و بیکا با خەبەر (٣٧٧٥)

تۆیی تۆ، پنهان دەنێو یەک تۆیی دی — من غولامم بۆ کەسێکی خۆی کەدی (٣٧٧٦)

هەرچی نێو ئاوێنەدیتی یەک جەوان — پیر دە خشتەی دا، دەبینێ، بێ گومان (٣٧٧٧)

ئەمری شاهان ئێمەلانا بۆ کەنار — ئێمەلوتفی بابی خۆمان کرد خەسار (٣٧٧٨)

قەولی شاهان بوو لەلا کەم، هەم حەقیر — ئەو هەموو ئەڵتافی باش و کەم نەزیر (٣٧٧٩)

ئێستەنێو کەنداڵی ڕەنجانین دوچار — هەم بریندار، هەم قەتیل، بێ کارزار (٣٧٨٠)

عەقڵ و هۆشی خۆن لەلابوو موعتەبەر — ئێمەبۆیە، ئەو بەڵایەن هاتەسەر (٣٧٨١)

ئێمەخۆمان بێ مەرەز، دی،دوورلەریق — وەک دەبینێ، خۆی سەلیم، بیماری دیق (٣٧٨٢)

دەردی پنهان ئێستەچاک بوو ئاشکار — پاش ئەوەی میحنەت هەموونی کرد شکار (٣٧٨٣)

زیکری حەق ناگاتەسایەی ڕەهنەما — وەک قەناعەت باش نییەسەت جوور غەزا (٣٧٨٤)

چاوی بینا چاکترە، تا سەت عەسا — چاو دەکاتن گەو هەرو خیز، لێک جودا (٣٧٨٥)

جستو جۆیان کرد شڕووع، بێ حەد غەمین — ساحەبی ئەو عەکسەکێ یە، سەر زەمین؟ (٣٧٨٦)

پاشی جستو جۆی زیبادی کەم نەزیر — کەشفی کرد، ئەو ڕازە، یەک زانایی پیر (٣٧٨٧)

نەک لەڕێی گۆش،بەڵ لەڕێگای وەحیی هۆش — چون لەلای وی، ڕاز نەبوو،هیچ پەردەپۆش (٣٧٨٨)

پێیکوتن مەحسوو د لەبۆ پەروینەئەو — سوورەتی کیژی شەهەنشای چینەئەو (٣٧٨٩)

هەر وەکوو گیان و جەنین پنهانەئەو — ون لەنێو کاخ، هەم لەنێو ئەیوانەئەو (٣٧٩٠)

ڕێ نییەلای وی لەبۆ پیاوو ژنان — بەس لەبەر فیتنان ئەوی شا، کرد نیهان (٣٧٩١)

شا، بەنیسبەت نێوی وی بوو، وا غەیوور — بۆ پەڕەندەش بانی وی مەمنووع عبوور (٣٧٩٢)

وای بەحاڵ قەلبێک ئەوی داوا دەکا — با، نەبێ ئەو کەس، خەیاڵی وا دەکا (٣٧٩٣)

وایەموزدی وەی کەچاندی تۆوی جەهل — پەندی وا باش، بوو لەلای وی پەست و سەهل (٣٧٩٤)

بەس بەفیکرو ڕایی خۆی کرد ئیعتیبار — بەس بەعەقڵی خۆم دەدەم ئەنجام کار (٣٧٩٥)

نیوەزەڕرێک لوتفی زاتی کردگار — چاکترەتا فکری عەقڵا ن، سەت هەزار (٣٧٩٦)

تەرکی مەکری خۆت کە، زوو، ئەی میر، ئەتۆش — بێرەسایەی لوتفی وی جا، بمرەخۆش (٣٧٩٧)

سەختەمەکرت جێ بەجێ کا کارو بار — تۆ لەمەکران بمرە، تا بێ ڕەستگار (٣٧٩٨)

**حیکایەتی سەدری جیهانی بوخارا کەهەرسائیلێک کەبەزبان داوای لێ کردبا هیچی نەدەدایەو ئەو زانا فەقیرەی کەلەبەر فەرامۆشی و شیددەتی حیرس و پەلەکردن بەزبان**

**داوای لێ کرد. سەدری جیهان ڕووی لێ وەر گێڕا و ئەویش هەموو ڕۆژێ حیلەیەکی تازەی دەکرد وخۆی وەک ژنان لێ دەکردوچادرەی بەسەر دادەدا، وجارو باریش خۆی وەک کوێران لێ دەکر د ڕووی خۆی دەبەست وسەدری جیهان دەی ناسی..الی اخره..**

**خولاسەی داستان ..**

سەدری جیهان حاکمی ویلایەتی بوخارا خسڵەتێکی زۆر باشی بوو،وکۆ مەکی بەفەقیران دەکرد ئەو بەڕاستی چاوو چرای نیازمەندان بوو، بەڵام چاکەکردنی خۆی بەو جوورەدەکرد کەهەموو ڕۆژێک بەیانان نیازمەندان دەبا لەسەر ڕێی وی ڕا بوەستن ونیازو ئیحتیاجی خۆیان بەزبان نەڵێن بەڵکەم بێ سەدا، ڕا وەستن تا سەدری جیهان لەوێ ڕەد دەبێ، و بەهەموویان عەتای لایق بەخۆیان بدا،و ئەگەرکەسێک بەزبان داوای لێ کردبا،لەو عەتاوبەخشیشی وی مەحرووم دەماوزیمنەن بەخشیشی هەررۆژەی مەخسووسی گرووهێک بوو، مەسەلەن، ڕۆژێک مەخسووسی نەخۆشان بوو و ڕۆژێک مەخسووسی بیوەژنان ورۆژێکیش مەخسووسی فەقیهان بەڵام دەنۆبەی هەموویان دا،سکووت وداوا نەکردن بەزبان زۆر دەقیق موراعات دەکرا، تا ڕۆژێک پیرەمێردێکی کەم حەو سەلەوقسەزان بەدەنگێکی بڵیند بەشێوەی تەڵەبکاران، بەخشیشی لەسەدر داواکرد، سەدر کەلەو ڕەفتارەناسازگارەو بێ وەختی پیرەمێرد حەیران و توو ڕەبوو بەشیوەیەکی مەسخەرەپێیکوت، با بەگیان هیچکەسەم لەتۆ بێ حەیاترنەدیوە، پیرەمێرد دەجواب داکوتی جەنابی سەدرئەتۆ لەمن بێ حەیاتری مەگەر ئەتۆ نی کەدەت هەوێ دونیاو ئاخیرەت وەدەس بێنی؟ ئەو دونیایەو تەواوی زیوەری ویت وەدەس هیناوەوئێستا دەت هەوێ بەکەمێک سەدەقەو زەکات و بەزل و بەخشیش، موڵکی ئاخیرەتیش وەدەس بێنی؟ ئێستا بڵێ بزانم ئەمن بێ حەیاترم یا ئەتۆ؟ سەدر لەجوابی پیرەمێرد پێکەنی ومالٚ وسەدەقەیێکی زۆری دایە..پیرەمێرد تەنها کەسێک بوو کەتوانی بەداوا کردنی زبانی، شتێک لەسەدر وەربگرێ،ڕۆژی دوایەنۆبەی فەقیهان بوو،فەقیهێک کەئیحتیمالەن بەپەیڕەوی لەوپیرەمێردەبەدادوفەریاد شتێکی لەسەدر داوا کرد، بەڵام نەیدایە، فەقیەکەتەسمیمی گرتبوو بەهەرجوورێک بێ لەوعەتاو بەخشیشی سەدر بەهرەمەند بێ، ڕۆژی دوایەکەو شێکی کۆنی دەپێ کرد و لەسەفی عەلیل و نەخۆشان ڕاوەستا، بەڵام ئەو چەلەش سەدر ئەوی ناسی و هیچی نەدا یە،ڕۆژێکی دیش فەقیەخۆی گۆڕی و لیباسێکی دیکەی دەبەرکرد، بەڵام ئەو چەلەش سەدر ناسی، ولەبەخشیش مەحروومی کرد، ڕۆژێکیش چادرەی ژنانی بەسەر دا دا، و دەسەفی بیوەژنان دا، دانیشت،

ئەوچەلەش ناسرا، عاقیبەت فەقیەچوو بۆ لای کفن خواز، ودەگەڵ وی قەرارێکی دانا کەدەلبادێکی وەرپێچێ و لەسەر ڕێی سەدری دانێ وبۆ خۆشی تەماشا بکا، تا لەعەتاو بەخشیشی سەدر هەرچی وەدەستی کەوت پێکەوەبەشی بکەن وەختێک کەسەدر بەوێ دا ڕۆی، بەو خەیاڵەکەجەنازەیەکی بێ کەس لەعەرزی ماوەتەوە، زێڕێکی هاویشتەسەر،وی، فەقیەلەوترسەکەکفن خواز، زووترزێڕی سەدر هەلگرێ و هیچ بەوی نەدا، فەو رەن دەستی لەژێر لباد هینایەدەر و زێڕی سەدری هەلگرت و سەری لەعەرزی بلیندکردوکوتی دیتت کەعاقیبەت لێم ئەستاندی؟سەدرکوتی تا نەمردی نەت برد ..

ئیوخارا یەک نەفەر بوو، گەو رەمیر — خەسلەت و خووی بوو گەلێک باش،گەڵ فەقیر (٣٧٩٩)

ئەو بەداد و بەخشیشی زۆر بێ ژمار — تا کو شەو دەیکرد لەزێڕی خۆی نیسار (٣٨٠٠)

دایدەنا نێو کاغەزان زێڕ ئەوکیبا — ڕانەوەستا قەت لەبەخشیش تا ژیبا (٣٨٠١)

چەشنی ڕۆژو چەشنی مانگی ڕوون و جوان — قەت نەیان کرد کەس لەنوور، بێ بەش ئەوان (٣٨٠٢)

کێ بەخاکی داوەزێڕ، غەیری هەتاو — زێڕ لەوی، نێو مەعدەنەو، گەنج نێو خەراو (٣٨٠٣)

جا بەیانان لەو دەبوون عام موستەفید — تا نەبێ لەو هیچ گرووهێک نائومید (٣٨٠٤)

بۆ نەخۆشان ڕۆژەکی بوو ئەو عەتا — ڕۆژەکیش بیوان، سەهیم بوون لەو سەخا (٣٨٠٥)

ڕۆژەکیش مەخسووسی ساداتی نەدار — گەڵ فەقیهانی فەقیر، مەشغووڵ بەکار (٣٨٠٦)

ڕۆژەکی دیش بۆنیبازمەندانی عام — ڕۆژەکی دیش بۆ گرفتارانی وام (٣٨٠٧)

ولی قەرار دانا بوو، ئەو سەدری جیهان — کەس بەئەزمان لێی نەوێتن زێڕ، چ ئان (٣٨٠٨)

ڕادەوەستان جا لەسەر ڕێگایی وی — بێ سەدا ئاواتییان ئیعتایی وی (٣٨٠٩)

هەرکەسێ کردبای بە ئەزمان لەو سوواڵ — نەیدەبرد بەو جورمە ئەو، یەک زەڕڕە ماڵ (٣٨١٠)

هەرچی خامووش با، دەبوو ئەو ڕەستگار — ئەو بەخامووشان دەیکرد زێڕ نیسار (٣٨١١)

ئەزقەزا ڕۆژێک کوتی یەک شەخسی پیر — پێم زەکات دەنا تەوانم هەم فەقیر (٣٨١٢)

چی نەدا پیر، پیر بەجید داوای دەکرد — مان عەجەب عالەم کەپیر هەر وای دەکرد (٣٨١٣)

دەیکوت ئەی پیر، بێ حەیای زۆر چونکەوای — پیر کوتی تۆ زێدەتر خۆ، بێ حەیای (٣٨١٤)

ئەو جیهانەت خوارد و دەت وێ، ئێستەتۆ — ئەو جیهانی دیش بێنیەدەستەخۆ (٣٨١٥)

پێکەنی جا ماڵی زۆری دا، بەپیر — پیر بەتەنها ماڵی وای بوو، دەستگیر (٣٨١٦)

غەیری ئەوپیر نەیدەگرت لەو هیچ گەدا — ماڵی دونیای گەر بەئەزمان ویستبا (٣٨١٧)

ماوەیەک پاش هات فەقیهان، نۆ بەیان — یەک فەقیهی باتەمەع، کردی فیغان (٣٨١٨)

چـــی نەهاتـــەدەس بـــەناڵین و فیغـــان	زۆر وتـاری کـوت نـەیان بـوو سـوود ئـەوان (۸۱۹
ڕۆژی دوایەئـەو بـەکۆنان پـای دەبەسـت	نێو نەخۆشان سەر نەوی، بێ دەنگ و هەست (۸۲۰
ساقی خۆی بەست ئەو بەچەندین تەختەدار	تـــا نیشـــان دا، لاق شـــکاوەو،دەردەدار (۸۲۱
میـر ئـەوی ناسـی و هیچـی پـێ نـەدا	ڕۆژی پاشـان ئـەو لـەڕووی خـۆی، مەغنـەدا (۸۲۲
ئەوچەلـەش ناسـی، ئـەمیر چـی بـەو نـەدا	چونکەویستی خـۆی، بەئـەزمان کـرد، ئـەدا (۸۲۳
چونکـەعاجزبوو لەگشـت مـەکری زەمـان	چـا درێکـی خستەسـەر خـۆی، وەک ژنـان (۸۲۴
چـــوو جلووســـی کـــرد لـــەنێو بیوەژنـــان	جا سەری خۆی کرد نەوی و، دوو دەس نیهان (۸۲۵
ئـەو چەلـەش ناسـی و، نەیـدا بـەوچ مـاڵ	جـا بـەحیرمان قـەلبی سـووتا، وەک زوغـاڵ (۸۲۶
چـوو بـەیانێک لای کـەفن خوازێـک، کـەتۆ	دامبنـێ سـەر ڕێ کـەپێچات لـێم، پـەتۆ (۸۲۷
دابنیشـــەجا، بنـــۆڕە، بـــێ ســـەدا	تـا دەچـێ سـەدری جیهـان بـەو ڕێگـەدا (۸۲۸
بەڵکـەپێی وابـێ کەمـەیتم لێـرە، مـن	زێـڕ بهـاوێ، سـەر جـەنازەم، بـۆ کفـن (۸۲۹
پێت دەدەم نیوەی ئـەوەی دای، ئـەو ئـەمیر	جـا وەهـای کـرد ئـەو کـەفن خـوازی فـەقیر (۸۳۰
نێـو پـەتۆ پێچـای و داینـا جـا، لـەڕێ	مەعبـەری سـەدری جیهـان جـا کەوتـەوێ (۸۳۱
وای کـەدی میـر، زێـڕی زۆری خستەسـەر	زێـر پـەتۆ زوو دەسـتی خـۆی هێنایـەدەر (۸۳۲
تـا نـەباتن ئـەو کـەفن خـواز، ئـەو عـەتا	ون نـەکا، جـا، زێـڕی سـەر وی، لـەو هـەتا (۸۳۳
هـەردوو دەسـتی ژێـر پـەتۆ، هێنایـەدەر	جـا لـەدووی دەسـتیش بڵینـدی کـرد سـەر (۸۳۴
ڕوو ی لەمیر کرد، خۆ لەتۆم ئەستان، نیعـەم	ئـەی ئـەتۆ بەسـتت لـەمن دەرکـی کـەرەم (۸۳۵
پێیـدەکوت تـا تـۆ نـەمردی ئـەی عـەنوود	نەت دەکەوتەدەس لـەمن خۆ، تۆ، چ سوود (۸۳۶
ڕازی (موتـــوا قبـــل مـــوت)، ئـــەی بـــرا	پاشـی مـردن دێـن گـەلێک زۆر ئاشـکرا (۸۳۷
غـەیری مـردن هـیچ فـەزڵ و هـیچ هونـەر	لای خـودا نیتـی ئەسـەر، ئـەی حیلـەگـەر (۸۳۸
ســـەت لەکۆشـــیش چـــاترەلوتفی ئـــیلاە	چونکەکۆشیش هـەیتی سـەت ڕێگـای تـەباه (۸۳۹
لوتفی حەق ئەو دەم دێ،گەرکو، بێ مـەمات	ئیمتیحانیـــان کـــرد ئـــەو ڕێگـــا، ســـیقات (۸۴۰
مردنیشـــــیان دێ بـــــەلوتفی کردگـــــار	تـۆ فەقـەت بـەو لوتفـە، بـت بـێ، ئیعتیبـار (۸۴۱
چەشنی زومڕود لوتف ونەفسیش ماری پیر	کـوا بـەبێ زومـڕود دەبێـتن مـار زەریـر (۸۴۲

**داستانی ئەو دوو برایەی کەیەکیان کۆسەبوو و یەکیان ئەمرەد(مێر منداڵ ) بوو لەعەزەب خانەیەک نوستن، ئەزقەزا شەوێک ئەمرەد خشتەی زۆر لـەدەوری مەقعـەدی خـۆی کـۆ کردەوەعاقیبەت لیوات کار ویستی عەمەلی فەساد ئەنجام بدا، ئەو خشتانەی بـەئارامی**

**ویەنەرمی لەپشتەوەی وی وەلا بردن، ئەو مێر منداڵە، وەخەبەرهات و دەستی کرد بەجنێو دان کەخشتەکان کوان؟ بۆ کوێت بردن؟ وبۆ چیت بردن؟کابرای لیوات کار کوتی ئەتۆ ئەو خشتانەت بۆ داناون الی اخره..**

**خولاسەی داستان ..**

دوو برای کەم تەمەن چوونەخانەقایەک کە مەخسووسی ئەفرادی بێ ژن بوو، یەکێک لەو دوو برایانەزۆر ساف و جوان بوو فەقەت چەند دانەمووی لەدەرەوەی چەنەگەی هاتبوونەدەر، بەڵام برایەکەی دی سووڕەتێکی زۆر نا حەزی بوو، بەڵام هیچ موو لەسووڕەت شین نەببوو، مەعموولەن بەوی ئەووەڵی دەڵێن کۆسەو بەدووەمی دەڵێن ئەمرەد، ئەفرادی بەدکاری خانەقا هەردەگەڵکو ئەو دوو مێر منداڵەیان دیتن تەماعیان دەمێر منداڵەئەمرەدەکەکرد،و تەوەججوهێکیان بەکۆسەنەکرد، چونکەچەند دەنکەموو کەلەدەورەی چەنەی وی شین ببون هەیئەتێکی پیاوانەی بۆ وی ساز کردبوو، ئەمرەد کەلەنەزەری ئەفرادی خەرابکار ئیتتیلاعی بوو، بۆ ئیحتیات و محکەم کاری دەو رەی خۆی بەخشتان چنی .. یەکێک لەلیوات کاران کەلەبەر هەیەجانی شەهوەت لەئەووەڵی شەو وەخەبەربوو،وردەوردەبەئەسپایی بۆ لای چوو، ویەک یەک خشتەکانی وەلانان،جا دەگەڵکو ویستی کەدەست بەکار بێ، ئەمرەد لەجێ ڕاپەڕی ودادو فەریاد و جنێودانی دەست پێ کرد، لەو بەینەدا ئیشارەی بەبرا کۆسەکەی خۆی کرد و بەحەسرەت کوتی ئەوەبەخاتر چەند دەنکەمووی کەلەدەوری چەنەی شین بوونەلەسووئی قەستی ئەفرادی ناباب وخیلافکار نەجاتی بوو، بەڕاستی چەند دەنکەموویەک لەحەساری ساز کراو بەخشتی من ئەمنییەت ساز کەر ترە..

| | | |
|---|---|---|
| کۆسەیەک گەڵ ئەمرەدێکی جارەکی | چوون لەبۆ نێو مەحفیلێکی شارەکی | (٣٨٤٣) |
| عیددەیەک مەشغووڵی سوحبەت بوون، لەوێ | ڕۆژ دەڕۆیشت و دەچوو سولسی شەوێ | (٣٨٤٤) |
| نێو عەزەب خانەدەمان جا ئەو دوو کەس | هەر لەوێش نوستن لەبەر بیمی عەسەس | (٣٨٤٥) |
| سەرچەنەی ئەوکۆسەبوو بەس چوار موو | ئەو بەڵام بووی چەشنی مانگی چاردەڕوو | (٣٨٤٦) |
| ئەمرەدیش بووزۆر بەسووڕەت ناڵەبار | دایدەنا پشت قوونی خۆی، خشت، پێنج و چوار | (٣٨٤٧) |
| لۆتییەک چۆ لای بەشەو، بێ دەنگ و هەست | لای دەبردن خشتەئەو شەهوەت پەرەست | (٣٨٤٨) |
| ڕاپەڕی، لێیدا کە ئەو بەدکارەدەست | پێیدەکوت کێی؟بێژەئەی شەهوەت پەرەست | (٣٨٤٩) |
| پێیدەکوت چۆن کۆت وەکرد خشت سی عەدەد؟ | پێیدەکوت لات نان چلۆن ئەی پەستی بەد؟ | (٣٨٥٠) |
| مـن منـاڵێکم نـەخۆش و ناتـەوان | بۆ خەوم ئێرەم ئەمن دی، جێی ئەمان | (٣٨٥١) |

پێیدەکوت گەرکو نەخۆش و حاڵ بەدی     بۆ شەفا خانەنەچووی بۆچی ئەدی؟ (۳۸۵۲

یا نەچووی لای یەک تەبیبی میهرەبان     تا کودەرمان کا، لەبۆ ت دەردی گران (۳۸۵۳

پێیدەکوت ئاخر چلۆن بۆ وێ بڕۆم؟     خۆ منی بێچارەبۆ هەرجێ بڕۆم (۳۸۵۴

کافرێکی پەستی وەک تۆ نابەکار     دێ لەسەر ڕێگایی من، دەگرێ قەرار (۳۸۵۵

خانەقا کە، چاکترین جێ یەو مەکان     لەحزەیەک نەمبوو لەوێ، ئەمن ئەمان (۳۸۵۶

عیددەیەک شەهوەت پەرەست و زگ پەرەست     وردەوردەدێنەلای من کیر بەدەست (۳۸۵۷

سۆفییەک زاهیر،کەئیستیحیا دەکا     دەس بەکیر دادێنێ، ئیستیمنا دەکا (۳۸۵۸

خانەقا وابێ ئەدی بازاری عام     چۆن دەبێ؟ وەک کەر گەل و شەیتانی خام (۳۸۵۹

کوادەزانێ هیچ کەرێک تەقوا چییە؟     کوا دەزانێ کەر، کەبیم لەخوا چییە؟ (۳۸۶۰

عەقڵەعەدڵ و ئیمەنی پەیدا دەکا     گەر عەقڵ مەوجوود نەبێ،کێ وادەکا؟ (۳۸۶۱

گەر هەڵێم من جا، بڕۆم بۆ لای ژنان     چەشنی یوو سوف دەچمەچاڵی ئیفتینان (۳۸۶۲

ژن کەیووسوفیان دەبەند خست و فشار     ئێ وەکوو من سەت کەڕەت دەیدەن لەدار (۳۸۶۳

دێنەلام جا ئەو ژنانەی هیچ نەزان     قەو م وکەسیان دێن دەکەن لێم، قەستی گیان (۳۸۶۴

نیمەچارەمن لەپیاوان و ژنان     چی بکەم من؟نیمەمن هیچ یەک لەوان (۳۸۶۵

دوایەئەو منداڵ، دەکۆسەی چاو بڕی     چاو، بەوان دوو موو، ڕەگی ڕەنجی بڕی (۳۸۶۶

ئەو لەخشتی پشتی نیتی خۆ، چ باک     هەم لەتۆی نامەردی پیسی جندەداک (۳۸۶۷

سەر چەنەی وی،چوار مووی، بەس بۆ نموون     چاکترن تا سی عەدەد خشت، دەوری قوون (۳۸۶۸

زەڕڕەیەک سایە، لەلوتفی کردگار     چاکترەتا کۆششیش وتاعەت هەزار (۳۸۶۹

چونکەشەیتان خشتی تاعەت ڕا دەکا     ڕێ لەنێو خشتان لەبۆ خۆی چا دەکا (۳۸۷۰

خشت کەزۆرن دانراوی تۆن ئەوان     ئەو دوو سێ موو، بەخشیش و ئیعتای خودان (۳۸۷۱

چەشنی کێوی زۆرعەزیمن ئەو مووان     وەک ئەمان نامەی شەهەنشاهی جیهان (۳۸۷۲

گەر لەدەرکێک دەی سەدان قفڵی گران     لەت دەکا هەموان زەعیفێک ناتەوان (۳۸۷۳

مۆر لەدەرکێک دا بەمێو، گەرپاسەوان     نەتوانێ دەس لەوێ دا، پاڵەوان (۳۸۷۴

چەشنی کێون ئەو دوو سێ مووی، سەر چەنە     سەد دەکەن دێو، چەشنی نووری چیهرەنە (۳۸۷۵

دەوری خۆت ئەی پاک نێژاد خشت دامەنێ     ترسی شەیتانیش لەدڵ خۆت، لا مەنێ (۳۸۷۶

دوو عەدەد لەو مووی کەرەم، پەیدا کە، تۆ     ئەو دەمی ڕاحەت بنوو، ئەی کاکە، تۆ (۳۸۷۷

خەو لەبۆ عالیم لەتاعەت زۆر، لەسەر     گەر بکا بەو عیلمەئەو، ئاگا، بەشەر (۳۸۷۸

گەر سکوون کا، نێو مەلە، زانای مەلە  زۆر لەوەی چاتر، نەزان، بێ بێ، پەلە (٣٨٧٩)

تا بەڵەد، خنکا کەکردی زۆر تەلاش  سابیحی ساکین، دەچی وەک دار بەواش (٣٨٨٠)

عیلم ودانیش چەشنی دەریای بێ کەنار  عیلم و دانیش خواز، غەوواسی بیحار (٣٨٨١)

گەر کو دانیش خواز، هەزار ساڵ عومرکات  تێر کەنابێ ئەو لەجستو جۆ، چ کات (٣٨٨٢)

وێی لەبۆمان کرد، ڕەسوولی خوا، بەیان  دوو تەمەعکار هەن، کەتێر نا بن، چ ئان (٣٨٨٣)

**تەفسیری ئەو حەدیسەکەپێغەمبەر (صلوات الله علیه) فەرمووی .. (منهومان لا یشبعان طا لب العلم و طالب الدنیا )..کەئەو عیلمەعیلمی غەیری دونیایەتا ببێتەدوو قیسمەت و عیلمی دونیا هەردونیایەوئەگەرلەوعیلمەعیلمی دو نیا ئیرادەبکرێ تیکراری غەیری موراد ئستینبات دەکرێ نەتەقسیم کەبەیان کراوەچون دەبێتە (طالب الدنیا وطالب الدنیا ) ..**

تالیبی دونیا و هەرچی جوانی وی  تالیبی زانست و ئەندیشانی وی (٣٨٨٤)

گەرکو، لەو تەقسیمەتۆ بێ زۆر دەقیق  غەیری دونیا خۆ، مورادەئەی ڕەفیق (٣٨٨٥)

غەیر ی دونیا یەعنی ئاخیر ئەی فلان  عیلمی ئاخیر پێت دەدا، ڕێی باش نیشان (٣٨٨٦)

**گفتو گۆی ئەو سێ شازادەلەبارەی چارەی ئەو واقیعە..**

کردیان ڕوو لێکتری ئەو سێ عەشیق  دەردو غەمیان موشتەرەک بوو، ئەی ڕەفیق (٣٨٨٧)

یەک غەم و فیکرو خەیاڵیان بوو ئەوان  هەرسێ کەسیان بوون بەیەک غەم ناتەوان (٣٨٨٨)

وەختی خامووش بوون فیکری وان،یەکێ  وەختی بەحس و گفتو گۆ،بوورهان، یەکێ (٣٨٨٩)

یەک زەمان گریان و شینیان بوو بەکار  ئەشکی خوێنینیان لەچاو دەڕژایەخوار (٣٨٩٠)

یەک زەمان دڵیان ئەوان سێ، زۆر حەزین  ئاهی وان ئەو دەم دەهات بێ حەد، بەتین (٣٨٩١)

**قسەو وتاری برا گەو رە..**

ئەو برا گەورەکوتی بەو دوو برا  پەندی زۆر مان دا بەعالەم ئاشکرا (٣٨٩٢)

تۆکەران شاکی کەبان لامان چ جار  بۆ بەلاو خەوف و پەرێشی و ئیفتیقار (٣٨٩٣)

ئێمەدەن کوت نەت بێ بۆ ناڵین هەوەس  چون کلیلی شادمانی سەبرەبەس (٣٨٩٤)

کوا ئەدی ئێستا کلیلی حەو سەلە  یا مەگەر مەنسووخەقانوون، ئەو چەلە؟ (٣٨٩٥)

تەن دەکوت نێو ئاگری دەردی زیاد؟  چەشنی زێڕ تۆ پێکەنە خۆشحاڵ و شاد (٣٨٩٦)

ولن بەلەشکر کرد نەسیحەت وەختی جەنگ  تێک مەدەن حاڵتان،مەگۆڕن ئێوەڕەنگ (٣٨٩٧)

ئەو دەمەی فەرشن لەژێر لاقی فەرەس ئەو سەرانەی وان لەمەیدان، بێ نەفەس

لەشکری خۆمان دەکەین تەشویق وەها بچنەپێش بێ ترس و بێ پەروا هەتا

سەبرمان نیشان بەعام دا نەک پەلە چون چراو نووری دڵانە، حەو سەلە

بۆ سەبووری نۆبەمانە، واش کەنین وەک ژنانی پیس لەژێر چارشێو دەژین

ئەی دڵەی کردت عمووم ئومێد وار تۆش ئومێدت بێ و لەخۆت بە، شەرمەزار

نسحەتت کرد ئەی زەبان عالەم بەعام ئێستەنۆ بەی خۆتەبۆ ناڵەی کەلام؟

ئەی عەقڵ کوا پەندی بێ حەد جوانی تۆ؟ نۆبەتە،کوا گفتی بێ نۆقسانی تۆ؟

ئەی لەقەلبان لات دەبرد تەشویش ئەتۆ نۆبەتە، جا، تۆ تەکان دەریشی خۆ

گەر بەنامەردیت دزی تۆ ریشی خۆ مەسخەرەت کرد زۆر لەپێشدا، خۆت ئەتۆ

وەختی پەندی خەڵکی دی، غەوغای دەکەی وەک ژنان وەختی غەمان،وای وای، دەکەی

تۆ دەوا بۆ دەردی عالەم بووی ئەدی لاڵ دەبی، بۆ، رەنج و دەردی خۆت،کەدی؟

بانگی ئیرشاداتی تۆ بوو، سازی تۆ بۆ لەسەرخۆت نایەهیچ ئاوازی تۆ

تۆ، بەپەنجاساڵ وەدەستنت، خست وتار لەو وتانەئێستەبۆ خۆت بێنەکار

بەو نەوای ئیرشاد، شادت کرد یار بەو نەوا، تۆش شادکەخۆت ئەی هووشیار

تۆ،کەرەهبەربووی مەبە، پەیرەو، چ جار خوار مەکەخۆت، توکەبووت زۆر ئیقتیدار

نۆ بەتی بازیتەخۆ،ئێستاکەتۆ تەبعی خۆش و شاد، لەبۆ خۆت، چاکەتۆ

**باسی ئەو پاشایەکەئەوزانایەی بەزۆر هینا لەمەجلیس داینا و ساقی شەرابی بۆ ئەو زانایەهینا وشەرابی بۆ راگرت، رووی وەرگێراو تووڕەبوو شا بەساقی کوت خۆشحاڵی کە، ساقی چەند مستێکی لەسەری دا، وشەرابی دەرخوارد دا ..الی اخرە..**

**خولاسەی داستان ..**

پاشایەک بەزمێکی تەشکیل دابوو، فەقیهێک بە دەو رو بەری وێ دا دەرۆیشت، پاشا بەمەئموورانی خۆی دەستوور دا کەئەو فەقیهەبێننەنێو ئەو بەزمە، جا شەرابی وەدەست بدەن مەئموران چوون بەراکێش راکێش ئەو یان هینا نێو بەزمی شایانە،لەئەووەڵەوەشەرابیان بۆ هینا بەڵام زۆر بەتووڕەیی قەبوو لی نەکرد، وکوتی دەتەواوی توولی عومرم دالێوم لەشەرا ب نەداوە وئەسڵەن ژەهری کوشەندەلەلای من زۆر لەشەرابی ئێوەچاکترە، لەو کاتەدا شا بەساقی ئیشارەیەکی مەخسووسی کرد و کوتی ئەوی خۆشحاڵ بکە، ساقی لەئیشارەی شا، ئاگادار بوو.

فەورەن چەند مستێکی لەسەرو سوورەتی فەقیەدا، ولەپاشان جامی شەرابی وەدەس دا،ئەو بەناچار شەرابەکەی خواردەوە،وبەمەستی چۆ دەستشۆیی ئەزقەزاکەنیزێکی زۆرجوانی لەوێ دی،وچونکەشەهوەت لەسەروی غالب بوو ئەوکەنیزەی دەباوەش گرت،وشا وەختێک دیتی کە فەقیە تەئخیر بوو ودوای کەوت و ئەو سەحنەی دیت، زۆر تووڕە بوو فەقیە فەورەن ڕاپەڕی و هەڵات و هاتەنێو بەزم، وشەرابێکی قەوی تری خواردەوە، شای زۆر تووڕەکەدەی ویست ئەو فەقیهە، ئەزیەت بکا،بەحاڵەتێکی غەیرەعادی هاتەمەجلیس، شەخسی بەزاهیرفەقیەکەشای زۆر تووڕەدی بانگی ساقی کرد کەئەی ساقی، شا خۆشحاڵ بکە، شا لەحازر جوابی ونوکتەسەنجی وی پێکەنین گرتبووی نەتەنها ئەوی موجازات نەکرد، بەڵکەکەنیزەکەشی دا بەوی ..

| | | |
|---|---|---|
| مەست بوو نێو مەجلیسێک، یەک شەهریار | کەوتەلای وێ، ڕێی فەقیهێک ڕێبووار | (٣٩١٤) |
| وای دەدا، فەرمان، بڕۆن ئەو بێننەژوور | پێی بنۆشن لەو شەرابی جوانی سوور | (٣٩١٥) |
| جا دەیان هینا بەزۆر، لای شەهریار | دادەنیشت زۆر ترش و تاڵ، وەک ژەهری مار | (٣٩١٦) |
| ساقی مەی هینا لەبۆی ئەو، تووڕەبوو | هەم لەساقی هەم لەشای سووڕاند ڕوو | (٣٩١٧) |
| قەت شەرابم مەن نەچۆتەنێو زار | لەو شەرابەخۆشترەلام،ژەهری مار | (٣٩١٨) |
| زار لەباتی ئەو مەیە، بێنن لەبۆم | تا خەلاسین بێت، ئێوەو، خۆم، لەخۆم | (٣٩١٩) |
| عەربەدەو غەو غای دەکرد، ئەو بێ شەراب | ئەو لەبۆ مەجلیس ببوو، دەردو عەزاب | (٣٩٢٠) |
| وەک دەگەڵ ساحەبدڵێک بن هاونشین | عیددەیەک دونیا تەڵەب غافڵ لەدین | (٣٩٢١) |
| لەو شەرابی پاکی ئازادان، دەدا | زۆر بەپنهانی، بەدۆستی خۆی، خودا | (٣٩٢٢) |
| دۆست بەمەحجووبان دەکاتن عەرزە، جام | تێدەگا مەحجووب لەو جام بەس، کەلام | (٣٩٢٣) |
| ڕێ نموونی وی لەلای وان، ناتەواو | بەخشیشی وی چونکەنابینن بەچاو | (٣٩٢٤) |
| گەر لەگوێی وان ڕێ هەبا، تا گیان و ڕووح | بێ گومان مەقبووڵ دەبوو،پەندی نەسووح | (٣٩٢٥) |
| چونکەگیانی وان نارە، خۆ، نەنوور | پێستەلایق بوو بەسووتان، نێو تەنوور | (٣٩٢٦) |
| پێست دەڕوات و دەمێنی بەس مەغز | قەت بەپێستان مەعدە نابێ خۆ، نەغز | (٣٩٢٧) |
| ناری دووزەخ بەس دەدا پێستان فشار | نار بەمەغزو کاکڵان نیتی، چ کار | ٣٩٢٨ |
| گەرکو مەغزێک بێتەسەر نار،جارو بار | بۆ کوڵانە، نەک لەبەرسووتان بەنار | (٣٩٢٩) |
| تا هەبێتن حوکمی زاتی کردگار | ڕێی و شوێنی وا، دەبێتن پایەدار | (٣٩٣٠) |
| جوانەمەغزو، پێست بەوی دەی بێ نەجات | چۆن خودا ئەو مەغزەجوانە،گڕ دەدات؟ | (٣٩٣١) |

گەر سەری وی دا، وەبەر بەردان، خودا    بۆ شەرابی سوور دەی بێ ئیشتیها (۳۲)

لێی نەدا گەر، ئەو دەمێنێ بەستەزار    وەک فەقیەلەو شوڕب و بەزمی شەهریار (۳۳)

شا بەساقی کوت کەتۆ ئەی باش خیساڵ    ئەو فەقیهەشادمان کەو، خۆشحاڵ (۳۴)

حاکمێک هەس، بۆ هەموو عەقڵان نیهان    ئەو دەکا عەقڵان،قەوی، هەم ناتەوان (۳۵)

ئەو هەتاوی مەشریق و تەنویری وی    وەک ئەسیران وان، لەژێر زەنجیری وی (۳۶)

نیو، فسوون نێو مەغزی ئەفلاک دا، قەرار    هەڵدەسووڕێن جێ بەجێ، دێوانەوار (۳۷)

عەقڵ گەر عەقڵێکی ژێر فەرمان هەیە    قودرەتی لەو حاکمی پنهان هەیە (۳۸)

چەند مستی دا،لەسەر، دەی بگرەزوو    ئەو لەترسی مستی دی، خواردی هەموو (۳۹)

مەست بوو جا چەشنی باغ خەندان و شاد    دەستی کردەمەسخەرەو شۆخی زیاد (۴۰)

شادمان بوو، بشکەنی جا، لێدەدا    ڕووی دەکردەموستەڕاح، میز کا، هەتا (۴۱)

ئەزقەزا، نێو موستەڕاح بوو یەک کەنیز    ئەو کەنیزی شابوو، جوان، وەک مانگ تەمیز (۴۲)

هەرکەدیتی، ئاوەڵای کرد لێوو، زار    لای نەما ئەو، خۆ، چ هۆش و ئیختییار (۴۳)

ئەو کەدائیم بوو عەزەب موشتاق و مەست    زوو کەنیزی خستەباوەش خۆی، بەدەست (۴۴)

بۆ نەجاتی خۆی کەنیز کردی تەلاش    دادو هاوارو تەقەللای بوو، بەلاش (۴۵)

ژن بەدەس پیاوان، لەئەوقاتی ئەوا    وەک هەویر وایە، بەدەستی نانەوا (۴۶)

جار بەنەرمی، جار شەدید، ئەو، و ەر،د ەدا    لەو هەویر، دێ، ئەودەمی جق جق سەدا (۴۷)

جا رلەسەر یەک تەختەدار، ئەو پان دەکا    جار ئەوی خڕ، هەر وەکوو تۆپان دەکا (۴۸)

جار دەڕێژێتن دەوی ئاو، جار نەمەک    بۆی دەکا تەندوورو ئاگر، ئەو مەحەک (۴۹)

پێکترین وابەستەمەتلووب و تەلووب    وان خەریک بەو بازی، مەغلووب و غەلووب (۵۰)

بەس لەبۆ شوو وژن نییەئەو بازییە    هەر عەشیق و عاشقێک، داخوازییە (۵۱)

بۆ قەدیم و حادیس و عەین و عەرەز    ئیرتیبات وەک وەیس و ڕامین،موفتەرەز (۵۲)

بازییان لێکتر جودان ئەمما ئەوان    مەرتەبەو شەئن و مەقامیان لێک جودان (۵۳)

بۆمیسالم من ژن و شوو کرد، بەیان    تۆ، نەدەی ئازاری ژن، ئەی شوو، چ ئان (۵۴)

بۆ ئەمانەت نەیدەنا دەس تۆ مەگەر؟    دەستی بووک، بەر بووکی خۆش قەو ل و نەزەر (۵۵)

چی دەگەڵ وی تۆ بکەی، ئەی موعتەمەد    خوا دەگەڵ تۆ، وا دەکا باش، یانە، بەد (۵۶)

ئەو فەقیهەچون لەهۆش چوو، بوو بەمەست    عیففەت و تەقواوو، دینی چوو لەدەست (۵۷)

زوو کەنیزی خستەژێر خۆی توندو تۆڵ    ئاگری وی کەوتەپەنبەی نەرم و نۆڵ (۵۸)

گیان وەگیان کەوت و بەدەن پڕ تین وتاو پڕ تەقەللا، چەشنی تەیری سەر بڕاو (٣٩٥٩)
جام چییە؟پاشا چییە؟ یان ئەڕسەلان؟ ئابڕووی چی؟دین چییە؟یاترسی گیان؟ (٣٩٦٠)
چلوی وان ئەو دەم دەبوو، جا، واخومار نەی دەدی لێکتر جودا، ئەغیار و یار (٣٩٦١)
زۆر لەدەسشووئی فەقیەبوو، ماندگار ئینتیزاری زیاد لەحەد بوو، شەهریار (٣٩٦٢)
شەهریار هات تا ببینێ واقیعە دی دەوێ دا،زەلزەلەی،(القارعە) (٣٩٦٣)
ئەو فەقیە، هەستا لەبیم، ڕۆی، یەک نەفەس چوو دە مەجلیس جامی مەی جا،گرتەدەس (٣٩٦٤)
وەک جەهەندەم پڕ لەنار بوو شەهریار ئارەزووی بوو خوێنی ئەودوو، نا بەکار (٣٩٦٥)
گەر فەقیەدی، پڕ لەقار، ڕووی شەهریار تاڵ و خوێناوی بەچەشنی ژاری مار (٣٩٦٦)
بانگی ساقی کرد کەئەی ساقی وەرە زوو بەیەک جام شاد کەتۆ،ئەو سەروەرە (٣٩٦٧)
پێکەنی شا، جاکوتی بەو، ئەی شەریف شاد بووم دام پێت ئەو کیژەی لەتیف (٣٩٦٨)
پادشام و عەدڵەبەس خۆ، کاری من ژیم بەوەی، چون ژی بەجوودم، یاری من (٣٩٦٩)
ئەو شتەی نەی خۆمەوە،زۆر شادو خۆش ئەو بەیار نادەم کەبخوا، هەم بەتۆش (٣٩٧٠)
من دەدەم دەر خواردی ژێر دەستانی خۆم چی ئەمن دەی خۆم لەسفرەو خوانی خۆم (٣٩٧١)
من دەدەم خۆراک بەگشت بەندانی خۆم لەو غەزایەی من لەسەر سفرەم دەخۆم (٣٩٧٢)
چی دەبەر خۆ م کەم خەزو ئەتڵەس، لیباس من غولامم بەو دەپۆشم، نەک پەلاس (٣٩٧٣)
من حەیامەلەو نەبێ، دەیکوت ئەگەر بیخەبەر وان،چیت لەبۆ خۆ، کردەبەر (٣٩٧٤)
وای دەدا فەرمان ڕەسوولی خۆش ئەدا لێک مەکەن خۆراکی خۆو، ژێر دەس، جودا (٣٩٧٥)
ئێوەخەڵک و شادمان کرد زۆردروست بوون لەنسحەت ئێوە، زۆر چالاک و چوست (٣٩٧٦)
شاد کەخۆشت، بێنەبۆ خۆشت، سروور پێشەوای خۆت کە، ئەتۆ، عەقڵی سەبوور (٣٩٧٧)
تۆ کەسەبری ڕەهبەرت، بۆت بێتەباڵ ئەوجی عەرش و ئەو جی کورسیت دەبنەماڵ (٣٩٧٨)
موستەفا چاو، چونکەسەبری بوو، بوڕاق موستەفای برد، تاکو ژێر پای نا، تیباق (٣٩٧٩)

**وەرێ کەوتنی شازادان پاش تەواو بوونی بەحس و ماجەڕا، بۆ لای مەملەکەتی چین، بۆلای مەعشووق ومەقسوود تا بەئەندازەی ئیمکان نیزیکتر بن ..ئەگەرچی ڕێگای وەسڵ بەستەبێ بەئەندازەی ئیمکان نیزیک بوون پەسەندیدەیە.. الی اخرە..**

چوونەلای چین دوایەجا ئەو سێ برا سەر نویشتیان ئەو دەمی،دیاری کرا (٣٩٨٠)
بوون بەسیدیق چونکەسادق بوو ن ئەوان بۆ وڵاتی چین دەبوون، ئەو دەم ڕەوان (٣٩٨١)
دایک و باب و موڵکییان لانا کەنار چوون لەبۆلای ئەو عەشیقی نادیار (٣٩٨٢)

چەشنی ئیبراهیمی ئەدهەم بوون، لەتەخت | چوون بەعیشقی خۆ،لەبۆ لای ژینی سەخت (٣٩٨٣
چەشنی ئیبراهیمی مورسەل،شادمان | چوون لەبۆ نێو ئاگرێکی بێ ئەمان (٣٩٨٤
چەشنی ئیسماعیل سەبوورو میهرەبان | هەرسێ ملیان بردەژێر تیغی دەبان (٣٩٨٥

**حیکایەتی ئیمروئولقەیس کەپاشای عەرەب بوو، سووڕەتێکی زۆر جوانی هەبوو، ویووسوفی زەمانی خۆی بوو، وژنانی عەرەب وەک زولیخا تالیبی وی بوون و ئەو تەبعی شاعیری هەبوو.. ( قفا نبک من ذکری حبیب ومنزل ) چون تەواوی ژنان ئەویان بەگیان و دڵ دەویست .. ئەی عەجەب ئەو ئامو نالەی وی لەبەرچی بوو؟ ڕەنگەحاڵی بووبێ کەتەواوی ئەو سووڕەتانەی زاهیری چەند نەقشێکن لەسەخاک کێشراون .عاقیبەت بۆ ئیمروئولقەیس حاڵەتێک هاتەپێش کەبەنیوەشەو ماڵ و منداڵ و سەڵتەنەتی بەجێ هێشت وخۆی دەنێو کۆنەلیباسێک دا پنهان کرد و لەو ئیقلیمەچۆ ئیقلیمەکی دی، بەجستوجۆی کەسێک کەنیازی بەئیقلیم نییە(یختص برحمته من یشاء) الی اخره..**

**خولاسەی داستان ..**

ئیمروئولقەیس شاعرێکی زۆر جوان بوو، وەختێک کەبەعیشقی حەقیقی گەیشت لەماڵ و قودرەت و ئەشرافییەت بێزار بوو، ونیوەشەوێک بەلیباسی کۆنەو دڕاو،زیندەگی خۆش و پڕ ئاسایشی خۆی، بەجێ هێشت، ئەو چۆ مەملەکەتی ڕۆم لەمەنتەقەی تەبووک مەشغووڵی کاری خشت لێدان بوو، تا بەڕەنجی دەست و ئارەقەی نێو چاوان ڕۆژگار تێپەڕ کا،کاتێک کەپاشای ڕۆم خەبەرداربوو، کەئمروئولقەیس هاتۆتەئەومەنتەقەیەوخەریکی خشت لێدانەبەشەو چوو بۆ دیدەنی وی وزۆربەئیحتیرام لەوی ویست کەدەولاتی ژێر دەسەلاتی وی دا وەک شایان زیندەگی بکا، لەوکاتەدابوو کەئیمروئولقەیس سرتەیەکی دەگەڵ کرد، پاشای ڕۆم لەناکاو گۆڕا،و دەستی دەدەستی وی نا، وتەخت و سەڵتەنەتی بەجێ هێشت و دەگەڵ وی چۆ جێگا یەکی زۆر دوور و لیباسی فەقرو دەروێشی دەبەرخۆی کرد ..

ئیمروئولقەیسی دەکرد، بێزار لەژین | پێی بەجێ هێشت خاکی نێو ئەعراب، ئەوین (٣٩٨٦
هات و خشتەی لێدەدا ن ئەو، لای تەبووک | پێی دەکوترا شا،کەئێکێکیان ملووک (٣٩٨٧
ئیمروئولقەیس، هاتووە، بۆ کەسب وکار | لێدەدا خشتان، ئەوین کردی شکار (٣٩٨٨
شەو لەبۆ لای وی دەچوو، ئەو شەهریار | پێیدەکوت ئەی شاهی ڕوو جوان، بێ قەرار (٣٩٨٩
یووسوفی وەختی بەدووجوور ئەی ئەمیر | هەم شەهەنشای هەم لەجوانی بێ نەزیر (٣٩٩٠

پیلو موتیعی تۆن لەبەر شەمشیر و تیر — ژن بەجوانی بێ نەزیری ڕووت، ئەسیر (٣٩٩١)

خۆشەبۆمان گەر بمێنی تۆ، لەلان — گیان لەوەسڵی تۆ دەبێتن سەت گیان (٣٩٩٢)

هەم ئەمن هەم مولکی من، مەملووکی تۆ — ئەی بەهیممەت سەڵتەنەت مەترووکی تۆ (٣٩٩٣)

ئەو خەمووش بوو، شاش بۆی کوت زۆر وتار — سیرڕو ڕازی کرد، لەناکاو ئاشکار (٣٩٩٤)

چی بەسرتەکوت بەگوێی ئەوشەهریار — تاکو، وەک خۆی کرد ئەویش، وێڵی دیار (٣٩٩٥)

دەستی وی گرت و دەگەڵ وی بوو بەیار — جا ئەویش جێی هێشت مولک و ئیقتیدار (٣٩٩٦)

جا بەجێ یان هێشت ئەو دووشا، وڵات — زۆر کەرەت کردی ئەوین، وا کارەسات (٣٩٩٧)

بۆ منالان شیرە، بۆ گەوران عەسەل — ئەو دەکاتن کەشتی حامیل خۆی فەشەل (٣٩٩٨)

ئەو دووشایەو زۆر ملووکی بێ ژمار — بوون لەبەر عیشق و ئەوینیان، تارومار (٣٩٩٩)

گیانی ئەو سێ بەچکەشا،جا، دەوری چین — چەشنی تەیران بوون، لەهەرلا، دانەچین (٤٠٠٠)

قەولی دڵیان هیچ نەوێران بێننەدەر — چونکەڕازیان زۆر عەزیم بوو، پڕ خەتەر (٤٠٠١)

سەت هەزار سەر، نیو پەشیز، نین، ئەو زەمان — عیشقی توورەگەر بنێ تیر نێو کەمان (٤٠٠٢)

گیان بەبێ پەروا، ئەوین دەگرێ ئەگەر — قەهرو کینەی هیچ نەبێتن، ئەو لەسەر (٤٠٠٣)

وەختی ڕازی بوون دەکووژێ وا ئەوین — چی دەبێ ئاخۆ، کەهەبێ، قەهرو کین؟ (٤٠٠٤)

گیان فیدای ئەو عیشقی چەشنی شێر، قەوی — چون دەکووژێ عیشق، هەم شەمشیری وی (٤٠٠٥)

کوشتنی وا چاترەتا زیندەگی — سەت هەزارشا، بن فیدای ئەو بەندەگی (٤٠٠٦)

جا دەگەڵ خۆیان دەکوت ئارام وتار — چون دەترسان زۆر لەخەڵکی ئەو دیار (٤٠٠٧)

غەیری خوا بۆ ڕاز نەبوو مەحرەم،چ کەس — غەیری ئاسمان نەی بوو،ئاە، هەمدەم، چ کەس (٤٠٠٨)

ئیستیلاحی خاس دەکەن عارف، بەیان — تا لەوەزع و حاڵ خەبەر دار بن،ئەوان (٤٠٠٩)

فێر دەبوون عالەم لەئەزمانی تیوور — جا دەیان کرد جەم،لەبۆ خۆیان غروور (٤٠١٠)

وەک سەداو ئاوازی تەیرەئەو کەلام — کوا دەزانێ حاڵی تەیران پیاوی خام؟ (٤٠١١)

کوا سولەیمانێک بزانێ گفتی تەیر؟ — دێو ئەگەر چی پاتشاش بێ، غەیرە، غەیر (٤٠١٢)

دێو بەسوورەت وەک سولەیمان بوو، بەشا — عیلمی مەکری بوو، و(علمنا ) کەنا (٤٠١٣)

چون سولەیمان بوو بەیەزدان خۆش و شاد — گفتی تەیری دا بەوی یەزدان یاد (٤٠١٤)

زلهیرت بابێ موراد، تۆ لەو تیوور — چون لەتەیری ( من لدن ) بوو زۆر بەدوور (٤٠١٥)

جێگەبۆ سیمورغ بوو، ئەولایی قاف — خۆ خەیاڵان گشت کەنابن دەست باف (٤٠١٦)

بەس خەیاڵێک وایە، دی، ئەو ئیتتیفاق — پاش عەیان جا، پێش دەهات بۆ ئیفتیراق (٤٠١٧)

نەک فیراقی دائیمی بەل، مەسڵەحەت    چون لەفیرقەت بوو مەسوون، ئەو مەنقەبەت ۱۸)

تا بمێنێ ئەو تەنەی ڕووحانییە    چارەتەنها جارو بار، پنهانییە ۱۹)

بۆگییانت تۆ لەوان بت وێ، سەلاح    تۆ لەگفتی وان مەدزە، ئیستیلاح ۲۰)

لای زولەیخا، نێوی یوو سوف بوو پەسەند    بۆ هەموو شت، جا، چ عوود با، یا سپەند ۲۱)

نێوی وی، نێو نێوی دی مەکتووم کرد    ئەو سوڕەی بۆ مەحرەمان مەعلووم کرد ۲۲)

ئەو کەکوتبای مێو، بەئاگر نەرم بوو    وای مەرام بوو، یار دەگەڵمان گەرم بوو ۲۳)

ئەو کەکوتبای مانگ لەئاسۆ، هاتەدەر    یا کەدار زۆر سەو زو شین بوو، پڕ لەبەر ۲۴)

ئەو کەکوتبای خۆش دەرەقسن بەرگی دار    یا کەکوتبای خۆش دەسووت،ئیسپەند، بەنار ۲۵)

ئەو کەکوتبای گوڵ بەبولبول ڕازی کوت    شا، هەموو ڕازی لەبۆ شانازی کوت ۲۶)

ئەوکەکوتبای بەختەبێ حەد بەختەوەر    هەڵپەڕن شاد ی بکەن بێ هیچ کەسەر ۲۷)

ئەوکەکوتبای ئاوودەر، هینای ئاو    ئەو کەکوتبای دەرکەوت لەسوێ، هەتاو ۲۸)

ئەو کەکوتبای چاک کولا، دوێ شەو غەزا    بوو کوڵاندن گشت غەزا بوون، جێی ڕەزا ۲۹)

ئەوکەکوتبای نان هەموو بوون بێ نەمەک    یا بەمەعکووسی دەسوو ڕێتن فەلەک ۳۰)

ئەو کەکەکوتبای زۆربەئێشەمن سەرم    یا بەئێشی سەر ئەمن زۆر خۆشترم ۳۱)

ئەو لەگفتی خۆش مورادی بوو عیناق    ئەو لەگفتی بەد مورادی بوو فیراق ۳۲)

گەر بەیانی کردبا ئەو نام، هەزار    غەیری یووسوف نەیدەبوو مەقسوود، چ جار ۳۳)

گەر کو برسی باوو، کوتبای نامی وی    ئەو دەبووتێر زێدە، مەستی جامی وی ۳۴)

نێوی هاتبا تونیەتی ساکین دەبوو    نێوی یوو سوف شەربەتی باتین دەبوو ۳۵)

ئەو دەمەی دەردی لەبۆ پەیدا دەبوو    نێوی یووسوف هاتبا، زوو چا دەبوو ۳۶)

وەختی سەرما نێوی وی دەیدایەتین    وەایەکاری نێوی یار، وەختی ئەوین ۲۷)

گەر کۆ بێنن خەڵکی نێوی خوایی پاک    دوورلەسوودەگەر نەبێتن عیشقناک ۳۸)

چی لەبۆ عیسا دەهینا نێوی (هوو)    واش لەنێوی خۆی ئەسەر پەیدا دەبوو ۳۹)

موتتەسیل بێتن بەیەزدان گەر گییان    زیکری وان دوو،هەریەکن،نەک لێک جییان ۴۰)

گیان لەخۆی خاڵی دەبێ و، پڕ عیشقی یار    چی دەگوزەی دا، دەبێ ئەو ئاشکار ۴۱)

زەعفەرانی وەسڵی بۆن دا، پێکەنین    بۆنی پیوازی فیراقی دا، گرین ۴۲)

یەک یەکەی ئەفراد هەیانەسەت موراد    وانییەئەمما تەریقی عیشق و داد ۴۳)

تاو لەڕووی یار بوو، وەری گرت ڕەو شەنی    تاو حیجاب بۆ عاشقانە، ئەی سەنی - ۴۴)

هـەرچی نـەی ناسـی حیجـابی ڕوویـی یـار  بو ت پەرەستە، خۆ ت لـەوی کە، بەرکـەنار (٤٠٤٥)

ڕۆژمەـــەم ڕزقـــی هـــەموو عوششـــاقەئەو  هـــەم دلّـــە، هـــەم دلّبـــەرێکی تاقەئـــەو (٤٠٤٦)

ـــلو بەتـــەنهائی لـــەبۆ گشـــت ماســـییان  هـــەم دەواو خـــەو، هـــەم لیباســـەوئاوو، نـــان (٤٠٤٧)

ـیر لەمـەمکی دایکـی دەخـوا وەک منـاڵ  غـەیری شیر، بۆی ناموشـەخخەس، وەزع و حـاڵ (٤٠٤٨)

ـۆ منـــاڵ مەعلوومەهـــەم مەجهوولەشـــیر  لاقـــی عـــەقڵان لێـــرەدا کردوویـــەگیر (٤٠٤٩)

ـــەو تەلەســـمە،کردنی ڕووح گێـــژو مـــات  فـــاتیح و مـــەفتووح هـــەتا پەیـــدا بکـــات (٤٠٥٠)

گێـــژ کـــەنایێ ئـــەو لـــەڕێگای کردگـــار  حـــامیلی وی، یـــەم، نەســـەیل و جۆییبـــار (٤٠٥١)

ـــەو حـــەقی گـــەر دیـــت ناپەیـــدادەبێ  چەشـــنی ســـێڵاو غـــەرقی نێـــو دەریـــادەبێ (٤٠٥٢)

ـتـــە ون بـــێ، ئـــەو دەمـــی هـــەنجیر دەبـــێ  تـا نـەمردووی، کـوا تـەلات، دەسگیر دەبێ؟ (٤٠٥٣)

**پاش مانەوەی وان بەنهێنی لەپایتەختی وڵاتی چین وزۆر سەبرکردنی وان، وبێ سەبر بوونی براگەورەکەئەمن ڕۆیشتم تابچمەلای شای چین، (خوا حافیز )...( اما قدمی تنیلنی مقصودی/ او الفی راسی کفوئا دی ثمه)) یا پای رساندم به مقصود و مراد - یا سر بنهم همچــو دل ازدســت ا نجــا ).. وبــێ فایــدەبوونی نەســیحەت وپەنــد دان بــەو بــرا گەورمتەومسسوتی برایەکانی خۆی .. الی اخره**

یا عازل العاشقین دع فئه    اضلها الله کیف ترشدها ..

جـا کـوتی ئەوگـەورە، ئـەی ئیخـوانی مـن  ئینتیـزار هینـای هـەتا لێـو، گیـانی مـن (٤٠٥٤)

لا ابـــالی) بوومەســـەبرم بـــوو فـــەنا  ئـەو سـەبووریەی مـن، منـی نێـو نـار دەنـا (٤٠٥٥)

ـەتی مـــن لـــەو ســـەبووریەم تـــاق بـــوو  واقیعـــەی مـــن، عیبرەتـــی عوششـــاق بـــوو (٤٠٥٦)

تێـر لـــەگیانم بوومـــەمن وەختـــی فیـــراق  وەختـــی فیرقـــەت زینـــدەگی یـــانی نیفـــاق (٤٠٥٧)

چەنـــدەدەگرێ فیرقـــەتی وی گیـــان لـــێم؟  ببڕەســـەر، تـــاکو ئـــەوین ســـەر، دات پـــێم (٤٠٥٨)

مەزهـەبی مـن ژیـن لـەڕێی عیشـق و ئـەوین  نەنگـەبۆم لـەو گیـان و سـەر، بـم بێـت،ژین (٤٠٥٩)

تیـــغ لـــەگیانی عاشـــقان تـــۆز لادەبـــا  چـون دەدا شەمشـیر، هـەموو جورمـان بـەبا (٤٠٦٠)

گـەر لەتـەن لاچـێ غوبـار، مانـگ دێتـەدەر  مـــانگی گیـــانم هـــیچ تـــەمی، نـــابێ لەبـــەر (٤٠٦١)

من لەتـەپڵی عیشقی ڕووی تـۆ ئـەی سـەنەم  ( ان فـــی قتلـــی حیـــاتی ) لێـــدەدەم (٤٠٦٢)

مـوددەعی بـۆ تـەیری ئـاوی بوونـە، گیـان  کـەی لـەتووفانی بـەڵا، دەی بـێ فیغـان؟ (٤٠٦٣)

بـــۆ مـــراوی گەرشـــکا کەشـــتی، چ غـــەم  کەشـــتییەبۆ وی کـــەدا ینـــا ئـــاو، قـــەدەم (٤٠٦٤)

زیندووەبەو ئیددیعا گیا ن و تەنم — چۆن ئەمن لەو ئیددیعا گیان هەڵقەنم؟ (۴۰۶۵)

خەو، دەبینم خۆ بەڵام من نیم لەخەو — موددەعیم من،خۆ بەڵام ناڵێم درەو (۴۰۶۶)

سەت کەڕەت گەر لێوەکەی تۆ گەردنەم — جار لەجار چاتر ئەمن، هەر ڕەوشەنم (۴۰۶۷)

گەر بەکوللی ئاگری بگرێ خەیان — خەرمەنی ئەو مانگ بەسە، بۆ شەو ڕەوان (۴۰۶۸)

کردیان یووسوف نیهان و موختەبی — حیلەتی ئیخوان، لەیەعقووبی نەبی (۴۰۶۹)

زۆر بەفێڵان کردیان یوو سوف نیهان — عاقیبەت بۆنی کراس،کردی عەیان (۴۰۷۰)

جا دەیان کوت بەو برا، ئەو دووی، دەدی — بۆ بەڵا و ئەختا ر، نەکەی خۆت مورتەدی (۴۰۷۱)

سەر برینمان دامەنێ جا، تۆ نەمەک — تۆ مەخۆ ئەو ژار، بەتەڕدید و بەشەک (۴۰۷۲)

ڕێ نموونت بێ کەچووی، شێخێک خەبیر — چونکەنیتەتۆ دەڵێک بیناو بەسیر (۴۰۷۳)

وای بەحاڵ، تەیرێک کەلێی نەڕواوەباڵ — ئەو کەبفڕێ، تێکدەچێ، لەو، وەزع و حاڵ (۴۰۷۴)

عەقڵی ئینسان باڵە، بۆ پەروازی وی — بێ عەقڵ، عاقڵ بێ، با، دەمسازی وی (۴۰۷۵)

یا موزەففەر، یا موزەففەر خواز بە — یانەچاو وازخواز،یا چاو، واز بە (۴۰۷۶)

بێ کلیلی عەقڵ و فام، ئەو قەرعی باب — هەر هەوایە، خۆ نەکارێکە، سەواب (۴۰۷۷)

عالەمی گیردا، لەنێو داو دا، هەوا — هەم برین و زەخمی زۆری وەک دەوا (۴۰۷۸)

ڕادەوەستێ، بێ سەدا، سەر سینگ مار — دادەنێ نێو زار،گەڵای جوان، بۆ شکار (۴۰۷۹)

نێوگیایان وەک گیا، سەر پایەئەو — جا پەڕەندەش وادەزانێ، گیایە، ئەو (۴۰۸۰)

گەر لەبۆ خواردن بنیشێ سەرگەڵا — دێتەزاری مردن و مارو بەڵا (۴۰۸۱)

زار دەکا تیمساح گەلێک جاران واز — نێو ددانی هەن گەلێک کرمی دراز (۴۰۸۲)

جا لەخۆراکی کەماوە نێو ددان — چا دەبوو ن کرمان، لەسەر دەندان، دەمان (۴۰۸۳)

گەر پەڕەندان دیتییان کرم و غەزا — چیمەنەتیمساحیان، ئەو دەم، لەلا (۴۰۸۴)

گەر بەتەیران زاری پڕ بوو، ئەو دەمی — قووت دەدا هەموان، لەناکاو، بێ کەمی (۴۰۸۵)

ئەو جیهانەی پڕ ژن و نۆغڵ ونەبات — چەشنی زاری وازی تیمساح بێ، لەلات (۴۰۸۶)

ئەی ئەوەی خۆراک وکرمت بوومراد — مەکری تیمساحی زەمانت، بێ، لەیاد (۴۰۸۷)

خۆی بەپشت نێو خاک دەکا، ڕێوی نیهان — جا دەڕێژێتن لەسەر ئەوخاکەدان (۴۰۸۸)

زاغی غافڵ تاکو بێ، بۆ لایی دان — لاقی وی بگرێ بەفێڵ، ئەو فێڵەزان (۴۰۸۹)

سەت هەزاران حیلەیان هەس جانەوەر — چۆنەمەکری ئەشرەفی عالەم، بەشەر؟ (۴۰۹۰)

پاک بەزاهیر چەشنی زەینولعابدین — خەنجەری پڕ کینی ناوەئاستین (۴۰۹۱)

دیتەلات خەندان و شاد ئەو چەشنی یار — ئەو لەباتین ئەژدیهایە پڕ لە ژار (۴۰۹۲)

ئەو لەباتین سەم، بەزاهیر شەهدو شیر — تۆ مەڕۆ بێ سوحبەتی پیری خەبیر (۴۰۹۳)

عەززەتی نەفسی هەموو، هەرمەکر و زەرق — دێ و،دەسووتێنێت و، دەڕوا،چەشنی بەرق (۴۰۹۴)

بەرقی نوور زۆر کورتەهەم کیزبەو مەجاز — زۆر لەدووی دێن زوڵمەتان، ڕێی تۆش دراز (۴۰۹۵)

خوێندنی نامەبەنووری وی، محاڵ — مەرکەبت بەو نووره قەت ناتباتەماڵ (۴۰۹۶)

تۆ بەڵام بەو جورمەچون بووی ڕەهنی بەرق — دادەپۆشێ ڕوو لەتۆ ئەنواری شەرق (۴۰۹۷)

مەکری بەرقت تۆ دەکێشێ بێ دەلیل — شەو لەسەحرای موزلیم و تار، میل بەمیل (۴۰۹۸)

جار دەکەویەشاخ و جارجار جۆیبار — تۆ دەکەویەگشت ئەتراف و کەنار (۴۰۹۹)

کوا دەبینی تۆ دەلیل ئەی باغروور — گەر بشی بینی،دەکەی لەو خۆت بەدوور (۴۱۰۰)

ئەو دەڵێ لەورێگەچووم من شەست میل — هێستەمن گومڕا دەزانێتن، دەلیل (۴۱۰۱)

گەر بەموڕشید گوێ بدەم ئەو جارەمن — لازمەلەو ڕێ بڕۆم، دوو بارەمن (۴۱۰۲)

عومری خۆم داناوەلەو ڕێگایەخۆ — تۆ بەبێ باک هەر بەتەنهایی بڕۆ (۴۱۰۳)

زۆر چەلان ڕێچوون بەزەنێک چەشنی بەرق — ڕێ بڕۆجارجاربەوەحیەک،چەشنی شەرق (۴۱۰۴)

گەرچی خوێندت زەننی (لایغنی) لەحەق — شەرقی حەققت تۆ نەویست،بەل بەرقی لەق (۴۱۰۵)

یا بەکەشتی ئیمەوەسڵی کە،گەمیت — یا لەنێو ئەو کەشتییەی مەت، جێگەبیت (۴۱۰۶)

جا دەڵێ ئەو، چۆن لەدەس دەم ئیعتیبار؟ — چۆن لەدووت بم چەشنی کوێرێک کۆڵەوار؟ (۴۱۰۷)

چاکەکوێر هەی بێت ڕەهبەر بۆ گوزەر — تاکو کەمتر، بۆی پەیابێ، دەردەسەر (۴۱۰۸)

دەچیەلای عەقرەب لەبەر پێشکێکی کەم — تۆ لەترسی نەم دەچی بۆ لایی یەم (۴۱۰۹)

تۆ دەکەی گەر ڕەنجی بابت دی، فیرار؟ — دەچیەنێو ئەفرادی لوتی و نابەکار؟ (۴۱۱۰)

چەشنی یوو سوف تۆ لەبەر غەم ڕادەکەی — دەچیەچاڵ، (نلعب) کەچی داوا دەکەی (۴۱۱۱)

دەچیەچاڵ وەک وی کەهیوات شادییە — تۆ بەڵام وەک ویت عینایەت، لا نییە (۴۱۱۲)

گەر ئیجازەی باب نەبا، بۆ ئەو سەفەر — نەی دەهینا دەر، لەچاڵ تاحەشر سەر (۴۱۱۳)

باب بەخاتر قەلبی وی ئیزنی دەدا — پێیدەکوت چون خۆشەلات، یاربێ خودا (۴۱۱۴)

کوێر کەلای نا، بۆ کەنار عیسای زەمان — ئەو دەمێنێ بێ هیدایەت وەک جووان (۴۱۱۵)

گەرچی کوێر بوو هەیبوو ئیستیعدادی نوور — بۆیەکوێر بوو چونکەعیسای خستەدوور (۴۱۱۶)

پێدەڵێ عیسا بەمن، تۆ بگرەدەس — کوحلی عیززەت لای منە، ئەی کوێری خەس (۴۱۱۷)

گەرچی کوێری، تۆ بەمن بینا دەبی — بۆ کراسی یووسوفی گیان، ساحەبی (۴۱۱۸)

کارو باری تۆ کەباش بێ، پاش فەساد    بەس لەبەر ئیقباڵ و مینهاجەو، ڕەشاد (۴۱۱۹)

وێڵ کەئەو کارەی کەنیتی پاوو، سەر    بگرەدەستت تۆ بەپیر، ئەی پیرەکەر (۴۱۲۰)

غەیری پیر هیچ نینەئوستادو ئەمیر    پیری گەردوون، نا، بەڵام پیری مونیر (۴۱۲۱)

گەربێ، بۆپیر پەیڕەو، بێ گومان    ڕوون دەبێ چاوی دڵی وی ئەو زەمان (۴۱۲۲)

شەرتەتەسلیم بوون لەبۆ پیر نەک تەلاش    نێو زەلالەت، جەهدوکۆشیش بوو ن بەلاش (۴۱۲۳)

من لەوەی پاش بۆ مەقام نابم ئەسیر    ویست و قەست و ئارەزووی من، پیرە، پیر (۴۱۲۴)

پیرە،تەنها نەردەبانی ئاسمان    تیر بەکام شت دێتەپەرواز؟، بەس کەمان (۴۱۲۵)

بۆ سەما، نەی کرد سەفەر، نەمرووود، مەگەر؟    تا بەکەرکەس، ئەو لەئاسمان بچتەسەر (۴۱۲۶)

زۆر لەبۆ لای سەر دەچوو، نەمروودی خام    کەرکەسان، نافڕن لەسەر ئاسمان بەڵام (۴۱۲۷)

وای خەلیلوڵڵا، بەوی کوت ئەی فڵان    چاکترەمن، کەرکەست بم، بێ گومان (۴۱۲۸)

گەرلەمن چاکەی لەبۆ خۆت نەردەبان    تۆ دەچی بێ هەڵفڕین، بۆ ئاسمان (۴۱۲۹)

هەر وەکوو دەڕوا، هەتاکو غەڕب و شەڕق    بێ وەسیلەو بێ غەزا، دڵ، چەشنی بەڕق (۴۱۳۰)

یا وەکوو ئەو حیسسی ئینسانان بەشەو    دەچتەشاخ و دەشت و شاران، وەختی خەو (۴۱۳۱)

یا وەکوو عارف لەڕێگای نادیار    نشتەجێ، دەڕواتەسەت شارو دیار (۴۱۳۲)

حاڵەتی وای گەر نەبێ عارف ئەدی    ئەو هەموو ئەخباری دونیای، چۆنە،دی؟ (۴۱۳۳)

بۆ ئەوان ئەخبارو گوفتاری موحیق    سەت هەزاران زێدەپیر بوون موتتەفیق (۴۱۳۴)

ئەهلی دین بۆ دین نەیان بوو ئیختیلاف    وەک دەبێ بۆ ئەهلی عیلمی زەن خیلاف (۴۱۳۵)

عیلمی زەن وەک جستو جۆ نێو لەیلی تار    عیلمی دین وەک کەعبە، بێ، ئاشکار نەهار (۴۱۳۶)

هەستەئەی نەمروود،کەباڵت ویست وەسان    نەردەبان نابن لەبۆ تۆ، کەرکەسان (۴۱۳۷)

عەقڵی جوزئی چەشنی کەرکەس ئەی نەزار    بۆ کەلاک خواردن دێ، بەس، باڵی بەکار (۴۱۳۸)

عەقڵی پاکان چەشنی باڵی جەبڕەئیل    تا کو سایەی سیدرە،دەڕوا، میل بەمیل (۴۱۳۹)

بازی شام خۆشخوومەجوانم،زێدەزۆر    دوورلەجیفەم،کەرکەسیش نیم، لاشخۆر (۴۱۴۰)

وێڵ کە،کەرکەس، من دەبم قەو م و کەست    یەک پەڕم چاکتر،لەدوو سەت کەرکەست (۴۱۴۱)

بۆ بەکوێری تۆ، دەبەی ئەسپت بەغار؟    دەیهەوێ کەسپ و هونەر، ئوستاد کار (۴۱۴۲)

خۆت لەچین بێچارەهەم ڕیسوا مەکە    عاقڵێک پەیداکە، لەو خۆت جیا مەکە (۴۱۴۳)

هەرچی بیڵێ ئەو فەلاتوونی زەمان    بەو عەمەل کە، گوێ مەدە، نەفست، چ ئان (۴۱۴۴)

خەڵکی چین، تێکڕادەڵێن زۆر زۆر، بەجید    شەهریارو سەر وەری مە، (لم یلد ) (۴۱۴۵)

تەهرياری ئێمەنيتی هيچ مناڵ — نايهەوێ ئەو، هيچ ژنێكی بێ، لەپاڵ (٤١٤٦)

گەر لەشاهان يەك نەفەركوتباى وەها — جێ بەجێ دەيكرد بەتيغ سەرلەو جودا (٤١٤٧)

تلـ دڵی جا چۆن كوتت تۆ ئەومەقاڵ — تۆ دەبێ سابيت بكەی بۆ من عەيال (٤١٤٨)

گەرتۆ سابيت كەی لەبۆ من كيژی من — سەر دەكەی مەحفووز لەتيغی تيژی من (٤١٤٩)

خۆ دەنا دەبڕم سەری تۆ بێ گومان — دەر دەخەم دەڵقت لەبەر سۆفی گيان (٤١٥٠)

ئەی درۆزن ئەی كەزووبی نالەبار — سەر دەكەی گەڵ تيغی من، هەموار و يار (٤١٥١)

ئەی ئەوەی كردت بەناحەق چەن وتار — چاو لەخەندەك، سەر لەوێن، بێ تەن، هەزار (٤١٥٢)

خەندەكێكی هەرلەبن، تاليو و، زار — پڕ سەری بڕياو، بەگفتی نالەبار (٤١٥٣)

چون خەريك بوون گشتيان بەو ئيدديعا — بۆيەسەريان دا هەموو، تێكڕا، بە، با (٤١٥٤)

تۆ بنۆڕەلەو بەچاوی ئيعتيبار — ئيدديعای وات تۆ نەبێ، قەت قەت، چ جار (٤١٥٥)

ئەی برا، ژينمان دەكەی وەك كەكرە، تاڵ — كێ بەتۆی دا، ئينتيخاب، ئەو جوورەحاڵ (٤١٥٦)

چەشنی كوێر بڕوات سەت ساڵ بێ خەبەر — بۆی حيساب ناكرێ، بەڕێ، دەڕوا هەدەر (٤١٥٧)

بێ سيلاح تۆ قەت مەڕۆ نێو مەعرەكە — چەشنی بێ باكان مەڕۆ نێو تەهلوكە (٤١٥٨)

پێشی ئەو گفتان كوتی ئەی ناسەبوور — لەو وتەو گفتانە، بێ حەددم، نەفوورر (٤١٥٩)

بوو بەمەنقەڵ، سينەيی پڕئاگرم — گەيوە، زەڕعم، داس وەدەستم، باگرم (٤١٦٠)

سينەسەبری بوو بەڵام ئێستاكەنا — جێی سەبووری، عيشق، ناری دادەنا (٤١٦١)

سەبری من مرد، گەر ئەوينم هاتەجۆش — من كەسەبرم چوو، نەما، مرد، ئێوەخۆش (٤١٦٢)

ئەی ئەوەی پەندم دەدەی لەيل و نەهار — دوور لەنەفع و سوودەبۆم، پەندو وتار (٤١٦٣)

سەر نيگوونم وێڵ كەتۆ، جا پايی من — زەڕڕەيەك، وشيار نين، ئەجزايی من (٤١٦٤)

تا تەوان بێ، بار دەبەم، من وشترم — گەر كو كەوتم،زار، بەكوشتن خۆشترم (٤١٦٥)

پڕ سەری لێكراوەبن، خەندەك هەزار — خۆ لەحاستی دەردی من بوون، يەك قومار (٤١٦٦)

تا زە، لێ نادەم لەوەی پاش قەت بەبيم — تەپڵی عيشقی خۆم لەبن لێفەو گليم (٤١٦٧)

دەمهەوێ كارێك بكەم من ئاشكار — يادەچێ سەر،يا دەبينم ڕوويی يار (٤١٦٨)

ئەو گەرووی لايق نەبێتن بەو شەراب — چاكترەببڕێ، بەشەمشيری عەزاب (٤١٦٩)

چاو بەوەسڵی وی نەبێ گەرشادمان — چاوی وا، كوێر بێت، چاتر، بێ گومان (٤١٧٠)

گەر نەبێ گوێی لايقی ئەسراڕی وی — لێوەبێ با، سەر نەبێ ژێر باری وی (٤١٧١)

دەس كەسەرمايەی ئەوينی لا نەبێ — چاكترەئەو لەت بەلەت بێ، با نەبێ (٤١٧٢)

پــێ ئەگــەر بــاعیس نــەبێ، ڕەفتــاری وی — گیــان ببــێ واســیل بــەنێرگس زاری وی (۴۱۷۳)

لایقــی زەنجیــرە، پــێ، وا، بــێ، ئەگــەر — عاقیبــەت دێنێــت،پێی وا، دەردەســەر (۴۱۷۴)

**دەبارەی ئەو تەلاشگەرەی کەدەست لەتەلا ش هەلناگرێ ئەگەرچی دەزانێ کەلوتف و بەخشیشی خودا لەڕێگایەکی دیکەمەقسوودی وی حاسڵ دەکا، هەرچەند کەئەو ڕێگایەی دەخەیاڵ دا نەبووە، و فەقەت بەڕێگای موعەییەن ئومێدوار بووە، فەقەت ئاڵقەی ئەو دەرکەی لێدەدا، و ڕەنگەخوداوەند لەڕێگایەکی دیکەرزق و ڕۆزی بەو بدا، کەدەخەیاڵی دا نەبووە(ویرزقەمن حیث لا یحتسب) (العبد یدبرواللەیقدر ) وڕەنگەبەندەخەیاڵ بکا کەهەرچەند ئەمن لەو دەرکەدەدەم لەدەرکێکی دیکەڕزقی من بگا .. خوداوەندیش لەو دەرکەڕزقی وی بدا .. خولاسە.. تەواوی ئەو دەرکانەدەرکی یەک ساختمانن ...مع تقریرە..**

یانەلــەو دەرکەمــەڕامی مــن دەگــات — یانــەوەک بــاز، دێمــەوە، بــۆ لای وڵات (۴۱۷۵)

ڕەنگەخواستەم، بێتەدەس، وەختی سەفەر — دوورنییەدەســتم کــەوێ وەختــی حــەزەر (۴۱۷۶)

زۆر بەجیــد،من یــاری خــۆم داوا دەکــەم — تــا دەزانــم نــایێ، واکــەم، وا دەکــەم (۴۱۷۷)

ئەومەعییەت کوا لـەگوێم دەگـرێ قـەرار؟ — تــا نــەبینم گشــت زەمــان و ڕۆژگــار (۴۱۷۸)

کوا دەکەم من لەو مەعییەت فەهمی ڕاز؟ — گــەر نەکــەم ئەســفاری زۆر دوورو دراز (۴۱۷۹)

خـوا کـوتی گـەڵ ئێوەمەو،قـەلبی دەبەسـت — بەس لەیەزدان کار دەدەن، مەتلووب بەدەست (۴۱۸۰)

گـەرکو زۆری کـرد سـالیک، بـاش سـەفەر — قەلبی وی نـای بێت هیچ مۆرێـک لەسـەر (۴۱۸۱)

وەک خـەتا ئـەین، لـەو حیسـابی باسـەفا — ڕوون دەبــێ مەتڵــەب لەپاشــی دوو خــەتا (۴۱۸۲)

جـا دەڵـێ گـەر ئـەو مەعییـەت بـا عـەیان — نەم دەکرد من جستو جۆی وی قەت، چ ئان (۴۱۸۳)

ئـەو دەبـێ مـەعلووم ئەگـەر بێـتن سـەفەر — ئـەو عــەیان نــایێ، بــەزۆر تیــژی فیکــەر (۴۱۸۴)

وەک ئـەدای ئـەو قـەرزی شـێخی وامـدار — چونکەیــــەک منــــداڵ گریـــا، زار زار (۴۱۸۵)

یـەک منـاڵ هـەڵوا فـرۆش شـینگێڕ بـوو — کـۆ وەبــوو، بـۆ شـێخ وامــی وی هــەموو (۴۱۸۶)

بــاس کــرا ئــەو داســتانەی مەعنــەوی — زۆر لــەوەی پـێش، نێـو وتـاری مەسـنەوی (۴۱۸۷)

خــوا لەجێیــەک تــرس و بیمــت پێــدەدا — تــا نــەیێ بۆتــۆ ئومێــد، غــەیری خــودا (۴۱۸۸)

نێــو ئومێــد داینــاوە خــوا، فائیــدەیــێ — ئــەو مــورادی تــۆ لــەئێکیدیکــە دێ (۴۱۸۹)

ئـەی ئـەوەی بـووی زۆر شـەدید ئوممێـد وار — دێــن لــەبۆم لــەو داری زۆر عــالی سـیمار (۴۱۹۰)

ئـەو ئومێـدەت تـۆ لـەوێ، دەس ناکـەوێ — بەڵکەجێیـەک، دیکەهـەس، بـۆت دێ لـەوێ (۴۱۹۱)

ئەو ئومێدەی بۆ ئەدی پێدای خودا؟ نەیدەویست گەر ئەو شتەت، لەو لا، بدا (٤١٩٢)

حیکمەتی مەنزوورە، وای کرد، کردگار تاکو قەلبیشت بەحیرەت بێ، دوچار (٤١٩٣)

تا دڵت ئەی موستەفید، حەیران بێ ئومەرامەی من، لەکام لا دەیتەجێ (٤١٩٤)

تاکو عەجزوجەهلی خۆت لێ بێ عەیان تایەقینت زێدەبێ تۆ، بۆ نیهان (٤١٩٥)

تا دڵت حەیران بێ لەو مێرغوزار چی دەوێدا شین دەکاتن کردگار (٤١٩٦)

زۆر بەخەبیاتیت هەی تۆ ئیشتیاق تا لەبۆزین تۆ، لەوی کەی، ئیرتیزاق (٤١٩٧)

رزق و رۆزیت دێ لەشوغلی زەرگەری گەرچی بوو لەو شوغڵەوەهمی تۆ، بەری (٤١٩٨)

بۆ بەخەبیاتی دەبووی ئومێد وار؟ نەیدەدا رزقت بەوی گەر کردگار (٤١٩٩)

حیکمەتێک مەوجوودەگەرکو وایەکار حوکمی وای نووسی لەپێشدا کردگار (٤٢٠٠)

تا کو حەیران بن هەموو ئەفکاری تۆ تا کو حەیران بن هەموویان، کاری تۆ (٤٢٠١)

یا دەکا من وەسڵی یاری خۆم تەلاش یا لەرێگای دی دەبم بەو شادو باش (٤٢٠٢)

موددەعی نیم کۆشیشم مەقسوود دەدات چاوەرێم تا دێ لەکام جێ، بۆم خەڵات (٤٢٠٣)

تەیری سەر لێکراوەبۆ گشت بەر،دەچێ تا لەکام لاو جێگەگیانی دەر دەچێ (٤٢٠٤)

یا موورادم دێتەدەس، من لەو خرووج یا لەبورجێک دیکەلەو،(ذات البرووج) (٤٢٠٥)

**حیکایەتی ئەو شەخسەی کەدەخەو دا پێیا نکوت ئەو سەروەتەی کەئەتۆ دەتهەوێ لەمیسر وەدەس دێ، لەوێدا لەفلان مەحەڵلەو لەفلان ماڵەدا گەنجێک هەیە، وەختێک کەهاتەمیسر نەفەرێک بەوی کوت ئەمن دەخەونم دا دیتم لەفلان مەحەڵلەی بەغدا دەفلان ماڵەدا گەنجێک هەیەنێوو، نیشانەی مەحەڵلەو ماڵی ئەوشەخسەی کوت، وئەو شەخسەحاڵی بوو کەئەگەر بەمنیان کوت کەگەنج دەمیسردایەبۆ ئەومبووکەئەمن لێم یەقین بێ کەدەبێ فەقەت لەماڵی خۆم بگەرێم وجستوجۆبکەم، بەڵام بەیەقینی ئەو گەنجەلەغەیری میسر پەیدا نابێ ..**

**خولاسەی داستان ..**

شەخسێک کەمیراتێکی زۆری وەدەس کەوتبوو و هەمووی بەهەدەردا بوو، بێ حەد موحتاج و فەقیر ببوو، فەقرو مەحرومییەت وەهای ئازار دابوو کەخالیسانەرووی دەکردەدەرگای خوداوەند وزۆر بەسۆزووزاری دەستی کردەدوعاو پارانەوە..تا شەو یێک دەخەو دا بیستی کەدەنگێک لەغەیبەوەبەوی دەڵێ کەهەرچی زووترەلەمەو تەنت کەبەغدایەبۆ میسر برۆ چونکەنیازی تۆ لەوێدا دێتەدی ئەو شەخسەبەئومێدێکی زۆر قەستی سەفەری کرد، وبۆ میسر وەرێ کەوت،

وەختێک کەگەیشتەمیسر تەواوی ئازووقەی خەڵاس بوو چونکەلەکاتی سەفەر هەمووی خەرج کردبوو، پاش ماوەیەک فیکرکردن غەیری گەدایی و سواڵ کردن هیچ چارەی نەدی، بەڵام ئەو بەحەقیقەت گەداو سواڵکەر نەبوو ورووی گەدایی وسواڵکەریشی نەبوو، عاقیبەت تەسمیمی گرت کەدەتارکایی شەو دا گەدایی بکا، تا کەس ڕووی وی نەبینێ،ئەزقەزا دەو دەمی دا مەحەللەکانی میسر بەدزو ڕێگران نا ئەمن ببووو بەحوکمی شەدیدی خەلیفەی وەخت داروغەی شارومەئمووورانی شەوگەڕمووەززەف ببوون کەعابیران دەشەو دا دەستگیر وموجازات بکەن شەخسێکی غەریب دەتارکایی شەو دا هاتەکووچەوهێنستا تەردیدی هەبوو کەئایا دەست بەگەدایی بکا؟یان نا، داروغەئەوی دی و فەورەن ئیقەی گرت، وبەبێ قسەوەبەر مست و دارانی دا، وزوو زوو پێیدەکوت .. بڵێ بزانم ڕەفیقەکانت لەکوێن؟ قەرار بوو ئەو شەو لەکوێ دزی بکەن؟ بڵێ دەی بڵێ .. شەخسی لەژێر لێدانی شەدید، بەناڵەناڵ داوای لێدەکرد کەئەمانی بدا وچیدی ئەزیەتی نەکا ..

نەعرەوو فەریاد ئەزان دەرویش خاست کەمەزەن تا مەن بگوویەم حال ڕاست ..

داروغەکەمێک دەستی ڕاگرت ونەفەسێکی تازەکردەوەوشەخسی غەریب سوێندی موغەللەزی خوارد (واللەباللە)ئەمن دزنیم و بەسەرهاتم بەو جوورەیەکەپێت دەڵێم،و ئەو دەمی حیکایەتی خەونی خۆی بۆ داروغەگێڕاوە.. داروغەکەپێی وابوو ڕاست دەڵێ، لێی یەقین بوو کەدەگەڵ شەخسێکی سا ویلکەو فەقیر حاڵ ڕوو بەڕوو بووەکەبەخاتری دیتنی خەو نێک و بەخەیاڵی پەیداکردنی گەنجێکی عەزیم لەبەغدا ڕاهاتۆتەمیسر، داروغەبەدڵسۆزیەکی تێکەڵاو بەمەسخەرەپێیکوت ئاخرمامەگیان چۆن ئەتۆ حازر بووی بەخاتری ئەو خەونەئەو هەموو ڕێگایەببڕی؟فەقیرێ! مەگەر عەقڵت لەکوێ یە؟ شەخسەن بۆ خۆم زۆرجار دەخەونم دا دیوەکەلەبەغدا لەفلان مەحەللەوفلان کووچەو فلان ماڵ،گەنجێک پنهانە، بەڵام ئەمن هیچ ئەهەممییەتم بەو خەونەنەداوە، ولەجێی خۆم تەکانم نەخواردووە، تازەئەتۆ بەدیتنی خەونێک تەرکی وەتەنت کردووە؟ عەجیب ئەوەبووکەتەواوی ئەونیشانانەی کەداروغەلەگەنجی ڕوئیایی خۆی دەیکوت موتابیق دەگەڵ ئەو نیشانانەی شەخسی غەریب بوو ..لێرەدابوو کەشەخسی غەریب موتەوەجیەبوو کەئەو گەنجەی کەبەدوای دا هاتووەلەشاری خۆی ولەماڵی خۆی دا یە، بەڵام پەیدا کردنی ئەو گەنجەوابەستەبووە،بەڕەنجی سەفەربۆ میسر وتەحەمولی ئازارو شکەنجەی داروغە،جا هەردەگەڵکو لەدەست داروغەنەجاتی بوو بۆلای بەغدا گەڕاوەوگەنجەکەی لەوجێگای کەداروغەکوتبووی پەیداکرد،وژیانێکی خۆشی پێ بردەسەر ...

یەک نەفەر میراتی گرت زۆر موڵک و ماڵ
زوو تــەواوی کــرد، مــا، ڕووت و ڕەجــاڵ (٤٢٠٦)

مــاڵ کــەمیرات بێــت، نیتــی هــیچ وەفــا
چونکــەمردوو نەیدەویســت لــەو بــێ جــودا (٤٢٠٧)

مــاڵی میــرات، بــێ قــەدر لای زۆر کەســان
بــێ عــەزابیان چونکەهاتــەنێو دەســان (٤٢٠٨)

قــەدری گیانــت بۆیــەناگری ئــەی فــڵان
چونکەموفتــەدای بــەتۆ خــوای دوو جیهــان (٤٢٠٩)

چــوون لەدەستی، نەغدو کاڵاو ماڵ، هــەموو
چەشــنی کونــدان مــاڵی وی، وێرانــەبوو (٤٢١٠)

دەیکوت ئەی حەق نیعمەتت زۆر،دان، نەمان
یــا بــەمن نیعمــەت بــدە، یــا بگرەگیــان (٤٢١١)

کەوتــەیادی حــەق کــەهیچی لا نــەما
تــۆ پــەنام دەئــەی خــودای عــەرز و ســەما (٤٢١٢)

دەیکوت ئەحمــەد چەشنی سازن موئمینان
ناڵــەیان دێ،گــەرکو خــاڵی بــن ئــەوان (٤٢١٣)

موتربیــان ناکــەن بەســازی پڕ،عەمــەل
پــڕ مەبــە، چــون، خۆشــەمیزڕابی ئــەزەل (٤٢١٤)

خۆت کەخاڵی، خۆش بە،بەینی (ا صبعین )
چون بەمەی( لا این)ە، خۆش و مەستە( این) (٤٢١٥)

ڕۆی غــرووڕو ئــاوی هاتــەخوار لــەچاو
ئــاوی چــاوی دای بــەزەڕعی دیــن، ئــاو (٤٢١٦)

**سەبەبی تەئخیری دوعای موئمین ..**

موخلیســان زۆر هــەن دەنــاڵن نێــو دوعــا
دوو کــەڵی ئیخلاســی وان، دەچتەســەما (٤٢١٧)

تــا دەچــێ بــۆ ژوور ئاســمانی بــەرین
بــۆنی ئاگر،لــەو، (انــین المــذ نبــین ) (٤٢١٨)

جا مــەلا ئیک شین دەکــەن لای کردگــار
ئــەی مــوجیبی گشت دوعا، ئــەی موستەجار (٤٢١٩)

عەبــدی تــۆ گریــان دەکــاو شــین، زار زار
غــەیری تــۆ نیتــی ئومێــد ئــەی کردگــار (٤٢٢٠)

خــۆ بــەبێگانان دەبەخشــی تــۆ عــەتا
بــۆ نیبازمەنــدان ئــەتۆی پشــت و پــەنا (٤٢٢١)

حــەق دەڵێ خــۆ نــەک لەبــەر خــواری ویــە
عــەینی تــەئخیری عــەتا یــاری ویــە (٤٢٢٢)

هاتــەلای مــن چــون بــەمن بــووی ئــەو نیــاز
هاتــەلام چــون بــوو، لــەمن حاجــەت خــواز (٤٢٢٣)

گــەر نیــازی وی بــدەم ئــەو ســار دەبــێ
ئــەو بــەبازی پێش کەبووی، دوو چار دەبێ (٤٢٢٤)

گەرچی ناڵەی دێ و، دەڵێ ئەی موستەجار
بێژەتــۆ، هــەر دڵ شــکاو بــەو دەردەدار (٤٢٢٥)

چــون لــەلای مــن خۆشــەزۆر ئــاوازی وی
ئــەو ســەدای خــوا کــردن و ئــەو ڕازی وی (٤٢٢٦)

خۆشەویســتە، لام کەســێکی نێــو دوعــا
جــەلبی لــوتفی مــن لــەبۆ لای خــۆی دەکــا (٤٢٢٧)

تووتیــا ن و بولبــولانی دڵپەســەند
بــەس لەبــەر ئاوازیــان دەخرێنەبەنــد (٤٢٢٨)

زاغ وکونــدان کــێ دەخاتــەنێو قەفــەس؟
هیچ کەسێ نەی بیس، لەداستان و قەسەس (٤٢٢٩)

دوو نەفــەر یــەک پیرو یــەک زۆر ساز بێ
بچنــەلای یــەک کــەس کەشاهید باز بێ (٤٢٣٠)

نان بکەن داوا ئەوان دوو،جوان و پیر     تاکوبڕوا پیر،دەدا بەو زوو، فەتیر (٣١)

بۆ ئەوەی دیکەی قەدو ڕوو جوان و شاد     کەی دەدا نان؟ بەل دەکا تەئخیر زیاد (٣٢)

پێیدەڵێ دانیشەیێ ئازار کەمێ     نانی تازە، دێ لەماڵ، من دەت دەمێ (٣٣)

پاش عەزاب ئەو نانەگەرمە، گەرکو هات     پێیدەڵێ دانیشەهەڵواش، دێتەلات (٣٤)

جا بەفێڵی وا، ئەوی تەئخیر دەکا     زۆر بەپنهانی ئەوی یەخسیر دەکا (٣٥)

پێیدەڵێ کارم بەتۆیەئەی فڵان     مونتەزیر بە، ئەی ئەتۆ جوانی جیهان (٣٦)

گەر مەرامی موئمینان دێر دێتەدی     بەس لەبەر ئەو کارەیە، ئەی موهتەدی (٣٧)

## گەڕانەوەبۆلای داستانی ئەو شەخسەی کەلەمیسردا گەنجیان نیشان دا وبەیانی ناڵین و پاڕانەوەو ئیلتیماس لەبەر فەقیری لەدەرگای حەزرەتی حەق ..

شەخسی واریس ئیرسی خۆی خوارد،بوو فەقیر     کەوتەیاڕەب یاڕەب و شین و نەفیر (٣٨)

کێ یە، لێدا لەو دەرەی ڕەحمەت نیسار     بۆئیجابەت بۆی نەیەت دوو سەت بەهار (٣٩)

دی دەخەو دا، بەو دەڵێ دەنگێک نیهان     تۆ لەمیسرت بۆ دەبێ سەرووەت عەیان (٤٠)

تۆ بڕۆ میسر، چا دەبێ بۆت کارو بار     لێی قەبووڵ کردوویەویستت کردگار (٤١)

نێو فڵان جێگایە،گەنجێک زۆر عەزیم     تا میسر وەدوای کەوە، بێ ترس و بیم (٤٢)

تۆ لەبەغدا هەستەزوو، ئەی دەردمەند     ڕووکەلای ئەو میسرە، چێ شین بوونی قەند (٤٣)

ئەو کەڕێی میسری لەبەغدا گرتەبەر     گەییەمیسرو،زوو تەوانی هاتەبەر (٤٤)

بەو ئومێدەی دەنگی غەیبی دای،کەگەنج     ئەو لەمیسری دێتەدەس، بۆ دەفعی ڕەنج (٤٥)

نێو فڵان کۆیەو فڵان جێگا، دەفین     گەنجەکی زۆر نادرو بێ حەد سەمین (٤٦)

لای نەما هیچ خەرج و پووڵێک ئەو، بەڵام     بۆ گەدایی ویستی بچتە، دەرکی عام (٤٧)

شەرمی وی نەی هێشت بکا ئەو کارەئەو     دامەنی سەبری دەگرت ئەو جارەئەو (٤٨)

نەفسی وی، ئەمما لەبرسان، هاتەجۆش     غەیری سواڵ،ئەو چی نەهاتە، فکرو، هۆش (٤٩)

زۆر بەنەرمی شەو کەهات من دەچمەدەر     تا نەبینرێ ڕووم کەبووم شەو، سواڵکەر (٥٠)

چەشنی شەو گەڕ شەو دەکەم من زیکری (هوو)     تابگا پێم پووڵ لەبان، هەرچەندەبوو (٥١)

چوو مەحەللە، بەو خەیاڵەی بوو ی لەسەر     بەو خەیاڵەئەو دەچوو، بۆ دەو روو بەر (٥٢)

شەرمی وی مانیع بووجار جار، وابکا     جووع، بەڵام دەی ویست کەئەو، داوا بکا (٥٣)

بوو مورەددەد تاکوچوو سولسی شەوێ     سواڵ بکەم من، یا بنووم، هیچم نەوێ؟ (٥٤)

**گەیشتنی ئەو شەخسەبەمیسر و بەشەو وەدەرکەوتنی وی بۆ مەحەللە، بۆ گەدایی وسواڵ کردن.. وگرتنی دارۆغەئـەو شەخسەوحاسڵ بـوونی مـرادی وی لـەو دارۆ غەیـە،پاش لێدانێکی زۆر .. (وعسی ان تکرهووا شیئا وهو خیر لکم .. وقوله تعالی سیجعل الله بعد عسر یسرا .. وقوله تعالی، ان مع العسر یسرا،.. وقولـه علیـه السلام اشتدی ازمـه تنفرجی ) وجمیع القران والکتب المنزله فی تقریر هذا..**

| | | |
|---|---|---|
| پاسـەوان گرتـی لـەناکاو ئـەو هـەژار | مسـت و زلـلـەو داری کـردن، بـەو نیسـار | (٤٢٥٥) |
| ئیتیفاقـەن دەوشـەوانی زێـدەتار | شـەو دزان بوویـان لـەبۆ عالـەم زیـرار | (٤٢٥٦) |
| بوو شەوێک ئەو شەو، مەخووف وموتەحەس | زۆر بەجیـد بـەدوای دزان دابـوو، عەسـەس | (٤٢٥٧) |
| ئـەمرو فـەرمانی دەدا، جـا، وا خـەدیو | ئێـوەببڕن دەس لەهەرکـەس، شـەو کـەدیو | (٤٢٥٨) |
| شـا، گـەلێک تەهدیـدی کـردن پاسـەوان | هێنـدەبۆچی بـۆ دزانـن، میهرەبـان | (٤٢٥٩) |
| مـەکرو فێڵـی وان لـەبۆ بـاوەڕ دەکـەن؟ | بـۆ قـەبووڵی زێـڕ، لەئـەهلی شـەڕ دەکـەن | (٤٢٦٠) |
| میهرەبـانی گـەڵ دزان و دەس کەسـیف | زەرب و شـەتم وخەشمەگەڵ شەخسی شـەریف | (٤٢٦١) |
| ڕەنجی خاس پێت وێڵ نەکا، قەت ئینتیقام | ڕەنجـی وی مـەنوارەتۆ، بـەل ڕەنجـی عـام | (٤٢٦٢) |
| مـار کـەقامکی گـەزت، زوو ئـەو لێوەکـەن | تـا نەیـەت، سەم بۆ هەموو ئەعزای بـەدەن | (٤٢٦٣) |
| دز،گـەلێک زۆر بـوون ئـەوان ڕۆژ، ئەزقـەزا | هـەم دزی خـام هـەم دزی زۆر شـارەزا | (٤٢٦٤) |
| پاسـەوان دەوکاتـەدا، دی دای لـەوی | هـەم بـەدار و هـەم بەمسـتی زۆر قـەوی | (٤٢٦٥) |
| دادو هـاواری بڵێنـد بـوو ئـەو فـەقیر | لێم مەدە، من ڕاس دەڵێم پێت، ئەی ئەمیر | (٤٢٦٦) |
| پێیـدەکوت مۆڵـەت بـەتۆم دا، بێژەتـۆ | بـۆ بەشـەو هاتوویـەدەر، بـۆ نێـو کـۆ؟ | (٤٢٦٧) |
| خـەڵکی ئێـرە، نـی ئـەتۆ بـۆ م ناشـناس | بێژەمـەکری تـۆ چییـە؟ دەی بێـژەڕاس | (٤٢٦٨) |
| ئـەهلی دیـوان تەعنـەیان نـارد بـۆ عەسـەس | ئێسـتەبۆ زۆرن دەزانـی پـیس دەس؟ | (٤٢٦٩) |
| زۆر دەبـن دز، بـەس لـەتۆو، ئەمسـالی تـۆ | بێـژەدەی پـێم، یـاری زۆر بـەدکـاری خـۆ | (٤٢٧٠) |
| ئینتیقـامی وان لـەتۆ دەگـرم دەتـا | مـاڵی ماڵـداران نـەچی تـا بـۆ فـەنا | (٤٢٧١) |
| ئـەو لەپاشـان خـواردنی زۆر سـوێندی پـڕ | نـیم ئـەمن خـۆ، خانەسـووزو کیسـەبڕ | (٤٢٧٢) |
| زاڵـم و دز نـیم بـەزاتی زولمینـەن | مـن غـەریبی میسـرو، بەغـدا شـم وەتـەن | (٤٢٧٣) |

**بەیانی ئەو حەدیسەکە..(الکذب ریبه والصدق طما نینه) یـانی درۆ شک دێنێ وڕاستی ئارامیش و سەکینە..**

| | | |
|---|---|---|
| گـەنجی زێـڕو خـەونی دی بـووی،کرد بـەیان | بـەو سـەداقەت وازبـوو قـەلبی پاسـەوان | (٤٢٧٤) |

حەق بەعیزرائیلی کوت ئەی زۆر قەوی  هات بەکێ ڕەحمت،کەگیانت ساند لەوی؟ (٤٧٩٧)

ـەوکوتی ڕەحمم بەعام دادێ بەلام  ئەمری تۆ ئیجرا دەبێ بکرێ تەمام (٤٧٩٨)

ـ ئەلێم من خۆزگەخوای هەر دووجیهان  بۆ عیوەز قوربان بکا، من بۆ جەوان (٤٧٩٩)

ـەکوت ڕەحمت بەکێ زیاتر دەهات؟  کێ لەقەلبت کۆی دەکرد غەم وەک قەلات؟ (٤٨٠٠)

ـێ جەواب ڕۆژێک لەسەر مەوجی قەوی  یەک گەمیم لەت کرد،نەم هێشت،ساغ،لەوی (٤٨٠١)

ـێت کوتم تۆ گیان لەهەموان جیا دەکەی  غەیری گیانی یەک مناڵ و دایکەکەی (٤٨٠٢)

ـن لەسەر یەک تەختەئەو دایکەو مناڵ  تەختەیان ئەمواج دەبرد، وەک بای شەماڵ (٤٨٠٣)

ـێت کوتم من دایکەکەش کەم بێ گییان  ئەمری (کن) بێ، بۆ مناڵیش پاسەوان (٤٨٠٤)

ـەرجودام کرد من لەدایکی خۆی مناڵ  خۆت دەزانی ئەو دەمەبوو، چەندەتاڵ (٤٨٠٥)

ـەمم دیون گەلێک سەخت و گران  دەردی ئەو تیفلەم لەبیر ناچێ، چ ئان (٤٨٠٦)

حەق کوتی ویستم لەئەمواج، تا مناڵ  بێن بەرن، جەنگەڵ بکەن بۆ وی، بەماڵ (٤٨٠٧)

ـەنگەڵێک پڕ سوێسن و گوڵ بێ ژمار  پڕ لەداری سەو زو جوان و میوەدار (٤٨٠٨)

ـر لەکانی ئاوی شیرین و زوڵاڵ  من بەسەت نازم بەخێو کرد ئەو مناڵ (٤٨٠٩)

ـەری دەنگ خۆش بوون دەوێدا، سەت هەزار  سەت نەوایان کرد ئەدا، لەو سەوزەزار (٤٨١٠)

ـێ گەڵای نەسرین بۆم کرد جێ وو بان  من لە فیتنەو میحنەتان، پێم دا ئەمان (٤٨١١)

ـن بەڕۆژم کوت ئەوی ئازار مەدە  من بە بام،کوت، توند بەسەر وی غار مەدە (٤٨١٢)

ـێ کوتم سەر وی هەور، باران نەدا  من بەبەرقم کوت بەوی،خۆی،شان نەدا (٤٨١٣)

ـێک مەدە، ئەی دەی، هەوای ئەو چیمەنە  لانەبەی، بەهمەن، لەوی، تۆش، چی هەنە (٤٨١٤)

## کەراماتی شێخ شەیبانی ڕاعی (قدس الله روحه العزیز)

ـەک خەتی شەیبانی ڕاعی دەو ری مەڕ  جومعەدەیکێشا، نەیەت تا گورگی شەڕ (٤٨١٥)

ـکو مەڕ هیچ لەو خەتی وی نەچنە دەر  تا نەیەن، گورگ و دزانی بەد نەزەر (٤٨١٦)

ـەشتی جغزی حیرزی ئەو هوودی نەبی  نێو ئەوی، سەڕ سەڕ، ئەمان بۆ ئالی وی (٤٨١٧)

ـەشت ڕۆژ دەو جغزەدا، سوکنا بکەن  چاو لە موسلەی عام بەدەستی با، بکەن (٤٨١٨)

ـۆ حەوا دەی بردن و دەیدان لەبەر  نەیدەهێشت ئێسکێک کەگۆشتی بێ لەسەر (٤٨١٩)

ـەستەیێکی لەو حەوا، وا، لێک دەدان  ورد دەبوو ئێسکیان، ئەوان، وەک تۆزی بان (٤٨٢٠)

ـەو سەزای لەرزی لەبەر وی ئاسمان  مەسنەوی جێگا ی کەمە، بۆ ئەو بەیان (٤٨٢١)

ـەر تەبیعەت وا دەکا، بۆ بایی سار  نەیدەگرت نێو جغزی حیرزی هوود قەرار؟ (٤٨٢٢)

ئـــەی تـــەبیعی یـــا تەبیعـــەت لابنـــێ / یانـــە، قورئـــان هـــەر لەســـەر ڕا، تـــابنێ (٤٨٢٣)

یـا لـەقوڕ ئـان خـوێن، ببەسـتەزار، ئـەتۆ / یـا موعـەللیم ڕەنـج بـدەو ئـازار ئـەتۆ (٤٨٢٤)

مـات دەمـای لـەو عـەجزەتۆ، لـەکوێ،دەهات؟ / یـەک نموونەعـەجزی حەشـرە، هاتـەلات (٤٨٢٥)

تـا تـەوانیت زۆر لـەپێش هـەن ئـەی غـەروور / ئێســـتەوەختەنادیاران، کـــەن، زهـــوور (٤٨٢٦)

خۆش بەحاڵ وەی عەجزو حیرەت بوون غـەزای / نێـو دوو دونیـا سـێبەری یـار بـوو پـەنای (٤٨٢٧)

ناتـــەوانی، نێـــو دوودونیـــا یـــاری وی / مـــردو دینـــی پیـــرەژن، موختـــاری وی (٤٨٢٨)

وەک زولـەیخا، نـووری یووسـوف دای لـەوی / ئـەو بـەپیری بـوو جـەوانێک، موسـتەوی (٤٨٢٩)

زینـــدەگی نێـــو مردنـــەو نێـــو میحنەتـــە / جێگـــەبۆ ئـــاوی ژیـــان، نێـــو زوڵمەتـــە (٤٨٣٠)

## گەڕانەوە بۆ داستانی بەخێو کردنی خوداوەند، نەمروود دەحاڵی منداڵی دا، بەبێ دایک و دایەن

ئـــەو گوڵســـتان چەشـــنی بـــاغی عارفـــان / ئەو لەسەر سەر، هەم سەمووم، دەبیوو،ئەمان (٤٨٣١)

یـەک پڵێنـگ منـداڵی سـاوای بـوو لەبـەر / من کەپێم کوت شیردەبەو، دەیکوت بەسەر (٤٨٣٢)

جـا بـەوی شـیر داوو، ئاگـای بـوو لـەوی / گـەو ڕەبوو، بـاڵغ دەبوو، وەک شـێر قـەوی (٤٨٣٣)

گـەر لەشـیر وەکرا،کـوتم بـا بـێن پـەری / یـاد بـدەن بـەو، نوتـق وبـەحس و،داوەری (٤٨٣٤)

مـن ئـەووم پـەروەردەکرد نێـو سـەو زەزار / کـوا بـەیان دەکرێـت، کـاری مـن بـەزار؟ (٤٨٣٥)

میهـری بـابم مـن دەدا، ئـەییووب نـەبی / تـا لـەوی کرمـان، زیانیـان، هـیچ نـەبی (٤٨٣٦)

دام بـەکرمی جیسـمی وی، میهـری وەڵـەد / بـۆ پـدەر چـاو قودرەتێکـە، زیـاد لەحـەد (٤٨٣٧)

میهـــری دایکـــم مـــن بـــەدایکان،یاد دەدا / چۆن دەبێ میهرێک کەخۆ م بیکەم ئەدا؟ (٤٨٣٨)

زۆر دەگـەڵ ویـم کـرد لوتـف و ڕابیتـە / تـــا ببینـــێ، لـــوتفی مـــن، بـــێ واســـیتە (٤٨٣٩)

تـا لـەنێو ئەسـباب ئـەو قـەت گیـر نـەکا / وەختـی یـاری، غـەیری مـن کـەس بیـر نـەکا (٤٨٤٠)

تـــا، چ عـــوزرو هـــیچ بەهانـــەی لا، نـــەبێ / قـــەت لـــەیاری زۆر بـــەدی، شـــکوا نـــەبێ (٤٨٤١)

ئـەو نیگەهداریـەی دەدی و، سـەت ڕابیتـە / چـۆن کەپـەر وەردەم دەکـرد، بـێ واسـیتە (٤٨٤٢)

شوکری وی بوو ئەوهە، ئەی بەندەی جـەلیل / ئـەو کـەبۆ نەمـروود و سـووزەندەی خـەلیل (٤٨٤٣)

شـــوکری ئـــەو شـــازادەبۆ شـــا، وا دەبـــوو / ئـــەو مـــەقام و گـــەو ڕەیـــی داوا، دەبـــوو (٤٨٤٤)

مـــن لـــەبۆ بێگانـــەتابیع بـــم، لـــەبۆ؟ / خـــۆم کەشـــام، ئیقبـــاڵی تـــازەم، لایـــەخۆ (٤٨٤٥)

لـــوتفی زۆری شـــا، کـــەکردم مـــن بـــەیان / نێـــو دڵـــی وی بـــوو لـــەخودخواهی نیهـــان (٤٨٤٦)

هـــەر وەهـــا نەمـــروود ئـــەڵتافی خـــودای / دادەنـا ژێـر پـای، لەبـەر جـەهل و عـەمای (٤٨٤٧)

ـتەبوتەکافرو گــومرا دەکــا    خودپەسـەندە، خـوایی هـەم داوا دەکـا (۴۸۴۸)

ـوو لـەبۆ لای ئاسـمانی بـا جـەلال    ئـەو بەخەرتـەل، تـا بکـا، گـەڵ مـن قیتـاڵ (۴۸۴۹)

ـتی منـداڵ بەناحـەق سـەت هـەزار    تـا کـو ئیبـراهیم، نـەبێ، پەیـدا، چ جـار (۴۸۵۰)

ـن مونەججیم وای بەیان کرد حوکمی ساڵ    دیتـەدونیا بـۆ قیتالـت، یـەک منـاڵ (۴۸۵۱)

ـ تەلاش کەتا هیلاک کەی ئەو عەدوو    بۆیەدەیکوشـت هـەر منالێـک، بایـەزوو (۴۸۵۲)

ـ بـەکوێری وی نـەجاتی بـوو منـاڵ    خوێنـەکانی دیکەشـی بـۆ بـوون، وەبـاڵ (۴۸۵۳)

ـعباب ئەو مولکەبۆی هات ئەی عەجەب    تـا فریـوی خـوارد بـەتاریکی نەسـەب؟ (۴۸۵۴)

ـ شـەهانی دی، کـەدایک و بـاب حیجـاب    گەو هەری وەر گرت لەمن، ئەو بەد حیساب (۴۸۵۵)

ـسی بـەدخوو، گورگـە، زۆر دڕنـدە، هـار    بـۆ بەهانـەدا دەنێـی، سـەر دۆسـت و یـار؟ (۴۸۵۶)

ـسی عاسـی وکـافرو پـیس و چەپـەڵ    بـۆ زەلالەت،ئـەو کـڵاوی سـەت کەچـەڵ (۴۸۵۷)

ـت دڵـیتم مـن بۆیەئـەی بەنـدەی خـودا    قەت نەکەی، رستە، لەئەستۆی سەگ، جودا (۴۸۵۸)

ـر موعەللەم بێت ئەو سەگ هەر سەگە    تۆ زەلیل کە، نەفسی خۆت، چون بەد ڕەگە (۴۸۵۹)

ـ دەمەی دەیکەی ئەتۆ، کەعبەی تەواف    نی،لـەبوونی مورشـیدی کامیـل مـەعاف (۴۸۶۰)

ـ کومورشـید تـۆ لەئـەرجاس پـاک بکـا    ببیەچەکمـەی پـایی دۆسـتی خـۆت، هـەتا (۴۸۶۱)

ـی دەکـا قورئـان گـەلێک نەفسـی دەنـی    چـاو لـەقورئان کـە، بـەچاوی بـاتینی (۴۸۶۲)

ـکـری نەفسـی عادیـان، قادرکـەبوون    بـۆ قیتـالی ئـەنبیا یـەک یـەک، دەچـوون (۴۸۶۳)

ـسی بەدشـووم نێـو هـەموو دەورو زەمـان    بـەر دەدا ئـاگر دەدونیـا ناگـەهان (۴۸۶۴)

**گەڕانەوەبۆلای داستانی شازادە کە لە ئازار دانی شا، ئازاری پێ گەیشت وپێش کامیل کردنی فەزایلی دیکەی خۆی کۆچی دوایی کرد ..**

ـی سـاڵێک غیرەتـی ئـەو شـەهریار    شـاهزادەی بـرد لـەبۆ لای گـۆڕی تـار (۴۸۶۵)

ـر ومهـۆش هـات شـەهریار لـەو مەحوەیـە    چـاوی خـۆی قاتـڵ دەدی، بـەو نەحوەیـە (۴۶۶۶)

ـ کـەچاوی کـرد لـەتیردان، ئـەو دەمـە    دی لـەنێو تیـردان، کـەتیرێکی کەمـە (۴۸۶۷)

ـوکوتی ئـەو تیـری مـن کـوا، ئـەی خـودا    خـوا کـوتی نێوحـەڵقی ئـەو شـازادەدا (۴۸۶۸)

ـی مـەقام والا، ئـەوی بەخشـی بـەلام    عـومری وی بـەو تیـر، لـەدونیا بـوو تـەمام (۴۸۶۹)

ـیومنی شـا، بـۆ دەگێـڕا، ئـەو دەمـە    ئـەو هەمووشـت، قاتڵـەو سـاحەب دەمـە (۴۸۷۰)

ـون بـەکول تەبـدیل نـابێ، قـەت بەشـەر    قاتـڵ و شـین گێـڕ نـەبێتن ئـەو ئەگـەر (۴۸۷۱)

ئەو شەهید دەیکرد گەلێک شوکری خودا / دای لەتەن تیر ئەو، لەڕووحی وی نەدا (٤٨٧٢)

تەن دەبێ نابوود و فانی( بیلمەئال) / جاویدان و شادەڕووحی خۆش خیسال (٤٨٧٣)

ئەو عەزاب بەس بوو لەسەر تەن ئاشکار / بێ عەزاب یار، خۆی گەیاندەلایی یار (٤٨٧٤)

گەرچی ئەو بوو زۆر بەشا، ئوممێد وار / عاقیبەت چاوی کەما ڵ،کردی دوچار (٤٨٧٥)

ئەو برای چووک تەنبەڵی وان جا، دەبوو / ئەو بەرەندەی سوورەت و مەعنا، دەبوو (٤٨٧٦)

**وەسیەت کردنی ئەو شەخسەکەلەپاش من ماڵ و سەروەتی من بدەن بەیەکێک لەو سێ منداڵانەم کەلەهەموان لەدواتر و تەنبەڵ ترە..**

وەسیەتی کرد وەختی مردن یەک نەفەر / بێ پەلە، باحەوسەلە،زۆر موعتەبەر (٤٨٧٧)

سێ کوڕی بوون قەد،وەکوو سەروی ڕەوان / وەقفی وانی کرد بوو ڕووح و ڕەوان (٤٨٧٨)

ئەوکوتی من چی هەمەماڵ و تەلا / بەو برای تەنبەڵ تر و کاهیل بگا (٤٨٧٩)

وەسیەتی لای قازی جا تیکرار کرد / جا شەرابی مەرگی خۆی، نێو زار کرد (٤٨٨٠)

جا بەقازیان کوت کوڕان ئەی موحتەرەم / ئەمری باب ئیجرا دەکەین، بێ زیاد و کەم (٤٨٨١)

ئەمری وی مەقبوولە، دەس وی ئیختییار / ئەمری وی لای ئێمە، هەیتی ئیعتیبار (٤٨٨٢)

ئێمەئیسماعیل و، ئیبراهیم ئەوە / گەر بکا قوربان، دەبین گشت پێکەوە (٤٨٨٣)

قازی دەیکوت ئێوەتیبقی عەقڵی خۆ / تەنبەڵی خۆتان بەیان کەن بێ درۆ (٤٨٨٤)

تا بناسم تەنبەڵیتان یەک بەیەک / تا لەحاڵی ئێوەنەم بێ من، چ شەک (٤٨٨٥)

عارفان تەنبەڵ ترینی دووجیهان / چون بەبێ کێڵان دەبەن خەر مەن ئەوان (٤٨٨٦)

تەنبەڵی بۆ عارفان بوو موتتەکا / چونکەکاری وان دەدا ئەنجام، خودا (٤٨٨٧)

کاری یەزدان چونکەنابینن عەوام / قەت لەڕەنج ئاسودەنابن سوبح و شام (٤٨٨٨)

تەنبەڵی خۆتا ن بکەن بۆ من بەیان / تا ببێ بۆم، حەددی سستیتان عەیان (٤٨٨٩)

چون زبان پەردەی دڵانەبێ گومان / پەردەگەرجوولا، دەبن ئەسراڕ، عەیان (٤٨٩٠)

پەردەیەک چووک چەشنی یەک پارەی کەباب / دا دەپۆشێ سەت هەتاوان،ئەی جەناب (٤٨٩١)

گەر وتارێکی درۆ بکرێ بەیان / سیدق و کیزبی وی لەبۆنی وی عەیان (٤٨٩٢)

ئەو نەسیمەی مەعبەری وی چیمەنە / جیایەلەو بای مەعبەری وی گوڵخەنە (٤٨٩٣)

بۆنی سیدق و بۆنی کیزبی سادەگیر / نێو نەفەس پەیدایەچەشنی عەترو سیر (٤٨٩٤)

گەر لەفەرقی یارو فێڵباز دوور خرای / تۆ، مەشامت زۆر خەراپە، بۆیەوای (٤٨٩٥)

نارەتەی نامەرد و مەردانی دلێر / لێک جودان وەک دەنگی ڕێویو، دەنگی شێر (٤٨٩٦)

وەک سەری مەنجەڵ بزانەتۆ زەبان     بۆت تەعام مەعلوومە، گەربخوا تەکان (٤٨٩٧)

ئەو بوخار مەعلووم دەبێ تامی تەعام     بۆ کەسێکی تیژ هۆش و،تیژ فام (٤٨٩٨)

گەر کو بکڕێ مەنجەڵی نوێ یەک جەوان     بۆی دەبێ مەعلووم، بەدەس لێدان، شکان (٤٨٩٩)

یەک کوتی من پیاو دەناسم زوو، لەزار     بێ وتار،سێ ڕۆژەدەیکەم ئاشکار (٤٩٠٠)

یەک کوتی من پیاو دەناسم چاک لەزار     گەر نەڵێ هیچ، وادەکەم بێژێ، وتار (٤٩٠١)

پێدەکوت گەر بیستبی ئەو،کاری تۆ     بێ گومان و شک دەبەستێ زاری خۆ (٤٩٠٢)

چەشنی ئەو دایکەی کەدەیکوت بۆمناڵ     گەر دەشەو دا هاتەبەرچاوت خەیاڵ (٤٩٠٣)

یا لەگۆڕستان و جێگای زۆر بەسام     یەک خەیالت دی بەکین و ئینتیقام (٤٩٠٤)

دڵ قەوی بەو، حەملەکەسەر وی، بەغار     ئەو لەپێش چاوت دەکا، فەو رەن فیرار (٤٩٠٥)

جا بەدایکی خۆی دەکوت ئەو دەم مناڵ     چەشنی تۆی کوتبێ ئەگەر، دایکی خەیاڵ (٤٩٠٦)

من دەکەم هێرش ئەویش هەروا دەکا     چی بکەم ئەو دەم ئەویش گەر وا دەکا؟ (٤٩٠٧)

پێم دەڵەی تۆ، من نەکەم هیچ جار فیرار     لای خەیاڵیش دایکەکەی گرتی قەرار (٤٩٠٨)

فێرکەری ئینسان و جین تەنها، یەکە     زۆرکەڕەت غاڵب کەمەو، زۆر، موندەکە (٤٩٠٩)

زەمبەرت بێ، با ئیرادەی کردگار     ڕاس بەدووی وی دا بڕۆ بێ هیچ خووار (٤٩١٠)

پێدەکوت قازی، نەڵێ گەر هیچ وتار     چون لەلای وی مەکرو فێڵت ئاشکار (٤٩١١)

چۆن دەناسی تۆ ئەوی؟ ڕاس بێژەجا     پێیدەکوت لای دادەنیشم بێ سەدا (٤٩١٢)

من لەسەبرم، چا دەکەم یەک نەردەبان     دەچمەسەر، بۆلای هەدەف، تا پشتی بان (٤٩١٣)

گەر لەقەلبی من لەلای وی بێتەجۆش     یەک وتاری غەیری ئێش و غەیری خۆش (٤٩١٤)

تێدەگەم ئەو بۆ منی نارد ئەو وتار     لەو دڵەی ڕووناک بەنووری کردگار (٤٩١٥)

لەو دڵەی پاک هاتەقەلبم ئەو وتار     چون لەدڵ ڕێی دا، بەدڵ، پەروەردگار (٤٩١٦)

---

**تەواو بوو جڵدی شەشەمی مەسنەوی شەریف بە سووڕەتی هۆنراوەی کوردی بە قەڵەمی عەبدوسسەلامی مودەڕیسی (خانی)... للەالحمدوالمنە... لە تاریخی بیست و پێنجەمی بانەمەڕی یەک هەزار و سێسەد و هەشتا و پێنجی کۆچی هەتاوی ... ١٣٨٥/٢/٢٥**

بسم الله الرحمن الرحيم

## کشف‌الابیات(میسرەعی یەکەمی بەیتەکان)

## ل

م